کردووە، کە کەسێ ڕێزی بشکێنێ و قەدری نەزانا، دیارە ئەرکی بەندە ئەوەیە کەنوێژو بەندەیی بۆ پەروەردگاری خۆی بکا، منیش بەم مەبەستە لێرەدا، دامناون، پەروەردگاری گەورەمان! ڕووی دڵی موسوڵمانانیان تێکە، کە بە تاسەو شەوقەوە بڕۆن بۆ لایان‌و بچن بۆ دێنی کابەی پیرۆز. خودایە! خۆت ڕۆزیدەری و بەس! دەی بەمیهری خۆت هۆو مایەی ڕۆزی و بەش و بارەی باشو زۆری هەردوو جیهانیان بۆ فەراهەم بهێنە، میوەو سەوزەوات و بەری دارو دەرەختیان پێ بدە، بەڵکوو ئەوانیش سوپاسی تۆ بکەن.

ئیتر دایکی ئیسماعیل لەو ئاوەی دەخواردەوە مەمکی دەدابە ئیسماعیل، کە ئاوەکە بڕایەوە ئەوسا خۆی و کوڕەکەی توونیەیان بوو، دایکی ئیسماعیل تەماشای کرد ئیسماعیل لەتاو توونێتی گینگڵە دەدا و، تەپاوتل دەکا، ئیتر ئوقرەی پێ نەگیراو چاوی بەرایی نەدەدا کە لەسەر ئەو حاڵە تەماشای جگەر گۆشە نۆبەرەکەی بکا! لەبەر ئەوە ڕۆیشت، ڕوانی کەوا کێوی صەفا نزیکترین کێوە لێیەوە لەو شوێنەدا، سەرکەوتە سەری و لەسەری وەستاو، ڕووی کردە ناو شیوەکە، سەیری دەکرد، تا بزانێ کەسێك دەبینێ، بەڵام کەسی نەدی، لەصەفا هاتە خوارەوە، هەتا گەیشتە ناو شێوەکە، لەوێ داوێنی کراسەکەی خۆی هەڵکردو خۆی گورج کردەوەو چاکی کرد بەلادا، ئینجا وەك مرۆڤێکی شەکەت و ماندوو، بەڵام کۆڵ نەدەر تا ئاخر هەناسە دەستی کرد بە لۆ قەکردن، تالە شیوەکە پەڕییەوە، ئەو جا سەرکەوتە سەر مەڕوەو لەسەری ڕاوەستاو، تەماشای ئەم لاولای خۆی کرد، تابزانێ ئایا کەسا دەبینێ، وەڵێ دیسان کەسی نەدی، وەحەوت جار وای کرد.[١١٥]

---

(١١٥) چارەی تۆ خوشکا! کاتی تەنگانە     هەولاو تەقەلای بەبێ وچانە
کریان و شیوەن پیشەی نەزانە     تەنیا کۆششە بۆ تۆ دەرمانە
دایکی ئیسماعیل ئەو مەردە کوردە     سەرمەشق و دایکی گشت ژنی کوردە!

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرمویٚ: پێغەمبەر (سەرو ڕۆح و ماڵ و منداڵو هەستو نەست، گشتی بە قوربانی گەردو تۆزی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێت) فەرمووی: لەبەر ئەمەیەو، بۆ یادگاری ڕووداوو داستانی ئەم ئافرەتە مەردە نەبەردەیە کە ئێستا لەکاتی حەج و عەمرەدا، حەوت جار خەڵکی هەڕا دەکەن لە نێوانی ئەم دووگردەدا، کە ئەم ڕاکردنە ناو دارە بە سەعی نێوانی صەفاو مەڕوە، دەنگێ بەرگوێی کەوت، خۆی بەخۆی گوت: ئاوس! کە بە باشی گوێی هەڵخست، دەنگەکەی بە باشی بیست، جا هاجەرە خاتوون فەرمووی: گوێم لە دەنگتە، لێقەوماوم، ئەگەر بەهاواری ئێمەوە هاتووی، ئەی خاوەنی دەنگ! پەریشانین تازووە فریامان بکەوە! کە سەرنجی‌دا وا فریشتەکە لە لای شوێنی زەمزەم دایە، لە پەنا حەزرەتی ئیسماعیل دا، بە پاژنەی پێی یا گوتی: بە باڵی خەریك بوو زەوییەکەی دەکۆڵییەوە، هەڵی کۆڵی هەتا ئاوی لێ دەرکەوت، ئیتر دایکە هاجەرە لە خۆشییاندا بە خۆڵ کردی بەگۆمیلکەو، بەدەستی ئاوای لێ دەکرد، هەتا ئاوەکەی بلاو نەبێتەوە، وە خۆش خۆش بەمشت ئاوەکەی هەڵ دەهێنجاو، دەیکردە کوندەکەیەوە، ئاوەکەیش لە دوا مستەکەی ئەوەوە خۆش خۆش هەڵ دەقولایەوە!

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: دایکی ئیسماعیل، (سەلامی خودای لێ بێ) ئەگەر لەکاتی خۆیدا دەست کاری زەمزەمی نەکردبایە، یا فەرمووی: ئەگەر بەلالەویچ هەڵی نەگۆزیایە، هەتا هەتایە زەمزەم دەبوو بەکانیاو، بەخوڕ لەبەری دەڕۆیشت، ئیتر دایکی ئیسماعیل هەم خۆی ئاوی خواردەوەو، هەم شیری دابە کوڕەکەی، جوبرائیل پێی فەرموو: مەترسن پەکتان ناکەوێ، چونکە خانەی خودا ئالێرەدا هەیە، ئەم کوڕەو باوکی دروستی دەکەن، وە خودا ئەهل و کەسی ئەو خانەی خۆیە زایە ناکاو داڵدەیان دەدا.

بەیتیش ئەو سەردەمە پارچەیێ زەوی قۆقز بوو، وەك تە پۆڵکە وابوو، لافاو لێی دەدا و لە ڕاست و لە چەپیەوە لێی دەبرد، ئیتر دایکی

ئیسماعیل هەروا بەو شێوەیە لەوێ مایەوەو، ئاوی زەمزەمی دەخواردەوەو، برێتیی نان و ئاو دەکەوت بۆی و، مەمکی دەدا بە ئیسماعیل هەتا کاروانێکی جورهومی، یاخێزانێکی جورهومی لە ڕێگەی کەلی کەدا ئەوە هاتن، لە خوار مەککەوە خستیان، کەچی باڵندەیەکیان دی گڕی دەخوارد بەسەر ئاوەکەوە، گوتیان، ببێ و نەبێ ئەم مەلە بەسەر ئاوەوە دەگەڕێ، ئەم دۆڵەش ئێمە شك بەرین شیوێکی وشك و برینی بێ ئاوە، دەی دەبێ ئەمە چی بێ؟

جانوێنەرێ، دوو نوێنەریان نارد، کە چوون ئاوەکەیان دۆزییەوە و گەڕانەوەو، هەواڵی ئاوەکەیان بۆ یان بردەوە، ئەوانیش چوون بۆ لای ئاوەکە، دایکی ئیسماعیل لەسەر ئاوەکە بوو، گوتیان پێی: ڕێگەمان دەدەی کە لە لای تۆ هەوار هەڵ دەین؟ گوتی: بەڵێ، بەڵام ئاوەکە هی منەو مافی ئێوەی پێوە نییە، مەگەر بەرمزای من سوودی لێ وەربگرن.

گوتیان: بەڵێ باشە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: جا ئاوا ئەو خێڵە لەسەر ئەوحاڵە دایکی ئیسماعیلیان دۆزییەوەو تووشی بوون، لەکاتێکی وادا کە دایکە هاجەرە خۆشی حەزی لە ئاوەدانی و هاودەم و ئاو دەنگ بوو! ئیتر خۆیان لەوێ بەزین و ناردیان بەشوێن کەس و کاریانا، ئەوانیش هاتن و لەگەڵ ئەوانا لەوێ کۆچ و باریان خست و مەککەیان ئاوەدان کردەوە! هەتا بەرە بەرە لەوێ بوون بەچەن ماڵی و زۆر بوون، لەو لایشەوە کوڕکەیش گەورە بوو، تا بوو بە هەرزەکارو هەر لەوانەوە فێری زمانی عەرەبی بوو، کە گەورە بوو دڵیان گرتیو، کە ڕەسیدە بوو ژنێکیان لە خۆیان بۆ هێنا، ئەوجا هاجەرە خاتوونی دایکی ئیسماعیل مردو فەرمانی هەقی بەجێهێنا، تەمەنی نەوەد ساڵ بوو، ئیسماعیلی کوڕی (سەلامی خودای لێ بێ) لە حیجرا ناشتی، پاش ژنهێنانی ئیسماعیل، حەزرەتی ئیبراهیم هات سەر لەخێزانە جێماوەکەی بدات، واڕێ دەکەوێ ئیسماعیل لە ماڵ نابێ، لە ژنەکەی ئیسماعیل دەپرسێ: ئیسماعیل لە کوێ یە؟ دەڵێ: چووە شتێکمان بۆ پەیدا بکا، لەگوزەران و حاڵ و بارودۆخی ژیانیشیانی پرسی، ژنەکە گوتی: حاڵمان شڕە و زۆر خراپە و

لەتەنگانەو سەخڵەتیدابن! وەشکاتو سکالایەکی زۆری لای ئیبراهیم کرد. ئیبراهیم (سەلامی خودای لێ بێ) فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سڵاوی لێ بکەو پێی بڵێ: ئاسانەی دەرگاکەی بگۆڕێ، کە ئیسماعیل دێتەوە وەك سووسەو بۆنی شتێ بکا، دەفەرموێ: کەسێ هاتووە بۆ لاتان؟ ژنکەی دەڵێ: بەڵێ، پیرە مێردێ لەم حاڵە لەم ڕەنگە هاتبوو، پرسیاری تۆیشی لێ کردین، منیش پێم گوت، وە پرسیشی: کە گوزەرانمان چۆنە، پێم گوت: حاڵمان شڕە، زۆر پەرۆش و سەخڵەتین! فەرمووی: ئایا هیچ ئامۆژگارییەکی نەکردیت؟ دەڵێ: با، فەرمووی: سڵاوت لێبکەم و دەشی فەرموو: ئاسانەی دەرگاکەت بگۆڕە. فەرمووی: ئەو پیاوە باوکم بوو، فەرمانی پێ کردووم، کە لە تۆ جیا ببمەوەو دەستت لێ بەردەم، کەواتە بڕۆرەوە بۆ لای کەس و کاری خۆت، تەلاقی داو ژنێکی تری لێ مارەکردن.

جا چەندەی کە خودا حەزکا ئەوەندە ئیبراهیم مایەوەو نەهاتەوە بۆ لایان، لە پاشا کە هاتەوە بۆلایان دیسان ئیسماعیلی نەبینی، چوو بۆماڵەوە بۆلای ژنە تازەکەی و هەواڵی ئیسماعیلی لێ پرسی، گوتی: دەرچووە تا بژێوییەکمان بۆ پەیدا بکا، دەفەرموێ: ئێوە چۆنن و حاڵو گوزەرانتان چۆنە؟ دەڵێ: زۆر باشین و لە خودا بەزیاد بێ، گوزەرانمان زۆر باشە عەرزی کرد: قوربان بفەرموو دابەزە، پشوێی بدە، نانێ ئاوێ بخۆ، دەفەرموێ: خۆراکتان چییە؟ دەڵێ: گۆشتە، دەفەرمووێ: ئەی خواردنەوەتان چییە؟ دەڵێ: ئاوە، دەفەرموێ: خودایە! پیتو فەڕو بەرەکەت بخەرە گۆشتو ئاویانەوە بۆیان.

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو سەردەمە دانەوێڵە یان نەبوو، ئەگینا بۆ ئەویش نزای پیت و فەڕی بۆ دەکردن. گوتی: هەرکەسا لە شوێنێکی تر، جگە لە مەککە، خۆراك و خواردنەوەی تەنیا ئاوو گۆشت بێ، پێی ناکەوێ، بەڵام لە مەککە پێی دەکەوێ، فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سڵاوی لێ بکەو پێی بڵێ: ئاستانەی دەرگاکەی واتە: داری ژێر دەرگاکەی لە جێی خۆی چەسپ بکاو بهێڵێتەوە.

که ئیسماعیل دێتەوە دەفەرموێ: کەس هاتووە بۆ لاتان؟ دەڵێ: بەڵێ، پیرە مێردێکی نوورانی شێوە شیرین هاتە ماڵمان، گەلێ وەسپی باشی کرد، پرسیاری تۆی لێ کردم، هەواڵی تۆم بۆی باس کرد، لەگوزەرانی پرسین، پێم گوت: کە زۆر باشین، فەرمووی: ڕاسپێری کردیت؟ گوتی: بەڵێ، سلاوی لێ دەکردیتو دەیفەرموو: کە ئاستانەی دەرگایەکەت مەحکەمتر بکەی، فەرمووی: ئەوە باوکمە، ئاستانەی دەرگاکەیشم مەبەست تۆیە، ژن بەردی بنچینەی ماڵە، باشی و خراپیی خانوو بەندە لەسەر بەردی بناغەکەی جابۆیەکا فەرمانی پێ کردووم کە لەلای خۆم بتهێڵمەوەو بەرەلات نەکەم.

جا چەندەی کە خودا حەزبکات، حەزرەتی ئیبراهیم مایەوەو، نەهاتەوە بۆلایان، کە هاتەوە ئیسماعیل لەبن ئەو شێخەڵە گەورەدا کە خۆی یەکەمجار لەوێ دایناڻ، کە لە نزیکی بیری زەمزەمەوە بوو، خەریك بوو تیرێکی دادەداو دەیتاشی، کە چاوی بە باوکی کەوت بەرزەپێ لەبەری هەڵساو چوو بەپیریەوەو لەسەر شێوەی باوك و کوڕ، دەست و مۆچانو ئەمانەیان کردو، لە پاشا ئیبراهیم فەرمووی: ئەی ئیسماعیل! خودا فەرمانێکی داوە بەسەرما، ئایا تۆ دەتوانی کۆمەکیم بکەی؟ فەرمووی: فەرمانی پەروەردگارت بەجێ بێنە، فەرمووی: تۆ یارمەتیم دەدەی؟ فەرمووی: منیش یارمەتیت دەدەم.

ئیبراهیم تەپۆڵکەیەکی بە ئیسماعیل پێ نیشان دا، کە دەیڕوانی بەسەر دەوروبەری خۆی داو فەرمووی:خودای گەورە فەرمانی پێ فەرمووم کە ئا لێرەدا خانەیەك دروست بکەم، گوتی: ئیتر ئەو حەلە دەستیان کردبە بناغە دانانی بەیتی خانەی خوداو بەرە بەرە بناغەی بەیتیان دوو بە دوو بەرز کردەوە، ئیسماعیل شاگرد بوو بەردی دەهێناو، ئیبراهیمیش وەستابوو، دروستی دەکرد، یەك شاگردو یەك وەستا! تاخانووەکە بەرز بۆوە، ئەو جا ئیسماعیل ئەم بەردەی بۆ باوکی هێنا، کەپێی دەگوترێ: بەردەکەی ژێرپای

ئیبراهیم، یاحەجەری مەقامی ئیبراهیم، بەردەکەی بۆ دانـاو، ئیبراهیم لەسەری وەستاو، خانووەکەی دروست دەکردو ئیسماعیل بەردی بۆ دەهێناو دەیدایە دەستی‌و ئەویش لە ڕیزی دیوارەکەدا دای دەناو، پێکەوە بەیەك دەنگ‌و یەك دڵ، بەسۆزەوە دەپاڕانەوەو دەیان فەرموو:﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا انَّكَ انْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (١٢٧/٢).

واتە: خوایە ئەم کارەمان لێ قەبووڵ بفەرموو، چونکە هەر خۆتی کە گوێت لەدەنگمان بێ و ئاگات لەحاڵی دڵمان بێ (تاج/٦ ل/١٥ ز/٣ ق/١٢).

کوڕە شاگردەو باوکی وەستایە
خانووش بەیتوڵڵای خانەی خودایە
شتی وانایاب، بەدەگمەن وایە
بەهەرەی باوانی ڕەسولە ئلایە

١٣٥٢- عَنْ ابَي ذَرّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ ايُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الارْض اوَّلَ؟ قَالَ: (الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ)، قَالَ: قُلْتُ: ثمَّ ايٌّ قَالَ: (الْمَسْجِدُ الاقْصَى) قُلْتُ: كَمْ كَانَ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: (ارْبَعُونَ سَنَة ثمَّ ايْنَمَا ادْرَكَتْكَ الصَّلاة بَعْدُ فَصَلِّهْ فَانَّ الْفَضلَ فِيهِ)(الحديث: ٣٣٦٦، طرفه في:٣٤٢٥ )(١١٦)

ئەبوزەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم پرسی، کام مزگەوتە یەکەم مزگەوتە کە لەسەر زەوی دروست کراوە؟ فەرمووی: (مسجیدو لحەرام) گوتم: ئەی پاش ئەو؟ فەرمووی: (مسجیدول ئەقسا) گوتم: چەن ساڵیان بەین بووە؟ فەرمووی (چل ساڵ، پاش ئەمەش زەوی هەمووی بۆ تۆو بۆ هەموو موسوڵمانێ، لە حوکمی مزگەوت دایەو، لە هەرکوێ نوێژت لێ بوو نوێژی خۆت بکە، چونکە خێر لەوەدایە کە هەموو نوێژی لە کاتی خۆی دا، لەسەرەتای کاتیەوە بکرێ). (تاج/١ ل/٣٤٩ ز/١١٥ ف/١ باسی گەورەیی سێ مزگەوتەکە)+ (ریاض/٤ ل/١٣٦٩ ف/٦٠).

(١١٦) اخرجه مسلم في الصلاة (عيني/١٥ ص-٢٦٢ —المترجم ).

**ڕونكردنەوە:**

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە كە هەموو شوێنێكی زەوی بە مەرجی تایبەتی خۆی دەست دەدا بۆ نوێژكردن، نەتەوەی ئیسلام دەتوانن لەهەر شوێنێ نوێژ بوو نوێژی خۆیان بكەن، نەك وەك هەندێ نەتەوەیتر كە بەپێی ئایینی تایبەتی خۆیان مەرجە هەر لەپەرستگاكانیانا نوێژ بكەن. وەكیتریش زۆر بڕیاری تر لەم بڕیارە گشتییە دەردەكرێ، وەك لە غەیری مزگەوتا نوێژی سلاوی مزگەوت ناكرێ، یاحەرام نییە تۆ لەهەركوێیەكی زەوی كە مزگەوت نەبێ، دورست ببێ لەگەڵ حەلاڵی خۆتا، یابە لەشی پیسەوە دابنیشی، وە زۆر بڕیاری تری لەم بابەتانە.

١٣٥٣- عَنْ ابي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) انَّهُمْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَازْوَاجِهِ وَذُرِّيَتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ وَبارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَازْوَاجِهِ وَذُرِّيَتِهِ كَمَا بارَكْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) (الحديث: ٣٣٦٩، طرفه في: ٦٣٦٠)[١١٧].

ئەبو حومەیدی ساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتیان كرد: چۆن چۆنی درووودت لە دیدار بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَازْوَاجِهِ وَذُرِّيَتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ وَبارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَازْوَاجِهِ وَذُرِّيَتِهِ كَمَا بارَكْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

واتە: ئەی خودایە! بڕژێنە میهرەبانی و ڕەحمەت بۆ سەرموحەممەدو كەس وكاری موحەممەد، وەك ئەو میهرەبانی و ڕەحمەتەی كەڕژاندووتە بەسەر ئیبراهیم و كەس وكاری ئیبراهیم دا، وەپیتو فەڕوبەركەت بڕژێنە بەسەر موحەممەدو بنماڵەی موحەممەددا وەك ئەو پیتو فەڕو بەرەكەتەی

(١١٧) اخرجه مسلم في الصلاة ، باب: الصلاة على النبي ﷺ بعد التشهد ، رقم: ٤٠٧.

كە ڕژاندووتە بەسەر ئیبراهیم و بنەماڵەی ئیبراهیم دا، بەڕاستی تۆ ئەی خودایە! شایستەی هەموو سوپاس و ستایشێکیت، وەخودایەکی گەلێ گەورەو پیرۆزیت (تاج/١ ل/٢٥٤ ز/٧٢ ف/١٣ باسی بنیات (روکن)ەکانی نوێژ+ تاج/٩ ل/٢٤٤ ز/٨٨ ف/١ - باسی صەلاوتدان لەدیداری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) + ریاض/٣ ل/١٠٠٩ ف/١١- باسی نامەی سەلاواتدان لەدیداری پێغەمبەر).

١٣٥٤-عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُما)قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ وَيَقُولُ: (انَّ اباكُمَا كَانَ يُعَوِّذُ بِهَا اسْمَاعِيلَ وَاسْحَاقَ اعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّة مِنْ كُلِّ شَيْطانٍ وَهَامَّة وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لامَّة) (الحديث: ٣٣٧١)[١١٨].

ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) دووعای بێچاوێنی و نزای ئاگاداری و چاوەزاری، بۆ حەسەن و حوسەینی کچەزای (درووود و سەلات و سەلام، لەسەر باپیرەیان و باوك و دایك و خۆیان بێ) نزای چاوەزاری بەم شێوەیە بۆیان دەكرد، دەیفەرموو: (اعُيذكما بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّة مِنْ كُلِّ شَيْطانٍ وَهَامَّة وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لامَّة) لە پەنای وشە تەواوەکانی خودا دابن، دووربن لەزیانی هەموو شەیتانێ، وە خودا بتانپارێزێ لە وەزەنی هەموو مارو مێروو و گەزەندەیێ، وەبێ چاوێنی بن لە هەموو چاوێکی پیسی تاوانبار، وە حەزرەت (درووودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (بابەگەورەشتان ئیبراهیم لە کاتی خۆی دا، بەم وشانە دوعاو نزای حیفظ و چاوەزاری دەکرد، بۆ ئیسماعیل و ئیسحاق، کە هەردووکیان کوڕی خۆی بوون، درووودی خودا لە هەموو یان بێ). تاج/٦ ل/٢٢٠ ف/٩ ز/٧٤ - باسی ووشەکانی دوعاو نووشتی).

١٣٥٥- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (نَحْنُ احَقُّ بالشَّكِّ مِنْ ابْرَاهِيمَ اذ قَالَ: ﴿رَبِّ ارِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ: اوَ لَمْ تُؤْمِنْ قَالَ: بَلَى وَلَكِنْ لِيَطمَئِنَّ قَلْبِي﴾ وَيَرْحَمُ اللَّهُ لُوطا لَقَدْ كَانَ يَاوِي الَى رُكْنٍ

---

(١١٨) لم يوافقه مسلم على اخراجه (فتح/٦/٥٢٤ - فتح /٧/٢٠٨ طبعة جديدة -المترجم).

شَدِيدٍ وَلَوْ لَبِثتُ فِي السِّجْنِ طولَ مَا لَبِث يُوسُفُ لاجَبْتُ الدَّاعِيَ) (الحديث: ٣٣٧٢، اطرافه في: ٣٣٧٥، ٣٣٨٧، ٤٥٣٧، ٤٦٩٤، ٦٩٩٢)[(١١٩)].

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (گریمان ئەگەر من لە فەرزی مەحاڵدا، گومان و دوودڵیم لە زیندوو بوونەوەدا هەبێ ئیبراهیم شتی وای نەبووە، بەڵام ئەم گوفتوگۆی ئیبراهیمە، کە لەم ئایەتەدا، خوا باسی فەرمووە بۆمان، تەنیا بۆ ئەوە بووە کە بە هۆی دیتن بە چاوی سەرەوە، تەواو دڵ ئەستوورو دڵنیابێ، وەکوو چۆن ئێمە بەبیستن بۆمان دەرکەوتووە، کە دەریای گەورە گەورە هەیە، بەڵام کاتێ بە چاوی سەر ئەو دەریایانە دەبینین، هەرچەند زانست و عیلمە کۆنە کەمان، کە لە ڕێگەی ژنەوتنەوە بووە، هیچ پترنابێ، بەڵام پتەو ترو دامەزراوتر دەبێ، تەنانەت ئەگەر یەکێ لەوە دوا بڵێ دەریا ووجوودی نییە، ئێمە بڕوای پێ ناکەین.

ئایەتی گوفتوگۆکە ئەمەیە: ﴿رَبِّ ارِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَى قَالَ: اوَلَمْ تؤمِنْ قَالَ: بَلَى وَلَكِنْ لِيَطمَئِنَّ قَلْبِي﴾ بەقەرە (٢/٢٦٠).

واتە: ئیبراهیم فەرمووی: پەروەردگاری من! ئەی خاوەنی هەردوو جیهان! نیشانم بدە ئەم خەڵکە کە دەمرن و ساڵەهای ساڵ دەبنە وە بەخاك و ئەندامەکانی لە شیان دەڕزێن و دەبن بە خۆڵ و خاشاك و بای ڕۆژگار، بە ئارەزووی خۆی شەن و کەویان دەکاو، پەخش و پرشیان دەکا لە وولاتا، چۆن چۆنی تۆ لە قیامەتا زیندوویان دەکەیتەوەو، بەچی شێوەێی ئەو پارچە پەرتو بلاوانە یەك دەخەیتەوە؟

خودا لەوەلامی ئیبراهیم دا فەرمووی: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ هێشتا باوەڕت نەهێناوە بەوە کەمن دەتوانم مردوو زیندوو بکەمەوە؟ عەرزی کرد:

---

(١١٩) اخرجه مسلم في الايمان، باب: زيادة طمانينة القلب بتظاهر الادلة، وفي الفضائل، باب: من فضائل ابراهيم الخلايل ﷺ رقم: ١٥١ .

با، بەخودا زۆر باش ئەوە دەزانم و باوەڕم بەوە هەیە، بەڵام دەمەوێ کە دڵم ئاو بخواتەوەو وەها دابمەزرێ، کەئیتر دڵەڕاوکێ و ڕێگەی سووسەی سووسەبای وەسواس و ڕاڕایی و دوو دڵی نەفس و دەروون لە دڵ وناخی مندا نەمێنێ و، ئەوەی کە بەدڵ باوەڕم پێی کردووە، بە چاوی سەریش بیبینم!!

خودای مەزن بۆ خۆی دەیزانی کە ئیبراهیم ئەمە دەزانێ، وەڵێ بۆیە ئەم پرسیارەی لێ کرد تا بیسەران وەلامەکەی ئیبراهیم ببیستن!). تاج/٦ ل/٤٨ ف/٥٦ ز/٣- تەفسیری سوورەتی بەقەرە).

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووشی: ڕەحمەتی خودا لە لووط پێغەمبەربێ، لەسەرچی بیرو باوەڕێ فەرموویەتی: ﴿لَوْ انَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً اوْ اوِي الَى رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ واتە: حەزرەتی لووط پێغەمبەر، کاتێ هۆزەکەی پەلاماری میوانەکانیان داو، هەوڵی لەگەڵیاندا دا کەوازبێنن و رووزەردی بەسەر خۆی و میوانەکانی نەهێنن و هەوڵەکەی سوودی نەبوو، پاش ئەمە فەرمووی: کاشکی یاخوم هێزێکم ببوایە، هەتا چارەی ئەم بێ شەرمیو نامەردی و زیادەڕەویی ئێوە مەپێ بکردایە، یاخود لە پەنای زاتێکی تەواناو بەهێزدا دەبووم، تا ئەو چارەسەری ئەم بێ شەرمییەی ئێوەی بکردایە! پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: چۆن وادەفەرموێ، خۆ ئەو واتە: حەزرەتی لووط لە ڕاستیدا لە پەنای زاتێکی تەواناو بەهێزدا بوو، کە خودای تەوانایە، ئیتر چۆن وا دەفەرموێ. لەلایەکی تریشەوە ئافەریم بۆ حەزرەتی یووسف، بۆ خۆی و بۆسەبری و بۆ خۆگرتنی، بەڕاستی مەردو بەسەبرو ئازاو بەپشوو بوو، ئەوە بوو، پاش ئەو هەمکە حەپس و زیندانییە، کاتێ پاشا ناردی بە شوێنی دا، کە بچێ بۆ لای، ئەو نەچوو، وە ویستی لە پێش دا بیسەلمێنێ کە ئەو بەناڕەوا بەند کراوە، بۆیە بەفروستادەکەی پاشای فەرموو: بڕۆ عەرزی پاشا بکە، فەرمان بدا، ئەو ژنانە کە دەستیخۆیان لەت و پەت کرد، لەگەڵ ژنی وەزیردا، لەکاتی دەعوەتە کەدا، کۆیان بکاتەوەو لێیان بپرسێ: حاڵی ئەوان چۆن بووە و حاڵی منیش چۆن بووە؟ تا پاك و

پیس دەر بکەویٚ بۆ هەمو لایێ، ئەوسا من دیٚم بۆ لای پاشا، وەلیٚ ئەگەر من لە جێگەی یووسف بوومایە و ئەوەندەی ئەو، وا زۆر لەبەندیخانەدا بمایەتەوە هەرکە دەهاتن بە دوامدا، گورج بەبیٚ چەندو چوون دەچووم لەگەڵیان بۆ لای پاشا. تاج/٦ ل/٢٤٣ ز/١٢ ف/٥ - باسی تەفسیری سوورەتی هوود.

١٣٥٦-عَنْ سَلَمَةَ بْنَ الاكوَع (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى نَفَرٍ مِنْ اسْلَمَ يَنْتَضِلُونَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (ارْمُوا بَنِي اسْمَاعِيلَ فَانَّ اباكُمْ كَانَ رَامِيًا ارْمُوا وَانَا مَعَ بَنِي فُلان)، قَالَ: فَامْسَكَ احَدُ الْفَرِيقَيْنِ بايْدِيهِمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا لَكُمْ لا تَرْمُونَ؟ قَالُوا: كَيْفَ نَرْمِي وَانْتَ مَعَهُمْ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (ارْمُوا فَانَا مَعَكُمْ كُلِّكُمْ) (الحديث:٣٣٧٣، طرفه في:٢٨٩٩، ٣٣٥٠٧ )[١٢٠].

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەلای دەستەیەکی ئەسلەمیەوە ڕابورد، نیشانینان نابۆوە، فەرمووی: ئەی نەوەی ئیسماعیل پێغەمبەر! تیر بهاوێژن و مەشق بەتیرو ڕم و چەك بکەن، چونکە لەکاتی خۆیدا، بابەگەورەیشتان تیرئەنداز بووا دەی بهاوێژن و ڕەفتاری باشی باو باپیرتان پشت گوێ مەخەن، دەی تێگرن، من لەسەر ئەم تیپەم! ئیتر تیپەکەی تر دەستیان کێشایەوە، حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوەچیتانە بۆ تیٚ ناگەن؟) گوتیان: چۆن تیٚ بگەین کەتۆ لەسەر ئەوان بیت! چۆن دڵمان بەرایی دەدا لە دژی تیپا کار بکەین کە تۆیان تیادا بیٚ! فەرمووی: (تێگەن من لەگەڵ هەمووتانم!) تاج/٨ ل/١٠٦ ف/٤ ز/٢٤ - باسی تیرئەندازی.

١٣٥٧- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا نَزَلَ الْحِجْرَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ امَرَهُمْ انْ لا يَشْرَبُوا مِنْ بِئْرِهَا وَلا يَسْتَقُوا مِنْهَا فَقَالُوا: قَدْ عَجَنَّا مِنْهَا وَاسْتَقَيْنَا فَامَرَهُمْ انْ يَطرَحُوا ذلِكَ الْعَجِينَ وَيُهَرِيقُوا ذلِكَ الْمَاءَ)[١٢١].

---

(١٢٠) استثناه العسقلاني من المتفق عليه (فتح /٦ص ١٩٥ —خاتمة كتاب الجهاد) - المترجم.

(١٢١)اخرجه مسلم في الزهد و الرقائق، باب: لاتدخلوا مساكن الذين ظلموا ... رقم:٢٩٨١.

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە غەزای تەبووکدا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کاتێ لە حیجر دابەزی، کە حیجر ولاتی هۆزی سەموودە، فەرمانی بە هاوڕێکانی کرد: کە نە لەئاوی بیرەکەی بخۆنەوە نەئاوی لێ بگرن، ئەوانیش عەرزیان کرد: قوربان! ساخۆ پێش ئەم فەرمانەی تۆ، هەم هەویریشمان پێ شێلاوەو، هەم ئاویشمان لێ هەلگرتووە! ئەویش فەرمانی پێکردن کە هەویرەکەی فڕێ بدەنە بەر وشترەکانیان و ئاوەکەیش بڕێژن) تاج/٦ ل/٢٥٨ ز/١٦ - سوورەتی حیجر.

١٣٥٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْكَرِيمُ ابْنُ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ اسْحَاقَ بْنِ ابْرَاهِيمَ عَلَيْهِمْ السَّلام) (الحديث:٣٣٨٢، طرفاه في: ٣٣٩٠، ٤٦٨٨ )[١٢٢].

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (مەردی کوڕی مەردی کوڕی مەردی کوڕی مەرد، کە خۆی و باوك و باپیری مەردو بەڕێز بوون، یووسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیراهیمە، سلاوو دروودی خوایان لێ بێت. تاج/٦ ل/٢٤٥ ز/١٣- سوورەتی یووسف -١+٢.

١٣٥٩- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: انَّمَا سُمِّيَ الْخَضرَ انَّهُ جَلَسَ عَلَى فَرْوَةٍ بَيْضَاءَ فَاذا هِيَ تَهْتَزُّ مِنْ خَلْفِهِ خَضرَاءَ)(الحديث:٣٤٠٢) + (رياض/١ ل/٨٣ ف/١/٦٩ ز/٦ – باسي تةقوا)[١٢٣].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (خدری زیندە بۆیە ناونراوە خدر، چونکە هەرکاتێ دادەنیشت لەسەر زەوی وشك و برینگ، گیای سەوزی لێ دەڕواو سەوز دەبوو، وە دەبوو

(١٢٢)لم يستثنهِ العسقلاني من الاحاديث المتفق عليها في خاتمة كتاب الانبياء. المترجم.

(١٢٣) لم يوافقهه مسلم على تخريج حديث (انما سمي الخضر) (فتح/٦ ص/٢٠٨ خاتمة كتاب احاديث الانبياء) -المترجم.

بەپارچەیا سەوزەگیا جالەبەر ئەمە ناونرا خضر (خدر) (واتە: سەوزایی و شینایی) تاج/٧ ل/١٢ ز/١ سوورەتی کەهف).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

١- بڕوانە: تاج بەرگی حەوتەم لاپەڕە/٤، فەرموودەی ژمارە /٢+٣+٤ بۆ زایناری تەواو لەبابەت حەزرەتی خدری زیندەوە.

٢- کورتەی هەواڵەکانی حەزرەتی خدری زیندە:

ا- فەرمایشتی هەرە دروست ئەوەیە کە جەماوەری زانیان دەفەرموون: پێغەمبەرە، هەندێکیش دەفەرموون: وەلیە، پێغەمبەر نییە.

ب- سەبارەت بە ژیانی، دیسان جەماوەر دەفەرموون: هەر ماوەو، ئێستا لەژیان دایە، بەتایبەتی پیاوانی تەریقەت و خاوەن کەشف و کەرامەتەکان دووپاتی دەکەنەوە، کە ئێستا دەژی و زۆر جاران پیاو چاکان دەیبینن و لەگەڵی دادەنیشن و گوفتوگۆی لەگەڵ دەکەن، خوایە بەنسیبمانی بفەرمووی و چاوی سەرو چاوی دڵمان بە دیداری ئەو و بەدیداری پیاوچاکان ڕۆشن بکەیتەوە، عەینی دەفەرموێ: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و بیشری حافی و شێخ مەعرووفی کەرخی و سری سەقەطی و جونەیدی بەغدادی و ئیبراهیمی خەواصێ و کەسانی تریش بەچاوی خۆیان بینیویانە.

ج/عەسقەلانی لە فەتحدا دەفەرموێ: ئیبنو عەساکیر لە ژینامەی ئەبو زورعەی رازیدا، بەرشتەیەکی ساغ (بەسەندیکی صە حیح) دەگێڕێتەوەکە: ئەبوزورعە دەفەرموێ: لاو بووم، پیاوێکم بینی، ئامۆژگاری کردم و فەرمووی: هاموشۆی کاربەدەستان و فەرمانڕەوایان مەکەو، ئامادەی کۆڕ و کۆبوونەوەیان مەبە، پاشان کاتێ پیریش بووم، هەمان پیاوم بینییەوە، لەسەر هەمان شێوەی پێشووی، دیسانەوە هەمان ڕاسپێری کردمەوە، فەرمووی: ئاوڕم دایەوە کە قسەی لەگەڵ بکەم، کەچی نەمبینی، هات بەدڵما کە ئەوە خدری زیندەبووا

٣- لەم شوێنەدا مامۆستای عەسقەلانی لە فەتحداو، مامۆستای عەینی لەعومدە تول قاریدا، بە دوورو درێژی هەواڵەکانی حەزرەتی خضریان نووسیوە.

١٣٦٠- عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَجْنِي الْكَبَاث وَانَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (عَلَيْكُمْ بالاسْوَدِ مِنْهُ فَانَّهُ اطيَبُهُ)، قَالُوا: اكُنْتَ تَرْعَى الْغَنَمَ؟ قَالَ: (وَهَلْ مِنْ نَبِيّ الا وَقَدْ رَعَاهَا) (الحديث:٣٤٠٦، طرفه في:٥٤٥٣ )(١٢٤).

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمەڕو ظەهران، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (درودی خودای لێ بێ) بەری دارسیواکمان دەڕنی، فەرمووی (درودی خودای لێ بێ): (ڕەشەکەی بڕنن، ڕەشەکەی خۆشە) عەرزمان کرد: قوربان! دەڵێی ڕانت لەوەڕاندووە، کەوا باشی لێ دەزانیت؟ فەرمووی: (ئەدیی، بۆچی پێغەمبەر هەیە کەشوانی ڕانی نەکردبێ!). تاج/٤ ل/٧٣ ز/٢١ - باسی خواردەمەنی.

١٣٦١- عَنْ ابِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثيرٌ وَلَمْ يَكْمُلْ مِنْ النِّسَاءِ الا اسِيَةُ امْرَاةُ فِرْعَوْنَ وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ وَانَّ فَضلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضلِ الثريدِ عَلَى سَائِرِ الطعَامِ) (الحديث:٣٤١١، اطرافه في: ٣٤٣٣، ٣٧٦٩، ٥٤١٨)(١٢٥).

ئەبو مووسا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (زۆرکەس لە پیاوان، پیاوی تەواویان لا دەرچووەو، بوون بە پیاوی یەکی کەڵەمێرد، بەڵام لە ژنان هەرمەریەمی کچی عیمران و ئاسیەی ژنی فیرعەون، ئافرەتی تەواویان لێدەرچوو، وە باو و فەضل و

---

(١٢٤) اخرجه مسلم في الاشربة، باب: فضيلة الاسود من الكباث، رقم: ٢٠٥٠

(١٢٥) خرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل خديجة ام المؤمنين (رضي الله عنها)، رقم: ٢٤٣١ .

گەورەیی عائیشە لە چاو ژنانی تردا، وەك باو و گەورەیی تریت وایە لە چاو خواردەمەنییەكانی تردا). ت/٤ ل/٧٦ ف/١٢ ز/٢١- باسی خواردەمەنی.

١٣٦٢- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا يَنْبَغِي لِعَبْدٍ انْ يَقُولَ انِّي خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى وَنَسَبَهُ الَى ابِيهِ) (الحديث: ٣٤١٦، طرفه في: ٣٤١٥، ٤٦٣١، ٤٦٠٤، ٤٨٠٥)[(١٢٦)].

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (بۆ كەس ڕەوا نیە لەخۆیەوە بڵێ من (واتە پێغەمبەر) لەیونسی كوڕی مەتتا باشترم ) حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) یوونسی بەناوی باوكیەوە ناوهێنا كە مەتتایە) (تاج/٤ ل/٢٨٨ ف/٢ ز/١١٨ - باسی فەزڵ و گەورەیی یوونس...).

١٣٦٣- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خُفِّفَ عَلَى دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلام الْقُرْانُ فَكَانَ يَامُرُ بِدَوَابِّهِ فَتُسْرَجُ فَيَقْرَا الْقُرْانَ قَبْلَ انْ تُسْرَجَ دَوَابُّهُ وَلا يَاكُلُ الا مِنْ عَمَلِ يَدِهِ) (الحديث: ٣٤١٧ )[(١٢٧)]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (خوێندنی زەبوور وا سووك و ئاسان و خۆش كرابوو بۆ داود، گەلێ جار كە فەرمانی دەكرد ولاخەكەیی بۆ زین بكرێن خۆی لەو ماوەكەمەدا، تەیی زەمانی بۆ دەكرا، لە خوێندنی زەبوور دەبۆوە، كەچی هێشتا مەیتەرەكە لە زین كردنی ولاخەكە نەبوو بوو وە!). (تاج/٦/٢٦٩ ف/٩ ز/١٨ - سوورەتی ئیسراء).

١٣٦٤- عَنْ ابَي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ مَثَلِي وَمَثَلُ النَّاسِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا فَجَعَلَ الْفَرَاشُ وَهَذِهِ الدَّوَابُّ تَقَعُ فِي النَّارِ (الحديث٣٤٢٦).

---

(١٢٦) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: في ذكر يونس عليه السلام، رقم: ٢٣٧٧ .

(١٢٧) لم يوافقه مسلم على اخراج حديث ابي هريرة (خفف على داواد القران) (فتح/٧/٢٠٨) خاتمة كتاب احاديث الانبياء —المترجم .

وَقَالَ: كَانَتْ امْرَاتَانِ مَعَهُمَا ابْنَاهُمَا جَاءَ الذئْبُ فَذهَبَ بِابْنِ احْدَاهُمَا فَقَالَتْ صَاحِبَتُهَا: انَّمَا ذهَبَ بِابْنِكِ وَقَالَتْ الاخْرَى: انَّمَا ذهَبَ بِابْنِكِ فَتَحَاكَمَتَا الَى دَاوُدَ فَقَضى بِهِ لِلْكُبْرَى فَخَرَجَتَا عَلَى سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ فَاخْبَرَتَاهُ فَقَالَ: ائْتُونِي بِالسِّكِّينِ اشُقُّهُ بَيْنَهُمَا فَقَالَتْ الصُّغْرَى: لا تَفْعَلْ يَرْحَمُكَ اللّٰهُ هُوَ ابْنُهَا فَقَضى بِهِ لِلصُّغْرَى).
(الحديث: ٣٤٢٧، طرفه في: ٦٧٦٩)[١٢٨].

**فەرموودەی یەکەم لە رياض الصالحين دا ئاوایە:**

**لە جابیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (درووودی خودای لێ بێ) **دەفەرموێ:** (وێنەی من و وێنەی ئێوەی ئۆمەتی من، وەك وێنەی پیاوێ وایە، ئاگرێکی کردبێتەوە، جانەوەرو پەپولەیەکی زۆری تێ وورووکابێ و، پەیتا پەیتا بکەونە ناوی و بسووتێن، ئەویش خۆش خۆش بە پەرۆشەوە دووریان بخاتەوە لە ئاگرەکە، ئەوە تانێ من کەمەرم گرتوون و بەزۆر دوورتان دەخەمەوە لە ئاگرەکە، کەچی ئێوە بەزۆر خۆتان لە دەستم ڕادەپسکێنن و خۆتانی تێ فڕێ دەدەن!). (رياض/١ ل/١٥١ ز/١٦ ف/١٦٣) + (تاج/١ ل/٥٤ ز/٩ ف/٦).

**فەرموودەی دووەمیش لە تاجول ئوصول دا ئاوایە:**

**ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر** (درووودی خودای لێ بێ) **فەرمووی** (جارێ دووژن دوو کوڕی خۆیان پێ دەبێ، گورگێ لەولاوە دێ، کوڕی ژنێکیان دەبێ، ژنەکە بەهاوڕێکەی دەڵێ: گورگەکە کوڕەکەی تۆی فڕاندووە، ئەویش دەڵێ: نەء، کوڕەکەی تۆی بردووە، جابۆ دادگایی و مەحکەمە دەچنە لای داوود پێغەمبەر داوودیش (سەلامی خوای لێ بێ) بڕیاردەدا: کە ئەو کوڕەی ماوە بۆ ژنە گەورە کەبێ، چاکە دینە دەرەوە دەگەن بە حەزرەتی سولەیمانی کوڕی داوود (سەلامی خوای لێ بێ) وە باسەکەی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش دەفەرموێ: ئادەی چەقۆیەکم بۆبێنن دەیکەم بە دوو لەتەوە بۆتان!

(١٢٨) اخرجه مسلم في الاقضية، باب: اختلاف المجتهدين، رقم: ١٧٢٠.

جاژنە بچکۆلەکە دەڵێ: نا، ڕەحمەتی خودات لێبێ وای لێ مەکە، کوڕی ئەوە، ئەویش کەڕوانی: ژنە بچکۆلەکە سکی بە منالەکە دەسووتێ زانی کەمنالی خۆیەتی، جالەبەر ئەوە دایەوە بەژنە بچکۆلەکە).

ئەبو هورەیرە (رمزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخوا ئەو ڕۆژە نەبێ ناوی چەقۆم نەبیستبوو، ئێمە جاران لەولاتی خۆمان هەردەمانگوت سیکاردو کێرد (تاج/٣ ل/٣١٥ ز/١١٩ ف/٧ - باسی اجتهاد) + ( ریاض/٤ ل/١٣٢٣ ف/٢٠ ).

١٣٦٥- عَنْ عَلِيّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ) (الحديث: ٣٤٣٢، طرفه في:٣٨١٥ )(١٢٩).

عەلی (رمزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست دروودی خوای لێ بێ فەرمووی: (باشترینی ژنانی جیهان مەریەمی کچی عیمرانە (واتە: لەکاتی خۆیا) لەم سەردەمەی ئێمەیشدا باشترینی ژنانی جیهان خەدیجەی کچی خووەیلیدە، کە دایکی حەزرەتی فاطیمەی کچی پێغەمبەرە). (تاج/٥ ل/١٥١ ز/٣٦ - باسی چاکێتیی خەدیجە).

١٣٦٦- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (نِسَاءُ قُرَيْشٍ خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الابِلَ احْنَاهُ عَلَى طفْلٍ وَارْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذاتِ يَدِهِ) (الحديث: ٣٤٣٤)(١٣٠).

ئەبو هورەیرە (رمزای خودای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئافرەتی باشی قورەیش، باشترین ئافرەتی عەرەبن، زۆر دڵسۆزن بۆ منداڵی ساوا، وە گەلێ دڵیان بەماڵی مێرد دەسووتێ.(تاج/٣ ل/٥٥ ز/٢٤ – باسی ژنی پەسەند (الزوجة المحودة)).

---

(١٢٩) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل خديجة ام المؤمنين (رَضيَ اللهُ عنها)، رقم: ٢٤٣٠

(١٣٠) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل نساء قريش، رقم:٢٤٣٠ .

١٣٦٧- عَنْ عُبادَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ شَهِدَ انْ لا الَهَ الا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَانَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَانَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ وَكَلِمَتُهُ الْقَاهَا الَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ ادْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنْ الْعَمَلِ) (الحديث: ٣٤٣٥)[(١٣١)].

عوبادەی كوڕی صامیت (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:(هەركەسێ شایەتی بدا كە بێجگە لە یەزدانی پاك، خودای ترنییە و، هەر خۆی خودای بە هەقە و، تاك و تەنیایە و، هاوبەشی نییە، وەشایەتی بدا كە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە، وەعیساش بەندەو پێغەمبەری خودایەو، بەفەرموودەی خودا لەمەریەم بووەو رەحمەتێكە و خودا ناردوویەتی، وەشایەتی بدا كە بەهەشت ڕاستە و دۆزەخ ڕاستە. هەركەسێ ئەم شایەتیە بدات، لەسەر ئەم شێوەیە خودا دەیخاتە بەهەشتەوە، ئیتر كردەوەی هەرچی بێ) (تاج/١ ل/٢٩ ف/١ ز/٤ - باسی گەورەیی ئایین).

١٣٦٨- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ:(لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ الا ثَلاثَةٌ: عِيسَى وَكَانَ فِي بَنِي اسْرَائِيلَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ جُرَيْجٌ، كَانَ يُصَلِّي، جَاءَتْهُ امُّهُ فَدَعَتْهُ فَقَالَ: اجِيبُهَا اوْ اصَلِّي فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ لا تُمِتْهُ حَتَّى تُرِيَهُ وُجُوهَ الْمُومِسَاتِ، وَكَانَ جُرَيْجٌ فِي صَوْمَعَتِهِ فَتَعَرَّضَتْ لَهُ امْرَاةٌ وَكَلَّمَتْهُ فَابَى فَاتَتْ رَاعِيًا فَامْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا فَوَلَدَتْ غُلامًا فَقَالَتْ: مِنْ جُرَيْجٍ فَاتَوْهُ فَكَسَرُوا صَوْمَعَتَهُ وَانْزَلُوهُ وَسَبُّوهُ فَتَوَضا وَصَلَّى ثُمَّ اتَى الْغُلامَ فَقَالَ: مَنْ ابُوكَ يَا غُلامُ؟ قَالَ الرَّاعِي قَالُوا: نَبْنِي صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ؟ قَالَ: لا الا مِنْ طِينٍ وَكَانَتْ امْرَاةٌ تُرْضِعُ ابْنًا لَهَا مِنْ بَنِي اسْرَائِيلَ فَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ رَاكِبٌ ذو شَارَةٍ فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ ابْنِي مِثْلَهُ، فَتَرَكَ ثَدْيَهَا وَاقْبَلَ عَلَى الرَّاكِبِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ لا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ ثُمَّ اقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهَا

---

(١٣١) اخرجه مسلم في الايمان، باب: الدليل على ان من مات على التوحيد دخل الجنة قطعا، رقم: ٢٨.

يَمَصُّهُ قَالَ ابُو هُرَيْرَةَ: كَانّي انْظرُ الَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمَصُّ اصْبَعَهُ ثُمَّ مُرَّ بامَةٍ فَقَالَتْ اللّهُمَّ لا تَجْعَلْ ابْنِي مِثلَ هَذهِ فَتَرَكَ ثدْيَهَا فَقَالَ: اللّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثلَهَا فَقَالَتْ:لِمَ ذاكَ فَقَالَ الرَّاكِبُ: جَبارٌ مِنْ الْجَبابِرَةِ وَهَذهِ الامّة يَقُولُونَ سَرَقْتِ زَنَيْتِ وَ لَمْ تَفْعَلْ) (الحديث:٣٤٣٦، اطرافه في:١٢٠٦، ٢٤٨٢، ٣٤٦٦)(١٣٢).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەم سێکەسە نەبێ کەسی تر لەبێشکەدا قسەی نەکردووە: یەکەم عیسای کوڕی مەریەم، دوەم هاوڕێکەی جورەیج، پیاوی دەبێ لەنەوەی ئیسرائیل ناوی جورەیج دەبێ، سۆفیلکەو خواناسێکی باش دەبێ، خەڵوە خانەیی بۆ خۆی دروست دەکاو، لە ناویدا خوا ناسی دەکا، جارێ نوێژ دەکا، لەوکاتەدا دایکی دێ بۆلای و بانگی دەکا ئەی جورەیج! ئەویش لەدڵی خۆیدا دەفەرموێ: خودایە! نازانم وەلامی دایکم بدەمەوە یان نوێژەکەم تەواو بکەم، لە پاشا وا بە باش دەزانێ کە نوێژەکەی تەواو بکاو، وەلامی دایکی نەداتەوە، دایکیشی دەگەڕێتەوە، بۆ سبەینێ کەدێتەوە بۆلای دیسان جورەیج خەریکی نوێژکردن دەبێ بانگی دەکاو، دەڵێ: جورەیج! جورەیجیش دەفەرموێ: خودایە! نازانم وەلامی دایکم بدەمەوە یان نوێژەکەم تەواو بکەم، لە پاشاوا بەباش دەزانی کە نوێژەکەی تەواو بکا، دایکیشی دەڵێ: خودایە! نەیمرێنی هەتا ڕووی داوێنپیسانی پێ نیشان دەدەی. لەولاشەوە نەوەی ئیسرائیل لە ناو خۆیانا باسی خواناسیی جورەیج دەکەن کە چۆن بۆ خودا لێ بڕاوە.

ژنێکی سۆزانی دەبێ، بۆ جوانی بێ وێنە دەبێ، دەڵێ: ئەگەر حەز دەکەن من دەچم لەخشتەی دەبەم و تووشی فەرتەنەی دەکەم، جا ژنەکە دەچێ بۆلای، گەلێ خەریکی دەبی و دێ بەلایەوە کە ئەو ئیشەی لەگەڵ دا بکا، بەلام جورەیج مل ناداو ئاوڕی لێ ناداتەوە، جاژنەکە کە لەو نا ئومید دەبێ، دەچێ بۆلای شوانێ، کە لەشەودا لەخەڵوە خانەکەی جورەیجا

(١٣٢) اخرجه مسلم في البرّ و الصلة و الاداب،باب: تقديم برّالوالدين على التطوع بالصلاة، رقم :٢٥٥٠.

دەحەوایەوە، ئەو شوانە دەنێ لەخۆی و سکی پڕدەبێ و کوڕێکی دەبێ، دەڵێ: ئـەم منداڵـە لـە جورەیجـە! ئـەوانیش دەچـن بـۆ گیـانی جـورەیج و لـە خەڵوەخانەکـەی دەری دەهێـنن و خەڵوەخانەکـەی دەرووخێـنن و، خۆشـی تێروپڕ فەلاقە دەکەن و دەیدەنە بەرجمێن، ئەویش دەفەرموێ: ئەوە چیتانە بۆ واله من دەکەن، گوناهم چییە؟ دەڵێن: چونکە ئیشی بی شـەرعیت لەگەڵ ئەم قەحبەیەداکردووەو ئەوەتانا لە تـۆ ئـەم زۆڵـەی بـووە! دەفـەرموێ: تـۆزی پشووم بدەن با نوێژێ بکەم جا دەسنوێژ دەگـرێ و نوێـژ دەکا، کە نوێژەکە تـەواو دەکـا دەڕوا بـۆلای کـوڕە سـاواکەو دەژەنـێ بەسـکیاو دەفـەرموێ: ئـەی کۆرپەی سـاوا! کـێ باوکتـە، بـاوکی تـۆ کێیـە؟ کوڕەکـەش دێتـە زمـان و دەڵێ: باوکی من فیسارە شوانە!!

جا ئەوسا خەڵکەکە لەڕاستی ڕووداوەکە تـێ دەگـەن و داوای لێ بـووردن لەجورەیج دەکەن و پەلاماری دەدەن و دەست دەکەن بەماچ کردنی و خۆیـانی تـێ هـەلا دەسـوون بـۆ مووفـەڕك، وە دەڵـێن: خەلوەخانەکـەت لـە زێـڕ بـۆ دروسـت دەکەینـەوە؟ دەفـەرموێ: نـەو، بـەلام لـە قـوڕ وەك جـارانی خـۆی بۆم دروست بکەنەوە، سێیەم منداڵ: جارا ژنـا مـەمکی دەدا بەمنداڵەکەی، کەلە نەوەی ئیسرائیل بوو، لەوکاتەدا سوارێکی قۆز بـەناو بـانگ بـەلایا ڕادەبووری، بەسواری ولاخێکی کەشخە، پایەو نیـشانێکی زۆری پێـوە دەبـێ، ژنەکـە دەڵێ: خودایە! ئەم کوڕەی منیش بکەی بەسوارچاکێکی ئـاوا قـۆزو بـەناوبانگ ! جا کوڕەکە مەمکەکەی بەردەداو، ڕوودەکاتە سوارەکە و تەماشایەکی دەکاو دەڵێ: خوایـە! وەك ئـەوم لێنەکـەی! ئینجـا دیـسان مەمکەکـەی دەگرێتـەوەو دەسـت دەکاتەوە بەمژینی.

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لـێ بێ) دەیفـەرموو: دەڵێی وا لەبـەر چـاوم کـە چۆن چۆنی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) پەنجەی دۆشاو مژەی خۆیی دەمـژی و لاسکایی حاڵی مەمکخواردنی منداڵەکەی دەکردەوە.

حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپاش دا کە نیزەکێکیان هێنا، هێنا بوویانە گیرو گاز و لێیان دەداو دەیانگوت: حیزی و دزیت کردووە، ئەویش هەردەیگوت: (حسبي الله ونعم الوكيل): من هەر خودام هەیە کە کەسم بێ و بەسم بێ! بەڕاستی خودا پشتیوانی چاکە. جا دایکی منالەکە دەڵێ: خودایە! ئەم کوڕەی من وەك ئەم کچە بەم دەردە نەبەی، دیسان کوڕەکەی مەمکەکەی دایکی بەردەداو تەماشایەکی کچەکەی کرد و گوتی: خودایە! وەك ئەم کچەم لێ بکە. جا لێرانەدا منالەکە و دایکی کەوتنە گوفتوگۆو ڕازو گلەیی، دایکی گوتی: ئەو پیاوە شێوە جوانە ڕەت بوو، من گوتم: خودایە! کوڕەکەم پیاوێکی وەك ئەمەی لی دەرچێ، کەچی تۆ وتت: خودایە! نەمکەی بە پیاوێکی ئاوا، لە پاشا ئەم کەنیزەکەیان بەلێدان و تێهەڵدان هێنا و پێی دەڵێن: حیزی و دزیت کردووە، منیش گوتم: خودایە! کوڕەکەم وەك ئەمەی لێ نەیێ، کەچی تۆ گوتت، خودایە! وەك ئەمەم لێ بکەی، ئەمە لەبەرچی؟ گوتی: چونکە سوارەکە زۆردارێکە لەزەبردارەکان و ملهوڕێکە لە ملهوڕەکان، لەبەر ئەوە گوتم: خودایە! نەمکەی بە پیاوێکی ئاوا ستەمکار، بەڵام ئەم کەنیزەکەی کە پێی دەڵێن: دزی و حیزی کردووە، بێ تاوان و پاك و بێ گەردەو ستەمبارە، نەدزی کردووەو نەحیزی، لەبەر ئەوە گوتم: خودایە! وەك ئەم ستەمبارەم لێ بکەی). (تاج/١٠ ل/٨٧ ف/١ ز/٢٣ - باسی ئەو مندالانەی کە لەناو بێشکەدا قسەیان کردووە).

١٣٦٩- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): (رَأيْتُ عِيسَى ومُوسَى وَابْرَاهِيمَ فَامَّا عِيسَى فَاحْمَرُ جَعْدٌ عَرِيض الـصَّدْرِ وَامَّا مُوسَى فَادَمُ جَسِيمٌ سَبْط كَانَّهُ مِنْ رِجَالِ الزُّط) (الحديث: ٣٤٣٨)[١٣٣].

(١٣٣) قال العسقلاني واخرجها مسلم عن شيخ البخاري (ج/٦ص٤٨٥)- المترجم.

**ئیبنـو عومـەر** (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) **فـەرمووی: پـێغەمبـەر** (دروودی خودای لـێ بـێ) **فەرمووی: عیسا و مووساو ئیبراهیمم لەشەوی ئیسرادا، بینی، عیسا پیاوێکی سپی و سووری قژ لولی سینگ پان بوو، مووسایش پیاوێکی گەنم ڕەنگی سەوزەی قووچی قژ خاوە، ئەڵێی لە پیاوانی زوططە کە ڕەگەزێکی سودانی بالابەرزی لەڕو لاوازن).**

١٣٧٠- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بن عمر(رضي الله عنهما) ذَكَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا بَيْنَ ظَهْرَيْ النَّاسِ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: (انَّ اللَّهَ لَيْسَ بِاعْوَرَ الا انَّ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ اعْوَرُ الْعَيْنِ الْيُمْنَى كَانَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طافِيَةٌ وَارَانِي اللَّيْلَةَ عِنْدَ الْكَعْبَةِ فِي الْمَنَامِ فَاذا رَجُلٌ ادَمُ كَاحْسَنِ مَا يُرَى مِنْ ادْمِ الرِّجَالِ تَضرِبُ لِمَّتُهُ بَيْنَ مَنْكِبَيْهِ رَجِلُ الشَّعَرِ يَقْطُرُ رَاسُهُ مَاءً وَاضعًا يَدَيْهِ عَلَى مَنْكِبَيْ رَجُلَيْنِ وَهُوَ يَطوفُ بِالْبَيْتِ فَقُلْتُ مَنْ هَذا؟ فَقَالُوا: هَذا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ثُمَّ رَايْتُ رَجُلا وَرَاءَهُ جَعْدًا قَطِطا اعْوَرَ الْعَيْنِ الْيُمْنَى كَاشْبَهِ مَنْ رَايْتُ بِابْنِ قَطنٍ وَاضعًا يَدَيْهِ عَلَى مَنْكِبَيْ رَجُلٍ يَطوفُ بِالْبَيْتِ فَقُلْتُ مَنْ هَذا؟ قَالُوا: الْمَسِيحُ الدَّجَّالُ) (الحديث ٣٤٤٠ – اطرافه في ٣٤٤١، ٥٩٠٢، ٦٩٩٩، ٧٠٢٦، ٧١٢٨).

وعنه (رضي الله عنهما) في رواية اخرى قَالَ لا وَاللَّهِ مَا قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لِعِيسَى احْمَرُ وَلَكِنْ قَالَ بَيْنَمَا انَا نَائِمٌ اطوفُ بِالْكَعْبَةِ فَاذا رَجُلٌ ادَمُ سَبْط الشَّعَرِ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ يَنْطفُ رَاسُهُ مَاءً اوْ يُهَرَاقُ رَاسُهُ مَاءً فَقُلْتُ مَنْ هَذا؟ قَالُوا: ابْنُ مَرْيَمَ فَذهَبْتُ الْتَفِتُ فَاذا رَجُلٌ احْمَرُ جَسِيمٌ جَعْدُ الرَّاسِ اعْوَرُ عَيْنِهِ الْيُمْنَى كَانَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طافِيَةٌ قُلْتُ مَنْ هَذا؟ قَالُوا: هَذا الدَّجَّالُ وَاقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا ابْنُ قَطنٍ) (الحديث: ٣٤٤١)[١٣٤].

---

(١٣٤) اخرجه مسلم في الايمان، باب: ذكر المسيح ابن مريم و المسيح الدجال، وفي الفتن و اشراط الساعة، باب: ذكر الدجال وصفته وما معه، رقم: ١٦٩.

دیسان ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژا پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لەناو مەردومەکەدا، بە ئاشکرایی دانیشتبوو، باسی جەجاڵی بۆیان کرد، فەرمووی: (جەجاڵ کە داوای خوایەتی دەکا، یەکڵە چاوە، چاوی ڕاستی کوێرە، دیارە کە ئەوە عەیب و نەنگەو عەیب و نەنگیش نیشانەی کەمی وناتەواویە، شتی وا لەگەڵ داوای خوایەتی دا ناگونجێ، بێ گومان کە خودای گەورە پاك و بێ گەردەو دوورە لە ڕەوش و سیفەتی ناشیرینی وەکوو کوێری! ئەو چاوەی جەجاڵ کە کوێرە وەك دەنکە ترێی زەقی قۆقزی لە بۆڵ دەرپەڕیووایە، فەرمووی: ئەم شەویش لەخەوما لە لای کەعبەدا بووم، کە تەماشام کرد وا پیاوێکی سەوزەی گەنم ڕەنگ لە لامابوو، تابڵێی سەوزەیەکی زۆر زۆر جوان بوو، لە پیاوانا گەنم ڕەنگی وا جوان نەبینراوە، پرچێکی زۆر جوانی هەبوو، دەیدا لەناو شانی، بەجوانی پرچەکەی داهێنابوو، سەری ئاوی لێ دەتکا، وەك لەگەرماو دەرچووبێ، ئاوا پاك و خاوێن بوو، هەردوو دەستی لەسەر شانی دووپیاو دانابوو، تەوافی بەیتی دەکرد، پرسیم: ئەمە کێ یە؟ گوتیان: ئەمە عیسای مەسیحی کوڕی مەریەمە.

لە پاشا پیاوێکم دی، سەری لوول بوو، قژی کرژ، چاوی ڕاستی کوێربوو، لە هەموو کەسا پتر شێوەی لە ئیبنو قەطەن دەچێ، کە پیاوێکی ناسراو بوو لە هۆزی خوازعە، جەجاڵ هەردوو دەستی لەسەر هەردوو شانی پیاوێ دانابوو، تەوافی بەیتی دەکرد، گوتم: ئەمە کێ یە؟ گوتیان: جەجاڵی هەلاتبازە). (تاج/٤ ل/٣٨٣ ف/١ ز/١١٧ - باسی گەورەیی عیسا).

دیسان ئەو، لەگێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: نەبە خوا، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) بەعیسای نەفەرموو سوورو سپییە، بەلام فەرمووی: (جارێ نووستبووم لەخەو ماتەماشام کرد وا تەوافی کابەتۆڵلا دەکەم، تەماشام کرد وا پیاوێکی سەوزەی گەنم ڕەنگ، والەوێ، لەنێوانی دوو پیاودا، بەلارە سەنگی دەڕۆیی، قژێکی خاوی هەبوو، سەری ئاوی لێ دەتکا، یافەرمووی: سەری ئاوی لێ ئەچۆڕایەوە. گوتم: ئەمەکێیە؟ گوتیان: ئەمە

عیسای کوڕی مەریەمە لەپاشا کە ئاوڕم دایەوە وا پیاوێکی سوورفلی فیلەتەنی زەبەللاحی کەتەی قژلوولی قژ کرژی، یەکلە چاوی، چاوی ڕاست کوێر والەوێ. گوتم: ئەی ئەمە کێیە؟ وتیان: ئەمە جەجالە، لەهەموو کەسێ زیاتر شێوەی لە ئیبنو قەطەن دەچێ!) (تاج/١٠ ل/٣١٦ ز/١١٢ ف/٣ - باسی نیشانەکانی جەجالّ..).

**ڕونکردنەوە:**

باسی جەجالّ بەدوورو درێژی لە تاجولئصولا وا لە بەرگی پێنجەمدا، لەعەرەبیەکەی دا، لەوەرگەڕاوە کوردییەکەشیدا، وا لەبەرگی دەیەم دا، لاپەڕە ٣٠٥هەتا لاپەڕە/٣٣٣ = تاج/٥ ص/٢٣٥-٣٥٧ پێشەوا زوهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیبنو قەطەن پیاوێ بوو، لەسەردەمی جاهیلییەتدا مردووە.

١٣٧١- عن ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (انَا اوْلَى النَّاسِ بابْنِ مَرْيَمَ وَالانْبِيَاءُ اوْلادُ عَلاتٍ لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ) (الحديث:٣٤٤٢، طرفه في:٣٤٤٣ )[(١٣٥)].

ئەبو هویرەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەگوێی خۆم لەدەمی پێغەمبەری خۆشەویستم بیست (درودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (لەهەر دووجیهاندا من لە هەموو کەسێکیتر، لە پێشترم بەعیسای کوڕی مەریەم) عەرزیان کرد:- چۆن ئەی پێغەمبەری خودا؟! فەرمووی: (پێغەمبەرەکان هەموو برای یەکترین، بەلام دایکیان جیایە و هەریەکێ لە هەوێیەکن، گەرچی دایکیان جیایە بەلام لەبنەڕەتدا ئاییینەکەیان یەکە، کە خودا بەیەك زانین و یەکتا پەرستیە، هۆی ئەوەش کە من لە پێشتر پێغەمبەرم بەعیسا ئەوەیە کە لە نێوانی من و لەنێوانی ئەو دا پێغەمبەری تر نییە).

١٣٧٢- وعَنْهُ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (رَاى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلا يَسْرِقُ فَقَالَ لَهُ: اسَرَقْتَ؟ قَالَ: كَلا وَاللّٰهِ

---

(١٣٥) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: فضائل عيسى عليه السلام، رقم: ٢٣٦٥.

الّذي لا الَهَ الا هُوَ فَقَالَ عِيسَى: امَنْتُ باللّهِ وَكَذبْتُ عَيْنِي) (الحديث: ٣٤٤٤)[١٣٦].

ديسان لەوەوە، خۆشەويست (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: عيسا سلاوی لێبێ چاوی لێ بوو كابرايێ دزی دەكا، پێی فەرموو: تۆ دزيت دەكرد. كابراكە گوتی: نەو، بەو خودايەی كە هەرخۆی خودايە من شتی وام نەكردووە! عيساى كوڕی مەريەميش (سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: باوەڕم هەيە بە خوداو چاوی خۆم بەدرۆخستەوە! ).

١٣٧٣- عَنْ عُمَر (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: سَمِعْتُ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَقُولُ: (لا تُطرُونِي كَمَا اطرَتْ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ فَانَّمَا انَا عَبْدُهُ فَقُولُوا عَبْدُ اللّهِ وَرَسُولُهُ) (الحديث:٣٤٤٥، طرفه في: ٢٤٦٢، ٣٩٢٨، ٦٨٣٠، ٤٠٢١، ٧٣٢٣)[١٣٧].

عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لە زاری پيرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت دەيفەرموو: (وەك نەصرانييەكان عيساى كوڕی مەريەميان هەڵناو، مەتحێكی ناڕەوايان كردو لافی خوايەتی و ئەمانەيان بۆيكرد، ئێوەيش ئاوا من هەڵ مەنێن و لافی وا درۆم بۆ هەڵ مەبەستن، من بەهيچ جۆرێ لافو گەزافو هەڵنانی وابە ڕەوا نابينم، من ڕايدەگەيەنم كە من خوداو كو ڕی خوداوشتی وانيم، بەڵكو من دووپاتی دەكەمەوە كە من بەندەی خودام، كەواتە: بەس پێم بڵێن: بەندەو پێغەمبەری خودا).

١٣٧٤- عنْ ابي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): كَيْفَ انْتُمْ اذا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ وَامَامُكُمْ مِنْكُمْ (الحديث:٣٤٤٩، اطرافه في:٢٤٧٦، ٣٤٤٨، ٣٤٤٩ )[١٣٨].

---

(١٣٦) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: فضائل عيسى عليه السلام، رقم: ٢٣٦٨.

(١٣٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٧/٢٠٨ —ط. ج- خاتمة كتاب احاديث الانبياء) — المترجم.

(١٣٨) اخرجه مسلم في الايمان، باب:نزول عيسى عليه السلام .حاكما بشريعة محمد...رقم: ١٥٥.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (لە ئاخر زەمانا، لە ئاسمانەوە عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوە بۆ ناوتان، پێشەواکەتان لە خۆتانە، کەموحەممەدی مەهدییە، دەشێ ئەو سەردەمە ئێوە حاڵتان چۆن بێ!). (تاج/١٠ ل/٣٣٥ ف/٢ - باسی: عیسا کاتێ لە ئاسمان دێتە خوارێ).

١٣٧٥- عن حُذيْفَةَ قَالَ سَمِعْتُ رسول الله (صلّى اللهُ عليهِ وسلّم) يَقُولُ: (انَّ مَعَ الدَّجَّالِ اذا خَرَجَ مَاءً وَنَارًا فَامَّا الَّذي يَرَى النَّاسُ انَّهَا النَّارُ فَمَاءٌ بارِدٌ وَامَّا الَّذي يَرَى النَّاسُ انَّهُ مَاءٌ بارِدٌ فَنَارٌ تُحرِقُ فَمَنْ ادْرَكَ مِنْكُمْ فَلْيَقَعْ فِي الَّذي يَرَى انَّهَا نَارٌ فَانَّهُ عَذبٌ بارِدٌ) (الحديث: ٣٤٥٠، طرفه في: ٧١٣٠)[١٣٩].

حوزەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (کاتێ جەجاڵ هەڵ دەستێ، ئاوو ئاگری لەگەڵە، بەلام ئەوەی کەخەڵك بە ئاوی دەزانێ، ئەوە ئاگرێکی سووری سووتێنەرە، وە ئەوەی کەخەڵك بە ئاگری دەزانی، ئەوە ئاوێکی ساردی فێنکی شیرینی زولاڵە، دەی هەرکامێك لە ئێوە واتە: لەگەڵی ئیسلام فریای ئەو رشۆژە کەوت، با خۆی بخاتە ناو ئەوەیانەوە کە ئەو بە ئاگری دەزانی، چونکە ئەوەیان ئاوێکی شیرین و زولاڵ و خۆشە!). (تاج/١٠ ل/٣١٨ ف/٨ - باسی نیشانەکانی جەجاڵ..). (ریاض/٤ ل/١٣١٠ ز/٣٧٠ ف/٢ +١+ ٣ - باسی پەخشان و جوانکاری.

١٣٧٦- وعنه (رضي اللهُ عنهُ) قال: (وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (انَّ رَجُلا حَضرَهُ الْمَوْتُ فَلَمَّا يَئِسَ مِنْ الْحَيَاةِ اوْصَى اهْلَهُ اذا انَا مُتُّ فَاجْمَعُوا لِي حَطبا كَثِيرًا وَاوْقِدُوا فِيهِ نَارًا حَتَّى اذا اكَلَتْ لَحْمِي وَخَلَصَتْ الَى عَظمِي فَامْتُحِشَتْ فَخُذوهَا فَاطحَنُوهَا ثمَّ انْظرُوا يَوْمًا رَاحًا فَاذرُوهُ فِي الْيَمِّ فَفعَلُوا فَجَمَعَهُ اللَّهُ فَقَالَ لَهُ لِمَ

---

(١٣٩) اخرجه مسلم في الفتن و اشراط الساعة، باب ذكر الدجال و صفته و مامعه، رقم: ٢٩٣٤، ٢٩٣٥.

فَعَلْتَ ذلِكَ قَالَ مِنْ خَشْيَتِكَ فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ) (الحديث: ٣٤٥٢، اطرافه في: ٣٤٧٩، ٦٤٨٠)[١٤٠].

دیسان حوزەیفە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (پیاوێ دەبێ کفن دز دەبێ، هەرگیز کردەوەی چاکەی نەکردبوو، لەسەرەمەرگا، کاتێ لە خوّی نا ئومێد دەبێ و دەزانی کەئیتر نازێ، کەسوکارەکەی ڕادەسپێرێ وپێیان دەڵێ: کە من مردم دارێکی زۆر کۆبکەنەوەو ئاگری تێ بەردەن و لەناو ئەو ئاگرەدا لەشەکەم بسووتێنن، تەواو تەواو، کاتی گۆشت و ئێسکەکەم داپلۆخان و بووم بە خەڵووز، لەناو دنگێکا وورد وورد بمهاڕن و بمکەن بە ئاردو لە ڕۆژێکی ڕەشەبادا، نیوەم بچێنن بەدەشت و دەرداو، ئەو نیوەکەی تریشم بچێنن بەناو دەریادا.جا کەپیاوەکە دەمرێ کەسوکارەکەی وەسێتەکەی بەجێ دەهێنن، ئەوسا خودای گەورە ئاردۆ تۆزەکەی کۆدەکاتەوەو، سەرلەنوێ زیندووی دەکاتەوەو دەیکاتەوە بەپیاوەکەی جاران و، پێی دەفەرموێ: لەبەر چی وات لە خۆت کرد؟ دەڵێ: لە ترسی تۆ ئەی خودایە! وەخۆشت باشتر ئاگات لە نیازی دڵم هەیە، ئیتر خودا لێی خۆش دەبێ). (تاج/٩ ل/٢٦٩ ف/٢ ز/٩٢ -باسی هەرچەند بەندە لە ڕادەبەدەر تاوانی هەبێ..)

١٣٧٧- عن ابي هُرَيْرَةَ (رضيُ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (كَانَتْ بَنُو اسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمْ الانْبِيَاءُ كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ وَانَّهُ لا نَبِيَ بَعْدِي وَسَيَكُونُ خُلَفَاءُ فَيَكْثُرُونَ) قَالُوا: فَمَا تَامُرُنَا؟ قَالَ: فُوا بِبَيْعَةِ الاوَّلِ فَالاوَّلِ اعْطوهُمْ حَقَّهُمْ فَانَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ) (الحديث: ٣٤٥٥)[١٤١].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خودای لێ بێ) دەفەموێ: (جاران نەوەی ئیسرائیل (واتە: گەلی جوولەکە، کەلە زمانی

---

(١٤٠) اخرجه مسلم عن ابي هريرة (صم/١٧ ص٧٠. محث سعة رحمة الله — كتاب التوبة) — المترجم.

(١٤١) اخرجه مسلم في الامارة، باب: وجوب الوفاء ببيعة الخلفاء الاول فالاول، رقم: ١٨٤٢.

سونتەتدا ناودارن بە بەنی ئیسرائیل) پێغەمبەران دەیان بردن بە ڕێوەو سەرپەرشتی کارو باریان دەکردن، هەرکاتێ پێغەمبەرا فەوتی دەکرد، گورج پێغەمبەرێکیتر لەجێگەی ئەو دادەنیشت و ولاتی دەبرد بەڕێوە بەلام ئاشکرایە کە لەپاش من پێغەمبەری ترنابێ، وەلێ جێنیشن دەبن زۆریش دەبن نەوەك کەم، یاران گوتیان: جا فەرمانت بەچییە پێمان و ئەرکی سەرشانی ئێمە چییە بەرابەریان؟ فەرمووی: (بەرودوا یەك لە دوایەك پەیمانیان بدەنێ، باهیچ کاتێ بێ ئیمام و بێ سەرۆك نەبن، بەلام لەهەر سەردەمێکا کێ لە پێش پێشەوە پەیمانتان داپێی، ئیتر ئەوە جینشینی ڕاستەقینەیە، وە پەیمانەکەشیان ببەنەسەرو مافی خۆیانیان بدەنێو، بەناڕەوا بەترە بیانوویێ لەفەرمانیان دەرمەچن! بێ گومان کە ئەوانیش لەلای خوداوەند بەرپرسیارن دەرهەق بە بەردەستەکانیان، کە خودا ئەوانی کردووە بەکاربە دەست و بە شوانیان). (تاج/٣ ل/٢٧٣ ز/١٠٤ - باسی پەیمان بەستن و پەیمان بردنەسەر).

١٣٧٨-عَنْ ابِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ قَبْلَكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ سَلَكُوا جُحْرَ ضَبٍّ لَسَلَكْتُمُوهُ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى قَالَ: فَمَنْ؟ (الحديث:٣٤٥٦، طرفه في: ٧٣٢٠) [١٤٢].

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی خۆشەیست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (بست بە بست و هەنگاو بە هەنگاو، لاسکایی میللەتەکانی پێش خۆتان دەکەنەوەو چاو لەڕەوشت و ڕەفتاری نالە بارو ناهەمواری ئەوان دەکەن، بەشێوەیەکی واکوێرانە پەیڕەوی یان دەکەن، تەنانەت ئەگەر گریمان ئەوان خۆیان بترنجێننە ناو کونی بزنمژەوە، ئێوەش چاویان لێ دەکەن و خۆتانی تێ دەترنجێنن و دەڵێن: دیارە سوودێکی هەرهەیە!! گوتمان: ئەی

(١٤٢) واخرجه مسلم في في القدر عن سويد بن سعيد (عينى/١٦ص٤٣ )-المترجم.

پێغەمبەری خودا! مەبەستت لەمیللەتەکانی پێش ئێمە کێیە؟ ئایا مەبەستت لێیان جوولەکەو گاورەکانە؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەی گوایە کێم مەبەستە). (تاج/١ ل/٥٢ ز/٩ ص/٤٣ ف/٢ - باسی: ڕەفتار کردن بە قورئان و بەسوننەتی پێغەمبەر).

لەغایەتول ئوصوولی شەرحی اجول ئوصولا دەفەرموێ: لەگێڕانەوەیەکا دەفەرموێ: تەنانەت ئەگەر کەسێ لەوان، بەبەرچاوی خەڵکەوە داوێن پیسی و زینا لەگەڵ دایکی خۆی بکا، ئێوەش بەبێ سێ و دوو شتی وا دەکەن!! سبحان الله! ئەمڕۆ ئەمەوایە، بەبێ کەم و زیاد خوا پەنامان بدا.

١٣٧٩- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنهما) انَّ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ ايَةً وَحَدِّثوا عَنْ بَنِي اسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ وَمَنْ كَذبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ) (الحديث: ٣٤٦١)(١٤٣).

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەگەر تەنیایەك ئایەتیشتان لەلایەنی منەوە ڕاگەیاندووە بەموسوڵمانان، بیکەن و ڕای بگەیەنن پێیان، قسەو باس و خواسی بەنی ئیسرائیل (نەوەی ئیسرائیل)یش بگێڕنەوە قەیناکا، هەرکەسێکیش بە ئارەزوو بەدەم منەوە درۆ بکا جێگەی خۆی لە دۆزەخا خۆش دەکا). (تاج/١ ل/٨٤ ف/٢ ز/١٥ - باسی ڕاگەیاندنی زانین پێوستە..) + (ریاض/٣ ل/٩٩٧ ز/٢٤١).

**ڕوونکردنەوە:**

گێڕانەوەو باس کردنی ئەو هەواڵو دەنگو باس و چیرۆك و داستان و سەرگوزەشتانەی کەوان لەکتێب و لەمێژووی جوولەکە و گاوردا دروستە،

---

(١٤٣) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عبدالله بن عمرو: (بلغوا عني) (فتح/٦/٥٢٤) - ج /٧ -ط. ج -خاتمة كتاب احاديث الانبياء - المترجم.

هەروا ئەو فەرموودەو ئایەتانەی تەورات و ئینجیل و کتێبەکانی تری ئەم دوونەتەوانە، کەدەبن بەهۆی ڕەفتاری بەرزو نزیکبوونەوە لە خوداو دوور کەوتنەوە لە خراپە دروستە.

کورت و پۆخت، وەك مامۆستای عەسقەلانی لە فەتحا دەفەرموێ: (نەقل لەبەنی ئیسرائیلەوە دروستە بە مەرجێ سوورنەزانرا کە درۆیە).

١٣٨٠- عنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (انَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لا يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ) (الحديث: ٣٤٦٢، طرفه في: ٥٨٩٩)(١٤٤)

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (جوولەکە و گاور سەروریشی خۆیان بۆیە ناکەن، کەواتە بە پێچەوانەی ئەوانەوە ئێوە بۆیەیان بکەن). (ریاض/٤ ل/١٢٠٤ ف/٣ ز/٢٩٣ - باسی لاسکایی شەیتان و نامۆسوڵمان نادروستە+تاج/٤ ل/١٤٢ ز/٤٤ ف/١ - باسی ڕەنگ کردن و بۆیاخ کردنی مووی سەروڕیش).

١٣٨١- عن جُنْدَبِ بْنُ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجَزِعَ فَاخَذ سِكِّينًا فَحَزَّ بِهَا يَدَهُ فَمَا رَقَا الدَّمُ حَتَّى مَاتَ قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى بادَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ) (الحديث: ٣٤٦٣، طرفه في: ١٣٦٤)(١٤٥).

جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (پیاوێ لەنەتەوەکانی پێش ئێوە بریندار دەبێ، ئۆقرەی لێ هەڵ دەگیرێ، چەقۆیێ دەهێنێ، دەستی خۆیی پێ لەت دەکا، ئیتر خوێنەکەی ناگیرسێتەوە، هەتا دەمرێ. خوای گەورە دەفەرموێ: (ئەم بەندەیەی من

(١٤٤) اخرجه مسلم في اللباس و الزينة باب: في مخالفة اليهود ... رقم: ٢١٠٣ .

(١٤٥) اخرجه مسلم، باب: غلظ تحريم قتل الانسان نفسه (صم/٢ ص١٢٤ وما قبلها وما بعدها)- المترجم.

دەست پێشکەری لێ کردم و پەلەی لە مردنی خۆی کرد، وا منیش لەسەر ئەوە بەهەشتم لیێ قەدەغە کرد) (تاج/٩ ل/٣٩ ز/١٠).

١٣٨٢- عنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (انَّ ثلاثةً فِي بَنِي اسْرَائِيلَ ابْرَصَ وَاقْرَعَ وَاعْمَى بَدَا لِلّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ انْ يَبْتَلِيَهُمْ فَبَعَثَ الَيْهِمْ مَلَكًا فاتَى الابْرَصَ فقَالَ: ايُّ شَيْءٍ احَبُّ الَيْكَ؟ قَالَ: لَوْنٌ حَسَنٌ وَجِلْدٌ حَسَنٌ قَدْ قَذرَنِي النَّاسُ قَالَ: فَمَسَحَهُ فَذهَبَ عَنْهُ فَاعْطِيَ لَوْنًا حَسَنًا وَجِلْدًا حَسَنًا، فقَالَ: ايُّ الْمَالِ احَبُّ الَيْكَ؟ قَالَ: الابِلُ اوْ قَالَ: الْبَقَرُ هُوَ شَكَّ فِي ذلِكَ انَّ الابْرَصَ وَالاقرَع قَالَ: احَدُهُمَا الابِلُ وَقَالَ الاخر: الْبَقَرُ فَاعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ فقَالَ: يُبارَكُ لَكَ فِيهَا وَاتَى الاقرَع فقَالَ: ايُّ شَيْءٍ احَبُّ الَيْكَ؟ قَالَ: شَعَرٌ حَسَنٌ وَيَذهَبُ عَنِّي هَذا قَدْ قَذرَنِي النَّاسُ، قَالَ: فَمَسَحَهُ فَذهَبَ وَاعْطِيَ شَعَرًا حَسَنًا، قَالَ: فَايُّ الْمَالِ احَبُّ الَيْكَ؟ قَالَ: الْبَقَرُ، قَالَ: فَاعْطَاهُ بَقَرَةً حَامِلا وَقَالَ: يُبارَكُ لَكَ فِيهَا، وَاتَى الاعْمَى فقَالَ: ايُّ شَيْءٍ احَبُّ الَيْكَ؟ قَالَ: يَرُدُّ اللّٰهُ الَيَّ بَصَرِي فَابْصِرُ بِهِ النَّاسَ، قَالَ: فَمَسَحَهُ فَرَدَّ اللّٰهُ الَيْهِ بَصَرَهُ، قَالَ: فَايُّ الْمَالِ احَبُّ الَيْكَ؟ قَالَ: الْغَنَمُ فَاعْطَاهُ شَاةً وَالِدًا فَانْتِجَ هَذانِ وَوَلَّدَ هَذا فَكَانَ لِهَذا وَادٍ مِنْ ابِلٍ وَلِهَذا وَادٍ مِنْ بَقَرٍ وَلِهَذا وَادٍ مِنْ غَنَمٍ.

ثمَّ انَّهُ اتَى الابْرَصَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ تَقَطعَتْ بِيَ الْحِبالُ فِي سَفَرِي فَلا بَلاغَ الْيَوْمَ الا باللّٰهِ ثمَّ بِكَ اسْألُكَ بالَّذي اعْطاكَ اللَّوْنَ الْحَسَنَ وَالْجِلْدَ الْحَسَنَ وَالْمَالَ بَعِيرًا اتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِي سَفَرِي فقَالَ لَهُ: انَّ الْحُقُوقَ كَثيرَةٌ فقَالَ لَهُ: كَانِّي اعْرِفُكَ الَمْ تَكُنْ ابرَصَ يَقْذرُكَ النَّاسُ فَقِيرًا فَاعْطاكَ اللّٰهُ، فقَالَ: لَقَدْ وَرِثتُ لِكَابِرٍ عَنْ كَابِرٍ، فقَالَ: انْ كُنْتَ كَاذبا فَصَيَّرَكَ اللّٰهُ الَى مَا كُنْتَ وَاتَى الاقرَع فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فقَالَ لَهُ مِثلَ مَا قَالَ لِهَذا فَرَدَّ عَلَيْهِ مِثلَ مَا رَدَّ عَلَيْهِ هَذا فقَالَ: انْ كُنْتَ كَاذبا فَصَيَّرَكَ اللّٰهُ الَى مَا كُنْتَ.

وَاتَى الاعْمَى فِي صُورَتِهِ فقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ وَتَقَطعَتْ بِيَ الْحِبالُ فِي سَفَرِي فَلا بَلاغَ الْيَوْمَ الا باللّٰهِ ثمَّ بِكَ اسْألُكَ بالَّذي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ

شَاةً اتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي، فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ اعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ بَصَرِي وَفَقِيرًا فَقَدْ اغْنَانِي فَخُذ مَا شِئْتَ فَوَاللَّهِ لا اجْهَدُكَ الْيَوْمَ بِشَيْءٍ اخَذتَهُ لِلَّهِ، فَقَالَ: امْسِكْ مَالَكَ فَانَّمَا ابْتُلِيتُمْ فَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنْكَ وَسَخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ (الحديث ٣٤٦٤ – طرفه في: ٦٦٥٣) (بروانة: رياض/١ ل/٧٨ ذمارة: ٦/٦٥ ز/٥)[١٤٦].

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: بە گوێچکەی خۆم لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەرم بیست(دروودی خودای لێ بێ) دیفەرمووی: (سێ کەس لەنەوەی ئیسرائیل، واتە: لەبەنی ئیسرائیل: بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك خودای گەورە دەیەوێ تاقییان بکاتەوە، جا فریشتەیێ لەسەر شێوەی پیاوێ دەنێرێ بۆ لایان.

فریشتەکە دەچێتە لای بەڵەکە کەوپێی دەڵێ: زیاتر حەزت لە چییە؟ دەڵێ: حەزم لە ڕەنگو بۆیەکی جوان و پێستێکی جوانەو ئەم بەڵەکییەشم نەمێنێ، کەبووە بەهۆی ئەوە کەخەڵك قێزو بێزم لێ دەکەنەوە، فریشتەکە دەستێ دەهێنا بەسەر جەستەیدا ئیتر یەك دەنك چەپەڵییەکەی نامێنێ و، ڕەنگوبۆیەکی جوان و پێستێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئەو جا فریشتەکە پێی دەڵێ: حەزت لەچی جۆرەماڵێکە؟ پیاوەکە دەڵێ: حەزم لەووشترە، یاخود دەڵێ: حەزم لە ڕەشە وولاخە، ئیسحاق کەیەکێکە لە ڕاوییەکانی ئەم حەدیپە گومانی لەوە دا بۆ پەیدا بووبوو کە بەڵەك و کەچەڵەکە کامیان داوای ووشترو کامیان داوای ڕەشە وولاخی کردبوو، فەرمووی: جا ووشترە مێیەکی هەراش ئاوسوی لەسەر گوانی دایەو پێیی گوت خودا پیت و فەڕی تێ بخات بۆت، فەرمووی: ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆ لای کە چەڵەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لە چیە ؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لە قژێکی جوانەو ئەم کەچەڵییەشم نەمێنێ، کە بووە بەهۆی ئەوە خەڵك قێزو بێزم لێ بکەنەوە، فەرمووی: جا فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بەسەریدا ئیتر کە چەڵییەکەی دەڕواو قژێکی

---

(١٤٦) اخرجه مسلم في اوائل كتاب الزهد و الرقائق، رقم: ٢٩٦٤.

جوانیشی پێ دەدرێ، ئینجا پێی دەفەرموێ: حەز لە چی جۆرەماڵی دەکەی؟ دەڵێ: لەڕەشە وولاخ، جا مانگایەکی ئاووسی دەداتا و پێی دەڵێ: خودا پێت وبەرەکەتی تێبخات بۆت.

فەرمووی: ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆلای کوێرەکە و پێی دەفەرموێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لە دووچاوی ساخو گەشە، کە خودا بیانـدا پـێم هـەتا ئـەم خەڵکـەیان پـێ ببیـنم، فـەرمووی: جادەسـتا دەهێنـا بەچـاوەکانیداو خـودا چـاوەکانی پـێ دەداتـەوە، جـا پێـی دەفـەرموێ: ئـەی حـەز لەچـی جـۆرە سـامانێ دەکـەی؟ دەڵـێ: لەمـەڕ، جامـەڕێکی زاوی بـەرخ بەبـەری دەداتـێ، ئـیتر بـەرە بـەرە ئاژەڵـەکان زاوزێ دەکـەن و ئـەوانیش بەرهەمیان دەهێنن، تا وازۆر دەبن، ئەمیان بوو بە خاوەنی پڕ شیوێ ووشترو ئـەویان بـوو بـە خـاوەنی پـڕ دۆڵـێ ڕەشـەوولاخ و ئەویتریـشیان بـوو بـە خـاونی پڕشـیوێ گەلـەڕان! فەرمووی: لەپاشـدا فریـشتەکە خـۆی لێ گـۆڕین و لەسەر شێوە و شەکڵی ئەوسای بەڵەکەکە خۆی، هاتـەوە بۆلای و پێـی گـوت: پیاوێکی هەژاری داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم، سەربەهیچ لایەکا دەرناکەم، سا مەگـەر یەکـەم بەپـشتیوانی خـوداو دووەم بـەهۆی یارمـەتی تـۆوە بگەمـەوە شوێن ورێی خۆم، جاتوبیت و ئەو کەسەی کە ئەم شێوە شیرینەو ئـەم لـەش و لارە جوانەو ئەم ماڵە زۆرەی پێ داویت وشترێکم بدەرێ، تا لەم سـەفەرەمدا خۆی پێ بگەیەنمە ماڵەوە، کابرا وتی: خاوەن بەش زۆرن بەرتۆ ناکەوی!

فریشتەکەش پێی فەرموو: وەك من تـۆ بناسمـەوە وایـە، ئـەرێ تـۆ ئـەو پیاوە بەڵەکەنیت کە خەڵك بێزی لێ دەکردیتەوە، وە ئەو هەژارەنیت کەخودا دەوڵەمەندی کردیت! گوتی: خەیرا من ئەم مـاڵ و سـامانەم لـەباو باپیرمـەوە بـۆ بـەجێماوە، ئـەواینش هـەر بـووە بـوون و پـشتاو پـشت بـە بـەگزادەیی هاتوونەتە خوارەوە! فریشتەکەش دەڵێ: ئەگەر درۆ دەکەی خـودا وەك جـاری جـارانی خۆتـت لێ بکاتـەوە. فـەرمووی: جالـە شـێوەی شـکڵی پێـشووی

کەچەڵەکەدا چوو بۆ لای ئەویش، چی بە بەڵەکەکە گوت دیسان بەمیشی وا وت، وە بەڵەکەکە چی بەفریشتەکە گوت دیسان کەچەڵەکەش ئەوەی پێ گوت. فریشتەکە گوتی: ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاریجارانی خۆتت لێ بکاتەوە! فەرمووی: جا لە شێوەو شەکڵی پێشوی کوێرەکەیش دا هاتەوە بۆ لای و فەرمووی: پیاوێکی هەژاری داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم، سەر بەهیچ لایەکا دەرناکەم، سامەگەر یەکەم بە پشتیوانی خوداو دووەم بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێن ورێگەی خۆم، جا توبیت و ئەو خودایە کە چاوەکانی چاك کردیتەوە مەرێکم پێ بدە بەشکوو لەم شەفەرەمدا پێی بگەمەوە ماڵەوە، پیاوە کویرەکە دەڵێ: ئای! منیش وەك ئێستای تۆ کوێر بووم و دەزانم کوێر چەندە کۆڵەوارە وە خودا چاوی چاك کردمەوە، سەرەڕای ئەوەیشە هەژاریش بووم و دەشزانم هەرژاری چەندە ناخۆشە جا کەواتە بە ئارەزووی خۆت چی دەبەی بۆ خۆت ببە، وەچی دەهێڵێتەوە بۆمن ئارەزووی خۆتە، بەو خودایە هەرچی ئەمڕۆ تۆ بیبەیت بۆ خۆت لەڕێگەی خودا دا دەست ناهێنمە ڕێگەت فریشتەکە فەرمووی: ماڵی خۆت بۆخۆت، من فریشتەم هەوەجێم بەماڵ و سامان نییە، لە ڕاستی دا ڕووداوەکە ئاوایە: ئێوە -واتە: تۆو بەڵەکەکە و کەچەڵەکە- لەلایەنی خودای گەورەوە تاقی کرانەوە خودا لە تۆرازییە، بەڵام لەهەردوو هاوڕێکەت ناڕازییە). (تاج/١٠ ل/٨٢ ز/٢٢ ف/١ - داستانی بەڵەکێك و کەچەڵێك و..).

١٣٨٣- عَنْ ابِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (كَانَ فِي بَنِي اسْرَائِيلَ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ انْسَانًا ثُمَّ خَرَجَ يَسْأَلُ فَاتَى رَاهِبًا فَسَأَلَهُ فَقَالَ لَهُ هَلْ مِنْ تَوْبَةٍ قَالَ لا فَقَتَلَهُ فَجَعَلَ يَسْأَلُ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: ائْتِ قَرْيَةَ كَذا وَكَذا فَادْرَكَهُ الْمَوْتُ فَنَاءَ بِصَدْرِهِ نَحْوَهَا فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلائِكَةُ الْعَذابِ فَاوْحَى اللَّهُ الَى هَذِهِ انْ تَقَرَّبِي وَاوْحَى اللَّهُ الَى هَذِهِ انْ

تَباعَـدِي وَقَـالَ قِيـسُوا مَـا بَيْنَهُمَـا فَوُجِـدَ الَـى هَـذِهِ اقْـرَبَ بِـشِبْرٍ فَغُفِـرَ لَـهُ) (الحديث: ٣٤٧٠)(١٤٧).

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەنەوەی ئیسرائیل نەوەدو نۆکەس بەناهەق دەکوژێ، ئینجا دەپرسێ: کێ زاناترین کەسە لەولاتا، دەڵێن: فیسرە سۆفیلکە، جا کابراکە دەچێ بۆلای و پێی دەڵێ: من نەوەدو نۆکەسم بەدەستی خۆم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆهەیە؟ پەشیمانیم لێ گیرادەبێ؟ خوداناسەکە دەفەرموێ: نەو، جا کابرا ئەویش دەکوژێ و دەیکا بە سەدی تەواو. جا دیسان دەست دەکاتەوە بە پرسیارو دەڵێ: کێ زاناترین کەسە لەولاتدا؟ ئەمجارە پیاوێکی زانای پێ نیشان دەدەن، جا دەچێ بۆلای و پێی دەڵێ: من سەدکەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆهەیە؟ زاناکە دەڵێ: بەڵێ: وەکەس ناتوانێ ڕای تەوبەت لێ بگرێ، تەوبە هەموو کاتێ لەهەموو کەسێ قەبووڵ دەکرێ، بەڵام لێرە مەمێنەو بڕۆ بۆ فیسارە ولات لەوێ کۆمەڵەیا خواناسی باشی لێیە، خەریکی خوداپەرستی و عیبادەتکردنن، بڕۆ لەوێ تۆیش لەگەڵ ئەواندا خواناسی بکەو مەچۆرەوە بۆ ولاتی خۆت، چونکە خاکێکی شووم و بەد قوومە، پیاوەکەیش دەکەوێتە ڕا بۆ ئەو ولاتە، دەڕوا تا دەگاتە نیوەی ڕێ، لەوێ دەمرێ؟ جافریشتەی ڕەحمەت و فریشتەی عەزاب لەسەر تەرمەکەی حازر دەبن و لەسەری دەبێ بەکێشمە کێشیان: فریشتەی ڕەحمەت دەفەرموون: ئەمە بۆ تەوبە هاتووەو بەکوڵی دڵ ڕووی لەخودای گەورە کردووە، کەواتە ئەمە دیاری دەستی ئێمەیە و دەیبەین بۆ بەهەشت! فریشتەی سزاش دەفەرموون: ئەمە هەرگیز کردەوەی چاکەی نەکردووە، کەواتە: ئەمە نێچیری خۆمانەو دەیبەن بۆ دۆزەخ! جا بەفەرمانی خودا فریشتەیێ لە شێوەی ئادەمیزاد دا دەچێ بۆلایان و هەردوولا ئەو فریشتەیە

(١٤٧) اخرجه مسلم في التوبة، باب: قبول توبة القاتل وان كثر قتله، رقم: ٢٧٦٦.

دەکەن بەحەکەم و ناوبژیکار، حەکەمەکە دەفەرموێ: نێوانی هەردوو شوێنەکە بپێون، ولاتەکەی خۆی و ولاتەکەی کە بۆی دەچوو، جا لەکام لایانەوە نزیکتر بوو هی ئەوەیانە، کە دەیپێون دەروانن لەو جێگایەوە نزیکتر دەبێ کە بۆی دەچێ، ئیتر فریشتەی ڕەحمەت وەری دەگرن- ش) (تاج/٩ ل/٢٧٠ ز/٩٢ ف/٣ - باسی: هەرچەندێ بەندە لە ڕادەبەدەر تاوانی هەبێ بەڵام تەوبەی گیرا دەبێ).

١٣٨٤- عنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عَقَارًا لَهُ فَوَجَدَ الرَّجُلُ الَّذي اشْتَرَى الْعَقَارَ فِي عَقَارِهِ جَرَّةً فِيهَا ذهَبٌ فَقَالَ لَهُ الَّذي اشْتَرَى الْعَقَارَ: خُذ ذهَبَكَ مِنِّي انَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الارْض وَلَمْ ابْتَعْ مِنْكَ الذهَبَ وَقَالَ الَّذي لَهُ الارْض: انَّمَا بِعْتُكَ الارْض وَمَا فِيهَا فَتَحَاكَمَا الَى رَجُلٍ فَقَالَ الَّذي تَحَاكَمَا الَيْهِ: الَكُمَا وَلَدٌ قَالَ احَدُهُمَا: لِي غُلامٌ وَقَالَ الاخَر: لِي جَارِيَةٌ قَالَ: انْكِحُوا الْغُلامَ الْجَارِيَةَ وَانْفِقُوا عَلَى انْفُسِهِمَا مِنْهُ وَتَصَدَّقَا) الحديث: ٣٤٧٢[(١٤٨)].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (جارا پیاوێ خانووبەرەیەکی کڕی لە پیاوێکی تر، کڕیارەکە کووپەڵەیا زێڕی تیا دۆزییەوە، جا بەفرۆشیارەکەی گوت: زێڕەکە هی تۆیە لێم وەربرگرەوە، چونکە من تەنیا زەوییەکەم لەتۆ کڕیوە، خۆ زێڕەکەم لێ نەکڕیوی، ئەویش وتی: من زەوییەکە خۆی و هەرچی وا تیادا فرۆشتوومە بەتۆ، زیڕەکە هی خۆتە من وەری ناگرمەوە. فەرمووی: جا بۆ دادخوایی و ناوبژی کردن چوونە لای پیاوێ و کردیان بە فەرمانڕەواو ناو بژیوان (حەکەم = ناوبژیکەر).

---

(١٤٨) اخرجه مسلم في الاقضية، باب: استحباب اصلاح الحاكم بين الخصمين، رقم: ١٧٢١.

پیاوەکە گوتی: ئایا منالّتان هەیە؟ یەکێکیان گوتی: من کوڕێکم هەیە. ئەوی تریشیان گوتی: منیش کچێکم هەیە، ئەویش گوتی: کە واتە کچەکە لە کوڕەکە مارە بکەن و زێڕەکەیش بۆ خۆتان خەرج بکەن بۆ مەسرەفی شایی، وەخێریشی لێ بکەن، ئیتر ئەوانیش وایان کرد). (تاج/٣ ل/٣١٩ ف/١ - باسی دانانی ناو بژێکار).

١٣٨٥- عَنْ اسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قِيلَ لَهُ: مَاذا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الطاعُونِ فَقَالَ اسَامَةُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الطاعُونُ رِجْسٌ ارْسِلَ عَلَى طائِفَةٍ مِنْ بَنِي اسْرَائِيلَ اوْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَاذا سَمِعْتُمْ بِهِ بارْض فَلا تَقْدَمُوا عَلَيْهِ وَاذا وَقَعَ بارْض وَانْتُمْ بِهَا فَلا تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ قَالَ ابُو النَّضرِ: لا يُخْرِجْكُمْ الا فِرَارًا مِنْهُ) (الحديث: ٣٤٧٣، طرفاه في: ٥٧٢٨، ٦٩٧٤)[(١٤٩)].

پرسیارکرا لە ئوسامەی کوڕی زید (رەزای خودایان لێ بێ) سەبارەت بەپەتای تاعوون چیت لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بیستووە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (تاعوون دەردێکی پیسە، خودا لەسەر شێوەی سزا نارد بۆ سەر بەرەیێ لەنەوەی ئیسرائیل) یافەرمووی: (سزایە بوو خودا ناردی بۆسەر نەتەوەکانی پێش ئێوەی نەتەوەی ئیسلام. جا ئەگەر بیستتان کەوا تاعوون لە شوێنێدا کەوتووە ئێوە لەخۆتانەوە، بەبێ پێویستی مەچن بۆسەری بۆ ئەوێ، کاتا تاعوون لە شوێنێ پەیدا بووکە ئێوە لەوێ بوون ئەوە دەرمەچن لەوێ و لەدەستی ڕامەکەن). (تاج/٤ ل/١٧٦ ف/٣+٢+١ - باسی: پاداشتی ددان بەخۆداگرتن لەکاتی داکەوتنی تاعووندا).

١٣٨٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ سَالْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ الطاعُونِ فَاخْبَرَنِي انَّهُ عَذابٌ

---

(١٤٩) اخرجه مسلم في السلام، باب: الطاعون و الطيرة و الكهانة و نحوها، رقم: ٢٢١٨.

يَبْعَثُهُ اللّٰهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَانَّ اللّٰهَ جَعَلَهُ رَحْمَةً لِلْمُؤْمِنِينَ لَيْسَ مِنْ احَدٍ يَقَعُ الطـاعُونُ فَيَمْكُثُ فِي بَلَدِهِ صَابِرًا مُحْتَسِبا يَعْلَمُ انَّهُ لا يُصِيبُهُ الا مَا كَتَبَ اللّٰهُ لَـهُ الا كَـانَ لَـهُ مِثْلُ اجْرِ شَهِيدٍ) (الحديث: ٣٤٧٤، طرفاه في: ٥٧٣٤، ٦٦١٩)[١٥٠].

عائيـشەی هاوسـەری پێغەمبــەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) فــەرمووی: سـەبارەت بـەتاعوون پرسـيارم لەپێغەمبـەر (دروودی خودای لێ بێ) كـرد فـەرمووی پێم: تـاعوون جۆرە سزايەكە خودا دەينێرێ بۆسـەر ئـەو كەسانەی كە خـۆی ئـارەزووی هـەبێ، بـەڵام خـودا ئـەم پەتايـەی كـردووە بـە ڕەحمـەت وبـەهۆی شـەهيد بـوون بـۆ موسـوڵمانان، ئـيتر لەهـەرولاتی كـە تــاعوون دەكەوێتــەوە، هـەر بەنــدەيی لەشـارەكەی خـۆی دا بمێنێتــەوەو لەبـەر بـاری خـودادا ئـارام و ئـۆقرە بگـرێ و بەبەشـی خـودا ڕازیبـێ و بەشـی باشـی خـۆی لـەخودا داوابكـا، وەلەهـەمان كـات دابزانێ ئەوەی كە خـودا لـە چارەيی نەنووسيبێ قـەت تووشـی نـابی، ئـەوە ئـەو بەندەيە بەقەد پاداشتی شەهيدێ پاداشتی بۆهەيە). (تاج/٤ ل/١٧٦ ز/٥٣ ف/٢).

١٣٨٧- عن ابن مسعود (رضي الله عنهما) قَالَ عَبْدُ اللّٰهِ: (كَانِّي انْظُرُ الَـى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَحْكِي نَبِيًّا مِنْ الانْبِيَاءِ ضَرَبَهُ قَوْمُهُ فَادْمَوْهُ وَهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ وَيَقُولُ: (اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَانَّهُمْ لا يَعْلَمُـونَ) (الحـديث: ٣٤٧٧، طرفه في: ٦٩٢٩)[١٥١].

ئيبنو مەسعوود (ڕەزای خوادايان لێ بێ) فەرمووی: (دەڵێی هـەر لەبـەر چـاومە، كــە چــۆن چــۆنی پێغەمبــەر (دروودی خـودای لــێ بــێ) لاســكايی پێغەمبــەرێ لەپێغەمبــەرەكانی دەكــردەوە، گەلەكــەی لێيــان دابــوو، وە دەموچــاو يــان خوێنـاوی كردبـوو. حـەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) بـە پەنجـەی خـۆی ڕوخساری خـۆی دەسـڕی و تـەمـسيلی ئـەو پێغەمبـەرەی دەكـرد، كـە لـەپاش دەسـدرێژی

(١٥٠) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عائشة في الطاعون (فتح/ ٧ص ٢٠٨ - ط. ج. خاتمة كتاب احاديث الانبياء) المترجم.

(١٥١) اخرجه مسلم في الجهاد و السير، باب: غزوة احد، رقم: ١٧٩٢.

هۆزەکەی خوێنەکەی لە ڕووی خۆی دەسڕی، کەچی لە باتی ئەوەی نزای خراپیان لێ بکا، بۆ یان دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (اللهم اغفر لقومي فانهم لايَعْلَمُونَ) خودایە! لێیان مەگرە، لە بەر نەزانی خۆیانەکە ئەمە حاڵی منە بە دەستیانەوە!). (ریاض/١ ل/٥٦ ژمارە/٣٦ ز/٣ + تاج/٢ ل/١٧٧ ز/٥٧ ژ/٦٤٦ - باسی لێبوردن و چاو پۆشی کردن لە نادانان) + (ریاض/١ ل/٥٦ ز/٣).

١٣٨٨- عن عبدالله بْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَجُرُّ ازَارَهُ مِنْ الْخُيَلاءِ خُسِفَ بِهِ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الارْض الَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) (الحديث:٣٤٨٥، طرفه في: ٥٧٩٠ ) [١٥٢].

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (جارێ کابرایێی دەنازێ بە کاکۆڵ و بەجلەکانیاوەو بۆ فیز و دەعیە جلەکەی شۆڕکردبۆوە و بەسەر زەوییەکەدا دەیخشان و بەکێشی دەکرد، لە پڕ لەو کاتەدا ڕۆچوو بە ناخی زەویدا، ئیتر هەتا ڕۆژی قیامەت هەلا دەستی، ئەو کابرایە هەر قوڵتە قوڵت دا دەچێ بە ناخی زەویداو، هەر ناگاتە بنی تا تۆزی ستار بگرێ). (تاج/٢ ل/١٢٤-٣٨ - باسی: دەستووری جل و بەرگ).

**ڕاڤەو شیکرنەوە:**

●یەکەم: پەیوەندی زۆر بەی فەرموودەکان بە باتەکەوە تا ڕادەیێ دیارە، لەبەر کورتە بڕی زۆربەی کات لاباسە تایبەتییەکانمان نەنووسی.

●دووەم: هەمووومان دەزانین مەبەست لەوەرگێڕان تێگەیشتنە لە دەقەکە، جاکەواتە: هەتا تەرجەمەو وەگەڕاوەکە ڕوونترو تێرو تەسەلتربێ، مەردومەکە باشتر لێی تێ دەگەن، بەلام بۆ ئەوەی کە هەمووومان لە

---

(١٥٢) قال في التاج: رواه الشيخان (التاج الجامع للاصول في احاديث الرسول ج/٣ص١٦٣ + صحيح مسلم/١٤ باب تحريم التبختر)-المترجم.

تەرجەمە کوردییەکە دڵنیابین، جارێ تریش عەرزتان دەکەم کە بەرنامەی تەرجەمەکە زۆرمتمانە دارە و بێ گەردە، ومبەهیچ جۆرێ من لە خۆمەوە، بەبێ بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا هیچ شتێ تەرجەمە ناکەم، وشە بە وشە، ڕستە بەڕستە، فەرموودە بە فەرموودە، بە پێی شەرح و سەرچاوەکان دڵنیادەبم لە ماناو واتاو مەبەستەکانیان ئەوسا تەرجەمەی دەکەم، لە هەمان کاتدا بەهرە لەهەموو ئەگراف و ریوایات و طەریق و وەجە و موتابەعەکانی فەرموودەکە، لەصەحیحەین دا وەردەگرم ومزۆر جار زیادەو فائیدەی ناوەڕۆکەکەیان لەگەڵ تەرجەمەی ڕیوایەتەکەی ئێرەدا موتوربە دەکەم بۆ زیادە بەهرە و ڕوونکردنەوەی تەواو. جا بۆ نموونە عەرزتان دەکەم:

(فەرموودەی ژمارە: ١٣٨٨، سەرە ڕای تەرەف و وەجە و ریوایات و موتابەعات و تەریقە جیا جیاکانی لە صەحیحی بوخاریدا، کە بوخاری لێرەو لەکیتابی لیباس دا، تەخریجی کردوون، لە صەحیحی موسلیمیش دا، نزیکەی بیست گێڕانەوەو ریوایاتی جیا جیای هەیە، کە ئیمامی موسلیم (رەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بەسەنەدی خۆی دەری هێناون، کەوان لەبەرگی چواردەدا، لاپەڕە/٦٠ هەتا لاپەرە/٦٤، کە بریتین لەم دووبابە، بە پێی تبویبی ئیمامی نەوەوی لەشەرحەکەی خۆیدا لەسەر صەحیحی موسلیم: (باب: تحريم جر الثوب خُيَلاءَ و باب: تحريم التبختر في المَشْيِ مَعَ اعْجَابِهِ بثيابِهِ ج/١٤ ص/٦٠-٦٤).

جا عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم کە ئەم دەقە جیاجیایانە لەناو خۆیانا زوائد و فوائدیان هەیە، وە زانا گەورەکان کردوو یانن بە شەرح و شیکردنەوەو ڕافەو ڕوونکردنەوە بۆ یەکتری، لەبەر ڕووناکی ئەم گوتە ناودارەکە دەفەرموێ: (الحديث يفسِّرُ بَعْضهُ بَعْضا) چونکە شەرحی حەدیثو تەفسیری قور ئانی پیرۆز بە ڕای شەخصی حەرامە، مەگەر شتێ کە پەیوەندی بە زمان و ڕێسای زمانەوە هەبێ.

جا وا بۆ دڵنایی و شارەزایی تەواو، پۆختەی هەموو ئەم ریوایاتانەی صەحیحەین، لەسەر ئەم شێوەیە کۆ دەکەینەوە: (باب: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاءً، لاينظرُ اللهُ الى منْ جرَّ ثوبَهُ او ازاره او ثيابهُ خُيَلاءً او بطرا، يومَ القيامَةِ. بينما رجلٌ يمشي في حلَّةٍ تعجبُهُ نفسُهُ مرَّجَلٌ جمَّتُهُ او اعجبُتْهُ جمَّتهُ و برداهُ او يتبختَرُ في بردَيهِ اذ خسَفَ اللهُ به الارْض فهو يتجلجلُ في الارْض حتَّى تقوم السّاعة، او رجلا ممن كان قبلكم يتبختر في حلَّةٍ ...).

جا لێرەدا عەرزی دڵسۆزانی سوننەتی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دەکەم: (کە هەمیشە دڵسۆزیی خۆتان بۆ سوننەت دەربڕن، بەبیانووی هیچ و پووچ دڵی موسوڵمانان لە کتێبە گەورەکانی سوننەت سارد مەکەنەوە، وەك هەندێ نەفام پەیدا بوون، وەك کەڵەشێری ناوەخت و شاگردی شەیتان و تووتی فێرکراو، لە هەموو کۆڕو دانیشتنێك دا دەڵێن و دەڵێنەوە: (فیسارە کتێبی سوننەت چوار فەرموودەی زەعیفی واتیادا..) یا پڕو پاگەندەی زەهراوی لەدژی زۆر لەکتێبە ناودارەکانی تری شەریعەت دەکەن.

دەڵێن: لە پێش نزیکەی دوو سەد ساڵ لەمەوپێش، پادشایەکی ئێرانی دژی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەبێ، جاڕ دەدا کە هەرکەسێ یەك هەڵە لە مەتن یا سەنەدی صەحیحی بوخاری، یا صەحیحی موسلیم بگرێ، سەد لیرەی زێڕی دەدرێتی! چونکە بە بۆ چوونی ئەم وەکیلی شەیتانە، ستوونی قایمی دەواری ئەهلی سوننەت و جەماعەت صەحیحەینە، کە صەحیحەین ڕووخا، ئەهلی سەننەت و جەماعەتیش نامێنن!

## پایانێ (خاتِمَة)

مامۆستای عەسقەلان (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (نامەی ئەحادیثی ئەنبیاو و بابەتەکەی پاشی کە باسی بەنی ئیسرائیلە، دوو سەدو نۆ فەرموودەی بەرزەوە کراوی واتیادا، سەدوبیست و حەوت فەرموودەیان دووبارەن، پوختەکەیان: (٢٠٩-١٢٧ = ٨٢) هەشتاو دوو فەرموودەیە، ئەم

پوختەیە هەموویان پێشەوا ئیمامی موسلیمیش (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) گێڕاونیەتەوە، بێجگە لە مانەیان:

١. تەعلیقی ژمارە (٣٣٣٦) (الارْوَاح جُنُود مجَنَّدة). لەبەر ئەوەی کە تەعلیقە لە تەجریدەکەدا نییە.
٢. تەعلیقی کەوا لە پێش ژمارە: (٣٣٤٦)ەوە، کە دەفەرموێ: (قَالَ رَجُلٌ للنبيِّ: رَايْتُ السَّدَّ مِثلَ البُرْدِ الُمحَبَّرِ قَال: (قَدْ رَايْتَهُ).
٣. فەرموودەی ژمارە: (١٣٤٤ت = ٣٣٥٠ف).
٤. ژمارە: (١٣٥١ت = ٣٣٦٤ف).
٥. ژمارە: (١٣٥٤ت = ٣٣٧١ف).
٦. تەعلیقەکەی سبره بن معبد.
٧. تەعلیقەکەی ابو الشموس.
٨. تەعلیقەکەی ئەبوزەر.
٩. ژمارە: (٣٣٨٨ف)لە(ت)یدانییە.
١٠. ژمارە: (١٣٥٩ت = ٣٤٠٢ف).
١١. ژمارە: (٣٤١٢ف)لە(ت)یدانییە.
١٢. ژمارە: (١٣٦٣ت = ٣٤١٧فتح).
١٣. ژمارە: (١٣٧٣ت = ٣٤٤٥فتح) = لاتُطرُونِي.
١٤. ژمارە: (٣٤٥٨ف = حەدیثەکەی عائیشه (في كراهة الاتكاءِ عَلَى الخَاصِرَة).
١٥. ژمارە: (١٣٧٩ت = ٣٤٦١ف) = (بَلِغُوا عِنِّى وَلَوْ ايَةً).
١٦. ژمارە: (١٣٨٠ت = ٣٤٦٢ف = (ان اليهودَ لا يصبغونَ).
١٧. ژمارە: (١٣٨٦ت = ٣٤٧٤ف = (الطاعون عَذاب يَبْعَثهُ اللهُ).
١٨. ژمارە: (٣٤٨٤ف = اذا لم تَسْتَحِي فَاصْنَعْ مَاشِئتَ)لە تەجریدەکەدا نییە.

هەروا دەفەرموێ: سیی وشەش بیستراو (ئەسەر)ی هاوڕێیان و پاش ئەوانیشی واتیادا. (سوپاس و ستایش بۆ خودو سلاو دروودی بێ پایان بۆ پێغەمبەری خودا و یارو یاوەران و هاوەلانی).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٦٥- نامەی شانازییەکان
# (كِتَابُ المناقِبَ)

١٣٨٩- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الاسلامِ اذا فَقِهُوا وَتَجِدُونَ خَيْرَ النَّاسِ فِي هَذا الشَّانِ اشَدَّهُمْ لَهُ كَرَاهِيَةً) (الحديث:٣٤٩٣، طرفاه في: ٣٤٩٦، ٣٥٨٨).

(وَتَجِدُونَ شَرَّ النَّاسِ ذا الْوَجْهَيْنِ الَّذي يَاتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ وَيَاتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ) (الحديث:٣٤٩٤، طرفاه في:٦٠٥٨، ٧١٧٩ )[١٥٣].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (دەبینن کە ئەم خەڵکە وەك کان وان، هەرکەسەیان ڕەگەزی یادەچێتە سەر بنەماڵەیەکی خانەدان، یابنەچەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر بەرەبابێکی ناڕەسەن، وەبەشێوەی گشتی گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە، لەبەر ئەوە بە زۆری، کردارو ڕەفتاری ئەو خەڵکە، بە پێی ڕەسەنی و ناڕەسەنی ڕەچەڵەك و ڕەگەزیانە!

حا بۆیە ئەوانەیان کەلەسەر دەمی نەزانی پێش ئیسلامدا، خانە دان و ڕەسن باش بوون، ئێستاش لەسەردەمی ئیسلامدا دیسان باش و خانەدان دەردەچن، بەمەرجێ شارەزای ئایین ببن! هەروا دەبینین کە باشترین کەس بۆ ئەم کارو بارە، کە ئایینی ئیسلامە، یاکە فەرمانڕەواییە، ئەو کەسانەیانن کەلە پێش دا زۆر حەزیان لێی نەبووەو وزۆریش رقیان لێی بووە، تا کاتا دەکەونە ناوی! هەروەها سەرنج دەدەن کە بەدترین کەس مرۆڤی دووڕووە،

(١٥٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: خيار الناس، رقم: ٢٥٢٦.

کەلـەم لاقـسەیی دەکـەنو، لەولاقـسەیی تـر دەکـەن، وە بـەپێی بەرژەوەنـدی خۆیان گفت دەگۆڕن و قسە دەکەن).(تاج/٥ ل/٢٧٣ ز/٦٦ ف/٢).

١٣٩٠- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ: (النَّاسُ تَبَعٌ لِقُرَيْشٍ فِي هَـذا الـشَّانِ مُـسْلِمُهُمْ تَبَـعٌ لِمُـسْلِمِهِمْ وَكَـافِرُهُمْ تَبَـعٌ لِكَافِرِهِمْ وَالنَّاسُ مَعَادِنٌ خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَةِ خِيَارُهُمْ فِي الْاسْلَامِ اذا فَقِهُوا تَجِدُونَ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ اشَدَّ النَّاسِ كَرَاهِيَةً لِهَذا الشَّانِ حَتَّى يَقَعَ فِيـهِ) (الحـديثان: ٣٤٩٥، ٣٤٩٦، طرفه في:٣٤٩٣ )[١٥٤]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: (لـەم بارەیـەوە واتـە: لـەبارەی جێنـشینیو فەرمانڕەواییـەوە خـەڵکانی تـر پـەیڕەوی هـۆزی قورەیـشن: موسـوڵمانیان هـی موسـوڵمانیان و ناموسوڵمانیان هـی نـامو سوڵمانیان..) بـاقی فەرموودەکـە لـە ژمـارە: (١٣٨٩). (تاج/٣ ل/٢٦٨ ف/٣ + تاج/٥ ل/٢٧٣ ز/٦٦ ف/٢ ) + (ریاض/١ ل/٨٣ ژ/٦٩ ز/٦).

١٣٩١- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) وقد بلغَهُ انَّ عَبْدَ اللَّهِ بْـنَ عَمْـرِو بْـنِ الْعَاصِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) يُحَدِّثُ: (انَّهُ سَيَكُونُ مَلِكٌ مِنْ قَحْطَـانَ، فَغَـضبَ مُعَاوِيَـةُ فَقَامَ فَاثنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ اهْلُهُ ثـمَّ قَـالَ: امَّـا بَعْـدُ فَانَّـهُ بَلَغَنِـي انَّ رِجَـالا مِـنْكُمْ يَتَحَدَّثُونَ احَادِيث لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ وَلا تُؤثَرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَاولَئِكَ جُهَّالُكُمْ فَايَاكُمْ وَالامَانِيَ الَّتِي تُضلُّ اهْلَهَا فَانِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: انَّ هَذا الامر فِي قُرَيْشٍ لا يُعَادِيهِمْ احَدٌ الا كَبَّهُ اللَّهُ عَلَى وَجْهِهِ مَا اقَامُوا الدِّينَ) (الحديث: ٣٥٠٠، طرفه في: ٧١٣٩)[١٥٥].

جارێ عـەرزی موعاوییـەیان کـرد: کـە عـەبوڵڵای کوڕی عـەمری کوڕی عاص (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموودەیی دەگێڕێتەوە: (کە شایێ لە هۆزی قەحطان

---

(١٥٤) اخرجه مسلم في الامارة، باب: الناس تبع لقريش و الخلافة في قريش، رقم: ١٨١٨.

(١٥٥) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث معاوية(ان هذا الامر في قريش) (فتح/٧/ص٣٤٧. طبعة جديدة –خاتمة المناقب) –المترجم.

هەڵ دەکەوێ!) کە ئەم هۆزی قەحطانە سەرچاوەی هۆز و تیرەکانی عەرەبی یەمەنن. موعاوییەش توورەبوو لەمەو، هەڵسایەوە وتارێکی داو ستایش و سوپاسێکی جوانی خودای کردو پاشان فەرمووی: (پاش ئەمە بیستوومەتەوە، کە پیاوانێ لە ئێوە فەرموودەگەلێ دەگێڕنەوە، کە شتێوا نە لەقورئانا هەیە، کە نامەی پیرۆزی خودای گەورەیە، وەنە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر داشتی وا ریوایەت کراوە، دەی ئەم جۆرە کەسانەتان بەڕاستی نەزانن، ئاگاداربن شوێن ئاواتی هیچ و پووچ مەکەون، وەك ئەم خەیاڵ پلاوییەی کە عەبدوڵلا دەیگێڕێتەوەلە بارەی ئەم پادشا خەیاڵییەوە، چونکە شتێوا سەر لە خاوەنەکەی ئەشێوێنێ، قسەی ڕاست و دروست ئەمەیە، کە من خۆم لەدەمی پێغەمبەر خۆیم بیستووە، کە دەیفەرموو: (فەرمانڕەوایی هی قوڕەیشە، مافی ڕەوای خۆیانە، بە مەرجێ کە ئایینی ئیسلام ڕابگرن و پەیڕەوی شەریعەتی خودا بکەن و پابەندی بن، جالەکاتی وادا هەرکەسێ بە ناڕەوا لە سەر خەلافەت و ئەمارەت (جێنشینی و فەرمانڕەوایی)گەڕیان پێ بکاو، شەڕیان تێ بەستێ، ئەوە مسۆگەر کە خودای گەورە جەزرەبەی دەداو، لەسەر ڕوو لە ئاگری سووری دۆزەخدا دەیگەوزێنێ!).(تاج/٣ ل/٢٦٧ ز/١٠٢ ف/٢ - باسی: ئەوەی کەکێ ڕەواترین کەسە بە فەرمانڕەوایی).

**ڕاڤەو شیکرنەوە:**

بڕوانە: ژمارە: ١٤٠٠ت = ٣٥١٧ف لەدواوە. زاناکان بەتایبەت مامۆستای ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەفەرموون: (ئەم ڕەخنەیەی موعاوییە جێگەی سەرنجە، چونکە ئەوەی کە موعاوییە کردوویەتی بە بەڵگەی ڕەخنەکەی، کە گوایە جێنشینی تاپۆیە لەسەر هۆزی قوڕەیش، بەبێ بەندو مەرج نییە، بەڵکوو ئەوە بەو مەرجەیە کە قوڕەیش پابەندی ئیسلام بن، بەڵام هەرکاتێ قورەیش پابەندی ئەم مەرجە نەبوون جێنشینیش تەرخان نابێ بۆ ئەوان،

وەلەكاتی وادا دروستە كە پادشا لەهۆزی قەحطانو لەهۆزەكانی تریش هەڵبكەوێ. مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: ئێستا وای لێ هاتووە لەم لایەنەوە بەدەق دەفەرموێ: (فانّ الخلافَةَ لم تزل في قريش و النَّاسُ في طاعَتِهم الى ان استخفّوا بامر الدّين فضعفَ امرهم و تلاشى الى ان لم يبقَ لهم من الخلافةِ سوى اسمها المجرّد في بعض الاقطاردونَ اكثرها).

كورت و پوخت: (ئەم بابەتە بۆ ئەم ڕۆژە تەواو گۆڕانكاری بەسەر هاتووە).

١٣٩٢– عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قال: قَالَ رَسُولُ اللّٰـهِ (صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (قُرَيْشٌ وَالانْصار وَجُهَيْنَةُ وَمُزَيْنَةُ وَاسْلَمُ وَاشْجَعُ وَغِفَارُ مَـوَالِيَ لَـيْسَ لَهُمْ مَوْلًى دُونَ اللّٰهِ وَرَسُولِهِ) (الحديث: ٣٥٠٤، طرفه في: ٣٥١٢)[١٥٦].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هۆزی قوڕەیش و كۆمەڵەی ئەنصارەكانم و هۆزی جوهەینەو هۆزی موزەینەو هۆزی ئەشجەع و هۆزی غیفار، ئەمانە دۆست و یارو یاوەری منن، بێجگە لە خوداو لە پێغەمبەری خودای گەورە دۆست و یارو یاوەری تریان نییە!) (تاج/٥ ل/٢٤٠ ز/٦٧ ف/١ - باسی: پایەی هۆزەكانی غیفارو..).

١٣٩٣– عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لا يَزَالُ هَذا الامر فِي قُرَيْشٍ مَا بَقِيَ مِنْهُمْ اثْنَانِ. (الحديث: ٣٥٠١)[١٥٧].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (تا دووكەس لە هۆزی قوڕەیش بمێنێ ئەم كاروباری فەرمانڕەواییە هی خۆیانە). (تاج/٣ ل/٢٦٧ ز/١٠٢ ف/١ باسی: نامەی فەرمانڕەوایی).

---

(١٥٦) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: فضائل غفار واسلم و جهينة.. رقم: ٢٥٢٠.

(١٥٧) اخرجه مسلم في الامارة، باب: الناس تبعٌ لقريش و الخلافة في قريش..، رقم: ١٨٢٠ .

١٣٩٤- عَنْ جُبَيْرِ بْنَ مُطعِمٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: مَشَيْتُ انَا وَعُثمَانُ بْنُ عَفَّانَ الَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْنَا: اعْطيْتَ بَنِي الْمُطلِبِ مِنْ خُمْسِ خَيْبَرَ وَتَرَكْتَنَا وَنَحْنُ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ مِنْكَ فَقَالَ انَّمَا بَنُو هَاشِمٍ وَبَنُو الْمُطلِبِ شَيْءٌ وَاحِدٌ(الحديث: ٣٥٠٢، طرفاه في: ٣١٤٠، ٤٢٢٩)(١٥٨).

جوبەیری کوڕی موطعیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: من و عوسمانی کوڕی عەففان چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) عەرزیمان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی لە پێنج یەکی پێنج یەك واتە: لە خومسولخو مس بەشی بەرەبابی بەنی موطەللیب دەدەی، کەچی بەشی ئێمە نادەی، ئەمەیش لە کاتێکا کە ئێمەو ئەوان هەرسێ لامان بۆ تۆ، بۆخزمایەتی وەك یەکین و لەیەك پایەو پلەداین؟ فەرمووی (دروودی خودای لێ بێ): (ئاخر بەرەبابی بەنی موطەلیب و بەرەبابی بەنی هاشم یەك شتن، لەبەر ئەوەی کە لە سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام و لە دوا هاتنی ئیسلام، پشتی یەکتریان گرتووەو هەمیشە لە خۆشی و ناخۆشیدا وەك یەك بوون و هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی یەکتری بوون). (تاج/٨ ل/١٤١ ز/٥٩ - باسی پێشەوا).

١٣٩٥- عَنْ ابي ذرّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ سَمِعَ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ ابِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُهُ الا كَفَرَ وَمَنْ ادَّعَى قَوْمًا لَيْسَ لَهُ فِيهِمْ فَلْيَتَبَوَّا مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ) (الحديث: ٣٥٠٨، طرفه في: ٦٠٤٥)(١٥٩).

ئەبوزەڕ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو (هەرپیاوێك خۆی بکا بە کوڕی غەیری باوکی خۆی، وەسوور بشزانی کە کوڕی ئەم باوکە درۆینەیەی نییە و کوڕی کەسێکی ترە، ئەوە سپڵەیەو پێ نەزانە، وەهەرکەسێکیش بنەچەو ڕەگەزی خۆی بباتەوە

---

(١٥٨) لم يستثنهِ العسقلاني من الاحاديث المتفق عليها (خاتمة كتاب الجزية و الموادعة. ج/٦ص ٢٨٥)- المترجم.

(١٥٩) قال النووي: متفق عليه. انظر رياض الصالحين. ص٥٠٤. باب تحريم انتساب الانسان الى غير ابيه — المترجم.

سەرتیرەو هۆزا، کە بنەچەی نەچێتەوە سەر ئەوان، ئەوە باجێگەی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخا خۆش بکات) (ریاض/٤ ل/١٢٩٧ ز/٣٧٦ ف/١) بڕوانە: ژمارە: ١٥٩٣ لەم بەرگەدا کە لە دواوە دێت.

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

زاناکان دەفەرموون: تەبەننی و کردنی منالّی کەسێکی تربە منالّی خۆ حەرامەو نادروستە. بەلاّم ئێستا ئەم کارە زۆر کەس دەیکەن، بەزۆری ئەو ژن و مێردانە دەیکەن کە نەزۆکن، جالەم بارەوە دەلّێین:

١. ئەو منالّە، هەروا ئەم کردارە بەر ئەم فەرموودەیە ناکەوێ. ئەمە گەرچی کارێکی حەرامە، بەلاّم واباشە ئەگەر باوك و دایکی منالّەکە نە ناسراو بوون، باسی ئەو بێ باوك و دایکییەی خۆیی بۆ نەکرێ وەلەم لایەنەوە ئەو نهێنییە بپۆشرێ.

٢. لە ڕێگەی شیرپێدانەوە ئەو مندالّەکج بێ یاکوڕ، بکرێ بە مەحرەم و خۆیی بۆ ئەو باوك و دایکەی کە هەلّیان گرتۆتەوە.

شیر ئەم شتانەی پێ دەچەسپێ: (بڕوانە: فیقهی ئاسان/١ ل/٧١٦):

أ- نیکاحیان لە یەکتر حەرام دەبێ بۆ هەمیشە.

ب- نەظەریان بۆ یەکتری حەلاڵ دەبێ و بە بێگانە دانا نرێن.

ج- خەلّوەو سەفەرکردنیان بە یەکەوە دروستە و گفتوگۆو پێکەوە دانیشتن و ئەمانەیان دروستە وەك دوو خوێن.

د- سیلەی ڕەحم بەجێهێنان لەناویانا سوننەتە و چەندە دەتوانن یاریدەی یەکتری بدەن سوونەتە، چ یاریدەی سامانی چ هی تر، وەك دوو کەس کەخزم و کەسوکاری نزیکی یەکتری بن.

هـ- دەسنوێژیان لە یەکتر ناشکێ.

و- بەلاّم میرات و کەلەپوور لە یەکتری ناگرن.

ز- نەفەقەیان لەسەر یەکتری نییە... لەگەڵ هەندێ بڕیاری تردا بەڵام هەرچەندە لەناو خۆیانا باش بن بۆ یەکتری کەمە.

٣. حەرام هەتا حەرام جیاوازی هەیە، لەم ڕووەوە ئەم جۆرەکارانە لەزۆر ڕووەوە تەئویل و شتیوای بۆ دەکرێ وە زۆر لەکێشەکانی بەفێڵی شەرعی چارەدەکرێ.

وەك گوتمان: ئەم جۆرە کارانە نەکرێن باشترە، بەڵام ئەگەر کران و مەبەست لێیان چارەسەر کردنی کێشەیەکی دەروونی یاکۆمەلایەتی بوو، ئەوە وا باشە: (ڕێزی هەستی ئەو منالە بگیرێ، وەکارەکە لە ژێر پەردەی نهێنی بمێنێ، وەبە هۆی شیر خواردنەوە، ئەو مندالە بکرێ بە مەحرەم و خۆیی بۆ ئەو باوك و دایکە و بۆ کەس وکاریان، وەك ئەوە شیری دایکی ژنەکە. یا شیری دایکی مێردەکەی، یا شیری خوشکیان بدرێ پێی لەپێش تەمەنی دووساڵیدا وە لە پێنج جاریش کەمتری پێ نەدرێ، وا باشە لە دوولاوە شیری پێ بدرێ، حەزرەتی عائیشە شتی وای دەکرد، بۆ چەسپاندنی مەحرەمییەت: واباشە ژنەکە خۆی ناوبەناو مەمکی خۆی بخاتە سەردەمی ئەو منداڵە، جا ئەگەر منالەکە مەمکی بگرێ و بی ملچێنێ و گومانی بەهێز دروست ببێ کە منالەکە کەم یا زۆر شیری ئەو ژنە دەچێتە ناوسکی ئەویش هەر دروستە جۆرە مەحرەمییەتێکی پێ دروست دەبێ! لە لای حەزرەتی عائیشە ژنا شیربدا بە پیاوێ، یا بەژنی سەرە، مەحرەمێتی پێ دروست دەبێ و دەبن بە کوڕ و کچی شیریی ئەو ژنە، حەزرەتی عائیشە بە کچی برای خۆی دەگوت کەشیر بدا بە کەسێ، هەتا ببێ بەمەحرەم.

٤- لە فەتحولباریدا دەفەرموێ (ئەوەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پیشانی سەهلەی ژنی حوزەیفەی دا، کە شیر بدا بە سالم، کە ئەو کاتە سالم زەلام بوو، هەتا مەحرەمییەك لە بەینی سەهلەو سالم دا دروست ببێ و سالم ببێ بە کوڕی شیری حوزەیفەو سەهلەی ژنی، بناغەی ئەم داستانە لەسەر

فێڵە شەرعی دامەزراوە، کە لە بنەڕەتدا ئاوابووە: حوزەیفە سالم دەکا بە کوڕی خۆی بەمناڵی، بەڵام کاتێ سالم گەورە بوو، بوو بەپیاو، تەبەننی لە ئیسلاما حەرام کرا، وە ئەمە کێشەیەکی بۆسەهلە دروست کرد، کە زەلامێکی ناخۆیی وا لە ناودەست و پایانا، جا لەبەر رەفعی مەشەققەت پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەو فێڵە شەرعییەی نیشانی سەهلەدا، کە شیر بدا بەسالم و بیکا بە کوڕیخۆی وببێ بەمەحرەم و لە بێگانەیی دەرچی!).

هەروا دەفەرموێ: (لەم داستانی سالم و سەهلەیە داحیلە شەرع هەیە، وە ئەوەیشی واتیا: کە مرۆڤ دروستە بۆی کەسێکی تر فێری فێڵە شەرعی بکات..).

هەروا دەفەموێ: (ئیبنو رفعە دەفەرموێ: لەمەوە ئەوە وەردەگیرێ: کە دروستە مرۆڤ کارێکی حەرامی وابکا، کە لەکاتی کردنەکەی دا حەرام بێ، بەڵام ببێ بەهۆی ئەوە کا ئەوکارە لەوەودوا حەلاڵ ببێ!! فتح/٩ ص/١٥٠، کتاب النحاح، بابەتی شیرخواردن فەرموودەی ژمارە: ٥١٠٢). لەم نمونەدا: لەسەرتاوە سالم کاتێ مەمکی سەهلەی خواردووە، تەماشای کردووە، لەشی لە لەشی کەوتووە ئەم کردارانە هەموو لەپێش دا حەرام بوون، بەڵام چونکە دەبن بەهۆی ئەوە کە لەوەو دوا حەلاڵ ببن، ئەنجام دانیان ڕێگەی پێ دەدرێ.

١٣٩٦- عنْ وَاثلَةَ بْنَ الاسْقَعِ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انَّ مِنْ اعظمِ الْفِرَى انْ يَدَّعِيَ الرَّجُلُ الَى غَيْرِ ابِيهِ اوْ يُرِيَ عَيْنَهُ مَا لَمْ تَرَ اوْ يَقُولُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا لَمْ يَقُلْ(الحديث: ٣٥٠٩)[١٦٠].

واثیلەی کوڕی ئەسقەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) (هەلاتێکی فرەزلە: کەسێ خۆی بکابە کوڕی کەسێکی تر کە باوکی خۆی نەبێ، یابڵێ: لەخەو ما ئەوەم دیوە، وە لە راستیش دا هیچی نە دیبێ و

(١٦٠) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث واثلة: (من اعظم الفرى) (فتح/٧/٣٤٦ ط.ج -كتاب المناقب- الخاتمة) -المترجم.

به درۆ خەوێ هەڵبەستێ، یاقسەیێ بەدرۆ بەدەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستێ و بڵێ پێغەمبەروا دەفەرموێ پێغەمبەریش شتی وای نە گوتبێ!) تاج/ ٨ ل/١٠ ف/٨ ز/٣ - باسی: لەخەوگێرانەوەدا درۆ دروست نییە).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

١. واثیلەی کوڕی ئەسقەع، لە پێش غەزای تەبووکا موسوڵمان بووە، لەم غەزایەدا بەشداری کردووە، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرەوە ئەنجام داوە، تەنیا ئەم فەرموودەیەی هەیە لە بوخاریدا، یەکێ بوو لە دانیشتوانی صوففە دەڵێن سی ساڵ خزمەتی پێغەمبەری کردووە ماوەیێ لەبەصرە دانیشتووە لەوێ خانویەکی بووە، لە پاشا لە شام نیشتەجێ بوو، ماڵەکەی لەگوندێ بوو ناوی (البلاط) بوو، سێ فرسەخ لەدیمەشقەوە دووربوو، ئامادەی شەڕەکانی دیمەشق و حمص بوو، لە پاشا گواستیەوە بۆ بیت المقدس، لەوێ لەتەمەنی سەد ساڵیدا فەرمانی هەقی بەجێ هێنا، واثیلە دواکەسە لە هاوەڵان کەلە دیمەش مردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

٢. ئەم اسنادە لە عوالی بوخارییە، چونکە سەنەدەکەی روباعییە، سیانیان تابیعین و چوارەمیان هاوەڵی پێغەمبەرە.

١٣٩٧– عن ابن عمر (رَضيَ اللهُ عَنهُما) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ عَلَى الْمِنْبَرِ: غِفَارُ غَفَرَ اللّٰهُ لَهَا وَاسْلَمُ سَالَمَهَا اللّٰهُ وَعُصَيَّةُ عَصَتْ اللّٰهَ وَرَسُولَهُ (الحديث: ٣٥١٣)[١٦١].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هۆزی غیفار خودا لێیان خۆش بێ،هۆزی ئەسلەمیش خودا سەلامەت وخۆش و بێ وەییان کا، هۆزی عوصەییەش لە خوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی بوون!). (تاج/٥ ل/٢٤٠ ف/٣ ز/٧٦ - باسی پایەی هۆزەکانی غیفارو..).

(١٦١) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: دعاء النبيّ لغفار و اسلم ... رقم: ٢٥١٨ .

١٣٩٨– عن ابِي بَكْرَةَ عَنْ ابِيهِ انَّ الاقرَع بْنَ حَابِسٍ قَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انَّمَا بايَعَكَ سُرَّاقُ الْحَجِيجِ مِنْ اسْلَمَ وَغِفَارَ وَمُزَيْنَةَ وَاحْسِبُهُ وَجُهَيْنَةَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ارَايْتَ انْ كَانَ اسْلَمُ وَغِفَارُ وَمُزَيْنَةُ وَاحْسِبُهُ وَجُهَيْنَةُ خَيْرًا مِنْ بَنِي تَمِيمٍ وَبَنِي عَامِرٍ وَاسَدٍ وَغَطَفَانَ خَابُوا وَخَسِرُوا قَالَ نَعَمْ قَالَ وَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ انَّهُمْ لَخَيْرٌ مِنْهُمْ (الحديث: ٣٥١٥، طرفاه في: ٣٥١٦، ٦٦٣٥)[١٦٢]

ئەبوبەكرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەقرەعی كوڕی حابیس هاتە خزمەتی حەزرەت، پێی وت: كێ پەیمانی بەتۆداوە؟ مەگەر ئەو دزو جەردەو چەتانەی كە حاجیان رووت دەكەنەوە، كەلە هۆزی ئەسلەم و غیفارو موزەینە و جوهەهەینەن، بۆ جوهەینە باش لێم روون نییە، بەلام وابزانم ناوی جوهەینەیشی هێنا. پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوە پێم بلێ: ئەگەر ئەسلەم و غیفارو موزەینە، وا بزانم فەرمووشی جوهەینە، لەلای خودای گەورە چاتربن لە بەنی تەمیم و بنی عامیرو ئەسەدو غەطەفان، ئایا ئەمانە مایە پووچ و زیانەوەمەند دەرناچن؟ گوتی: با، فەرمووی: (دەسا بەوكەسە كە گیانی منی بەدەسە ئەوانە لە مانە باشترن). (تاج/٥ ل/٢٤١ ف/٥ ز/٦٧).

١٣٩٩– عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النبيّ (صلى الله عليه وسلم): اسْلَمُ وَغِفَارُ وَشَيْءٌ مِنْ مُزَيْنَةَ وَجُهَيْنَةَ اوْ قَالَ شَيْءٌ مِنْ جُهَيْنَةَ اوْ مُزَيْنَةَ خَيْرٌ عِنْدَ اللَّهِ اوْ قَالَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ اسَدٍ وَتَمِيمٍ وَهَوَازِنَ وَغَطَفَانَ (الحديث:٣٥١٦م، طرفه في: ٣٥١٥)[١٦٣].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرموی: (ئەسلەم و غیفار و هەنێ لەموزەینەو هەنێ لە جوهەینە، یافەرموی: هەنێ لە جوهەینەو هەنێ لەموزەینە باشترن لەلای خودا،

(١٦٢) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: دعاء النبيّ لغفار و اسلم ... رقم: ٢٥٢٢ .

(١٦٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: دعاء النبيّ لغفار و اسلم ... رقم: ٢٥٢١ .

یافـەرمووی: باشـترن لـە ڕۆژی قیامـەتا لـە ئەسـەدو هـەوازین و غـەطـەفـان).
(تاج/٥ ل/٢٤٢ ز/٧٦ ف/٦).

١٤٠٠- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ، يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ) (الحديث: ٣٥١٧، طرفه في: ٧١١٧)[١٦٤].

ئـەبو هرەیـرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی (قیامەت هەڵناسێ هەتا پیاوێ لـە هۆزی قـەحطان هـەڵ دەکـەوێ، مەردوم وەك گەلەڕان بە گۆچان لێ دەخـوڕێ و دەبـێ بـە پادشایان). (تـاج/١٠ ل/٢٧٩ ز/١٠٥ ف/١٠ - باسی: نیشانەی داهاتنی قیامـەت). (بـڕ: ژ:١٣٩١ = ٣٥٠٠ فتح لەم بەرگەدا، کەمێ لەمەوپێش ڕابوورد).

١٤٠١- حَدَّثَنا مُحَمَّدٌ اخْبَرَنَا مَخْلَدُ بْنُ يَزِيدَ اخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ اخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ انَّهُ سَمِعَ جَابِرًا (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) يَقُولُ غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ ثَابَ مَعَهُ نَاسٌ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ حَتَّى كَثُرُوا وَكَانَ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلٌ لَعَّابٌ فَكَسَعَ انْصَارِيًّا فَغَضِبَ الانْصَارِيُّ غَضَبا شَدِيدًا حَتَّى تَدَاعَوْا وَقَالَ الانْصَارِيُّ: يَا لَلانْصار وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ فَخَرَجَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ مَا بَالُ دَعْوَى اهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ؟ ثُمَّ قَالَ: مَا شَانُهُمْ؟ فَاخْبِرَ بِكَسْعَةِ الْمُهَاجِرِيِّ الانْصَارِيَ قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): دَعُوهَا فَانَّهَا خَبِيثَةٌ. وَقَالَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ ابَيِّ ابْنُ سَلُولَ: اقَدْ تَدَاعَوْا عَلَيْنَا لَئِنْ رَجَعْنَا الَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الاعَزُّ مِنْهَا الاذَلَّ فَقَالَ عُمَرُ: الا نَقْتُلُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ هَذا الْخَبِيثَ؟ لِعَبْدِ اللّٰهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ انَّهُ كَانَ يَقْتُلُ اصْحَابَهُ (الحديث: ٣٥١٨، طرفاه في: ٤٩٠٥، ٤٩٠٧)[١٦٥].

---

(١٦٤) اخرجه مسلم في الفتن و اشراط الساعة، باب: لاتقوم الساعة حتى يمرَ الرجل... رقم: ٢٩١٠ .

(١٦٥) اخرجه مسلم في البرَ و الصلة و الاداب، باب: نصر الاخ ظالما او .... رقم: ٢٥٨٤ .

**جابیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا** (دروودی خودای لێ بێ) **چووین بۆ غەزای مریسیع، کە پێشی دەگوترێ: غەزای بەنی موستەلیق، ساڵی شەشی کۆچی خەڵکێکی زۆر لەکۆچکاران لە خزمەتیدا کۆبوونەوە، پیاوێکی کۆچەری گاڵتەچی شەقێکی لە پیاوێکی ئەنصاری هەڵدا، ئەنصارییەکە زۆر تووڕە بوو، تەنانەت هاواریان لێ هەڵساو، هەرکەسەی هاواری لە دەستەی خۆی کرد، کەبچن بەهاوارییەوە، ئەنصارییەکە گوتی: ئەی ئەنصارینە فریام کەون، موهاجیرییەکەش گوتی: ئەی کۆچکارینە! فریام کەون.**

**پێغەمبەریش** (دروودی خودای لێ بێ) **هات بۆ ناویان و فەرمووی: (ئەم هات و هاوار و بانگەوازی سەردەمی نەفامییە چییە؟) ئەوجا فەرمووی: (ئەوە چییانە بۆ وا دەکەن؟) عەرزیان کرد: کە ئەمە لەسەر ئەوەیە کە ئەو پیاوە کۆچکارە بە گاڵتە وەشەقێکی لەو یاریدەدەرە (لەو ئەنصارییە)هەڵ داوە.**

**پێغەمبەریش** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (واز لەم جۆرە هات و هاوارە شەڕەنگێزە بهێنن، چونکە بەڕاستی کارێکی پیسە) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیەی کوڕی سەلوولیش گوتی: ئای ئەوە گەلە کۆمەکێمان لێ دەکەن، کاتێ گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، لەوێ لە ئێمە و لە دەستەی موحەممەد، کێمان بەدەست و بەدەستەلات و ئازاتربێ، شاری مەدینە بەدەستەکوونی و بێ دەستە لاتەکەی ترمانی چۆڵ دەکەین!**

**جا ئیمامی عومەر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ ئەم کابرا پیسە دەغەز لە دڵە نەکوژین، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول. پێغەمبەریش فەرمووی: (نەو، شتی وامەکەن، مە بادا خەڵك بڵێن: موحەممەد دەستی کردووە بە کوشتنی هاوڕێکانی خۆشی!) (ریاض/٣ ل/١١٢٠ ف/٤ ز/٢٥٦ - باسی سوورەتی موونافیقون) + (بڕ: ژ :٦٠٩ = ل/٢٩ = بەرگی/٢).**

# داستانی خوزاعه

١٤٠٢- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ(رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ عَمْرُو: بْنُ لُحَيٍّ بْنِ قَمَعَةَ بْنِ خِنْدِفَ ابُو خُزَاعَةَ (الحديث: ٣٥٢٠)[١٦٦].

**ئەبوهورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (عەمری کوڕی لوحەیی کوڕی قەمەعەی کوڕی خیندەف باوکی هۆزی خوزاعەیە).**

١٤٠٢م- وعنهُ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): رَايْتُ عَمْرَو بْنَ عَامِرِ بْنِ لُحَيّ الْخُزَاعِيَ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ وَكَانَ اوَّلَ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ (الحديث: ٣٥٢١، طرفه في: ٤٦٢٣)[١٦٧].

**دیسان ئەو فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: عەمری کوڕی عامیری کوڕی لوحەیی خوزاعیم لەناو ئاگری دۆزەخدا دی، حاڵی زۆر شڕبوو، ریخۆڵەی خۆی بەناو ئاگرەکەدا بەکێش دەکرد، چونکەئەو یەکەم کەسێ بوو کە ئاژەڵی سائیبەی داهێنا). (تاج/٦ ل/١٤٥ ز/٦ - سوورەتی مائیدە ف/٢٣).**

# داستانی موسوڵمان بوونی ئەبوزەڕ ﵁ و داستانی زەمزەم

١٤٠٣- عنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ قَالَ ابُو ذرّ: كُنْتُ رَجُلا مِنْ غِفَارٍ فَبَلَغَنَا انَّ رَجُلا قَدْ خَرَجَ بِمَكَّةَ يَزْعُمُ انَّهُ نَبِيٌّ فَقُلْتُ لاخِي انْطَلِقْ الَى هَذا الرَّجُلِ كَلِّمْهُ وَاتِنِي بِخَبَرِهِ، فَانْطَلَقَ فَلَقِيَهُ ثمَّ رَجَعَ فَقُلْتُ: مَا عِنْدَكَ؟ فَقَالَ: وَاللّٰهِ لَقَدْ رَايْتُ رَجُلا يَامُرُ بالْخَيْرِ وَيَنْهَى عَنْ الشَّرِّ فَقُلْتُ لَهُ: لَمْ تَشفِنِي مِنْ الْخَبَرِ

---

(١٦٦) والحديث من افراده (عيني/١٦ص٩٠) -المترجم.

(١٦٧) اخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمها و اهلها، باب: النار يدخلها الجبارون.. رقم: ٢٨٥٦ .

فَاخَذتُ جِرَابا وَعَصًا ثمَّ اقْبَلْتُ الَى مَكَّةَ فَجعَلْتُ لا اعْرِفُهُ وَاكْرَهُ انْ اسْالَ عَنْهُ وَاشْرَبُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ وَاكُونُ فِي الْمَسْجِدِ قَالَ فَمَرَّ بِي عَلِيٌّ فَقَالَ كَانَّ الرَّجُلَ غَرِيبٌ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: فَانْطَلِقْ الَى الْمَنْزِلِ، قَالَ: فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ لا يَسْالُنِي عَنْ شَيْءٍ وَلا اخْبِرُهُ فَلَمَّا اصْبَحْتُ غَدَوْتُ الَى الْمَسْجِدِ لاسْالَ عَنْهُ وَلَيْسَ احَدٌ يُخْبِرُنِي عَنْهُ بِشَيْءٍ.

قَالَ فَمَرَّ بِي عَلِيٌّ فَقَالَ: امَا نَالَ لِلرَّجُلِ يَعْرِفُ مَنْزِلَهُ بَعْدُ قَالَ: قُلْتُ: لا قَالَ: انْطَلِقْ مَعِي قَالَ: فَقَالَ: مَا امْرُكَ وَمَا اقْدَمَكَ هَذهِ الْبَلْدَةَ؟ قَالَ: قُلْتُ لَهُ: انْ كَتَمْتَ عَلَيَ اخْبَرْتُكَ قَالَ: فَانِّي افْعَلُ قَالَ: قُلْتُ لَهُ: بَلَغَنَا انَّهُ قَدْ خَرَجَ هَا هُنَا رَجُلٌ يَزْعُمُ انَّهُ نَبِيٌّ فَارْسَلْتُ اخِي لِيُكَلِّمَهُ فَرَجَعَ وَلَمْ يَشْفِنِي مِنْ الْخَبَرِ فَارَدْتُ انْ الْقَاهُ فَقَالَ لَهُ: امَا انَّكَ قَدْ رَشَدْتَ هَذا وَجْهِي الَيْهِ فَاتَّبِعْنِي ادْخُلْ حَيْث ادْخُلُ فَانِّي انْ رَايْتُ احَدًا اخَافُهُ عَلَيْكَ قُمْتُ الَى الْحَائِط كَانِّي اصْلِحُ نَعْلِي وَامْض انْتَ فَمَضى وَمَضَيْتُ مَعَهُ حَتَّى دَخَلَ وَدَخَلْتُ مَعَهُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقُلْتُ لَهُ: اعْرِضْ عَلَيَ الاسلامَ فَعَرَضَهُ فَاسْلَمْتُ مَكَانِي فَقَالَ لِي: (يَا ابا ذرّ اكْتُمْ هَذا الامر وَارْجِعْ الَى بَلَدِكَ فَاذا بَلَغَكَ ظهُورُنَا فَاقْبِلْ) فَقُلْتُ: وَالَّذي بَعَثكَ بالْحَقِّ لاصْرُخَنَّ بِهَا بَيْنَ اظهُرِهِمْ فَجَاءَ الَى الْمَسْجِدِ وَقُرَيْشٌ فِيهِ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ انِّي اشْهَدُ انْ لا الَهَ الا اللَّهُ وَاشْهَدُ انَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَقَالُوا: قُومُوا الَى هَذا الصَّابِئِ فَقَامُوا فَضرِبْتُ لامُوتَ فَادْرَكَنِي الْعَباسُ فَاكَبَّ عَلَيَ ثم اقْبَلَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ: وَيْلَكُمْ تَقْتُلُونَ رَجُلا مِنْ غِفَارَ وَمَتْجَرُكُمْ وَمَمَرُّكُمْ عَلَى غِفَارَ فَاقْلَعُوا عَنِّي فَلَمَّا انْ اصْبَحْتُ الْغَدَ رَجَعْتُ فَقُلْتُ: مِثلَ مَا قُلْتُ بالامْسِ فَقَالُوا: قُومُوا الَى هَذا الصَّابِئِ فَصُنِعَ بِي مِثلَ مَا صُنِعَ بالامْسِ وَادْرَكَنِي الْعَباسُ فَاكَبَّ عَلَيَ وَقَالَ مِثلَ مَقَالَتِهِ بالامْسِ قَالَ فَكَانَ هَذا اوَّلَ اسْلامِ ابِي ذرّ رَحِمَهُ اللَّهُ (الحديث:٣٥٢٢، طرفه في: ٣٨٦١)[١٦٨].

(١٦٨) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل ابي ذر (رمزى خوداى لى بى)، رقم: ٢٤٧٤

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەبوزەڕ فەرمووی: پیاوێ بووم لە هۆزی غیفار، کاتێ بەرگوێم کەوت پیاوێ لەشاری مەککە پەیدابووە، خۆی بەپێغەمبەر دەزانێ، بە ئونەیسی برامم گوت: سوار بە بچۆ بۆ ئەم دۆڵی مەککەیە، دەنگوباسی ئەم پیاوەم بۆ بزانە، قسەی لەگەڵ بکەو دوایی هەواڵی ئەوم بۆ بهێنەرەوە، ئەویش چوو، بە خزمەتی پێغەمبەر دەگا، دوایی هاتەوە، پێم گوت: هاچیت واپێ؟ گوتی: بەخوا ئەو پیاوەم دی، فەرمان دەکا بەچاکەو نەهی دەکا لە خراپە؟ جورەقسەیێی دەکا لە شیعرو هۆنراوە ناچێ؟ منیش پێیم گوت: بەدمردی منت نەخوارد لەبابەت ئەم هەواڵەوە، ئینجا خۆی توێشوو دەکاو کوندەیێی ئاو وهەمانەیێی خوراك و داردەستا هەڵ دەگرێ فەرمووی: ئەوجا چووم بۆ مەککە لەوێ چوومە مزگەوت و لەوێ گەڕام بۆ پێغەمبەر، بەلام لەبەر ئەوەی کە خۆم نەمدەناسی و حەزیشم نەدەکرد لە کەسێ تر بپرسم نەیم دۆزیەوە، لەوێ مامەوە تاشەوداهات لە ئاوی زەمزەمم دەخواردەوەو، لەناو مزگەوتا مامەوە، جا ڕاکشام، عەلی بینمی و زانی کەمن پیاوێکی نامۆم، پێی فەرمووم: ئەرێ تۆ وادەردەکەوێ پیاوێکی نا بەڵەدی و خەڵکی ئەم شارەنیت؟ گوتم: بەڵێ وایە،جا عەلی خولکی کردم و منیش شوێنی کەوتم و چووینەوە بۆ ماڵەوە، ئەوشەوە نە ئەو پرسیاری لەمن کرد و نەمن پرسیارم لەو کرد، کە ڕۆژ بووە کوندەو هەمانەکەو داردەستە کەمم هەلگرت و چوومەوە بۆ مزگەوت، ئەو ڕۆژەیش تا ئێوارە مامەوە پێغەمبەرم نەبینی، کە شەو داهاتەوە، چوومەوە لە شوێنەکەی دوێ شەوا پاڵکەوتمەوەو عەلی هاتەوە بۆ لام و فەرمووی: ئەوە چییە، هێشتا ئەم پیاوە ماڵی خانەخوێکەی خۆی نا ناسێتەوە، منیش گوتم: نەو، فەرمووی: جا لەگەڵێ چووم و فەرمووی: ئەرێ پێم ناڵێیت بۆچی هاتوویت؟ عەرزیم کرد: ئەگەر نهێنیم بپۆشی پێت دەڵێم، ئەویش فەرمووی: وا دەکەم.

پێم گوت: بیستوومانە کەپیاوێ لێرە پەیدا بووە خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ: برایەکی خۆم نارد بۆ سۆراخی ئەم هەواڵە، بەڵام کەهاتەوە دڵم بەقسەکانی تەواو ئاوی نەخواردەوە، لەبەر ئەوە خۆم هاتووم بەدەم ئەم هەواڵەوە عەلیش پێی فەرمووم: بەڕاستی رابەری کراوی، کەوایە بەیانەکی لەشوێن منەوە وەرە، ئەگەر شتێکی وام بینی کە مەترسی بۆ تۆ هەبوو، ئەوە لەپاڵ دیوارێکا دەوەستم، گوایە پێڵاوەکانم چاك دەکەم، تۆش بڕۆو دوور بەدوور چاوەڕوانم بکە، ئیتر ئەو لەپێشمەوە ڕۆیشت و منیش شوێنی کەوتم، تاچووینە ژوورێ لەماڵێ بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەوێ گوێم لە فەرمایشتەکانی گرت و عەرزیم کرد: ئیسلامم بۆبەیان بفەرموو، ئەویش بۆی ڕوونکردمەوە، ئیتر هەر لەوێدا موسڵمان بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پێی فەرمووم: (ئەی ئەبوزەر! باکارەکە بەنهێنی بێ، بچۆرەوە بۆ ولاتی خۆت، هەرکاتێ کە ژنەوتت کەوا ئێمە سەرکەوتووین ئەو کاتە وەرەوە!).

منیش عەرزیم کرد: سوێندم بەو کەسە کەتۆی کردووە بەپێغەمبەری ڕاست و دروست و ڕەوانەی کردووی بۆسەر ئەو خەڵکە، بەهەموو هێزی خۆم ئەم بانگەوازی ئیسلامە بەئاشکرا پەخشەوە دەکەم بەناویاندا، جا ئەبوزەر دەچێ بۆ مزگەوت و پیاوانی هۆزی قورەیش لەوێ کۆبوون، لەوێ بەدەنگی بەرز دەڵێ: ئەی گەلی قورەیش! شایەتی دەدەم کە بێجگە لەخودا هیچ خودایەکیتر نییە، وە هەروا شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە. ئەوانیش دەڵێن: ئادەی هەڵسن بۆ ئەم لەئایین وەرگەڕاوە، جابتپەرستەکان بۆی هەڵدەسن و دەچنە وێزەی و تێروپڕی دەکوتن و شل کوتی مەرگی دەکەن. تاعەبباس دەچێ و خۆی دەدا بەسەریا و دەڵێ: خانەخراپینە! ئەدی خۆتان نازانن کە ئەمە غیفارییە، ئیتر چۆن دەیکوژن، وەلحاڵ بازرگانی و ڕێگەی هاموشۆتان بۆشام بەسەر ئەم هۆزەدا دێو دەچێ، ئەوانیش وازی لێ دێنن.

بۆبەیانیش ئەبوزەر هەمان شت دووبارە دەکاتەوە، ئەوانیش دیسانەوە وەك رۆژی پێشوویان لێکردەوە، دیسان عەبباس خۆی دەداتەوە بەسەریداو لەدەستیان رزگاری دەکاو هەمان قسەی رۆژی پێشووی دووبارە دەکاتەوە. ئەبوزەر فەرموی: (ئەمە سەرەتای چۆنێتی موسڵمان بوونی ئەبوزەڕبوو) (تاج/٥ ل/٢٠٤ ف/١ ز/٥٩).

## باسی بنەچەو نەسەب

١٤٠٤- عَنْ ابْنِ عَباسٍ(رَضيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ ﴿وَانْذرْ عَشِيرَتَكَ الاقْرَبِينَ﴾ جَعَلَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يدعوهم قبائلَ قبائلَ يُنَادِي يَا بَنِي فِهْرٍ يَا بَنِي عَدِيّ بِبُطونِ قُرَيْشٍ (الحديث:٣٥٢٥، اطرافه في:١٣٩٤، ٣٥٢٦، ٤٧٧٠، ٤٨٠١، ٤٩٧١، ٤٩٧٢، ٤٩٧٣)[١٦٩]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئایەتی: ﴿وَانذر عشيرتك الاقربين﴾ هاتەخوارەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەستی کرد بە بانگەوازکردنی هۆزەکان، هۆزبەهۆز، بانگەوازی دەکرد: ئەی نەوەی فیهر! ئەی نەوەی عەدی!) هۆز بەهۆز و تیرە بەتیرە بانگی خێڵ و بەرەبابەکانی قورەیشی دەکرد).

١٤٠٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (اسْتَاذنَ حَسَّانُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي هِجَاءِ الْمُشْرِكِينَ قَالَ: كَيْفَ بِنَسَبِي فَقَالَ حَسَّانُ لاسُلَّنَّكَ مِنْهُمْ كَمَا تُسَلُّ الشَّعَرَةُ مِنْ الْعَجِينِ) (الحديث: ٣٥٣١)[١٧٠]

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەسانی کوڕی ثابیت (رەزای خودای لێ بێ) داوای لەپێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) کرد کەڕێگەی پێ بدا بەشیعرو هەڵبەست بتپەرستەکان دابشۆرێ و بەهەجو شڕیان بکا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ)

---

(١٦٩) لم يوافقه مسلم على حديث ابن عباس في قول ابي لهب (فتح/٣ص ٢٦٠ –خاتمة الجنائز)-المترجم.

(١٧٠) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل حسان، رقم: ٢٤٨٧، ٢٤٨٩ .

فەرمووی: (ئاخر شتی وا چۆن دەكرێ، چونكە ڕەچەڵەكی منیش لەوانەیە؟!) حەسان فەرمووی: (بۆ ئەوە خەمت نەبێ وەك چۆن تەڵەموو بەئاسانی لەهەویر دەردەكێشرێ ئاوا ڕەگەزو ڕەچەڵەكی تۆیان لێ جیادەكەمەوەو شتێ نەنگ و شوورەیی بێ بۆ بنەچەو بەرەبابی تۆ نایڵێم).

## ناوەكانی پێغەمبەر ﷺ

١٤٠٦- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطعِمٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لِي خَمْسَةُ اسْمَاءٍ: انَا مُحَمَّدٌ وَاحْمَدُ وَانَا الْمَاحِي الَّذي يَمْحُو اللّٰهُ بِي الْكُفْرَ وَانَا الْحَاشِرُ الَّذي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي وَانَا الْعَاقِبُ) (الحديث: ٣٥٣٢، طرفه في: ٤٨٩٦)(١٧١).

جوبەیری كوری موطعیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (من پێنج ناوی تایبەتیم هەیە: من ناوم محمدە، وە ناوم ئەحمەدە، وە ناوم قەلاچۆكارە، واتە: ئەو كەسەم كە خودا بەهۆی منەوەو كوفرو بێ باوەڕیی قەلاچۆ دەكاو قڕی تێ دەخا، وەمن ناوم كۆكەرەوەیە، واتە: ئەو كەسەم كە هەموو نەوەی ئادەم كۆ دەكرێنەوەو بە شوێنما دێن و دەچین بۆ دەشتی مەحشەرو گرد دەبینەوە لە دەشتی كۆبوونەوە، من ناوم پاشەبەرەیە، واتە: دواهەمین پێغەمبەرم). (تاج/٤ ل/٢٥٣ ف/٤ ز/٨٢ - باسی لە دایكبوونی پێغەمبەرو..).

١٤٠٧- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الا تَعْجَبُونَ كَيْفَ يَصْرِفُ اللّٰهُ عَنِّي شَتْمَ قُرَيْشٍ وَلَعْنَهُمْ يَشْتِمُونَ مُذَمَّمًا وَيَلْعَنُونَ مُذَمَّمًا وَانَا مُحَمَّدٌ (الحديث: ٣٥٣٣)(١٧٢).

---

(١٧١) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: في اسماءه ﷺ، رقم: ٢٣٥٤.

(١٧٢) لم يوافقه مسلم على حديث (الا تعجبون كيف يصرف الله عني شتم قريش) (فتح/٧ص٣٤٦ ط.ج) -المترجم.

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خودای لـێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(درروودی خودای لـێ بێ) فـەرمووی: (ئـەوە سـەیرتان نایـە لـەوە: کەچـۆن خـودا جمـین و نـەفرەتی قورەیش لەمن لادەدا، ئەوان ئەوەندە رقیان لەمنە دڵیان بەرایی نـادا، بـەناوی خۆمـەوە، کـە موحەممـەدە نـاوم بێـنن چونکە موحەممـەد بـەمانا پەسـەندو سوپاسـکراوە، بـەڵکو ناوەکـەم دەکـەن بـە مـوذەممـەم، پێچەوانەی ناوەکـەی خـۆم، ئـەوجا لـەکاتی نـەفرەت و جمـین دا ئـاوا دەڵـێن: خـوا وا لە موذەممـەم بکـا، ئـەوە لـە مـوذەممـەم بکـا، دەی مـن نـاوم مـوذەممـەم نییە، من ناوم موحەممەدە، کەواتە: جمین و نەفرەتەکەیان بەرمن ناکەوێ).

## باسی خاتەمی پێغەمبەران

١٤٠٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَثَلِي وَمَثَلُ الانْبِيَاءِ كَرَجُلٍ بَنَى دَارًا فَاكْمَلَهَا وَاحْسَنَهَا الا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ فَجَعَلَ النَّاسُ يَدْخُلُونَهَا وَيَتَعَجَّبُونَ وَيَقُولُونَ لَوْلا مَوْضِعُ اللَّبِنَةِ (الحديث: ٣٥٣٤)[١٧٣].

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا (رەزای خودایـان لـێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (داستانی من و داستانی پێغەمبەرەکانی پـێش مـن، وەك داستانی پیاوێ وایـە، خانووبـەرمێی هـەڵبخاو، لـە هـەموو لایەنێکـەوە زۆر بـە جوانی دروستی بکاو، بەباشی بیرازێنێتـەوە، تـەنیا شـوێنی تاقـە یـەك خـشت نـەبێ، کـە لـە گۆشـەیەکا چـۆڵ بـێ، دەسـتە دەسـتە خـەڵك بـە نـاوی دا بـسووڕێنەوەو بڵـێن: چـەندە جوانـە! خۆزگـە ئـەم خـشتەیش دادەنـراوم شوێنەکەی ئـاوا چۆڵ نـەدەبوو). فـەرمووی (دەی مـن ئـەو خـشتەیەم و ئـەو چۆڵی یـەم پـڕ کردۆتـەوەو، بـووم بـە دواتـرین پێغەمبـەر، ئیتر لـە پاش مـن

(١٧٣) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: ذكر كونه ﷺ خاتم النبيين، رقم: ٢٢٨٧.

پێغەمبەری ترنابێ!). (تاج/٤ ل/٢٤٧ ز/٨١ ف/٥) بڕوانە: ژمارە ١٤٠٩ کە لەپاش ئەم ژمارەیەوە دێت.

١٤٠٩-عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ انَّ مَثَلِي وَمَثَلَ الانْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا فَاحْسَنَهُ وَاجْمَلَهُ الاِمَوْضعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ فَجَعَلَ النَّاسُ يَطوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ لَهُ وَيَقُولُونَ: هَلا وُضعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ؟ قَالَ: فَانَا اللَّبِنَةُ وَانَا خَاتِمُ النَّبِيِّينَ (الحديث: ٣٥٣٥)[١٧٤].

بڕوانە: ژمارە: ١٤٠٨ لەوێدا واتاکەی ڕابووورد.

١٤١٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثلاث وَسِتِّينَ) (الحديث:٣٥٣٦،طرفه في:٤٤٦٦)[١٧٥].

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) کاتێ وەفاتی کرد تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو.

١٤١١- الْجُعَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ رَايْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ ابْنَ ارْبَعٍ وَتِسْعِينَ جَلْدًا مُعْتَدِلا فَقَالَ: قَدْ عَلِمْتُ مَا مُتِّعْتُ بِهِ سَمْعِي وَبَصَرِي الا بِدُعَاءِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انَّ خَالَتِي ذهَبَتْ بِي الَيْهِ فَقَالَتْ: ( يَا رَسُولَ اللّٰهِ انَّ ابْنَ اخْتِي شَاكٍ فَادْعُ اللّٰهَ لَهُ قَالَ: فَدَعَا لِي (الحديث:٣٥٤٠، طرفه في: ١٤١ت = ١٩٠ ف = بەرگی یەکەم، لاپەڕە/١٦٢)[١٧٦].

جوعەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: سائیبی کوڕی یەزیدم دی (ڕەزای خودای لێ بێ) تەمەنی نەوەدو چوار ساڵ بوو، هێشتا بەهێز و بەخۆوە بوو، باڵای ڕێك بوو نەچەمابووە، خۆی فەرمووی: زۆر باش دەزانم کە بۆ چی هەتا ئێستاش تەندروستیم باشە، بە تایبەتی تەندروستی چاو وگوێم، کە بە باشی دەبینم و دەبیستم، ئەم بەهرەیە بەهۆی نزای

---

(١٧٤) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: ذكر كونه ﷺ خاتم النبيين، رقم: ٢٢٨٦.

(١٧٥) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: كم سن النبيَ ﷺ.. رقم: ٢٣٤٩ .

(١٧٦) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: اثبات خاتم النبوة وصفته ومحله، رقم: ٢٣٤٥ .

پێغەمبەروەیە، (درروودی خودای لێ بێ) پوورم بردمی بۆ خزمەتی، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم کوڕەی خوشکەزام نەخۆشە نزای بۆ بکە. فەرمووی: پێغەمبەریش نزای بۆکردم.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

عەطای کوڕی سائیب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پێشە سەری سائیب لە کۆتایی تەمەنیشیدا هەر ڕەشبوو، سپی نەبوو بوو، بە بەرەکەتی ئەوەکە لە کاتی نزا بۆ کردنەکەدا، پێغەمبەر (درروودی خودای لێ بێ) دەستی هێنا بوو بە پێشە سەریدا.

## چۆنێتیی شێوەی پێغەمبەر ﷺ

١٤١٢- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِث (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ صَلَّى ابُو بَكْرٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) الْعَصْرَ ثمَّ خَرَجَ يَمْشِي فَرَاى الْحَسَنَ يَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ فَحَمَلَهُ عَلَى عَاتِقِهِ وَقَالَ بابِي شَبِيهٌ بالنَّبِيِّ لا شَبِيهٌ بِعَلِيٍّ وَعَلِيٌّ يَضحَكُ) (الحديث: ٣٥٤٢، طرفه في: ٣٥٤٣)(١٧٧).

عوقبەی کوڕی حاریث (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو بەکرم دی لە پاش وەفاتی پێغەمبەر (درروودی خودای لێ بێ) بەچەن شەوەێ، نوێژی عەصری بۆکردین، لە پاشا لەمزگەوت دەرچوو، حەسەنی کوڕی عەلی بینی، لەگەڵ منالانا یاری دەکرد، خستیە سەر قەلاندۆشکانی و فەرمووی: باوکم بە قوربانی بێ، شێوەی کوتومت لە شێوەی پێغەمبەر دەچێ، شێوەی کەمتر لە عەلی دەکا، عەلیش گوێی لێ بوو، بۆ پشتگیری قسەکەی ئەو پێ دەکەنی). (تاج/٥ل/٢١٦ ف/٧ ز/٢٠ - باسی گەورەیی حەسەن..).

---

(١٧٧) لم يوافقه مسلم على اخراج حديث ابي بكر (بابي شبيه بالنبيّ) (فتح/٧ص ٣٤٦ ط.ج) (المترجم).

١٤١٣- عـنْ ابَـي جُحَيْفَـةَ (رَضـيَ اللهُ عنـهُ) قَـالَ: (رَايْـتُ النَّبِـيَ (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيّ عَلَيْهِمَا السَّلام يُشْبِهُهُ قُلْـتُ لابِـي جُحَيْفَـةَ صِفْهُ لِي قَالَ: كَانَ ابْيَض قَدْ شَمِط وَامَرَ لَنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) بِـثلاث عَشْرَةَ قَلُوصًا قَالَ فَقُبِض النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ انْ نَقْبِضهَا). (الحديث: ٣٥٤٤، طرفه في: ٣٥٤٣)[١٧٨]

ئەبو جوحەيفـە (رەزای خودای لـێ بێ) فـەرمووی: بەچاوی خـۆم پێغەمبـەرم دیوە، حەسەنی کوڕی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) شێوەی تەواو لە پێغەمبەر دەچێ.

ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید فەرمووی: عەرزی ئەبو جوحەیفەم کرد: ئادەی بفەرموو چۆنی و شێوەی پێغەمبەرم پێ بفەرموو، فەرمووی: پیاوێکی سوور و سپی بوو، سەری بۆز بوو بـوون پێغەمبـەر (درוودی خودای لـێ بێ) فـەرمانی کرد کە سیازدە وشترە مێچکەمان پـێ بـدرێ، بـەڵام پـێش ئـەوەی کـە وەریـان بگرین، پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) مـرد).

١٤١٤- عن عَبْدِ اللَّهِ بْنَ بُسْرٍ صَاحِبَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) قِيـلَ لَهُ: ارَايْتَ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ شَيْخًا؟ قَالَ كَانَ فِي عَنْفَقَتِـهِ شَـعَرَاتٌ بِيض (الحديث: ٣٥٤٦)[١٧٩].

عـەرزی عەبـدوڵلای کـوڕی بوسـر (رەزای خودای لـێ بێ) کـرا: تـۆ پێغەمبـەرت دیـوە، ئایـا پـیر بـوو بـوو؟ فـەرمووی: چـەند موویـەکی سـپی بەچـالایی چەناگەیەوە هەبوو).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیەش لە فـەرمووده سیانیەکانی بـو خاریـیە، بڕوانـە: (ژمارە/٨٨٨و٩٠ ت = ١٩٢٩، ١٠٩ فتح).

---

(١٧٨) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: شَيْبُهُ ﷺ، رقم: ٢٣٤٣ .

(١٧٩) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: شَيْبُهُ ﷺ ، رقم: ٢٣٤٢ .

٢- ئەم فەرموودەیە لە ئەفرادی بوخاریيە، واتە: لەو فەرموودانەیە کە هەرئیمامی بوخاری گێڕاویەتەوە، ئیمامی موسلیم نەیگێڕاوەتەوە.

٣- مامۆستای مەزن عیصامی کوڕی خالید (رەحمەتی خودای لێ بێ) کەناو دارە بە ئەبوئیسحاقی حمصی حزرەمەوتی، لە گەورە مامۆسایانی شێخی بوخاریە، لە صەحیحا هەر ئەم فەرموودەیەی هەیە، لە ئەفرادی بوخارییە، لە مۆقەددیمەی شەرحی صەحیحی موسلیمی ئیمامی نەوەویدا، دەفەرموێ: (ژمارەی ئەو مامۆستایانەی کە پێشەوا بوخاری، لە صەحیحی بوخاریدا، فەرموودەی لێیانەوە گێڕاوەتەوە، بەلاّم پێشەوا موسلیم لە صەحیحی موسلیم دا فەرموودەی لێیانەوە نەگێڕاوەتەوە، ژمارەیان چوارسەدو سیی و چوار مامۆستان، ژمارەی ئەوانەیش کە پێشەوا موسلیم لە صەحیحی موسلیم دا گێڕانەوەی لێیانەوە ئەنجام داوەو بوخاری گێڕانەوەی لەوانەوەنییە لە صەحیحی بوخاریدا، شەش سەدوبیستو پێنج مامۆستان. کۆمەڵەی یەکەم پێیان دەگوترێ: مامۆستایانی ئەفرادی بوخاری، کۆمەڵەی دووەمیش پێیان دەگوترێ: ئەفرادی موسلیم).

٤- هەندێ دەفەرموون: ژمارەی ئەو مووە سپییانەی کە بەخاڵی چەناگەی پێغەمبەروە بوو (١٧)حەڤدەموو بووە.

٥- عەبدوڵلای کوڕی بوسر (رەزای خودای لێ بێ) لە بوخاریدایەك فەرموودەی هەیە، کە ئەم فەرموودەیەیە، لە شام، هەندێ دەفەرموون: لە حیمص لەتەمەنی نەوەدو چوار ساڵی دا، لە ساڵی هەشتاو هەشتی کۆچی دا مردووە، خۆی و باوکی و دایکی و عەگیهی برای و صەممای برای صەحابی بوون، دەفەرموێ: جارێ باوکم بە دایکمی فەرموو: خۆزەگە نانێکت بۆ پێغەمبەر دروست دەکرد، ئەویش صەمما کەرەو خورمای بۆ دروست کرد، نۆشی کرد. ئیمامی موسلیمیش (رەزای خودای لێ بێ) گێڕانەوەی لە عەبدوڵلاوە هەیە.

١٤١٥- عنْ انس بْنَ مَالِكٍ يَصِفُ النَّبِيَ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ كَانَ رَبْعَةً مِنْ الْقَوْمِ لَيْسَ بالطويلِ وَلا بالْقَصِيرِ ازهَرَ اللّوْن لَيْسَ بابْيَض امْهَقَ وَلا ادَمَ لَيْسَ بِجَعْدٍ قَطط وَلا سَبْط رَجِلٍ انْزِلَ عَلَيْهِ وَهُوَ ابْنُ ارْبَعِينَ فَلَبِث بِمَكّةَ عَشْرَ سِنِينَ

يُنْزَلُ عَلَيْهِ وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ وَقُبِضَ وَلَيْسَ فِي رَاسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعَرَةً بَيْضاء (الحديث: ٣٥٤٧، طرفاه في: ٣٥٤٨، ٥٩٠٠)[١٨٠].

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لێ بێ) پیاوێکی دەستە پیاوی مام ناوەندی بوو، نەزۆر درێژو نە زۆر کورت بوو، ڕەنگی سپی وسوور بوو، بەڵام سپییەکی سادەی بێ تام نا، گەنم ڕەنگ و سەوزەیش نەبوو، قژە سەریشی نەلوولێکی کرژ بوو، وەنەخاوێکی تەواو خاویش بوو، کاتێ سرووش (وەحی)ی بۆهات تەمەنی چل ساڵ بوو، دەساڵ لەمەککە مایەوە، لەو ماوەیەدا سرووشی بۆ دەهات، وەلە مەدینەیش دە ساڵی تر مایەوە لەوێش هەروەها، وەکاتێ کە گیانی پاکی سپارد هەموی بیست مووی سپی لەسەرو ریشیا نەبوو. (تاج/٤ ل/٢٥٤ ف/١ ز/٨٣).

١٤١٥م- عَنْ انَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ بالطويلِ الْبائِنِ وَلا بالْقَصِيرِ وَلا بالابْيَض الامْهَقِ وَلَيْسَ بالادَمِ وَلَيْس بالْجَعْدِ الْقَطط وَلا بالسَّبْط بَعَثَهُ اللّٰهُ عَلَى رَاسِ ارْبَعِينَ سَنَةً فَاقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ وَبالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ فَتَوَفَّاهُ اللّٰهُ وَلَيْسَ فِي رَاسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضاء (الحديث: ٣٥٤٨، طرفه في: ٣٥٤٧).

١٤١٦- عنْ الْبَرَاء (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) احْسَنَ النَّاسِ وَجْهًا وَاحْسَنَهُ خَلْقًا لَيْسَ بالطويلِ الْبائِنِ وَلا بالْقَصِيرِ (الحديث: ٣٥٤٩)[١٨١].

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: روخساری پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لەهەموو کەسێ جوانتربوو، ڕەوشت و ڕەفتاریشی بۆجوانی و شیرنی وێنەی نەبوو، بالای کەڵەگەت بوو، بەڵام قووچێکی بێ تام نەبوو، هەروەها کورتە بالاش نەبوو).(تاج/٤ ل/٢٥٥ ز/٨٣).

---

(١٨٠) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: في صفة النبي ﷺ ومبعثه و سنه ، رقم: ٢٣٤٧ .

(١٨١) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: : في صفة النبيﷺ .. رقم: ٢٣٣٧ .

١٤١٧- عنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انّه سئل: هَلْ خَضبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: لا انَّمَا كَانَ شَيْءٌ فِي صُدْغَيْهِ(الحديث: ٣٥٥٠، طرفاه في: ٥٨٩٤، ٥٨٩٥)[(١٨٢)]. (رياض/٢ ل/١٦٤ ذ/٦٢١).

لەپێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) کەدە ساڵ نۆکەریی پێغەمبەری کردووە پرسیار کرا: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەوەندە پیربووبوو هەتا سەروریشی خۆی بۆیە بکات؟ فەرمووی: نەء، چونکە بە ئاستەم کەمێ مووی سپی کەوتبۆ هەر دو لاجانگەکانی) بۆ زانیاری تەواو سەبارەت بەمووی پێغەمبەر بڕوانە (تاج/٤ ل/٢٥٨ ز/٨٤ - باسی: مووی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەروا: تاج/٤ ل/١٤٢ ز/٤٤ .

**ڕوونکردنەوە:**

جێگەی داخە لە تاجول ئەصوڵەکەدا، ئاماژەی لاپەڕەو زنجیرەی فەرمووده دووبارەکان تەواو تەواو شێواون، لەکاتی چاپدا وەك دەسخەتەکە نەقڵیان کردووە، هەستیان بەوە نەکردووە، کە لاپەڕە و بەرك و زنجیرەی چاپەکە بە پێی باری چاپەکە دەگۆڕی جالێرە ئەم دوو خاڵەتان عەرز دەکەم، کە هەرکەسێ مەبەستی بێبەیەکێ لەم دووشێوەیە ئاماژەو هێما هەڵەکان ڕاست دەکاتەوە:

١- لە دەقە عەرەبییەکەدا فەرموو دەکە بدۆزێتەوە.

٢- بەو شێوەیەی کە لە بەرگی هەشتەمی تاج دا، لەلاپەڕە: (١٤٣)دا ڕوونکراوەتەوە.

١٤١٨- عَنْ الْبَرَاء بْنِ عَازِبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَرْبُوعًا بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ لَهُ شَعَرٌ يَبْلُغُ شَحْمَةَ اذنِهِ رَايْتُهُ فِي حُلَّةٍ

(١٨٢) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: شيبهُ ﷺ ، رقم: ٢٣٤١ .

حَمْرَاء لَمْ ارَ شَيْئًا قَط احْسَنَ مِنْهُ (الحديث: ٣٥٥١، طرفاه في: ٥٨٤٨، ٥٩٠١)[١٨٣].

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پیاوێكی دەستە بوو، نەقووچێكی ناقولاو نەكورتە بنەیەكی بێ تام بوو، ناو شانی پان بوو، جاری وا دەبوو قژە سەری دەیدا لە نەرمەی هەر دوو گوێی، جارێ دیم دەستێ جلی سووری لە بەردا بوو، كەسم نە دیوە كە ئاوا جوان بێ !). (تاج/٤ ل/١١٣ ف/٦ ز/٣٣ - باسی: ڕەنگی جلو بەرگ) + (تاج/٤ ل/٢٥٥ ف/٢ ز/٨٣).

١٤١٨م– وعنهُ (رَضيَ اللهُ عنهُ) في رواية: انّه قيل لَهُ: اكَانَ وَجْهُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِثلَ السَّيْفِ قَالَ لا بَلْ مِثلَ الْقَمَرِ(الحديث: ٣٥٥٢)[١٨٤].

پرسیار كرا لە بەراو: ئایا دەموچاوی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) وەك شمشێر ئاوا درێژو جوان و بریقەدار بوو؟ فەرمووی: بگرە لەوەش گەلێ جوانتر بوو، وەك مانگی چواردە ئاوا پان و جوان و خڕو روناك و گەش بوو. تاج/٤ ل/٢٥٥ ف/٤ ز/٨٣).

١٤١٩– عن ابي جُحَيْفَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بالْهَاجِرَةِ الَى الْبَطحَاء فَتَوَضا ثمَّ صَلَّى الظهْرَ رَكْعَتَيْنِ وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ قَالَ شُعْبَةُ وَزَادَ فِيهِ عَوْنٌ عَنْ ابِيهِ ابي جُحَيْفَةَ قَالَ كَانَ يَمُرُّ مِنْ وَرَائِهَا الْمَرْاةُ وَقَامَ النَّاسُ فَجَعَلُوا يَاخُذونَ يَدَيْهِ فَيَمْسَحُونَ بِهَا وُجُوهَهُمْ قَالَ فَاخَذتُ بِيَدِهِ فَوَضعْتُهَا عَلَى وَجْهِي فَاذا هِيَ ابْرَدُ مِنْ الثلْجِ وَاطيَبُ رَائِحَةً مِنْ الْمِسْكِ (الحديث:

---

(١٨٣) اخرجه مسلم في الفضائل عن ابي موسى و بندار (عيني/١٦ص١٠٧) (صم/١٥ ص/٩١ –كتاب الفضائل، باب: صفة شعره ﷺ -المترجم .

(١٨٤) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث البراء: (كان وجه رسول الله ﷺ مثل القمر) (فتح/٧ص٣٤٦ط .ج = فتح /٦ص ٦٣٥ -المترجم .

٣٥٥٣، طرفه في: ١٤٠ت = ١٨٧ف = بةرطى يةكةم لاثةرة:١٦١) + (بـةرطى يةكةم: لاثةرة ٣٠٨ فةرموودةى (٢٩٧ت= ٤٩٥ ف)[١٨٥] .

ئـەبو جوحەيفـە (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: قرچـەی نیـوەڕۆ بـوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەرچوو بۆ بەطحاء، کە پادەشـتێکی لماوییـە، لـەوێ دەسنوێژی گـرت و نوێژی نیوەڕۆی کـرد، خەڵکەکـەیش هەڵـسان دەسـتەکانی پێغەمبەریان دەگرت و بۆ پیرۆزی و موو فەڕکی دەیانسوین لـە ڕووی خۆیـان، هـەروا لـە ئـاوە چـۆڕی دسـنوێژەکەی و لەبـەر مـاوەی ئـاوی دەسـنوێژەکەی. منیش دەستیم هەلگرت و هێنام بەدەموچاوی خۆمـا، تەماشـام کـرد: دەسـتی لە بەفر فێنك تـرو بـۆنی لـەبۆنی میسك خۆشـتربوو!). (تـاج/٤ ل/٢٥٩ ز/٨٥ - باسی: بۆنی پێغەمبەر زۆر خۆش بوو).

١٤٢٠- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰـهِ (صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ بُعِثتُ مِنْ خَيْرِ قُرُونِ بَنِي ادَمَ قَرْنًا فَقَرْنًا حَتَّى كُنْـتُ مِـنْ الْقَـرْنِ الَّـذي كُنْتُ فِيهِ. (الحديث: ٣٥٥٧)[١٨٦] .

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بێ) فەرمووی: (چەرخ بە چەرخ و پشت بە پشت بە پاکی و باشی و حـەلاڵزادەیی هاتوو مەتە خوارەوە، باو وبـاپیرم لـە هـەموو سـەردەمێکا لـە باشـترین چینـی ئادەمیزادی ئەو سەردەمە بوون، تـا گەیـشتوومەتە ئـەم چـەرخەی خـۆم، کـە خودا ڕەوانەی کردووم و کردوومی بـە پێغەمبـەر سلاو و درروودو ڕەحمـەت و سـۆزی خـودای گـەورەی لـە سـەربێ). (تـاج/٤ ل/٢٥٤ ز/٨١ - باسـی: نامـەی پێغەمبەرایتی...)

---

(١٨٥) اخرجه مسلم في الصلاة ، باب سترة المصلي ، رقم: ٥٠٣ .

(١٨٦) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي هريرة : (بعثت من خير قـرون بـني ادم )(فتح/٦ص٣٤٦) —خاتمة كتاب المناقب -المترجم .

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

سەبارەت بە پاکی و پیرۆزی و حەلاڵ زادەیی بنەچەو ڕەچەڵەك و ڕەگەزو سەرجەلەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرموودەی زۆر هەیە وەك ئەم فەرموودەیە، بەیهەقی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە ئیبنو عەباسەوە (رەزای خودایان لێ بێ) دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: (ماولدنی من سفاح الجاهلیه شیئ، وما ولدنی الا نكاح الاسلام) لە هیچ کاتێکا، هەتا لە سەردەمی نەفامیدا، باو باپیران و دایك و نەنکانی من، لە نوتفەی حەرام لە دایك نەبوون، هەمیشە پشتاو پشت، سەرجە لەو رشتەی بنەچەی من حەلاڵ زادە بوون و بە پێی یاسانامەی خودا حەلاڵ و هاوسەری یەکتری بوون) ئەبو نەعیمیش دیسان لەوەوە بە بەرزەوە کراوی دەگێڕێتەوە: (لَم یلتقِ ابوای قط علی سفاحٍ، لَم یزلِ اللهُ ینقلُنی من الاصلابِ الطیبة الی الارحام الطاهرة مصفّیً مهذبا، لاتشعّب شعبتان الا کنتُ فی خیرهما) (بڕوانە: رفع الخفا شرح ذات الشفا – تالیف ابن الحاج الالاني الكردی ج/١ ص/٦٨).

١٤٢١– عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَسْدِلُ شَعَرَهُ وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُءوسَهُمْ فَكَانَ اهْلُ الْكِتَابِ يَسْدِلُونَ رُءوسَهُمْ وَكَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحِبُّ مُوافَقَةَ اهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ بِشَيْءٍ ثمَّ فَرَقَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَاسَهُ) (الحديث: ٣٥٥٨، طرفاه في: ٣٩٤٤، ٥٩١٧)[١٨٧] .

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ هەرشتێ کە خودا فەرمانی پێ نەکردبایە کە چۆنی بکا، حەزی دەکرد کە موافەقەی خاوەن نامەکان بکا، خاوەن نامەکانیش دەستووریان وابوو، قژی خۆیانیان بە دەوری سەریاندا شۆڕ دەکردەوە، بەڵام هاوبەشپەیدا کەرەکان

(١٨٧) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: في سدل النبيﷺ شعر راسه .. رقم: ٢٣٣٦ .

(مشركەكان) دەستووریان وابوو قژی خۆیانیان لە ناوەڕاستی سەریان دا دەكرد بە دوو بە شەوەو لایان دەدا بەم لاو بەولای سەریاندا، جا لە پێش دا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر دەستووری خاوەن نامەكان پێشە سەری خۆی شۆڕ دەكردەوە بەبێ لەت كردن، بەڵام لە دوایی‌دا قژی خۆی دەكرد بە دوو لەتەوەو لای دەدا بەم لاو بەو لای سەریدا). (تاج/٤ل- ١٤٠ف- ٣ز- ٤٣).

١٤٢٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاحِشًا وَلا مُتَفَحِّشًا وَكَانَ يَقُولُ انَّ مِنْ خِيَارِكُمْ احْسَنَكُمْ اخْلاقًا. (الحديث: ٣٥٥٩، اطرافه في: ٣٧٥٩، ٦٠٢٩، ٦٠٣٥)[١٨٨]

عەبدوڵلای كوڕی عەمر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەرزەو هەرزە گۆنەبوو، دەشی فەرموو: (لە هەرە باشەكانی ئێوەن ئەو كەسانەتان كە ڕەفتاریان بەرزەو ڕەوشیتان زۆر جوان‌و شیرینە). (تاج/٤ ل/٢٧٦ ف/١ ز/٩٠ - باسی: ڕەفتارە شیرینەكانی پێغەمبەر) + (ریاض/٢ ل/١٦٦ ژ/٦٢٥ - باسی: رەوشت جوانی..)

١٤٢٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) انَّهَا قَالَتْ: (مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ امْرَيْنِ الا اخَذَ ايْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ اثْمًا فَانْ كَانَ اثْمًا كَانَ ابْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِنَفْسِهِ الا انْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ فَيَنْتَقِمَ لِلَّهِ بِهَا). (الحديث: ٣٥٦٠، اطرافه في: ٦١٢٦، ٦٧٨٦، ٦٨٥٣)[١٨٩].

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەركاتێ خۆی بكرایە بەسەرپشك لەنێوانی دووكارا، كە یەكێكیان لەوی تریان ئاسانتر بوایە، هەمیشە ئاسانە كەیانی هەڵدەبژاردو ئەوەی دەكرد بەمەرجێ ئەو كارە گوناە نەبوایە، ئەگینا لە هەموو كەسا زیاتر لێی دوور دەكەوتەوە.

---

(١٨٨) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: كثرة حيائه ﷺ رقم: ٢٣٢١ .

(١٨٩) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: مباعدته ﷺ للاثام .. رقم: ٢٣٢٧ .

هەرگیزیش پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەق و تۆڵە سەندنێ، کە پەیوەندی تایبەتی بەخودی خۆیەوە هەبوایە نەیدەسەندو کابرای دەبەخشی، مەگەر کەسێ قەدرو ڕێزی شەریعەتی خودای گەورەو مەزنی بشکاندبایە، ئەوە تۆڵەی ئەوەی لێ دەسەند) (ریاض/٢ ل/١٧٦) (تاج/٤ ل/٢٧٥ ز/٩٠ ف/١٦ - باسی ڕەفتارە شیرینەکانی پێغەمبەر..).

١٤٢٤- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ مَا مَسِسْتُ حَرِيرًا وَلا دِيباجًا الْيَنَ مِنْ كَفِّ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلا شَمِمْتُ رِيحًا قَط اوْ عَرْفًا قَط اطيَبَ مِنْ رِيحِ اوْ عَرْفِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث: ٣٣٥٦١، طرفه في: ٥٦٩ت=١٤١١ف)[١٩٠].

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرگیز و هەرگیز دەستم لە هیچ شتێ نەداوەن نە ئاوریشم و نەدیباج، نەشتی تر، کەوەك دەستو جەستەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئاوا نەرم و شل ناسك نازدار بێ، هەرگیزیش بۆنی خۆشی هیچ شتێکی ترم نەکردووە کەوەك بۆنی پێغەمبەر ئاوا خۆش بێ، تەنانەت بۆنی پێغەمبەر لە بۆنی عەنبەرو میسکیش خۆشتربوو). (تاج/٤ ل/٢٥٩ ز/٨٥ ف/١).

١٤٢٥- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اشَدَّ حَيَاء مِنْ الْعَذرَاء فِي خِدْرِهَا (الحديث: ٣٥٦٢، طرفاه في: ٦١٠٢، ٦١١٩)[١٩١].

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ شەرم و شکۆ لەگەورە کچی ناوپەردە بەشەرمو شکۆتربوو، ئەگەر حەزی لە شتێ نەبوایە بە رویا دەمانزانی کە حەزی لەو شتە نییە).

١٤٢٥- وفي رواية: وَاذا كَرِهَ شَيْئًا عُرِفَ فِي وَجْهِهِ[١٩٢].

---

(١٩٠) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: طيب رائحة النبيﷺ ولين مسه .. رقم: ٢٣٣٠ .

(١٩١) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: كثرة حيائهﷺ رقم: ٢٣٢٠

واتاكەی لەژمارەی پێشودا رابوورد (بڕوانە تاج/٤ ل/٢٦٧ ز/٩٠ ف/١).

١٤٢٦- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ)قَالَ: مَا عَابَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طعَامًا قَط انْ اشْتَهَاهُ اكَلَهُ وَالا تَرَكَهُ. (الحديث: ٣٥٦٣، طرفه في: ٥٤٠٩)[193].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) هەرگیز خراپەی لە خواردن و نان و ئاو نەدەگرت، ئەگەر حەزی لێی بوایە دەیخوارد، ئەگەر بەدڵیشی نەبوایە - وازی لێ دەهێناو بەس و نەنگ و ڕەخنەی لێنەدەگرت) (ریاض/٢ ل/٢٥٣ ز/١٠١ ژ/٧٣٦).

١٤٢٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُحَدِّث حَدِيثا لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لاحْصَاهُ (الحديث: ٣٥٦٧، طرفه في:٣٥٦٨)[194].

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) وا بە شێنەیی‌و لەسەر خۆ بەروونی و ڕەوانی فەرمایشتی دەفەرموو، ئەگەر کەسێ بیویستایە قسەکانی بژمێرێ، بە ئاسانی وشە وشە دەیژەماردن) (تاج/٤ ل/٢٦١ ز/٨٦ ف/٢).

١٤٢٧م- وعنْهَا قَالَتْ: انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَكُنْ يَسْرُدُ الْحَدِيث كَسَرْدِكُمْ (الحديث:٣٥٦٨، طرفه في: ٣٥٦٧).

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لە قسە کردنا، وەك ئێوە بە پەلە نەبوو) (تاج/٤ ل/٢٦١ ز/٨٦).

١٤٢٨- عنْ انَسِ بْنَ مَالِكٍ يُحَدِّث عَنْ لَيْلَةِ اسْرِيَ بالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ مَسْجِدِ الْكَعْبَةِ جَاءهُ ثلاثةُ نَفَرٍ قَبْلَ انْ يُوحَى الَيْهِ وَهُوَ نَائِمٌ فِي مَسْجِدِ

---

(١٩٢) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: كثرة حيائه ﷺ صم/١٥ص٧٨ -المترجم .

(١٩٣) اخرجه مسلم في الاشربة، باب: لايعيب الطعام، رقم: ٢٠٦٤ .

(١٩٤) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل ابي هريرة الدوسي .. رقم: ٢٤٩٣ .

الْحَرَامِ فَقَالَ اوَّلُهُمْ: ايُّهُمْ هُوَ؟ فَقَالَ اوْسَطُهُمْ: هُوَ خَيْرُهُمْ وَقَالَ اخِرُهُمْ: خُذوا خَيْرَهُمْ فَكَانَتْ تِلْكَ، فَلَمْ يَرَهُمْ حَتَّى جَاءوا لَيْلَةً اخْرَى فِيمَا يَرَى قَلْبُهُ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَائِمَةٌ عَيْنَاهُ وَلا يَنَامُ قَلْبُهُ وَكَذلِكَ الانْبِيَاء تَنَامُ اعْيُنُهُمْ وَلا تَنَامُ قُلُوبُهُمْ فَتَوَلاهُ جِبْرِيلُ ثُمَّ عَرَجَ بِهِ الَى السَّمَاء. (الحديث: ٣٥٧٠، اطرافه في: ٤٩٦٤، ٥٦١٠، ٦٥٨١، ٧٥١٧)[١٩٥].

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) باسی ئەو شەوەی دەگێڕایەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەمەسجیدو لحەرامەوە دەبرێ بۆ شەو ڕەوی و ئیسرا، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لە ناو مەسجیدول حەرام دا خەوتبوو، لە نێوانی حەمزەی مامی و جەعفەری ئامۆزای دا دەبێ، ئاگای لە ئیسراو میعراج نابی، چونکە هێشتا لەم بارەیەوە سرووشی بۆ نەهاتبوو، لەو شەوەدا سێ فریشتە دێنە دیاری، یەکە میان دەفەرموێ: ئەم سیانە کامەیان خۆیەتی، واتە: کامەیان موحەممەدە؟ ناوونجیەکەیان دەفەرموێ: باشەکەیان خۆیەتی، ئەوی تریشیان دەفەموێ: دەی باشەکەیان ببەن بۆ میعراج بۆ ئاسمان. ئیتر ئەو شەوە هەر ئەوەندە ڕوودەداو هیچی ترنابێ، بەس ئەم گوفتو گۆیە ڕوودەداو هیچی تر. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەوکاتەدا بەدڵ وریادەبێ‌و بەچاو دەخەوێ، وە دڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەمیشە وریا بووە، قەت دڵی خەوی لێ نەدەکەوت، چونکە پێغەمبەران هەموویان هەروان: بەچاو دەخەون بەلاّم بەدڵ وریان! ئیتر ئەم جاری دواییە، جوبرائیل خۆی سەر پەرشتی گەشتەکە دەکاو، پێغەمبەر بەڕابەریی ئەو دەچێ بۆ ئاسمان و دەیبا بۆ میعراج). (تاج/٤ ل/٢٦٤ ز/٨٨ ف/١ - باسی: نووستنی پێغەمبەر).

(١٩٥) اخرجه مسلم في الايمان . باب: الاسراء برسول الله ﷺ الى السموات .. رقم: ١٦٢ .

# نيشانەكانی پێغەمبەرایەتی

١٤٢٩- عَنْ انَسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ اتِيَ النَّبِيُّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بانَاء وَهُوَ بالزَّوْرَاء فَوَضعَ يَدَهُ فِي الانَاء فَجَعَلَ الْمَاء يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ اصَابِعِهِ فَتَوَضا الْقَوْمُ قيلَ لانَسٍ: كَمْ كُنْتُمْ؟ قَالَ: ثلاث مِائَةٍ اوْ زُهَاء ثلاث مِائَةٍ. (الحديث: ٣٥٧٢، طرفه في: (١٣٠ت=١٦٩ف، بەرگی یەكەم لاپەڕە: ١٥٤)[١٩٦].

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) خۆی و هاوڕێكانی لەزەوراء بوون، كە شوێنێك بوو لە ناو بازاڕی مەدینەدا، حاجەتێكیان بۆی هێنا، دەستی تێ خست، ئیتر خۆش خۆش ئاو لە نێوانی پەنجەكانیەوە، وەك كانی، لەسەر شێوەی موعجیزە هەڵ دەقولا، ئیتر پیاوەكان هەموویان دەسنوێژیان لەو ئاوە گرت، قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم بە ئەنەس: ئێوە چەن كەس دەبوون كە دەسنوێژتان گرت لەو ئاوە؟ فەرمووی: سا سەد كەس بووین. یا فەرمووی: پێم وابوو دەوری سا سەد كەس دەبووین).
(تاج/٤ ل/٣٣٣ ز/١٠٤ ف/١ - باسی موعجیزەكانی پێغەمبەر).

١٤٣٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ: كُنَّا نَعُدُّ الايَاتِ بَرَكَةً وَانْتُمْ تَعُدُّونَهَا تَخْوِيفًا كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ فَقَلَّ الْمَاء فَقَالَ اطْلُبُوا فَضلَةً مِنْ مَاء فَجَاءوا بانَاء فِيهِ مَاء قَلِيلٌ فَادْخَلَ يَدَهُ فِي الانَاء ثمَّ قَالَ حَيَ عَلَى الطهُورِ الْمُبارَكِ وَالْبَرَكَةُ مِنْ اللّٰهِ فَلَقَدْ رَايْتُ الْمَاء يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ اصَابِعِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَقَدْ كُنَّا نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطعَامِ وَهُوَ يُؤْكَلُ. (الحديث: ٣٥٧٩)[١٩٧].

---

(١٩٦) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: فضائل النبيَ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) (عيني /١٦ص١١٨) -المترجم .

(١٩٧) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن مسعود : (كنا نعدُ الايات بركة) فتح/٧ص٣٤٦ ط. ج -خاتمة كتاب المناقب)- المترجم .

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە جاران بەسەرینێی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) ڕوودانی نیشانەو عەلامات و خەواریقمان بە پیتو فەڕ دادەنا، کەچی ئێوە شتی وا بە هەڕەشەو گوڕەشە دا دەنێن، جارێ لەسەفەرێکا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین، ئاو هاتە کەمی فەرمووی (درودی خودای لێ بێ) (چۆڕێ ئاو پەیداکەن، جا حاجەتێکیان هێنا کەمێ ئاوی تیا بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دەستی کرد بە ناو حاجەتەکەداو، فەرمووی: (فەرموون وەرن بۆسەر ئەم ئاوە پاکە فەڕدارە، پیتو فەڕو پیرۆزیش لەسەر خودا) ئیتر بە چاوی خۆم دیم کە ئاوەکە لە نێوانی پەنجەکانیەوە هەڵدەقولا!! ئیتر جەماوەرەکە دەستیان کردبە ئاو بردن و دەسنوێژ گرتن لێی‌و هەرکەسەیان بەشی پێویستی خۆی ئاوی برد. وەگەڵ جار گوێمان لەخواردەمەنی دەبوو، لەکاتی دانانی لە خزمەتی پێغەمبەردا، بۆخواردن، بە زمانی حاڵ و بەزمانی گوتن، تەسبیحاتی خودای دەکرد، وەك ئەوە بە شێوەیەکی ڕەوان و ئاشکراو بیستراو دەیگوت: سبحان الله وبحمده: پاکی و پیرۆزی هەر بۆ خودایە و هەروا سوپاس‌و ستایش). (تاج/٤ ل/٣٤٥ ز/١٠٧ ژ/١).

١٤٣١- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمْ الشَّعَرُ وَحَتَّى تُقَاتِلُوا التُّرْكَ صِغَارَ الاعْيُنِ حُمْرَ الْوُجُوهِ ذلْفَ الانُوفِ كَانَّ وُجُوهَهُمْ الْمَجَانُّ الْمُطرَقَةُ. (الحديث: ٣٥٨٧، طرفه في:١٢٠٣ت= ٢٩٢٨ف) = ١٢٠٣ تجريد البخاري = ٢٩٢٨ ژمارەی فەرموودەکە لە فەتحولباریدا.

وَتَجِدُونَ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ اشَدَّهُمْ كَرَاهِيَةً لِهَذا الامر حَتَّى يَقَعَ فِيهِ وَالنَّاسُ مَعَادِنُ خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَةِ خِيَارُهُمْ فِي الاسلامِ (الحديث: ٣٥٨٨، طرفه في: ١٣٨٩ ت = ٣٤٩٣فتح).

وَلَيَاتِيَنَّ عَلَى احَدِكُمْ زَمَانٌ لانْ يَرَانِي احَبُّ الَيْهِ مِنْ انْ يَكُونَ لَهُ مِثْلُ اهْلِهِ وَمَالِهِ (الحديث: ٣٥٨٩)[198].

فەرمودەی یەکەم لە ژمارە: ١٢٠٣دا، لە تەجریدە کە دا رابوورد بە تەواوی فەرموودەی دووەمیش لە ژمارە: (١٣٨٩ت =٣٤٩٦ ف) دا، ڕابوورد.

فەرموودەی سێیەمیش لە تاج دا ئاوایە:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (بەوکەسە کە گیانی موحەممەدی بە دەسە، کە خۆی کەسی هەموو کەسە، ئێوە دەکەونە ڕۆژگارێکی واوە، حەزدەکەن کە سەرو ماڵی خۆتان بەخت بکەن و لە باتی ئەوە یەك دەم من ببینن). (تاج/٤ ل/٢٥٢ ز/٨١ ف/١٢- باسی: گەورەیی پێغەمبەر).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

زۆرجار پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) گوفتو گۆو ئاخاوتنەکەی ئاڕاستەی هاوڕێکانی خۆی دەکا، بەڵام مەبەستی نەوەو وەچەی ئەوانە، کە لە پاش چەندین سەدەو چەرخ دێن.

جا لێرەدا ڕستەی: (ئێوە دەکەونە ڕۆژگارێکی واوە...تاد) ئەم دوو واتایە هەڵ دەگرێ:

١- هاوڕێیانی پێغەمبەر، لەپاش وەفاتی پێغەمبەر ئەم ئاواتە دەخوازن.

٢- هەموو موسوڵمانێ، لە هەموو سەردەمێکا، ئاواتی ئەوەیە کە بەسەرو ماڵ و کەسوکار، چاوپێکەوتنی حەزرەت بکرێ.

---

(١٩٨) اخرجه مسلم في الفضائل ، باب: فضل النظر اليه (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلم) وتمتيه رقم: ٢٣٦٤ ، وفي الفتن و اشراط الساعة . باب: لاتقوم الساعة حتى يمرّ الرجل بقبر الرجل ، رقم:٢٩١٢

١٤٣٢- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا خُوزًا وَكَرْمَانَ مِنْ الاعَاجِمِ حُمْرَ الْوُجُوهِ فُطسَ الانُوفِ صِغَارَ الاعْيُنِ وُجُوهُهُمْ الْمَجَانُّ الْمُطرَقَةُ نِعَالُهُمْ الشَّعَرُ) (الحديث: ٣٥٩٠، طرفه في: ٣٠٢ ١ت=٢٩٢٨ف)(١٩٩).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (قیامەت هەڵناسی هەتا کوشتاری خوزستانو ولاتی کرمان نەکەن، کە دوو ولاتن لە خاکی عەجەم، دانیشتووەکانیان دەمو چاویان سوورو لووت فسو چاو وردیلەن، ڕوویان خڕپن و گۆشتنە، ڕێك وەك قەڵغانێ بەسیرمەی ژێ، سیرمە ڕێژ کرابێو، قات لە بان قات جووت بە فێ کرابێ، پێلاویان لەمووە!). (تاج/١٠ ل/٢٥٩ ز/٩٩ ف/٢- نیشانەکانی قیامەت).

١٤٣٣- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ(رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُهْلِكُ النَّاسَ هَذا الْحَيُّ مِنْ قُرَيْشٍ قَالُوا: فَمَا تَامُرُنَا ؟ قَالَ: لَوْ انَّ النَّاسَ اعْتَزَلُوهُمْ. (الحديث:٣٦٠٤، طرفاه في:٣٦٠٥، ٧٠٥٨)(٢٠٠).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درووودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەم چینەی ئەم خەڵکە، ئەم تیرەیە لە هۆزی قوڕەیش بە فەتارەتیان دەبات!) عەرزیان کرد: جا ئەی پێغەمبەری خودا، لەم بارەیەوە فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (کاشکی ئەو خەڵکە تێکەڵی یان نەکرد نایە).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

زاناکان دەفەرموون: مەبەست لەم تیرەیە خێڵی بەنی ئومەییەیە، کە بەیەزیدی کوڕی موعاوییە دەستیان پێ کرد، لە ساڵی شەستی کۆچییەوە هەتا

(١٩٩) راجع هامش رقم: ١٢٠٣ تجريد = ٢٩٢٨ فتح = ج / ٣ ل — ٣٢٥ — المترجم .

(٢٠٠) اخرجه مسلم في الفتن و اشراط الساعة ، باب: لاتقوم الساعة حتى يمرّ الرجل بقبر الرجل .. رقم: ٢٩١٧ .

دەوری سەدو سیی کۆچی=٦٨٠ز. خەلافەتی یەزیدی کوڕی موعاوییە، هەتا (٧٤٤ز). خەلافەتی مەڕوانی دووەم ناسراو بەحیمار، واتە: گوێرێژ.

١٤٣٤- وعنهُ في روايةٍ قال: سَمِعْتُ الصَّادِقَ الْمَصْدُوقَ يَقُولُ هَلاكُ امَّتِي عَلَى يَدَيْ غِلْمَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ فَقَالَ مَرْوَانُ: غِلْمَةٌ قَالَ ابُو هُرَيْرَةَ انْ شِئْتَ انْ اسَمِّيَهُمْ بَنِي فُلانٍ وَبَنِي فُلانٍ. (الحديث: ٣٦٠٥، طرفه في: ١٤٣٣ت=٣٦٠٤ ف)[٢٠١].

دیسان فەرمووی لەگێڕانەوەیەکدا: بە گوێچەکەی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوتووە، کە خۆی راستگویەو خودایش راستی پاگوتووە، دەیفەرموو: (گەلی من بەدەستی دەستیەك دەمرووتی هەرزەکاری هەرزەو پەتەڕی لە ناو دەچن، کە لە هۆزی قورەیشن). مەڕوانی کوڕی حەکەمیش گوتی: بەلەعنەتی خودا بن چۆن هەرزە کارێکن! ئەبو هورەیرەیش فەرمووی: ئەگەر حەزدەکەی دەستە دەستە ناویان ئاشکرا دەکەم، کە لە فیسارە هۆزو لە فلانە بەرەبابن!). (بڕ: تاج/١٠ ل/٢٣٢ ژ/٢ ز/٩٠ - سەرەتای بەر پابوونی فەرتەنەکان).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

لە ڕاستیدا لەهەموو سەردەمێکا ئەمجۆرە لاوە هەرزانە هۆی سەرەکی سەر تیاچوونی هەموو نەتەوەو گەلێکن، چونکە سەرکەش و تونـد ڕەو و بێ ئەزموونن، هەموو شتێ بە خود سەری و ملهوڕی و کەڵەگایی دەکەن، قوڕ بەسەر ئەو ملەتەی جڵەوی کاری و سەرنویشتی بکەوێتە دەست ئەم دەمڕووتە هەرزەو هەرزەگۆیانە، کە عەقڵەکوێتی خۆیان ڕابەرو مامۆستایانە، سەرەنجام چەواشە دەبنو شت بە پێچەوانەوە دەبینن و هەق بە ناهەق دەزانن و، گاڵتەیان بە ئایینو ڕەوشتی بەرزو بیروباوەڕی جوانی پیشینان دێ، دەبن بە کۆیلەو گوێ لەمشتی هەوەسبازیو ئارەزوو پەرستی، جگە لە کەیفو

(٢٠١) راجع رقم: ١٤٣٣ تجريد - المترجم .

سەفاو مەیو بادەو زرەی پارەو باوەشی یارو (پێك و نێك)هیچی تر بە ژیان نازانن، وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿يعلمون ظاهرا مِنَ الحيوة الدنيا وهم عن الاخرة هم غافلون﴾ الروم - ٧/٣٠. واتە: تەنیا لەڕواڵەتی ژیانی جیهان تێدەگەنو بێ ئاگان لەژیانی باڵای دوا رۆژ.

جێگەی داخە بەچاوی سەر بەرایی ئەم چینە بێ دینە منالکارە ولات وێرانکارە، لە کوردستانی ئازیزی خۆشمان دا دەبینم، بەڵام پشت بەڕەحمەتی خودا کوردستان هەمیشە خودا دەیپارێزێ، وەهەتا نزیکی قیامەت مەڵبەندی پەخشی نووری قورئان و قەلاو لانەی مەلا و ئەهلی دین دەبێ، لەئەهلی دڵم بیستووە: کە ئیسلام لە چیاکانی کوردستان ئاوا نابێ، هەتا لەچیاکانی مەککە و مەدینە ئاوا نەبێ.

١٤٣٥- عنْ حُذيْفَةَ بْنَ الْيمَانِ يَقُولُ كَانَ النَّاسُ يَسْالُونَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ الْخيْرِ وَكُنْتُ اسْالُهُ عَنْ الشَّرِّ مَخَافَةَ انْ يُدْرِكَنِي فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ انَّا كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وَشَرٍّ فَجَاءنَا اللّٰهُ بِهَذا الْخَيْرِ فَهَلْ بَعْدَ هَذا الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: وَهَلْ بَعْدَ ذلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيْرٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَفِيهِ دَخَنٌ. قُلْتُ: وَمَا دَخَنُهُ؟ قَالَ قَوْمٌ يَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي تَعْرِفُ مِنْهُمْ وَتُنْكِرُ. قُلْتُ فَهَلْ بَعْدَ ذلِكَ الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ، قَالَ: نَعَمْ دُعَاةٌ عَلَى ابْوَابِ جَهَنَّمَ مَنْ اجَابَهُمْ الَيْهَا قَذفُوهُ فِيهَا قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ صِفْهُمْ لَنَا، قَالَ: هُمْ مِنْ جِلْدَتِنَا وَيَتَكَلَّمُونَ بالْسِنَتِنَا قُلْتُ: فَمَا تَامُرُنِي انْ ادْرَكَنِي؟ ذلِكَ قَالَ: تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَامَامَهُمْ قُلْتُ: فَانْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلا امَامٌ؟ قَالَ: فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا وَلَوْ انْ تَعض باصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَانْتَ عَلَى ذلِكَ. (الحديث:٣٦٠٦، طرفاه في: ٣٦٠٧، ٧٠٨٤). (الحديث:٣٦٠٧، طرفه في: ٣٦٠٦)[٢٠٢]

---

(٢٠٢) اخرجه مسلم في الامارة ، باب: وجوب ملازمة جماعة المسلمين عند ظهور الفتن، رقم: ١٨٤٧.

حوزەیفـەی كـوڕی یـەمان (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: مـەردوم لـە بـارەی چـاكەو خێـرەوە، لـە پێغەمبـەری خۆشەویـستیان دەپرسـی، بـەڵام مـن لـەبارەی شەڕو خراپە وە لێم دەپرسی، مـە بـادا تووشـم ببـێ. جا عـەرزیم كـرد: قوربـان! ئەی پێغەمبـەری خـودا! خـۆت دەزانـی، ئێمـە لەسـەردەمی نـەزانی دا لـە حـاڵێكی خراپدا بووین، ئێستاكەیش خـودا دەرووی خێـری لێ كردووینەتـەوەو كـەوتووین بەسـەر ئـەم خێـرو خۆشـییەدا، جـا ئایـا لـەپاش ئـەم خێـرە شـەڕی تـر دەبـێ؟ فــەرمووی: (بــەڵێ)، گــوتم: ئــەی باشــە لــە پــاش ئەوشــەڕە خێــری تــر دێ؟ فــەرمووی: (بــەڵێ)، بــەڵام لــیخن و دوو كەلاویــیە). گــوتم: قوربــان! لێكــی و تەماویەكەی چییە؟ فـەرمووی: (كۆمـەڵێ پەیـدا دەبـن، بە شێوەێی ڕابـەری ئـەو خەڵكە دەكـەن، كـە دوورە لـە رابـەری و ڕێنمـایی ئـایینی منـەوە، شـت تێكـەڵ و پێكەڵ دەكەن: كاری شـەرعی و كـاری بـی شـەرعیی یـان لی دەبینـی) گـوتم: باشـە لــە پــاش ئــەم خێــرە دوو كەلاوییــە، خراپــەی تردەبــێ؟ فــەرمووی: (بــەڵێ، كۆمـەلانێ پەیـدا دەبـن، لـە دەرگـای دۆزەخ دا وەسـتاون، پـەیتا پـەیتا و كۆمـەڵ كۆمـەڵ خـەڵك لـەڕێ دەردەكـەن و بـەرەو دەرگاكـانی دۆزەخ ڕاپێـچیان دەكـەن، هەركەسا بەگوێ یان بكا، فڕەی دەدەنە ناوی!).

عـەرزیم كـرد: قوربـان! ناونیـشانی ئەمانـەمان پـێ بفـەرموو؟! فـەرمووی: (بەناو، بەدیمەن لە خۆمانن، بەزمانی خۆمان دەدوێن) گوتم: باشـە، مـن یـا هـەر موسـوڵمانێ كەوتـە ئـەو سـەردەمە، فـەرمانت بەچییە پێـی؟ فـەرمووی: (لایـەنی كۆمـەڵی موسـوڵمانان و پێـشەوای ئـەوان بگـرە) گـوتم: ئـەی ئەگـەر نەكۆمـەڵ و نەپێشەوایان هەبوو چۆن؟ فـەرمووی: (لـە و تیپانـە لـە هـەموویان كلاو كەناربـە تەنانـەت ئەگـەر هـەر چـارەت نـەبوو، بـاوەش بكەبـە قـەدی شـێخەڵێكاو، لـە بـن دارێكا بـۆ خـۆت سـتار بگـرە، هـەتا دوور لـەوان لەسـەر ئـەو حاڵـە مـردن دەگاتـە فریات!!). (تاج/٣ ل/٢٨٠ ز/١٠٥ - بەگوێكردنی فەرمانڕەوا).

١٤٣٦ - عن عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) اذا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)حَدِيثا فَوَاللّٰهِ لانْ اخِرَّ مِنْ السَّمَاء احَبُّ الَيَ مِنْ انْ اكْذبَ عَلَيْهِ وَاذا حَدَّثْتُكُمْ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ فَانَّ الْحَرْبَ خِدْعَةٌوَانّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ سَيَخْرُجُ قَوْمٌ فِي اخِرِ الزَّمَانِ احْدَاث الاسْنَانِ سُفَهَاء الاحْلَامِ يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبرِيَةِ لا يُجَاوِزُ ايمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنْ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَةِ فَايْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ فَانَّ فِي قَتْلِهِمْ اجْرًا لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. (الحديث: ٣٦١١، اطرافه في: ٥٠٥٧، ٦٩٣٠)[٢٠٣] .

پێشەوا عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ فەرموودەی پێغەمبەرتان بۆ بگێڕمەوە، ئەوەم پێ خۆشترە کە لە ئاسمانەوە بەر ببمەوەو پەراش پەراش ببم، هەتا ئەوە خوانە خواستە درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستم، کاتێکیش باسی نێوانی خۆمان و خۆتانتان بۆ بکەم، ئەوە دیارە کە جەنگ فریودا نەو، شەڕ بە درۆ و هاشەو هووشە دەبرێتەوە، شتی وا لە کاتی وا دا ڕێگەی پێ دراوە! جا لەم ڕوانگەیەوەو لەم بیرو باوەڕەوە، پێتان ڕادەگەیەنم، کە من بەگوێی خۆم، لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە، کە دەیفەرموو: (لە ئاخر زەمانا، کۆمەڵێ پەیدا دەبن، پڕوپاگەندە بەناوی ئیسلامەوە بۆ خۆیان بلاو دەکەنەوە، وەك خەواریجەکان دەیانگوت: لاحکم الاالله، ئەمانە نیشانەیان ئەوەیە منالّ و تواڵن، هەڵەشەو پەڵەشەو هەرزە و نەفامن، بۆ قسە دانامێنن، بەقسە بێ کەس وەك ئەوان قسەی باش ناکا، قورئان دەخوێنن، دەم لە فەرموودەی پێغەمبەر دەکوتن، بەلاّم ئەمان هەربەدەم موسوڵمانن.. باوەڕیان لە گەروویان ڕەت نابێ و ئیسلام وەك خۆی لەناو دڵیانا نەچەسپیوە. وەك چۆن تیرێ کە نیشان دەسمێ، خێرا لێی دەردەچێ، ئەوانیش ئاوا بە ترە بیانوویێ، بە بەرزکردنەوەی دروشمی ڕاست و دروست بۆ مەبەستی ناڕەوا، ئەوانیش ئاوا خێرابەم جۆرە مەهانەیە لە ئایین دەردەچنو لە ئیسلام پاش

(٢٠٣) اخرجه مسلم في الزكاة ، باب: التحريض على قتل الخوارج ، رقم: ١٠٦٦ .

گەز دەبنەوە، جا لە هەر لاو لە هەر کوێ تووشی ئەوانە بوون و بەرهەویڵتان کەوتن، بوارەیان مەدەن و بیانکوژن، بە ڕاستی کەسێ یەکێ لەوانە بکوژێ لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتی گەورەی بۆهەیە). (بڕ: تاج/٣ ل/٢٣٠ ز/٨٨ - حوکمی وەرگەڕاو لە دین و وئاژاوەگێڕو..) + (تاج/٥ ل/٢٨٨ ف/٩ ز/٧٨).

**ڕاڤەو شیکرنەوە:**

ئەم جۆرە چینو تاقمانە، چین و تاقمەیەکی تایبەتی نین، وەلە زۆر کات و سەردەم دا سەریان هەڵ داوەو سەرهەڵ دەدەن، بەڵام دیاری کردنی ئەمانەو کوشتنیان هەروا کارێکی ئاسان نییە، لەبەر ئەوە بۆ ئێمە مانان دەست لێ نەدانیان باشترە نابێلەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا، ڕەشە خەڵك شتێوا ئەنجام بدەن و خەڵك بکوژن و ئەم جۆرە فەرموودانە بکەن بەمەهانە و بیانوو، مەبەست لەم جۆرە فەرمانانەو جێبەجێکردنیان نەتەوەی ئیسلامو قازیو موفتیو کاربەدەستانە نەك ڕەشە خەڵك و تاك تاکی خەڵك.

١٤٣٧- عَنْ خَبابِ بْنِ الارَتِّ قَالَ: شَكَوْنَا الَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً لَهُ فِي ظلِّ الْكَعْبَةِ فَقُلْنَا لهُ: الا تَسْتَنْصِرُ لَنَا الا تَدْعُو الله لَنَا: فَقَالَ: كَانَ الرَّجُلُ فيمن قَبْلَكُمْ يُحْفَرُ لَهُ فِي الارْض فَيُجْعَلُ فِيهَا فَيُجَاء بالْمِنْشَارِ فَيُوضعُ عَلَى رَاسِهِ فيشقّ باثنين، وما يصدّهُ ذلك عن دينهِ وَيُمْشَط بامْشَاط الْحَدِيدِ مَا دُونَ لَحْمِهِ ومن عظمٍ او عصب فَمَا يَصُدُّهُ ذلِكَ عَنْ دِينِهِ وَاللّٰهِ لَيَتِمَّنَّ هَذا الامر حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاء الَى حَضرَمَوْتَ لا يَخَافُ الا اللّٰهَ وَالذئْبَ عَلَى غَنَمِهِ وَلَكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ (الحديث: ٣٦١٢، طرفاه في: ٣٨٥٢، ٦٩٤٣)(٢٠٤).

خەبابی کوڕی ئەڕەتت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسێبەری کەعبەدا، لەسەر عاباکەی خۆی شانی دادابو، سکالامان لە

(٢٠٤) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث خباب : (الا تستنصرُ لنا) (فتح/٧ص٣٤٦ ط.ج) - المترجم .

خزمەتیا کرد و عەرزمان کرد: قوربان! بۆ داوای کۆمەکی و سەرکەوتنمان بۆ ناکەی، بۆ لەخودا نا پاڕێیتەوە بۆمان! فەرمووی: (لەنەتەوەکانی پێش ئێوە پیاوی خواناسی وا هەبوو، چاڵیان لە زەویدا بۆی هەڵ دەکەن و تێیان دەخست و ئینجا مشاریان دەهێناو لەسەرتەوقی سەریدایان دەناو بەمشار دوو لەتیان دەکردو بەشەقە مشار شەقیان دەکرد، هێشتا بەوەش وازی لە ئایینی خۆی نەدەهێنا، وە خاوەن باوەڕی قایمی وەهابوو بە کەڵکیت و شانەی ئاسنین ڕنەیان دەکردو دەیان دا لە شانەو ڕنەو، پۆستو ڕەگو ڕیشە و ئێسکو پروسکیان هەنجن هەنجن دەکرد، هێشتا بەوەیش دەستی لە ئایینی خۆی هەڵ نەدەگرت، کەچی ئێوە بە پەلەن لەکارەکە، دەسا بە خودا، خودا ئەم ئایینی ئیسلامە بە ئەنجام دەگەیەنێو سەری دەخا، تەنانەت لە سێبەری ئیسلام دا ئەمن و ئاسایش و ا پەرەدەسێنێ و ڕەگو ڕیشە دا دەکوتێ و، دنیا وا ئەمین و هێمن دەبێتەوە، سوار بە تەنها خۆی لە صەنعاوە بەتەنیا سوارە دەڕوا بۆ حەزرەمەوت، لە خودا نەبێ لە کەسی تر ناترسێ، مەگەر ترسی گورگی هەبێ کە بنێتە ڕانەکەی! وەلی وا دیارە کە ئێوە لە ئیشەکە بەپەلەن). (تاج/٤ ل/٣٦٤ ز/١١٢ ف/٢- موعجیزەکانی پێغەمبەر).

١٤٣٨ – عَنْ انَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) افْتَقَدَ ثابِتَ بْنَ قَيْسٍ فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ انا اعْلَمُ لَكَ عِلْمَهُ فَاتَاهُ فَوَجَدَهُ جَالِسًا فِي بَيْتِهِ مُنَكِّسًا رَاسَهُ، فَقَالَ: مَا شَانُكَ؟ فَقَالَ: شَرٌّ. كَانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَدْ حَبِط عَمَلُهُ وَهُوَ مِنْ اهْلِ النار فَاتَى الرَّجُلُ فَاخْبَرَهُ انَّهُ قَالَ كَذا وَكَذا فَرَجَعَ الْمَرَّةَ الاخِرَةَ بِبِشَارَةٍ عَظيمَةٍ فَقَالَ اذهَبْ الَيْهِ فَقُلْ لَهُ انَّكَ لَسْتَ مِنْ اهْلِ النَّارِ وَلَكِنْ مِنْ اهْلِ الْجَنَّةِ. (الحديث:٣٦١٣، طرفه في: ٤٨٤٦)[(٢٠٥)].

---

(٢٠٥) اخرجه مسلم في الايمانو باب: مخافة المؤمن ان يحبط عملهُ(صحيح مسلم/٢ص١٣٣ بشرح النووي) - المترجم .

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پرسیاری لە حاڵی سابیتی کوڕی قەیس کردو لە هەواڵی ئەوی پرسی پیاوێ کەسەعدی کوڕی موعاز بوو فەرمووی: قوربان! هەرئێستە من هەواڵی ئەوت بۆ دەزانم، جارۆیشت بەشوێنیدا تەماشای کرد وا لە ماڵەوە کزو مات سەری داخستووە و دانیشتووە، سەعد پێی دەڵێ: ئەی سابیت! ئەوە چیتە بۆ وادەکەی؟ دەڵێ: خراپم لێ قەوماوە، هەرچی کردەوەی باشم هەیە هەموویم بە فیرۆ داناوە، بۆخۆم بووم بە دۆزەخی، بێ وێڵیم لە خزمەت حەزرەتدا کردووەو پاداشی باشم بەزایە چووە، چونکە من پیاوێکی دەنگ گەورەمو کە لە خزمەتی حەزرەتدا قسەدەکەم، دەنگم لە دەنگی ئەوبەرزترە خودایش فەرموویەتی: ﴿لاترفعوا اصواتكم فوق صوت النبى﴾ دەنگتان سەر دەنگی پێغەمبەر نەکەوێ. ئەوە لەبەر ئەوەیە کە وامات و دامام! جا سەعد هاتەوە بۆ خزمەتی حەزرەت و داستانەکەی قەیسی بۆێگێرایەوە. حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی سەعد! بچۆرەوە بۆ لای سابیت و موژدەی بدەرێ: کە تۆ دۆزەخی نیت، بەڵکو بە پێچەوانەوە تۆ بەهەشتیت!). (تاج/٧ ل/١٥٠ ز/٣٢ - سوورەتی حوجورات).

١٤٣٩- عنْ الْبَرَاء بْنَ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (قَرَا رَجُلٌ الْكَهْفَ وَفِي الدَّارِ الدَّابَّةُ فَجَعَلَتْ تَنْفِرُ فَسَلَّمَ فَاذا ضبابَةٌ اوْ سَحَابَةٌ غَشِيَتْهُ فَذكَرَهُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ اقْرَا فُلانُ فَانَّهَا السَّكِينَةُ نَزَلَتْ لِلْقُرْانِ اوْ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْانِ)(الحديث: ٣٦١٤، طرفاه في: ٤٨٣٩، ٥٠١١)[٢٠٦].

بەرائی کوری عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ کە ئوسەیدی کوڕی حوزەیربوو، (رەزای خودای لێ بێ) لەماڵەوە قورئان دەخوێنێ، لەوکاتەدا ماینەکەی لە لایەوە بەدوو گوریس بە سرا بۆوە، لەکاتی قورئان

(٢٠٦) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب نزول السكينة لقراءة القران، رقم: ٧٩٥.

خوێندنەکەدا پەڵە هەورێ دەدا بەسەریاو، دەیگرێتە ناوو دەست دەکا بە گڕخواردن بەدەوریا و لێی نزیك دەبێتەوە، ماینەکەیشی کە ئەمە دەبینێ سڵی لێ دەکاو هەڵ دەسڵەمێتەوە، ئەویش دەڵێ: خوایە! بەبێ وەیو بەسەلامەتی، جا بۆ بەیانی هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) وە ئەمەی بۆی گێڕایەوە. فەرمووی (دروودی خودای لێ بێ): (ئەوە ئارامی و فریستەی ئاسایش بوون، لە بەر خاتری قورئانەکە داباریون، کە واتە ئەی ئوسەید! لە قورئان خوێندن بەردەوام بەو هەمیشە هەلی وا بقۆزەرەوە!). (تاج/٥ ل/٢٩٣ ز/٨٠ ف/١ + ریاض/٣ ل/٨٠٨ ز/١٨٠ ف/٥).

١٤٤٠- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ عَلَى اعْرَابِيّ يَعُودُهُ قَالَ وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اذا دَخَلَ عَلَى مَرِيض يَعُودُهُ قَالَ: لا باسَ طهُورٌ انْ شَاء اللّٰهُ فَقَالَ لَهُ: لا باسَ طهُورٌ انْ شَاء اللّٰهُ قَالَ: قُلْتُ: طهُورٌ كَلا بَلْ هِيَ حُمَّى تَفُورُ اوْ تَثورُ عَلَى شَيْخٍ كَبِيرٍ تُزِيرُهُ الْقُبُورَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَنَعَمْ اذا. (الحديث: ٣٦١٦، اطرافه في: ٥٦٥٦، ٥٦٦٢، ٧٤٧٠)(٢٠٧).

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) چوو بۆ سەردانی پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی نەخۆش، کەسەر خۆشی لێ کرد فەرمووی: (قەیدی نیە، خودا حەزکا کەفارەتی گوناهەو پاکەوەکەری گوناهە). پیاوەکەیش گوتی: نەخێر، وەك تۆ دەڵێی ئەمە کەفارەت نییە، بەشکوو ئەمە لەرزوتایە، ئەم پیرە ئیختیارە هەڵ دەچۆقێنێ و لەکۆڵی نابێتەوە تا نەیخاتە ناو گۆڕ وانیە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (کەواتە وەك خۆت دەڵێیت با وابێ) ئیتر کابرا بۆ سبەینێ مرد ومنیشانەی پێغەمبەرایتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەرکەوت). (تاج/٤ ل/١٨٥ ز/٥٦ ف/٢).

---

(٢٠٧) لم یوافقه مسلم علی تخریج حدیث ابن عباس (شیخ کبیر وبه حمی تفور) (خاتمة کتاب المناقب ج/٧ ص ٣٤٦ ط.ج)- المترجم .

١٤٤١- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ كَانَ رَجُلٌ نَصْرَانِيًّا فَاسْلَمَ وَقَرَا الْبَقَرَةَ وَالَ عِمْرَانَ فَكَانَ يَكْتُبُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَعَادَ نَصْرَانِيًّا فَكَانَ يَقُولُ مَا يَدْرِي مُحَمَّدٌ الا مَا كَتَبْتُ لَهُ فَامَاتَهُ اللّٰهُ فَدَفَنُوهُ فَاصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الارْض فَقَالُوا: هَذا فِعْلُ مُحَمَّدٍ وَاصْحَابِهِ لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا فَالْقَوْهُ فَحَفَرُوا لَهُ فَاعْمَقُوا فَاصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الارْض فَقَالُوا: هَذا فِعْلُ مُحَمَّدٍ وَاصْحَابِهِ نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ فَالْقَوْهُ فَحَفَرُوا لَهُ وَاعْمَقُوا لَهُ فِي الارْض مَا اسْتَطاعُوا فَاصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الارْض فَعَلِمُوا انَّهُ لَيْسَ مِنْ النَّاسِ فَالْقَوْهُ. (الحديث: ٣٦١٧)[٢٠٨].

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی نەصرانی هەبوو، موسوڵمان بوو، سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمرانیخوێند، جارو بار کە ئایەتێ دەهات بۆ پێغەمبەر ئەو دەینووسی، لە پاشا بووەوە بە گاور، وە دەیوت: موحەممەد بێجگە لەوەی کەمن بۆم نووسیوە هیچی تر نازانێ، جا خودا مراندی و کۆمەڵەکەی ناشتیان، وە بۆ سبەینێ کە تەماشا دەکەن وازەوی لاشەکەی توورِ دابوویە دەرەوە. وتیان: ئەمە ئیشی موحەممەدو هاورِێکانیەتی، لەبەر ئەوەی رایکردووە لە دەستیان و لە ئاینەکەیان پەشیمان بۆتەوە، ئەم هاورِێیەی ئێمەیان بۆ سووکایەتی پێکردن والێ کردووە، دیسان گۆرِێکی قوڵتریان بۆیهەڵکەندو ناشتیانەوە، بەڵام بۆ سبەینێ دیسانەوە زەوی توورِی دابووە دەرەوە، دیسانەوە، بەڵام بۆ سبەینێ دیسانەوە زەوی توورِی دابووە دەرەوە، دیسان وایان گوتەوەو هەتا توانیان گۆرِێکی قوڵ قووڵیان بۆ هەڵکەندەوە، کەچی بۆ سبەینا هەمدیسان زەوی لاشەکەی توورِ دابووە دەرەوە. ئیتر زانییان کە ئەمەئیشی خوایەو لە مەردومەوە نییە، لە بەر ئەوە ئەوانیش تووریان داو خوداکردی بە پەندو، کردی بە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرا لەسەر راستیی ئایینی موحەممەدو، هەرکەسێ پشتی تێ بکا خودا پێی دەنوێنێ!).

---

(٢٠٨) اخرجه مسلم في صفات المنافقين واحكامهم ، رقم: ٢٧٨١ .

١٤٤٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلْ لَكُمْ مِنْ انْمَاطٍ؟ قُلْتُ: وَانَّى يَكُونُ لَنَا الانْمَاطُ؟ قَالَ: امَا انَّهُ سَيَكُونُ لَكُمْ الانْمَاط فَانَا اقُولُ لَهَا يَعْنِي امْرَاتَهُ اخِّرِي عَنِّي انْمَاطكِ فَتَقُولُ: الَمْ يَقُلْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انَّهَا سَتَكُونُ لَكُمْ الانْمَاط فَادَعُهَا.(الحديث: ٣٦٣١، طرفه في: ٥١٦١)[٢٠٩].

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەرێ قاڵیتان هەیە؟) عەرزیم کرد: قوربان! قاڵیمان لە کوێ بوو؟ فەرمووی: (دەسا ڕۆژا دەبێ کە قاڵیتان دەبێ!). دەی ئێستا زۆر جار کە بە ژنەکەم دەڵێم: (ئەم قاڵیچانە بۆمن ڕامە خەو لایبە) ئەویش بۆ ئەوەی کە بیچەسپێنێ، کە کارێکی ناشایستەی نەکردووە، وەلامم دەداتەوە دەڵێ: ئەی ئەومنە بو پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) هەواڵی لە پەیدا بوونی قاڵی دەداو دیفەرموو: (ڕۆژا دەبێ قاڵیتان دەبێ!) ئیتر منیش واز لە قاڵیەکە دەهێنم بەراخراوی).

١٤٤٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: انْطَلَقَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذ(رضيَ اللهُ عنهُ) مُعْتَمِرًا قَالَ: فَنَزَلَ عَلَى امَيَةَ بْنِ خَلَفٍ ابِي صَفْوَانَ وَكَانَ امَيَةُ اذا انْطَلَقَ الَى الشَّامِ فَمَرَّ بالْمَدِينَةِ نَزَلَ عَلَى سَعْدٍ فَقَالَ امَيَةُ لِسَعْدٍ انْتَظرْ حَتَّى اذا انْتَصَفَ النَّهَارُ وَغَفَلَ النَّاسُ انْطَلَقْتُ فَطفتُ فَبَيْنَا سَعْدٌ يَطوفُ اذا ابُو جَهْلٍ فَقَالَ: مَنْ هَذا؟ الَّذِي يَطوفُ بالْكَعْبَةِ؟ فَقَالَ سَعْدٌ: انَا سَعْدٌ فَقَالَ ابُو جَهْلٍ: تَطوفُ بالْكَعْبَةِ امِنًا وَقَدْ اوَيْتُمْ مُحَمَّدًا وَاصْحَابَهُ؟ فَقَالَ: نَعَمْ فَتَلاحَيَا بَيْنَهُمَا فَقَالَ امَيَةُ لِسَعْدٍ: لا تَرْفَعْ صَوْتَكَ عَلَى ابِي الْحَكَمِ فَانَّهُ سَيِّدُ اهْلِ الْوَادِي ثمَّ قَالَ سَعْدٌ: وَاللَّهِ لَئِنْ مَنَعْتَنِي انْ اطوفَ بالْبَيْتِ لاقْطعَنَّ مَتْجَرَكَ بالشَّامِ قَالَ: فَجَعَلَ امَيَةُ يَقُولُ لِسَعْدٍ: لا تَرْفَعْ صَوْتَكَ وَجَعَلَ يُمْسِكُهُ فَغَضبَ سَعْدٌ فَقَالَ: دَعْنَا عَنْكَ فَانِّي سَمِعْتُ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَزْعُمُ انَّهُ قَاتِلُكَ قَالَ: ايَايَ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: وَاللَّهِ مَا يَكْذبُ مُحَمَّدٌ اذا حَدَّث

---

(٢٠٩) اخرجه مسلم في القياس و الزينة، باب: جواز اتخاذ الانماط ، رقم:٢٠٨٣ .

فَرَجَعَ الَى امْرَاتِهِ فَقَالَ: امَا تَعْلَمِينَ مَا قَالَ لِي اخِي الْيَثْرِبِيُّ؟ قَالَتْ: وَمَا قَالَ؟ قَالَ: زَعَمَ انَّه سَمِعَ مُحَمَّدًا يَزْعُمُ انَّهُ قَاتِلِي، قَالَتْ: فَوَاللّٰهِ مَا يَكْذِبُ مُحَمَّدٌ قَالَ: فَلَمَّا خَرَجُوا الَى بَدْرٍ وَجَاء الصَّرِيخُ قَالَتْ لَهُ امْرَاتُهُ: امَا ذَكَرْتَ مَا قَالَ لَكَ اخُوكَ الْيَثْرِبِيُّ؟ قَالَ: فَارَادَ انْ لا يَخْرُجَ فَقَالَ لَهُ ابُو جَهْلٍ: انَّكَ مِنْ اشْرَافِ الْوَادِي فَسِرْ يَوْمًا اوْ يَوْمَيْنِ فَسَارَ مَعَهُمْ فَقَتَلَهُ اللّٰهُ (الحديث: ٣٦٣٢، طرفه في: ٣٩٥٠)[٢١٠].

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، سەعدی کوڕی موعاز کەوتەڕێ بۆ مەککە بۆ عەمرەکردن، جا لە مەککە بوو بەمیوانی ئومەییەی کوڕی خەلەفی کوڕی وەهەب، کەناز ناوی ئەبو صەفوانە، ئومەییەش کاتێ لە مەکەوە دەچوو بۆ شام، کە دەگەیشتە مەدینە دەبوو بە میوانی سەعد، چونکە سەعدو ئومییە پەیمانی برایەتی یان لە نێواندا بوو.

جا سەعد بەئومەییەی گوت: کاتێکی لەبارم بۆ هەڵبژێرە، کەدەوری بەیت چۆڵ بێ، هەتا عەمرەێی بکەم. ئەویش پێی گوت: چاوەڕوانکە، تا نیوەڕۆ، کە لە وکاتەدا خەڵکەکە، خەریکی وچان و پشوودان و نێوەڕۆخەون، ئیتر لەو کاتی غەفڵەتەدا بڕۆ تەوافی خۆت بکە، جالەو دەمەدا کە سەعد خەریکی تەواف بوو، ئەبو جەهل پەیدا دەبێ، دەڵێ: ئەمە کێیە کەوا لەم کاتەدا خەریکی تەوافێکا بەیە؟ سەعد فەرمووی: منم سەعدی کوڕی موعازم ئەبو جەهل گوتی: ئای ئەوە تۆ ئاوا بەبێ ترس تەوافی کەعبەدەکەی، لە کاتێکا کە پەنای موحەممەد تان داوەو داڵدەتان داوە، هەروا داڵ دەی هاوڕێکانیتان داوە سەعد فەرمووی: بەڵێ وایە ئیتر سەعد و ئەبوجەهل بوو بەدەمە قڕەیان. ئەو جا ئومەییە بە سەعدی گوت: مەقیڕینە بەسەر ئەبو حەکەمدا، چونکە ئەو سەرگەورەی ئەم ولاتی مەککەیەیە! دیارە کەمەبەستی

---

(٢١٠) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث سعد بن معاذ في قتل امية بن خلف (خاتمة كتاب المناقب ج/٧ص٣٤٦ ط.ج)- المترجم .

لە ئەبوحەکەم ئەبوجەهلە چونکە ئەبوجەهل لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر ناوی بنێ ئەبوجەهل، خۆیان پێیان دەگوت: ئەبوحەکەم، واتە: داناو هۆشمەند! لە پاشا سەعد فەرمووی: سوێندم بە خودا ئەگەر ڕێگەم نەدەی کە تەوافی خۆم بەدەوری بەیتا بکەم، ئەوا منیش ڕێگەی هاموشۆی شامتان دەبڕم، کە بەسەر مەدینەدا، کەولاتی ئێمەیە دەڕۆن بۆ بازرگانی بۆ ئەوێ. فەرمووی: ئیتر ئومەییە خۆش خۆش بەسەعدی دەگوت: دەنگت هەڵ مەبڕەو سەعدی دەگرت، سەعدیش لەمە تووڕە بوو، فەرمووی: ئەی ئومەییە واز لەم پارێزەرییەت بێنە کە دەیکەی بۆ ئەبو جەهل، چونکە من بە گوێی خۆم لە موحەممەدم بیستووە: کە موسوڵمانان دەتکوژن! ئومەییە گوتی: من دەکوژن؟ سەعد فەرمووی: بەڵێ، ئەی کێ؟ ئومەییە گوتی: بەخوا ئەمە ئەگەر قسەی موحەممەد بێ دەبێ بەڕاست، چونکە موحەممەد درۆ نازانێ، جا بە شەڵەژاوی و ترساوی دەچێت بۆلای ژنەکەی و پێی دەڵێ: ئوم سەفوان! گوێت لێیە کە برادەرە یەسریبییەکەم یەکەم دەڵێ چی، مەبەستی سەعدە کە خەڵکی مەدینەیە، چونکە مەدینە لە پێش دا ناوی یەسریب بوو، مەدینە ناوێکی ئیسلامی یەتی، ژنەکەی گوتی: برادەرەکەت دەڵێ چی؟ گوتی: بە قسەی خۆی دەڵێ کە گوایە موحەممەد دەڵێ: ئێمە دەیکوژین، ژنەکەیشی گوتی: دەی بە خودا موحەممەد درۆناکا، ئەوەی کە بیڵێ دیتە دی. گوتی: جاکاتێ هەرای بەدر ڕووی دا، وەخەڵکی مەککە دەرچوون بۆ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان، لە پاش ئەو بانگەوازەی کە کرا بۆ ئەم شەڕە، کە موحەممەد و لە شکرەکەی ڕێگەیان بە کاروانەکەی قوڕەیش گرتووە، کاتێ ئومەییە ویستی بچێت بۆ ئەم شەڕە، ژنەکەی یادی خستەوەو پێی گوت: لەبیرت دێ کە سەعدی برادەرت چی پێ گوتیت لەبارەی کوشتنتەوە لەسەر دەستی موسوڵماناندا؟ گوتی: جا ئومەییە ویستی کە نەچێ، بەڵام ئەبو جەهل وازێ لێ نەهێنا و پێی گوت: تۆ یەکێکی لە سەروەرانی ئەم ولاتە کە دۆڵی مەککەیە، چۆن دەبێ کەنەچێ، تۆ نەچیت کەسی تریش ناچێ و چاو لە تۆدەکەن، کەواتە: هەرهیچ نەبێ ڕۆژا دوان بچۆ،

ئـەويش لەگـەڵ لەشـكرى مەككەييـەكان چـوو بـۆ شـەڕەكە، ئـەوەبوو خـودا لەوشەڕە دا لەسەردەستى موسوڵمانەكاندا بە كوشتنى دا.

١٤٤٤- عن اسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ جِبْرِيـلَ اتَـى النَّبِـيَ (صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَعِنْدَهُ امُّ سَلَمَةَ فَجَعَلَ يَتَحَدَّث فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): لامٌ سَلَمَةَ مَنْ هَذا؟ اوْ كَمَا قَالَ قَالَتْ هَذا دِحْيَةُ فَلَمَّا قَامَ قَالَتْ وَاللّـهِ مَـا حَـسِبْتُهُ الا اياهُ حَتَّى سَمِعْتُ خُطبَةَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يُخبِرُ خَبَرَ جِبْرِيلَ اوْ كَمَـا قَـالَ (الحديث: ٣٦٣٣، طرفه في: ٤٩٨٠)[٢١١].

ئوسامەی كوڕی زەيـد (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لێ بێ) ئومموسەلەمەی ژنی لەگەڵی دا دەبێ، حـەزرەتی جوبرائيـل (سەلامی خوای لێ بێ) دێ بۆ خزمـەتی، وەدەسـت دەكـا بـەگفتوگۆ لەگـەڵيا، ئـەوجا جوبرائيـل هـەڵ دەسێ ودەڕوا، جاپێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بە ئوممو سەلەمە دەفـەرموێ: (ئايـا دەزانـی كەئەمـە كـێ بـوو؟) ياشـتێكی ئـاوای پـێ دەڵێ، ئوممو سـەلەمەش دەڵێ: ئەمە ديحيەی كەلبی بوو. ئوممو سەلەمە دەيگوت: بـە خـودا سـا لەڕاستىدا هـەر بە ديحەيەم دەزانی هـەتا ئـەو دەمـەی گوێم لـەوتاری پێغەمبـەر بـوو، باسـی ئـەم هەواڵەی هاتنیجوبرائيلی دەگێڕايەوە، يا فـەرمووی: هـەتا ئـەو كاتـەی پێغەمبـەر شـتێكی لـەم بارەيـەوە فـەرموو). (تـاج/٥ ل/١٥٨ ز/٣٩ - باسـی چـاكێتيی خـاتوو ئوممو‌سەلەمە).

**ڕاڤە و ڕوونكردنەوە:**

يەكـەم: گـەڵ جـار كـەداوی واتــە: قـسە گێـڕەوە لەبێـژەو لـە فقهكـە دا گومـانی بـۆ پەيـدا دەبـێ، بـەلام واتــەو مەبەسـتەكە وەك خـۆی لەميـشكيدا دەمێنێ، ئـەم جۆرە ڕستەيە (او كما قال) بـەكار دەهێنـێ. كەواتـە: گوتنی ئـەم

---

(٢١١) اخرجه مسلم في فضائل ام سلمة (عيني/١٦ص١٦٠) = صم/١٦ص٧ صم= صحيح مسلم بشرح النووي - المترجم .

گوتەیە، لە کاتێکا دروستە، کە فەرمووده گێڕەوەکە لە بێژەی فەرموودەکە دوو دڵ بێ، نەوەك هەمووکاتێ.

دووەم: دیحیەی کەلبی هاوەڵێکی ناسراوی نوداری پێغەمبەرە، لە خزمەت پێغەمبەردا غەزای زۆری کردووە، نوێنەری پێغەمبەر بوو بۆ لای قەیسەری ڕووم، بڕوانە: بەرگی یەکەم، لاپەڕە:٢١=فەرموودەی ژمارە: ٧ ت=٧ ف =٧ تەجرید =٧ فەتح.

دیحیە ماوەیێ لە شام ژیاوە، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، عەسقەلانی دەفەرموێ: من شەش فەرمودەی ئەوم لەلا هەیە، لەدیمەشق و لە المزة ژیاوە، تا سەردەمی جێنشینی موعاوییە ماوە، دحیە شێوەو سەروسیمایەکی زۆر جوانی هەبوو، زۆر جار وەك لەم فەرموودەیەوەو لەچەند فەرموودەیەکی ترەوە دەردەکەوێ، حەزرەتی جوبرائیل، کاتێ دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر، لەسەر شێوەو شەکڵی دەحیە خۆی نیشان دەدا، جاری وا دەبووکە هەرپێغەمبەرخۆی دەیدی و بەس، بەڵام جارێ وایش دەبوو کەسانی تریش وەك پێغەمبەر، جوبرائیلیان لەسەر شێوەی دەحیەیکەلبی دەبینی، وەك لەم فەرموودەدا دەردەکەوێ کە ئوممو سەلەمەش جوبرائیلی دیوە، بەڵام بەدیحیەی زانیوە، هەتا پێغەمبەر وتارەکە دەدات. ئەوسا دەزانێ کە ئەوە جوبرائیل بووە نەك دیحیە.

١٤٤٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بن عمر (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ رَايْتُ النَّاسَ مُجْتَمِعِينَ فِي صَعِيدٍ فَقَامَ ابو بَكْرٍ فَنَزَعَ ذَنُوبا اوْ ذَنُوبَيْنِ وَفِي بَعْض نَزْعِهِ ضعْفٌ وَاللّٰهُ يَغْفِرُ لَهُ ثمَّ اخَذَهَا عُمَرُ فَاسْتَحَالَتْ بِيَدِهِ غرْبا، فَلَمْ ارَ عَبْقَرِيًّا فِي النَّاسِ يَفْرِي فَرِيَهُ حَتَّى ضرَبَ النَّاسُ بِعَطنٍ (الحديث: ٣٦٣٤، اطرافه في: ٣٦٧٦، ٣٦٨٢، ٧٠١٩، ٧٠٢٠)[٢١٢].

(٢١٢) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل عمر ﷺ، رقم: ٢٣٩٣ .

**عەبدوڵلای کوڕی عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ لەخەوما، لەسەر بیرێ بووم، لەدەشتێکا، ئاوم لێ هەڵ دەگۆزی، لەوکاتەدا ئەبو بەکرو عومەر پەیدا بوون، ئەبو بەکر دۆڵچەکەی هەلگرت و بەکزێکەوە دۆڵچەیێ یادوو دۆڵچە ئاوی هەڵکێشا، خودا لێی خۆش بێ، ئەنجا عومەری کوڕی خەطاب لەدەستی ئەبوبەکری وەرگرت و، دۆڵچەکە لەدەستی عومەردا بوو بە سەتڵێکی گەورەی وا، کە بە قەد مەشکەیەکی گاوەس ئاو بگرێ، جا کەسم نەدیوە، کە وەك عومەر ئاوا بلیمەت بێ و ئاوا بە هەڵپەو هەڵمەت و دەست و بردبێ، ئیتر عومەر بە شێوەیەکی وا ئاوی زۆر کرد، هەتا خەڵکەکە لەدەوری ئاوەکە پەچەیان بۆ ئاژەڵەکانیان بەست بۆ حەوانەوەی پاش پاراو بوون!). (تاج/٨ ل/١٥ ز/٤ ف/٢- ئەو خەونانەی پێغەمبەر خۆی بینیویانی).**

**ڕوونکردنەوە:**

**١- خەونی پێغەمبەران هەقە، وەك ئەم خەونەی پێغەمبەر، ڕێك هاتۆتەدی، پێغەمبەر تاخۆی مابوو، زۆر بە جوانی بەم کارە هەڵدەساو، یاساکانی شەریعەتی دادەمەزراند، لە پاش خۆی ئەبو بەکر بۆ ماوەی دوو ساڵ بەم ئەرکە هەڵسا، بەڵام کەمێ کەم و کوڕی پێوە دیار بوو، بە هۆی خەریکبوون بەکوشتاری هەڵگەڕاوەکانەوە، بەڵام کاتێ عومەر ئەم ئەرکەی گرتە ئەستۆ زۆر بەجوانی پێی هەڵسا، وە بۆ ماوەی دەساڵ ئیسلامی بە جیهانی ئاوەدانی ئەو ڕۆژگارەدا بلاو کردەوە.**

**٢- ئەوەی کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: (ئە بوبەکر دۆڵچە کەی بەکزیەکەوە هەلگرت) مەبەست کەم کردنەوەی نرخی ئەبو بەکر نییە، بەڵکوو بەیانی حاڵە، هەروا ئەوەی کە دەفەرموێ: (خودا لێی خۆش بێ) مەبەستی حەزرەت لەم دوعایە تەنیا ئەوە بووە کە نزای خێر بۆ ئەبو بەکر بکا، چونکە ئەبو بەکر ئەوەندە پیاوێکی باشە هەموو کاتێ شایانی ئەوەیە کە**

نزای باشی بۆ بکرێ. هەزاران هەزار جار ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە ئەبوبەکرو عومەر و هەموو هاوڕێکانیتری پێغەمبەر بێ.

١٤٤٦- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُمـا) انَّ الْيَهُـودَ جَـاءوا الَـى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذكَرُوا لَهُ انَّ رَجُلا مِنْهُمْ وَامْرَاةً زَنَيَا فَقَـالَ لَهُـمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَانِ الـرَّجْمِ؟ فَقَـالُوا: نَفْضحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ فَقَالَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ سَلامٍ: كَذبْتُمْ انَّ فِيهَـا الـرَّجْمَ فَـاتَوْا بـالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا فَوَضعَ احَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى ايَةِ الرَّجْمِ فَقَرَا مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ سَلامٍ: ارْفَعْ يَدَكَ فَرَفَعَ يَدَهُ فَاذا فِيهَا ايَةُ الرَّجْمِ فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّـدُ فِيهَـا ايَـةُ الرَّجْمِ فَامَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرُجِمَا قَـالَ عَبْـدُ اللّٰـهِ: فَرَايْـتُ الرَّجُلَ يَجْنَا عَلَـى الْمَـرْاةِ يَقِيهَـا الْحِجَـارَةَ (الحديث: ٣٦٣٥، طرفه في: ١٣٢٩، ٤٥٥٦، ٦٨١٩، ٦٨٤١، ٧٣٣٢، ٧٥٤٣). (بڕوانـــــه: ژمـــــاره: ١٣٣٧ت= ٣٣٢٩ف)[٢١٣].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جوولەکەکان لە مەدینە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پێیان گوت: پیاوێك و ژنێ لە خۆمان داوێنپیسییان کردووە، تۆ مەحکەمەیان بکە بۆمان، ئەویش پێی فەرموون: (سەبارەت بە کەسێ داوێنپیسی بکا، لەتەوراتدا چی دەڵێ، لەبارەی سەنگە سارکردنیەوە؟) گوتیان: لەسەر ئەم شێوەیە ڕیسوایان دەکەین و لەپاشا داری حەدیان لێ دەدەین و تەواو، ڕووی هەر دوولایان ڕەش دەکەین و بەرپشت سواری دوو ولاخیان دەکەین و دەیانگێڕین بەناو دێدا، هەتا ببن بە پەندو ڕیسوا ببن.

عەبدوڵلای کوڕی سەلام کە خۆی لە پێشا زانایەکی گەورەی جوولەکە بووەوە ئیسلام بوو، پێیانی فەرموو: (درۆدەکەن، لە تەوراتا ئایەتی سەنگە سار کردنی داوێنپیسانی واتیادا) جا تەوراتیان هێناو والایان کردەوە، کەچی ئەو

---

(٢١٣) اخرجه مسلم في الحدود ، باب: رجم اليهود اهل الذمة في الزنا، رقم: ١٦٩٩ .

کەسەی کەدەیخوێندەوە ئایەتی ڕەجم کردنی کرد بە ژێر دەستیەوەو نەیخوێندەوە، بەڵکوو پێش و پاشەکەی خوێندەوە، عەبدوڵلای کوڕی سەلام پێی فەرموو: ئادەی دەستت هەڵبڕە، کەدەستی هەڵبڕی ئایەتەکە لەژێریدابوو، ئەو جا بە ناچاری گوتیان: ڕاست دەکا ئەی محمد! ئایەتی بەردە بارانکردنی واتیادا ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمانی دەرکرد، ژن و پیاوەکەیان بەردەباران کرد). (تاج/٣ ل/٢٤٣ ز/٩٢ ف/٨ - باسی: تۆڵەی شەروالپیسی).

١٤٤٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شِقَّتَيْنِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اشْهَدُوا. (الحديث: ٣٦٣٦، اطرافه في: ٣٨٦٩، ٣٨٧١، ٤٨٦٤، ٤٨٦٥)[٢١٤].

عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ لە مینا لە خزمەتی حەزرەتدا بووین، (دروودی خودای لێ بێ) بێبڕواکان داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەر کرد، جا لەسەر داواکردنی پێغەمبەر لەخودا مانگ بوو بە دوو کەرتەوە، کەرتێکیان کەوتە پشت کێوەکەوەو ئەو کەرتەکەی تریشیان کەوتە ئەو دیویەوە.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (تەماشاکەن و بەشایەت بن، کەوا ئەم موعجیزە گەورەیەتان بە چاوی خۆتان لەمن دی، کەشتێوا نیشانەو بەلگەیەکی گەورەیە لەسەر ڕاستی و دروستیی پەیامەکەی من). (تاج/٧ ل/١٧٠ ز/٣٧ ف/١+ ٢+ ٣- سوورەتی قەمەر). (ف/١ + ٢+ ٣ = فەرموودەی ژمارە: ١، ٢، ٣).

١٤٤٨- عَنْ عُرْوَةَ البارقي (رَضِيَ اللهُ عنهُ) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (اعْطَاهُ دِينَارًا يَشْتَرِي لَهُ بِهِ شَاةً فَاشْتَرَى لَهُ بِهِ شَاتَيْنِ فَبَاعَ احْدَاهُمَا بِدِينَارٍ وَجَاءَهُ بِدِينَارٍ وَشَاةٍ فَدَعَا لَهُ بالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ وَكَانَ لَو اشْتَرَى التُّرَابَ لَرَبِحَ فِيهِ) (الحديث: ٣٦٤٢)[٢١٥].

---

(٢١٤) اخرجه مسلم في الحدود ، باب: رجم اليهود اهل الذمة في الزنا، رقم: ١٦٩٩ .

(٢١٥) لاحظ ماجاء في خاتمة كتاب المناقب في فتح الباري ج/٧ص٣٤٦ - المترجم .

عوروەی ئەل باریقی (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دینارێکی زێری پێم دا، کە مەڕێکی بۆ بکڕم بۆ قوربانی، منیش بەو دینارە دوومەڕم کڕی، یەکێکیانم فرۆشتەوە بە دینارەکەو، دینارێك و مەڕێکیشم بۆی بردەوە، وە لە حاڵەکە حاڵیم کرد، ئەویش لەم سەودایەی من رازی بوو، بۆیە نزای بۆم کرد، کە خودای گەورە پیت و فەڕ بخاتە مامەڵەو سەو دامەوە، لە پیت و فەڕی نزا کەیەوە ئیتر لەوەو دوا ئەگەر خۆڵی ئاساییم بکڕیبایە، قازانجم لێی دەکرد). (تاج/٢ ل/٣٣٨ ز/١٦١ ف/٨ - هاوبەشی و سەرکاریی).

**ڕاڤەو شیکرنەوە:**

١- پەیوەندیّ هەندیّ لە فەرموودەکان بە بابەت و سەرباسەکانەوە، کەمیّ دوورە، بەڵام کاتیّ سەرنجیان دەدەین، دوور یانزیك جۆرە پەیوەندییەکیان بە یەکەترەوە هەیە، بۆ نموونە:

ا- پەیوەندی فەرموودەی ژمارە: ١٤٤٨ بەبابەتەکەوە، کە مەناقیب و نیشانەکانی پێغەمبەرایەتییە، لەو ڕووەوەیە کە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) نزای بۆ عوروە کردووە و لە پیت و فەڕی ئەو نزایەوە عوروە خۆڵی بکڕیبایە قازانجی لێ دەکرد.

ب- پەیوەندی ژ: ١٤٤٦ لەو ڕووە وەیە، کە پێغەمبەر نەخوێنەوار بووە جوولەکەکان نەفی ئەوەیان کردووە کە لە تەوراتا ڕەجمو بەردە باران هەبیّ، بەڵام دەردەکەویّ کە ئەوان درۆ دەکەن و پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) ڕاست دەکا.

ج- پەیوەندی ژ:١٤٤٣- هەڕەشەکەی پێغەمبەر لە ئومەییە هاتەدی.

٢- عورەوەی باریقی هاوەڵێکی پێغەمبەری ناودارە، ڕەوگە ماینی زۆری هەبوو، کۆمەڵیّ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە غەزاکانی شام دا بەشداری کردووە، زۆر تر فەرموودەکانی خەڵکی کووفە دەیگێڕنەوە.

لەمقدمەی فتح الباری دا دەفەرموێ: لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە. بڕوانە: ژ: ١١٧٥.

## پایانیێ (خاتِمَة)

مامۆستای عەسقەلانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: مەناقیبی نەبەوی هەتا ئێرە، سەدو نەوەدو نۆ فەرموودەی واتیادا، هەیانە مەرفووعن هەیانە لە حوکمی مەرفووع دایە، حەفدەیان بێڕشتەن، واتە: تەعلیقن، ئەوانیتریان پەیوەست (موصول)ن حەفتاو هەشتیان دووبارەن، پاڵفتەکەیان سەدو یەك فەرموودەیە.

پێشەوا موسلیمیش هەموویانی گێڕاوەتەوە بێجگە لە بیستو هەشت فەرموودەیان، کە ئەمانەن:

١- ٣٤٩٠. فەرموودەی ئیبنو عەباس لەبارەی (الشعوب)ەوە.

٢- ٣٤٩١. فەرموودەکەی زینەبی کچی ئەبو سەلەمە: (مِنْ مضر).

٣- ٣٤٩٢. فەرموودەکەی زینەب لەبارەی سرکەو نەبیزەوە.

٤- ٣٤٩٧. فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس: (الا المودَّةَ في القُرْبَى).

٥- ئەم چوارە لە تەجریدەکە دانین.

٦- ژمارە: ١٣٩١ ت =٣٥٠٠فەتح. فەرموودەکەی موعاوییە: (ان هذا الامر في قريش). لە(ت)یدانیە، هەرواژمارە: (٣٥٠٠٥)یش.

٧- ٣٥٠٥. فەرموودەکەی عائیشەو میسوەر لە بارەی نەزرەوە.

٨- ژمارە: ١٣٩٦ت=٣٥٠٩ فەتح: (من اعظم الفرى).

٩- ژمارە: ١٣٩٩ تەجرید =٣٥١٦م فەتحولباری: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە: (اسلم و غفار خير من اسد وتميم) مامۆستای عەسقەلانی وا دەفەرموێ، بەڵام ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیم دا هەیە، بڕوانە: پەراوێزی ژمارە: (١٣٩٩ت=٣٥١٦م ف) هەروا بڕوانە: شەرحی صەحیحی موسلیم،

دانـراوی ئیمـامی نـەوەی، بـەرگی/١٦ لاپـەڕە: ٧٢ +٧٥ +٧٦ + تـاج/٣ ص/٤١٨ + تاج/٥ ل/٢٤٢ ز/٦٧ ژ/٦، ٧.

١٠- ژمارە: ١٤٠٢ت=٣٥٢٠ف: (عَمْرو بْنُ لحيٍ بن قمعة..).

١١- ٣٥٢٤ف=(ان سرَّك ان تعلم جهل العرب). لەتەجریدەکەدا نییە.

١٢-ژمارە: (١٤٠٧ت=٣٥٣٣ف (ویلعنون مُذمّما وَ اناممحمد).

١٣- ژمارە: (١٤١٢ت=٣٥٤٢ف= (بابی شبیه بالبنی لا بعلیٍ..).

١٤- حدیث عبدالله بن بسر في صفة شیب النبی (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ). ئەگەر مەبـست ژمـارە (١٤١٤ ت= ٣٥٤٦ ف) بـێ، دیـارە کـە مەمەبـست ئەویـشە، موسلیم لەڕێگەی ئەنەسەوە گێڕاویەتـەوە، ئـەوەی کە لـە پەراوێزی ئـەم ژمارەیـەدا نووسـراوە، مەبەسـت گێڕانـەوەی ئەنەسـە. بڕوانـە شـەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم بەرگی پازدە لاپەڕە/٩٤- ٩٧.

١٥- ژمارە: (١٤١٨م =٣٥٥٢ ف= (بل مثل القمر).

١٦- ژمارە: (١٤٢٠ت=٣٥٥٧ ف= (بعثت من خیر قرون بنی ادم).

١٧-تەعلیقەکـەی جـابیر، کـەوا لـە پـێش ژمـارە/٣٥٦٩وە. کەدەفـەرموێ: (کان النبی (صلی الله علیه وسلم) تنام عینه ولا ینام قلبه رواه سعید بن مینـاء عن جابر عن النبي (صلی الله علیه وسلم)).

١٨- ژمارە/١٤٣٠ت=٣٥٧٩ ف= (کنا نعد الایات برکه)

١٩-ژمارە: ٣٥٧٧ ف= فەرموودەکەی بەڕاء: (کنا بالحدیبیة اربع عشرة ماته..).

٢٠- ژمارە: ٣٥٨٤ف، فەرموودەکەی (جابر فی حَنِین الجِذعِ..).

٢١-ژمارە: ٣٥٨٣، فەرموودەکەی ئیبنو عومەر (فی حنین الجزع..).

٢٢-ژمارە: ٣٥٩٢ف= فەرموودەکەی عـەمری کوڕی تـەغلیب: (بـین یـدي الـساعة تقاتلون قوما نعالُهُمُ..).

٢٣- ژمارە: ١٤٣٧ت=٣٦١٢ف= (الاتستنصِرُلَنا..).

٢٤- ژمارە: ١٤٤٠ت=٣٦١٦ف=شیخ کبیر وبه حمّی تفورُ..)

٢٥-زماره: ٣٦٢٧ف=فەرموودەكەی ئیبنو عەبباس، سەبارەت بە تەفسیری: ﴿اذا جَاءَ نَصْرُ اللهِ والفَتْح﴾.

٢٦- فەرموودەكەی سەبارەت بەراسپێری دەر بارەی ئەنصار=٣٦٢٨ف.

٢٧- زماره: ١٤٤٣ت=٣٦٣٢ف. لەبارەی كوشتنی ئومەییەی كوڕی خەلەفەوە.

٢٨- زماره: ٣٦٤١ف = قَالَ معاذ: (وهُم بالشَّام).

دەفەرموێ: حەوت بیستراو (ئەسەر)یشی واتیا.



## ٦٦- نامەی بەهرەوەری هاوڕێیانی پێغەمبەر (كِتَابُ فَضَائِلِ الصَّحَابَةِ)

باسی: بەهرەی هاوڕێكانی پێغەمبەر (دروودی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوان بێ).

## بەهرەی ئەبوبەكر

پێناسەی هاوڕێی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئاوایە: (هەر كەسێ هاوڕێتی پێغەمبەری كردبێ، یاپێغەمبەری دیبێ یا پێغەمبەر ئەوی دیبێ وەكوو كوێر، ئەوە دادەنرێ بە هاوڕێ، واتە: بە سەحابە، ئیتر پیاو بێ یا ژن، جیاوازی نییە، بەو مەرجە لەوكاتەدا كە پێغەمبەری دیوە یا پێغەمبەر ئەوی دیوە موسوڵمان بووبێ).

١٤٤٩- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطعِمٍ (رضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: اتَتْ امْرَاةٌ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَامَرَهَا انْ تَرْجِعَ الَيْهِ قَالَتْ ارَايْتَ انْ جِئْتُ وَلَمْ اجِدْكَ؟ كَانَّهَا

تَقُولُ: الْمَوْتَ قَالَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انْ لَمْ تَجِدِينِي فَاتِي ابا بَكْرٍ(الحديث: ٣٦٥٩، طرفاه في: ٧٢٢٠، ٧٣٦٠)(٢١٦).

جوبەیری کوڕی موطعیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنا هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) داوای شتێکی لێ کرد، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەو شتەی نەبوو، فەرمووی پێی: جارێکی تر وەرەوە. ژنەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر هاتمەوەو تۆم دەست نەکەوت بچم بۆ لای کێ، کەلەباتی خۆت بەڵێنەکەت جێ بەجێ بکا؟ ژنەکە لەم پرسیارە، وەك بڵێی مەبەستی ئەوەبوو، ئەگەر من هاتمەوەو تۆ مرد بووی ئەی پێغەمبەری خودا، بۆ موراجەعە بچم بۆلای کێ؟ فەرمووی (دروودی خودای لێ بێ) (ئەگەر منت دەست نەکەوت بچۆ بۆلای ئەبوبەکر، ئەو لەباتی من کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکا) (تاج/٣ ل/٢٩٩ ز/١١٠ ف/١- فەرمانڕەوا..)

١٤٥٠- عنْ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قالَ: رَايْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَا مَعَهُ الا خَمْسَةُ اعْبُدٍ وَامْرَاتَانِ وَابُو بَكْرٍ(الحديث: ٣٦٦٠، طرفه في: ٣٨٥٧)(٢١٧).

عەماری کوڕی یاسیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) تەنیا پێنج بەندەو دووژن و ئەبو بەکری سەدیقی لەگەڵ دابوو، من ئەمەم بە چاوی خۆم دیوە). (تاج/٥ ل/١٧ ز/١١٠ ف/٤).

١٤٥١- عَنْ ابِي الدَّرْدَاء (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اذ اقْبَلَ ابُو بَكْرٍ اخِذا بِطرَفِ ثَوْبِهِ حَتّى ابْدَى عَنْ رُكْبَتِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): امَّا صَاحِبُكُمْ فَقَدْ غَامَرَ، فَسَلَّمَ وَقَالَ: انّي كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ ابْنِ الْخطابِ شَيْء فَاسْرَعْتُ الَيْهِ ثمَّ نَدِمْتُ فَسَالْتُهُ انْ يَغْفِرَ لِي فَابَى عَلَيَّ فَاقْبَلْتُ الَيْكَ فَقَالَ: يَغْفِرُ اللّهُ لَكَ يَا ابا بَكْرٍ ثلاثا ثمَّ انَّ عُمَرَ نَدِمَ فَاتَى مَنْزِلَ ابِي بَكْرٍ

(٢١٦) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل ابي بكر، رقم: ٢٣٨٦ .

(٢١٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٧ص٥٥٠/ خاتمة) - المترجم .

فَسَالَ: اثمَ ابُو بَكْرٍ؟ فَقَالُوا: لا فَاتَى الَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمَ فَجَعَلَ وَجْهُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتمَعَّرُ حَتَّى اشْفَقَ ابُو بَكْرٍ فَجَثا عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاللَّهِ انَا كُنْتُ اظلَمَ مَرَّتَيْنِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انَّ اللَّهَ بَعَثنِي الَيْكُمْ فَقُلْتُمْ كَذبْتَ وَقَالَ ابُو بَكْرٍ صَدَقَ وَوَاسَانِي بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَهَلْ انْتُمْ تَارِكُوا لِي صَاحِبِي مَرَّتَيْنِ فَمَا اوذِيَ بَعْدَهَا(الحديث: ٣٦٦١، طرفه في: ٤٦٤٠)(٢١٨).

ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا دانیشتبووم، لە ناکاو ئەبو بەکر پەیدا بوو، داوێنی جلەکەیی گرتبوو بە دەستیەوە، بە شێوەیەکی وا ئەژنۆکانی دەرکەوتبوون، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) کەلەسەر ئەم حاڵە ئەبو بەکری دی فەرمووی: (وادیارە ئەم هاوڕێ یەتان قەو ماندویەتی!).

ئەبوبەکر هاتە بەرەوە سلاوی کرد و فەرمووی: (ئەوەی ڕاست بێ لەنێوانی من و عومەری کوڕی خەتابیشتێ رووی دا، وەمن خۆم پێ ڕانەگیراو قسەی ڕەقم پێ گوت، بەڵام لە پاشا پەشیمان بوومەوەو داوام لێی کرد کە لێم خۆش بێ و چاو پۆشیم لێ بکا، کەچی ئەو بەگوێی نەکردم، جاوا هاتووم بۆ لای تۆ ئەی پێغەمبەر خودا! تا تۆ ناو بژیمان بکەی، پێغەمبەریش (درودی خودای لێ بێ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر! خودا لێت خۆش بێ.

لەپاش دا عومەر پەشیمان دەبێتەوەو دەچێ بۆ ماڵی ئەبو بەکرو دەپرسێ: ئەرا ئەبوبەکر لە ماڵە؟ دەڵێن: نەء، ئیتر هەر لە وێوە دێ بۆ لای پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) کە گەیشتە بەرەوە سلاوی کرد، جا بەرە بەرە ڕووی پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) گرژ بوو، بە شێوەیەکوا کە ئەبوبەکر ترسی ئەوەی لێ نیشت کە عومەر لەسەر ئەو لەلایەنی پێغەمبەرەوە تووشی شتێ ببێ،

---

(٢١٨) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٧ص٥٥٠/ خاتمة) - المترجم .

ئیتر ئەبوبەکر هات بە چۆکا لە خزمەتی پێغەمبەرداو بۆ عومەر پاڕایەوەو فەرمووی: بە خودا ئەی پێغەمبەری خودا! زۆرتری سووچی من بوو..

جا حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (کاتێ کە خودا منی کرد بە پێغەمبەر و ڕەوانەی کردم بۆ ناوتان ئێوە دەتانگوت: درۆ دەکەی، بەڵام ئەبو بەکر دەیگوت: ڕاست دەکا، وە ئەبو بەکر، چ بەسەر، چ بەماڵ فریام کەوت و بەسەرو سامان خۆی کردووە بە قوربانی ئیسلام، ئەنجا دوو جار لە سەریەك فەرمووی: کە حاڵ وایە ئەدیی ئیتر بۆ واز لە ئازاردان و دڵڕەنجاندنی ئەم هاوڕێ یەم ناهێنن لە بەر خاتری من! گوتی: ئیتر لە پاش ئەم ڕووداوو فەرمایشتەی پێغەمبەرە، لەم بارەیەوە، ببڕای کەسێ بوێرێ ئازاری ئەبوبەکر بدا)، (تاج/٥ ل/١٢ ز/٣ ف/٢). (بڕوانە: تاج/٥ ل/١٣٩ ز/٣٠- چاکێتیی عەممار..).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

عەمماری کوڕی یاسیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) ناوی دایکی سومەییەیە، خۆی و باوکی و دایکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، ئەم بنەماڵەیە ئەشکەنجەی زۆریان چەشتووە لەپێناوی ئیسلام دا، هەرسێکیان لەموسوڵمانە پێشینەکانن، عەممار کۆچی کرد بۆ حەبەشە، یەکێکە لەو موسوڵمانانە کە بەرەو دوو قیبلە نوێژی کردووە، لە مەککە وە کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئامادەی هەموو غەزە واتەکانی کردووە، لە غەزای بەدردا دلێرییەکی بەرچاوی نواند، هەروا لە نەبەردی یەمامەدا، لەم نەبەردەدا گوێی پەڕی.

لەبوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە، کۆمەڵا فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، دایکی ئەبو جەهلی نەفرەتی، نێزەیەکی ماڵی بەشەرمیدا و کوشتی. واقیدی دەفەرموێ: لەسەر فەرمایشی ئیستیعابی ئیبنی عەبدولبەڕ (پیاوێکی باڵا بەرزی چاونەخشینی ناوشانیان بوو) پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لە پەسنی عەممار دا دەفەرموێ: (بەهەشت تامەزرۆی دیداری عەلی و عەممار

و سەلمان و بیلالە) تەمەنی لە نەوەد پتر بوو، لەشەڕگەی صەفین دا شەهید بوو، کە ئەم جەنگە گەورەیە لەنێوانی پێشەوا عەلیو موعاوییەدا، لەساڵی سیی وحەوتی کۆچیدا قەوما. هەزار ڕەحمەت لەگیانی پاکی.

١٤٥٢- عَنْ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ(رَضِيَ اللهُ عنهُ) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَهُ عَلَى جَيْشِ ذاتِ السُّلاسِلِ فَاتَيْتُهُ فَقُلْتُ ايُّ النَّاسِ احَبُّ الَيْكَ؟ قَالَ عَائِشَةُ. فَقُلْتُ: مِنْ الرِّجَالِ؟ فَقَالَ: ابُوهَا قُلْتُ: ثمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثمَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ فَعَدَّ رِجَالا(الحديث: ٣٦٦٢، طرفه في: ٤٣٥٨)[٢١٩].

عەمری کوڕی عاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) منی کرد بە فەرماندەی سوپای غەزای زاتوسەلاسیل، چوومە خزمەتی عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ زۆر خۆشەویستە لە لات؟ فەرمووی: (عائیشە) گوتم: ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی: (باوکی عائیشە) گوتم: لە پاش ئەوان کێی تر؟ فەرمووی: عومەر. وە چەند پیاوێکی تریشی ژمارد). (تاج/٥ ل/١٤١ ف/٤ ز/٣١).

١٤٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ:قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ جَرَّ ثوْبَهُ خُيَلاء، لَمْ يَنْظرْ اللَّهُ الَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. فَقَالَ ابُو بَكْرٍ: انَّ احَدَ شِقَّيْ ثوْبِي يَسْتَرْخِي الا انْ اتَعَاهَدَ ذلِكَ مِنْهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انَّكَ لَسْتَ تَصْنَعُ ذلِكَ خُيَلاء(الحديث:٣٦٦٥، اطرافه في:٥٧٨٤، ٥٧٩١، ٦٠٦٢)[٢٢٠].

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بۆ فیزو دەعیە جلی خۆی بە کێش بکاو، لە زەوی بخشێنێ لە ڕۆژی قیامەتا خودا بە چاوی مەرحەمەت و میهرەبانی تەماشای ناکاو، ڕووی نازی ناداتی!) ئەبو بەکریش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی

---

(٢١٩) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل ابي بكرﷺ، رقم: ٢٣٨٤ .

(٢٢٠) قال في تاج الاصول : رواه الخمسة. انظر(صم/١٤ص٦٢) - المترجم .

پێغەمبەری خودا! خۆ من لایەکی داوێنی جلەکەم شل دەبێ و شۆڕ دەبێتەوە، مەگەر هەمووکاتێ ئاگام لێی بێ دەنا شۆڕ دەبێتەوە و دەخشێ لەزەوی ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (تۆ لەو کەسانە نیت کەشتی وا دەکەن بۆ فیز و دەعیە کەواتە لەکاتی وادا قەیناکا) (بر:تاج/٤ ل/١٢٤ ز/٨٣ ف/١- دەستوری جلو بەرگ- ش/د/ت/ن).

١٤٥٤- عَنْ ابِي مُوسَى الاشعري (رضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ تَوَضا فِي بَيْتِهِ ثمَّ خَرَجَ فَقُلْتُ لالْزَمَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلاكُونَنَّ مَعَهُ يَوْمِي هَذا قَالَ فَجَاء الْمَسْجِدَ فَسَالَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: خَرَجَ وَوَجَّهَ هَا هُنَا فَخَرَجْتُ عَلَى اثرِهِ اسْالُ عَنْهُ حَتَّى دَخَلَ بِئْرَ اريسٍ فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبَابِ وَبَابُهَا مِنْ جَرِيدٍ حَتَّى قَضى رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حَاجَتَهُ فَتَوَضا فَقُمْتُ الَيْهِ فَاذا هُوَ جَالِسٌ عَلَى بِئْرِ اريسٍ وَتَوَسَّط قُفَّهَا وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلاهُمَا فِي الْبِئْرِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ ثمَّ انْصَرَفْتُ. فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبابِ فَقُلْتُ لاكُونَنَّ بَوَّابَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْيَوْمَ فَجَاء ابُو بَكْرٍ فَدَفَعَ الْبابَ فَقُلْتُ مَنْ هَذا؟ فَقَالَ ابُو بَكْرٍ: فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ ثمَّ ذهَبْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ هَذا ابُو بَكْرٍ يَسْتَاذِنُ، فَقَالَ: ائْذنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بالْجَنَّةِ فَاقْبَلْتُ حَتَّى قُلْتُ لابِي بَكْرٍ: ادْخُلْ وَرَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُبَشِّرُكَ بالْجَنَّةِ فَدَخَلَ ابو بَكْرٍ فَجَلَس عَنْ يَمِينِ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَهُ فِي الْقُفِّ وَدَلّى رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ كَمَا صَنَعَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ ثمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ وَقَدْ تَرَكْتُ اخِي يَتَوَضا وَيَلْحَقُنِي فَقُلْتُ: انْ يُرِدْ اللّهُ بِفُلانٍ خَيْرًا يُرِيدُ اخَاهُ يَاتِ بِهِ فَاذا انْسَانٌ يُحَرِّكُ الْبابَ فَقُلْتُ: مَنْ هَذا؟ فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: فَقُلْتُ عَلَى رِسْلِكَ ثمَّ جِئْتُ الَى رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقُلْتُ: هَذا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَسْتَاذِنُ فَقَالَ: ائْذنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بالْجَنَّةِ فَجِئْتُ فَقُلْتُ: ادْخُلْ وَبَشَّرَكَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بالْجَنَّةِ فَدَخَلَ فَجَلَسَ مَعَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْقُفِّ عَنْ يَسَارِهِ وَدَلّى رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ ثمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ فَقُلْتُ: انْ يُرِدْ اللّهُ بِفُلانٍ خَيْرًا يَاتِ بِهِ

فَجَاء انْسَانٌ يُحَرِّكُ الْباب فَقُلْتُ: مَنْ هَـذا؟ فَقَـالَ: عُثمَـانُ بْـنُ عَفَّـانَ فَقُلْـتُ: عَلَـى رِسْلِكَ فَجِئتُ الَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَاخْبَرْتُـهُ فَقَـالَ: ائْـذنْ لَـهُ، وَبَشِّرْهُ بالْجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى تُصِيبُهُ فَجِئْتُهُ فَقُلْتُ لَهُ ادْخُلْ وَبَشَّرَكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بالْجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى تُصِيبُكَ فَدَخَلَ فَوَجَدَ الْقُفَّ قَدْ مُلِئَ فَجَلَسَ وِجَاهَهُ مِنَ الشَّقِّ الاخَـر(الحـديث: ٣٦٧٤، اطرافـه في: ٣٦٩٣، ٣٦٩٥، ٦٢١٦، ٧٠٩٧، ٧٢٦٢)[٢٢١].

ئـەبو مووسـای ئـەشـعـەری (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەماڵـەوە دەسـنوێژم گـرت و دەرچـووم، گـوتم: دەبـێ ئـەمڕۆ لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) جیانەبمـەوە، بەهەناسـە خزمـەتی بـە جـا نـەهێڵم، فـەرمووی: جـا چـووم بـۆ مزگـەوت، لـەوێ پرسـیاریم کـرد، گوتیـان: تەشـریفی دەرچـووە، بـەرەو ئێـرەوە ڕۆیـشت، منـیش بەشـوێنیدا ڕۆیـشتم، دەم پرسـی، تـازانیم کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لـێ بـێ) وا لـە نـاو بـاخێ لـە باخـەکانی مەدینـەدا، خەریکـە دەسـت بـە نـاو دەگەیـەنێ، لـە پاشـا چـووە نـاو بـیری ئەریـسەوەو دەسـنوێژی گـرت، بیرەکـە دەرگاکـەی لـە چـەپەری پەلکـە خورمـابوو، پێغەمبـەر(دروودی خـودای لـێ بـێ) لەسـەر ئاخڵەی بیرەکە، لەناوەڕاستیدا دانیـشت و، هـەردوو لاقـی بـەرووتی داهێـشتنە نـاو بیرەکـەوە، منـیش چـووم بـۆ خزمـەتی و سـلاوم لێ کـردو ئـەوجا گەڕامـەوە دواوە لە بەردەم دەرگای بیرەکەدا دانیشتم، بووم بەدەرکەوانی.

زۆری پـێ نەچـوو ئـەبو بـەکر هـات، پـاڵی نابەدەرگاکـەوە، کـە بیکاتـەوە، گوتم: ئەوەکێیە؟ فەرمووی: منم ئەبوبـەکرم وتم: هێـواش بـە، جـا چـووم گـوتم: قوربـان! ئـەوە ئـەبو بـەکرە ڕێخـۆوازی دەکـا کـە بێتـە ژوورەوە؟ فـەرمووی: (ڕێگەی پێ بدەو موژدەی بەهەشتیی پـێ بـدە) منـیش چوومەوە، عـەرزیم کـرد: بفەرموو، وەرەژوورەوە، پێغەمبـەر مـوژدەی بەهەشـتت پـێ دەدا. ئـیتر ئەبوبـەکر هاتـە ژوورەوە، لـە لای ڕاسـتی پێغەمبـەرەوە لـە لەسـەر ئاخڵەکـە دانیـشت لـە

(٢٢١) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل عثمان رضي الله عنه، رقم: ٢٤٠٣ .

گەڵیدا و هەردوو قاچی خۆی بەناو بیرەکەدا داهیڵا، دەق وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەردوو لاقی خۆشی هەڵماڵی، وەسوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد، منیش گەڕامەوەو لەبەر دەرگا لە شوێنەکەی پێشووم دانیشتمەوە، برایەکم هەبوو، کەلە ماڵ دەرچووم بڕیار وابوو دەسنوێژ بگرێ و بێت بۆ لای من، جا لە دڵی خۆما گوتم: ئەگەر خودا مەیلی لەسەر بێ کە ئەو برایەم تووشی خێر ببێ، بەزوویی دەیهێنێ، جا لەم دەمە دەمی چاوەڕوانییەدا هەستم کرد واکەسێ دەرگاکە دەبزوێنێ. گوتم: ئەوەکێ یە؟ گوتی: عومەری کوڕی خەتابم گوتم: لەسەر خۆبە، تۆزێ هێواشکە.

ئەوجا چوومە خزمەتی حەزرەت و عەرزیم کرد: ئەوە عومەری کوڕی خەتابە، ڕێ خوازی دەکا. فەرمووی: (ڕێگەی بدەو موژدەی بەهەشتیشی پێ بدە). چووم پێم گوت: بفەرموو، پێغەمبەر موژدەی بەهەشتت پێ دەدا). ئەویش ڕۆیشتە ژوورەوە، سوپاس و ستایشی خوای کرد، لەخزمەت پێغەمبەردا، لەئاخڵەی بیرەکەدا، لەلای چەپی پێغەمبەرەوە دانیشت و هەر دووپێی خۆیی بەبیرەکەدا شۆڕ کردەوە، منیش چووم لەشوێنی خۆم دانیشتمەوە، دیسانەوە لەبەر خۆمەوە گوتمەوە: ئەگەر خودا حەزکا فیسارەی کەسی برام تووشی خێرو خۆشی بکا، لەم بۆنە جوانەدا دەیرەخسێنێ، جا مرۆڤێ هات لەدەرگای دا، گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتی: عوسمانی کوڕی عەففانە، منیش گوتم: هێواشکە چوومەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) عەرزیم کرد کە عوسمانە. فەرمووی: (ڕێگەی پێ بدەو موژدەی بەهەشتی پێ بدە، گەرچی تووشی قۆرتێکی گەورەش دەبێ!). منیش چووم بۆخزمەتیو عەرزیم کرد فەرموو وەرە ژوورەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) موژدەی بەهەشتت دەداتێ، ئەگەرچی لەو پێناوەدا تووشی مەینەتا دەبی! ئەویش هاتە ژوورەوە، تەماشای کرد واسەکۆی قەراخ دەمی بیرەکە پڕ بووە، جێگەی کەسی تر نابێتەوە کەتیایدا دانیشێ، لەبەرئەوە بەرامبەر پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) دانیشت لەلاکەی ترەوە). (تاج/٥ ل/٤٥ ز/٨- گەورەیی عوسمان).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئـەم بـیری ئەریـسە والـە نزیـك قـەباوە، ئـەو بیرەیـە کـە ئەموسـتیلەکەی پێغەمبـەر، کـە لەدەسـت عوسمـان دا بـوو کەوتـە نـاوێ، ئـیتر دوا ئـەوە بەرەبـەرە ئاشووب و فەرتەنـە سـەری هـەڵ دا، ئـەو مەینـە تـەیش کەتووشـی عوسمـان بـوو ئـەوە بـو کـە لـە ماڵەکـەی خـۆی دا گـەمارۆیان دا هەتاشـەهیدیان کـرد، بڕوانـە: ژ/١٣٦ ت=١٥٩ ف=بەرگی یەکەم، ل/١٤٨).

١٤٥٥ – عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لا تَسُبُّوا اصْحَابِي فَلَوْ انَّ احَدَكُمْ انْفَقَ مِثْلَ احُدٍ ذهَبـا، مَـا بَلَـغَ مُـدَّ احَدِهِمْ وَلا نَصِيفَهُ. (الحديث: ٣٦٧٣)[٢٢٢].

ئەبو سـەعیدی خـوردی (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: شـتێ هـەبوو لـە نێـوانی خالیدی کوڕی وەلیـدو ئـەوڕەحمان کـوڕی عەوفـدا، خالیـد جنێـوی بـە ئـەوڕەحمان دا، پێغەمبەریش(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: جمێن بە هیـچ کەسـێ لـە هـاوڕێ یـانی مـن مـەدەن، گریمـان یـەکێ لـە ئێـوە بـە قـەد کێـوی ئوحـودیش زێرببەخشێتەوە هێشا ناگات بە مشتێکی ئەوان، بگرە ناگات بـەنیو مشتیـشیان! (ش/ د/ ت - تـاج/٥ ل/١٠ ز/٢- جنێودان بە یارانی پێغەمبەرتاوانێکی گەورەیە).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کـە جنێـو دان بـە سـەحابەی پێغەمبـەر تـاوانێکی گەورەیـە، ئـەو کەسـەی کـە جنێوەکـە دەدا چ خۆشـی هـاوڕێی پێغەمبەربێ، چ لە چینەکانی دوا ئەوان بێ جیاوازی نییە.

١٤٥٦ – عَنْ انَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) حَدَّثَهُمْ انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَعِدَ احُدًا وَابُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثمَانُ فَرَجَفَ بِهِمْ فَقَالَ اثْبُتْ احُدُ فَانَّمَا عَلَيْـكَ

---

(٢٢٢) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: تحريم سب الصحابة رضي الله عنهم، رقم: ٢٥٤٠ .

نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ). (الحديث:٣٦٧٥، طرفاه في: ٣٦٨٦، ٣٦٩٧) (اخرجه مسلم من وجه اخر، انظر فتح/ ٧ ص ٣٩١ط.ج)[٢٢٣].

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەرو ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان دەڕۆنە سەر کێوی ئوحود، کێوەکە لە خۆشییا نا دەکەوێتە جموجوولێ و لەرزەلەرز، پێغەمبەریش (رەزای خودای لێ بێ) پێی دەفەرموێ: (ئەی ئوحود! داسەکنێ و دامرکێ، تەنیا پێغەمبەرێك و پیاو چاکێکی ڕاستاڵی ڕاستگۆو دوو شەهید وان لەسەر تۆ- ب/د/ت/ن) (تاج/٥ ل/٤٧ ز/٨- گەورەیی ئیمامی عوسمان+تاج/٥ ل/٥٣ ز/٨ ف/٩).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

لەم فەرموو دەیەدا دوو موعجیزەی گەورەی واتیادا:

یەکەمیان: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمان دەکا بەکێوەکە و کێوەکە فەرمانەکەی بە جێ دەهێنێ.

دووەم: هەواڵی داوەکە عومەرو عوسمان شەهید دەبن، وە خۆی وابوو، هەردوکیان شەهیدیی یان بەنصیب بوو.

١٤٥٧- عَنْ ابْنِ عَبَاسٍ(رَضيَ اللهُ عَنْهُما)قَالَ انِّي لَوَاقِفٌ فِي قَوْمٍ فَدَعَوْا اللَّهَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطابِ (رَضيَ اللهُ عنهُ)وَقَدْ وُضِعَ عَلَى سَرِيرِهِ، اذا رَجُلٌ مِنْ خَلْفِي قَدْ وَضعَ مِرْفَقَهُ عَلَى مَنْكِبِي يَقُولُ: رَحِمَكَ اللَّهُ انْ كُنْتُ لارْجُو انْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ لانِّي كَثِيرًا مَا كُنْتُ اسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: كُنْتُ وَابُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَفَعَلْتُ وَابُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَانْطَلَقْتُ وَابُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَانْ كُنْتُ لارْجُو

---

(٢٢٣) قال العيني : ووقع لفظ حراء في حديث ابي هريرة اخرجه مسلم قال: كان رسول الله (صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلم) على حراء هو وابوبكر و عمر و عثمان .. (عيني/١٦ص٢٠٧) - المترجم .

انْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَهُمَا فَالْتَفتُّ فَاذا هُوَ عَلِيُّ بْنُ ابِي طَالِبٍ (الحديث: ٣٦٧٧، طرفه في: ٣٦٨٥)[٢٢٤].

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپاش پێکانی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) کاتێ مرد، لەسەر دارەتەرمێ دایان نابوو، خەڵکەکە دەوریان لێدابوو، بۆی دەپاڕانەوەو نوێژیان لەسەری دەکرد، منیش لەناویانا ڕاوەستا بوم، لە ناکاو ئەوەندەم زانی پیاوێ لە پشتمەوە ئانیشکی دانا لەسەر سەرشانم و فەرمووی بە عومەر: ئەی ڕەحمەتی خودات لێ بێ، بەڕاستی من بە تەما بووم و ئومێدم بەڕەحمەتی خودا وابوو کە خودا بە سەربەرزی شادت بکاتەوە بەدیداری هەردوو هاوڕێکانت، کە پێغەمبەرو ئەبوبەکرن، چونکە گەلێ جار من دەم ژنەوت لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) باسی پێکەوە ژیانی خۆشی خۆی و ئێوەی دەکردو دەیفەرموو: (من وئەبو بەکرو عومەر بووین، یادەیفەرموو: من و ئەبو بەکرو عومەر وامان کرد، یا دەیفەرموو: من و ئەبو بەکرو عومەر ڕۆیشتین بۆ ئەوێ، وەهەروەها..) کە ئاوڕم دایەوە بەلا یەوە، تەماشم کرد ئەوە عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو کە وادەڵێ (رەزای خودای لێ بێ)). (تاج/٥ ل/٢٩ ز/٥ ف/٣).

١٤٥٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): رَايْتُنِي دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَاذا انَا بالرُّمَيْصَاء امْرَاةِ ابِي طَلْحَةَ وَسَمِعْتُ خَشَفَةً فَقُلْتُ: مَنْ هَذا؟ فَقَالَ: هَذا بِلالٌ وَرَايْتُ قَصْرًا بِفِنَائِهِ جَارِيَةٌ فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذا؟ فَقَالَ: لِعُمَرَ فَارَدْتُ انْ ادْخُلَهُ فَانْظرَ الَيْهِ فَذَكَرْتُ غَيْرَتَكَ فَقَالَ عُمَرُ: بِابِي وَامِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ اعَلَيْكَ اغَارُ. (الحديث: ٣٦٧٩، طرفاه في: ٥٢٢٦، ٧٠٢٤)[٢٢٥].

---

(٢٢٤) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل عمرﷺ، رقم: ٢٣٨٩ .

(٢٢٥) و الحديث اخرجه في فضائل عمر (عيني /١٦ص١٩٣) راجع: صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٥ ص١٦٣ - المترجم .

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (لە خەوما دەبینم وام لە ناوبەهەشتا، كە تەماشام كرد وا ڕومەیصای هاوسەری ئەبو تەلحە والەوێ، وەخشپە خشپێكم بەرگوێ كەوت، چرپەی پێی كەسی دەهات لە پێشمەوە دەڕۆیشت، بە فریشتەكانم گوت: ئەمە كێیە كە ئەوەندە بەختەوەرە؟ فەرموویان: ئەمە بیلالە. هەروا لەم خەوەم دا، لە بەهەشتا كۆشكێكم بینی، كیژا لە حەوشەكەیدا بوو، گوتم: ئەی ئەم كۆشك و كەنیزە هی كێ یە؟ جوبرائیل (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: هی عومەرە، ویستم كە بچمە ناوی و تەماشای ناوی بكەم، دوایی یادی غیرەتی عومەرم كەوتەوەكەچەندە بەتەنگی ناموسەوەدێ، ئیتر نەچوومە ناوی و بەرەو دوا گەڕامەوە. عومەریش فەرمووی: بە باوك و دایكمەوە بەقوربانت بم، ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن دڵ لە تۆ پیس دەكەم!). (تاج/٥ ل/٢٣ ف/٥+٦ ز/٤).

١٤٥٩- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَجُلا سَالَ النَّبِيَ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ السَّاعَةِ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: وَمَاذا اعْدَدْتَ لَهَا؟ قَالَ: لا شَيْءَ الا انِّي احِبُّ اللّهَ وَرَسُولَهُ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: انْتَ مَعَ مَنْ احْبَبْتَ قَالَ انَسٌ: فَمَا فَرِحْنَا بِشَيْءٍ فَرَحَنَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْتَ مَعَ مَنْ احْبَبْتَ قَالَ انَسٌ: فَانَا احِبُّ النَّبِيَ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَارْجُو انْ اكُونَ مَعَهُمْ بِحُبِّي ايَاهُمْ وَانْ لَمْ اعْمَلْ بِمِثْلِ اعْمَالِهِمْ (الحديث:٣٦٨٨، اطرافه في: ٦١٦٧، ٦١٧١، ٧١٥٣)[٢٢٦].

ئیمامی ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عارەبێكی دەشتەكی لە پێغەمبەری پرسی: كەی قیامەتە؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (باشە چیت بۆی ئامادە كردووە؟). گوتی: هیچ، بەڵام دەستمایەی دەستم ئەوەیە كە خودا و پێغەمبەری خودام خۆش دەوێ! تەنیا ئومێدم بەوە

(٢٢٦)والحديث اخرجه مسلم في الادب عن ابي الربيع(عيني ١٩٨/١٦)=(صم/١٦ص١٨٥)- المترجم

فەوییە. فەرمووی: (دەی موژدەت لێ بێ کە تۆ لە وێستگەو مەڵبەندەکانی قیامەتدا لەگەڵ ئەوکەسانە دەبی کە خۆشت دەوێن!).

ئەنەس فەرمووی: بەهیچی تر وەك ئەوە شادمان نەبووین، وەك بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر شادمان بووین، کە فەرمووی: (دەی موژدەت لێ بێ کە تۆ لە قیامەتا لەگەڵ خۆشەویستی خۆتا دەبیت). ئەنەس فەرمووی: لەخوا بەزیاد بێ من پێغەمبەرو ئەبو بەکرو عومەرم خۆش دەوێ، وە ئومێد دەکەم کە لە قیامەتا لە خزمەت ئەوانابم، بە هۆی ئەو خۆشەویستیەی کە هەمە بۆیان، گەرچی بەکردەوەی باش بەوانا ناگەم). (تاج/٩ ل/١٢١ ز/٥٤ ف/٢-ش/ ت- باسی: مَنْ احَبَّ قَوْما حُشِرَمعهم).

١٤٦٠- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَقَدْ كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ مِنْ بَنِي اسْرَائِيلَ رِجَالٌ يُكَلَّمُونَ مِنْ غَيْرِ انْ يَكُونُوا انْبِيَاء فَانْ يَكُنْ مِنْ امَّتِي مِنْهُمْ احَدٌ فَعُمَرُ(الحديث: ٣٦٨٩، طرفه في: ٣٤٦٩)[٢٢٧].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (لە پێشینان، لە نەتەوەکانی پێش ئێوە کەسانی خوا پێداوی وا هەبوون قسە بۆ کراو بوون، فریشتە قسەو گوفتوگۆی لەگەڵ دەکردن، بە تایبەتی لە هۆزی جوولەکە گەڵێ پیاوی وا هەبوون، لەگەڵ ئەوەشا کە پێغەمبەریش نەبوون، بەڵام قسەو گوفتوگۆیان لەگەڵ فریشتە دەکردو قسەو باسیان لە زۆر شت دەکرد، قسە کەیان ڕاست دەر دەچوو، وەك خودا بیخاتە ناو دڵیان، یا فریشتە هەواڵیان پێ بدەن، جا ئەگەر لەناو ئۆ مەتی من دا لەم جۆرە کەسانە هەبن، بێگومان کە عومەر یەکێك دەبێ لەوان!). (تاج/٥ ل/٢١ ز/٤ ف/٣).

---

(٢٢٧) الحديث اخرجه مسلم في فضائل عمر(صم/١٥ص١٦٦) - المترجم .

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

سوپاس‌و ستایش بۆ خودا، کە لەناو نەتەوەی موسوڵمانیش دا، لەم جۆرە خودا پێداوانە زۆر هەیە، وە ئەمەیش لەسەر ئەم شێوانە ڕوو دەدا (بڕ: ریاض/۳ ل/۱۰۸۷ ف/۳ ز/۲۵۳ - کرامات الاولیاء).

۱- بەخەو، زۆر لە موسوڵمانان بە خەون لەزۆر شت ئاگادار دەکرێن.

۲- بە القای قەلبی، زۆر کەس زۆرینەی کات خودا هەواڵ و دەنگوباس دەخاتە ناو دڵیان، زۆر جار بە فیراسەت ڕوو داوو پێشهات دەخوێننەوەو قسەو هەواڵیان دەڤا ودەق ڕاست دەر دەچێ.

۳- زۆر کەسیان فریشتە ڕووبە ڕوو قسەو گفتوگۆیان لەگەڵ دەکەن و هەواڵی شتیان پێ دەڵێن، وەك ئیمامی عومەر و عیمرانی کوڕی حوسەین و زۆر کەسی تر لە سەحابەو تابیعین و لە هەموو چینەکانی تری نەتەوەی ئیسلام. (بڕ: ژ: ۲۲۰ تجرید = ۳٤٤ فەتح، ژ: ۳٤ تەجرید=٤٥ فەتح ژ: ۸۹ ت، ژ: ۲۸۵، ژ: ۱٤٤٤، ۱۳۸۲، ۱۳۱۵ تاج/٤ ل/۱۹۷ ز/٦۰ ف/۷ + ۸. تاج/٤ ل/۲۸٦ ز/۹۵ ف/۱ + ژ: ۱٤۳۹ت).

١٤٦١- عن ابن عمر(رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انه جَاءه رَجُلٌ مِنْ اهْلِ مِصْرَ فَقَالَ لهُ: يَا ابْنَ عُمَرَ انِّي سَائِلُكَ عَنْ شَيْءٍ فَحَدِّثْنِي هَلْ تَعْلَمُ انَّ عُثمَانَ فَرَّ يَوْمَ احُدٍ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: تَعْلَمُ انَّهُ تَغَيبَ عَنْ بَدْرٍ وَلَمْ يَشْهَدْ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ تَعْلَمُ انَّهُ تَغَيبَ عَنْ بَيْعَةِ الرِّضوَانِ فَلَمْ يَشْهَدْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: اللَّهُ اكْبَرُ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: تَعَالَ ابَيِّنْ لَكَ امَّا فِرَارُهُ يَوْمَ احُدٍ فَاشْهَدُ انَّ اللَّهَ عَفَا عَنْهُ وَغفَرَ لَهُ وَامَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَدْرٍ فَانَّهُ كَانَتْ تَحْتَهُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَتْ مَرِيضَةً فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انَّ لَكَ اجْرَ رَجُلٍ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا وَسَهْمَهُ وَامَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَيْعَةِ الرِّضوَانِ فَلَوْ كَانَ احَدٌ اعَزَّ بِبَطنِ مَكَّةَ مِنْ عُثمَانَ لَبَعَثهُ مَكَانَهُ فَبَعَث رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عُثمَانَ وَكَانَتْ بَيْعَةُ الرِّضوَانِ بَعْدَ مَا ذهَبَ عُثمَانُ الَى مَكَّةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ الْيُمْنَى: هَذهِ يَدُ عُثمَانَ. فَضرَبَ بِهَا

عَلَى يَدِهِ فَقَالَ هَذِهِ لِعُثمَانَ فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ اذهَبْ بِهَا الانَ مَعَكَ. (الحديث: ٣٦٩٩، اطرافه في: ٣١٣٠، ٣٦٩٨(٣٦٩٩ط. ج) ٣٧٠٤، ٤٠٦٦، ٤٥١٣، ٤٥١٤، ٤٦٥٠، ٤٦٥١، ٧٠٩٥)[٢٢٨].

عوسمانی کوڕی مەوهیب (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: کابرایێ هات خەڵکی میسر بوو، حەجی ماڵی خودای کرد، تاقمێ پیاوی دی کە دانیشتبوون، گوتی: ئەم پیاو گەلە کێن؟ گوتیان: قوڕەیش، گوتی: ئەی ئەو مامۆستایە کێیە لەناویاندا؟ گوتیان: عەبدوڵلای کوڕی عومەرە، گوتی: ئەی ئیبنو عومەر! پرسیارێکم هەیە وەلامم بدەرەوە، ئەرێ پێم بڵێ: ئایا دەزانیت کە عوسمان لەڕۆژی غەزای ئوحود دا هەڵ هاتبوو؟ گوتی: ئادەزانم، گوتی: ئەی دەزانی کە لە غەزای بە دریش پاش کەوتبوو، بە شداری ئەویشی نەکرد بوو؟ گوتی: ئا، ئەوەش دەزانم، گوتی: ئەی دەزانی کە لە بەیعە تۆلڕیزوان (پەیمانی خۆ شنوودی و هۆی ڕەزای خودا)یش دا لەوێ نەبوو؟ گوتی: ئا دەزانم.

جا کابرا لە خۆشیانا، کە وەلامەکەی ئیبنو عومەریش ڕێکی دڵی ئەوەو، بەلگەیە لەسەر ناتەواویی عوسمان، لە خۆشی ئەمە بە دەنگی بەرز، کە نیشانەی سەرکەوتنە گوتی: (الله اکبر!) ئیبنو عومەریش (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: وەرە یەکە یەکە ئەمانەت بۆ ڕوون بکەمەوەو تێت بگەیێنم: هەڵهاتنەکەی ڕۆژی ئوحودی، من شایەتی بۆ دەدەم کە خودا لەوە لێی خۆش بووە بە پێی ئەم ئایەتە، کە لەو بابەتەوە قسە دەکاو دەفەرموێ: ﴿ولقد عفا اللهُ عنهُمْ انَّ الله غَفورُ حَليم﴾ (٣/١٥٥).

واتە: بەڕاستی خودا چاوپۆشی کرد، لەو موسولمانانەی کە لە غەزای ئوحوددا هەڵهاتبوون و، پشتی سوپای ئیسلامیان چۆڵ کرد بوو، چونکە خودا تاوانبەخش و بەمۆڵەت و ئارامە نەهاتنەکەی ڕۆژی بەدریشی، عوسمان لەبەر

(٢٢٨) لم نعثر عليه في مسلم ولم يشر احد من المصادر حسب معلوماتي الى اخراجه من قبل مسلم بل قال العيني: (الحديث من افراده- ج/١٦ ص٢١٧)- المترجم .

ئەوە نەهاتبوو چونکە کچی پێغەمبەری لەباخەڵا بوو، کە ناوی روقیە بوو، ڕوقیە نەخۆش بوو، عوسمان لەسەر فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەماڵ مایەوە بە دیار ژنەکەیەوە، بۆیە لە پاشا حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) پێی فەرموو: (هەم پاداشی باش و هەم پشكو بەشت بۆهەیە، بەقەی پیاوێ کە بە خودی خۆی بەشداریی کردبێ لە غەزای بەدردا).

لە بەیعەتول ڕیزوانیش دا کەعوسمان حازر نابێ، لەبەر ئەوە دەبێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەوکاتەدا کەسێکی تری وەك عوسمان تەوانا و هێژا، دەست ناکەوێ، هەتا لە شوێنی عوسمان بینێرێ بۆ گوفتوگۆ لەگەڵ کافرەکان ولاتی مەککە، هەتاتێیان بگەیەنێ کە حەزرەت و یارانی بۆ عەمرە هاتوون و بۆ شەڕو هەرا نەهاتوون.

جا لە پاش ئەوە کە عوسمان بەفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ڕۆیشت بۆ لای خەڵکی مەککە ڤاو بلاو دەبێتە وە کە قورەیش خۆیان ئامادە دەکەن بۆ جەنگ، ئیتر مو سوڵمانەکانیش خۆیان گورج دەکەنەوەو لە بارو دۆخێکی ئاوا ئالۆزدا بەیعەتو لڕیزوان ڕوودەدات، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بە دەستی ڕاستی خۆی ئامازەی کرد و فەرمووی: ئەمە دەستی عوسمانە، ئینجا دای بەدەستی چەپی خۆیاو فەرمووی: (ئەم بەیعەت و پەیمانەیش لە باتی عوسمان!) ئیبنو عومەر بەکابرای فەرموو: دەئێستا ئەم وەلامانە لەگەڵ خۆت بەرەو ئێتر ئەمانە مەکە بە بەهانە لە عوسمان (تاج/٥ ل/٥٠ ز/٨ - گەورەیی حەزرەتی عوسمان فەرموودەی ژمارە:٧).

١٤٦٢- عنْ عَلِيّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ فَاطمَةَ عَلَيْهَا السَّلام شَكَتْ مَا تَلْقَى مِنْ اثرِ الرَّحَا فَاتَى النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَبْيٌ فَانْطَلَقَتْ فَلَمْ تَجِدْهُ فَوَجَدَتْ عَائِشَةَ فَاخْبَرَتْهَا فَلَمَّا جَاء النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اخْبَرَتْهُ عَائِشَةُ بِمَجِيء فَاطمَةَ فَجَاء النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَيْنَا وَقَدْ اخذنَا مَضاجِعَنَا فَذهَبْتُ لاقُومَ فَقَالَ: عَلَى مَكَانِكُمَا. فَقَعَدَ بَيْنَنَا حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى صَدْرِي وَقَالَ الا اعَلِّمُكُمَا خَيْرًا مِمَّا سَالْتُمَانِي اذا اخَذْتُمَا مَضاجِعَكُمَا تُكَبِّرَان ارْبَعًا وَثلاثِينَ وَتُسَبِّحَان ثلاثا

وَثَلاثِينَ وَتَحْمَدَانِ ثَلاثًا وَثَلاثِينَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ. (الحديث: ٣٧٠٥، اطرافه في: ٣١١٣، ٥٣٦١، ٥٣٦٢، ٦٣١٨)(٢٢٩).

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: فاطیمە (رەزای خودای لێ بێ) تەنیا باڵ بوو، هەرخۆی ئیش و کاری ناو ماڵی دەکرد، سکالای بوو لە دەست شت هاڕین بەدەستاڕ، ناو لەپێ دەستاڕ بردبووی، ئەوەنەی دەستاڕ کردبوو، جا کۆمەڵێ ژنی دیلی بە تالانی گیراوی جەنگیان بۆ پێغەمبەر هێنا، فاطیمە بە ئومێدی ئەوەی کە باوکی لە و ژنە دیلانە کارەکەرێکی پێ بدا، هەتا لە ماڵەوە بۆ ئیش وکار یاریدەی بدا، چوو بۆ لای باوکی، بەڵام باوکی لەماڵ نەبوو، عائیشەی زڕدایکی لەماڵ بوو، عەرزی ئەوی کرد، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) تەشریفی هاتەوە، داخوازییەکەی فاطیمەی پێ ووت، عەرزی دەکا کە فاطیمەی کچت هاتبوو بۆ لات بۆ ئیشێکی ئاوا، داوای کارەکەرێکی لێ دەکردیت.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) تەشریفی هات بۆ لامان لەوکاتەدا ئێمە ڕاکشابووین، دەمان ویست بخەوین، من ویستم لەبەری هەڵسم، فەرمووی: (لە شوێنی خۆتان مەجووڵێن) لە بەینی من و لە بەینی فاطیمەی کچیدا دانیشت، تەنانەت هەستم کرد بە فێنکایی قاچەکانی کە دەکەوتن لە سینگم. فەرمووی: (ئەدیی باشتێکتان فێربکەم، زۆر لەوە باشترەکە ئێوە داواتان لە من کردووە: کاتێ ڕاکشان لەسەر نوێنەکانتان، سیی و چوار ئەڵلاهو ئەکەربکەن و سیی وسی سوبحانەڵلا بکەن و سیی وسێ جار بڵێن: (الحمد لله) ئەمە زۆر باشترە بۆ ئێوە لەکارەکەرو نۆکەر!). (بڕوانە: ژمارە: ١٤٦٧ تەجرید).

**ڕاڤەو شیکرنەوە:**

فاطیمەی زەهراء کچی حەزرەتی پێغەمبەرە، هاوسەری ئیمامی عەلیە)دایکی حەسەن و حوسەینە، نەنکە گەورەی هەموو سەیدەکانە، نەوەی

---

(٢٢٩) اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة ، باب: التسبيح اول النهار وعند النوم ، رقم: ٢٧٢٧

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەر لە ڕێگەی فاطیمەوە ماوە، لە منالەکانی تریەوە وەچەی نەماوە. بەپێی تەمەن، کچەکانی پێغەمبەر بەریز ئەمانەن: زینەب یەکەمیانە، ڕوقیە دوەمیانە، ئوموکەلسووم سێیەمیانە، فاطیمە زەهراء چوارەمیانە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ) راجیایی سەبارەت بە سالی لە دایکبوونی هەیە، هەندێ دەفەرموون پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) تەمەنی چل‌و یەك سال بووە کە فاطیمە لە دایك بووە، هەنێ تردەفەرموون: تەمەنی سی‌و پێنج سال بووە کە فاطیمە لەدایك بووە، دیارەکە فاطیمەو براو خۆشکەکانی، جگە لە ئیبراهیم، هەموویان لە خەدیجە بوون، فاطیمە کە شووی کرد بەعەلی تەمەنی پازدە سال بوو. لە پاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بە شەش مانگ فاطیمەش دەمرێ (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) . (بڕوانە: ئەم ژمارانە لە تەجریدی صەریح ١٢٦، ژ: ٦١٦، تاج/٥ ل/١٠٨ ز/١٩ + ل/١١٣ ز/٢٠ + ل/١٠٨ ز/١٩ - فەضلی فاطیمە..).

١٤٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ كُنْتُ يَوْمَ الاحْزَابِ جُعِلْتُ انَا وَعُمَرُ بْنُ ابِي سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) فِي النِّسَاء فَنَظَرْتُ فَاذا انَا بالزُّبَيْرِ عَلَى فَرَسِهِ يَخْتَلِفُ الَى بَنِي قُرَيْظَةَ مَرَّتَيْنِ اوْ ثلاثا فَلَمَّا رَجَعْتُ قُلْتُ يَا ابَتِ رَايْتُكَ تَخْتَلِفُ قَالَ اوَهَلْ رَايْتَنِي يَا بُنَيَّ؟ قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ يَاتِ بَنِي قُرَيْظَةَ فَيَاتِينِي بِخَبَرِهِمْ؟ فَانْطَلَقْتُ فَلَمَّا رَجَعْتُ جَمَعَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ابَوَيْهِ فَقَالَ فِدَاكَ ابِي وَامِّي (الحديث: ٣٧٢٠)(٢٣٠).

عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای خەندەق، من و عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە دانرابووین بەدیار ژنەکانی پێغەمبەرەوە، کە لە ناو قەلاکەی حەساندا بوون، ئاگاداری‌و سەرپەرشتیمان دەکردن، سەرنجم دا زوبەیر دوو سێجار بەسواریی ئەسپەکەی دێ و دەچێ. بۆ بەنی قورەیزە، کە گەڕامەوە مالا، گوتم: باوە! تۆم دی هەر دەهاتی و دەچووی

(٢٣٠)اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب:من فضائل طلحةو الزبير(رَضيَ اللهُ عَنهُما). رقم: ٢٤١٤

بۆ بەنی قورەیزە، ئایا خێر بوو؟ گوتی: بۆ کوڕم! تۆ بە چاوی خۆت لەم کاتەدا منت دی؟ گوتم: ئا، فەرمووی: ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: کێ دەچێ بۆ هۆزی بەنی قورەیزە، دەنگوباسی ئەوانم بۆ دێنێ هەتا بزانین کە پەیمانەکەیان دەشکێنن و شەڕ لە دژی ئێمە دەکەن یان نا؟) جامن چووم و دەنگو باسی ئەوانم بۆی هێنایەوە، کەچوو مەوە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) باوك و دایکی خۆی پێکەوە کردبە قوربانم و فەرمووی: (باوك و دایکم بە قوربانت بن!) (ش/ ت - تاج/ ٥ ل- ٧٩ ف- ٢ ز- ١٠- گەورەیی زوبەیر).

١٤٦٤- عَنْ طلحة بن عبيدالله (رَضيَ اللهُ عنهُ) قال: لَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْض تِلْكَ الايَامِ الَّتِي قَاتَلَ فِيهِنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَيْرُ طَلْحَةَ وَسَعْدٍ عَنْ حَدِيثِهِمَا. (الحديث: ٣٧٢٢، طرفه في: ٤٠٦٣) و (الحديث ٣٧٢٣ – طرفه في: ٤٠٦١)[٢٣١].

تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی:لەبازێ لەغەزاکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کەلەگەڵ دوژمندا دەجەنگی واتە: لە غەزای ئوحوددا، کەسی لەگەڵ نەما، بێجگە لەتەلحەوسەعدی کوڕی ئەبووەقاص)(بڕ: تاج/٥ ل/١٧٩ ز/٤٩ ف/١).

١٤٦٥- عَنْ قَيْسِ بْنِ ابِي حَازِمٍ قَالَ رَايْتُ يَدَ طَلْحَةَ الَّتِي وَقَى بِهَا النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ شَلَّتْ (الحديث: ٣٧٢٤، طرفه في: ٤٠٦٣)

قەیسی کوڕی ئەبو حازیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو دەستەی تەلحەم دیوە کە لە غەزای ئوحوددا کردبووی بە قەڵخان و دابوویە بەرشمشێری کافرەکان و نەیهێشتبوو، کە شیرەکە بەر پێغەمبەر بکەوێ، ئەو دەستەی گۆج بوو بوو. (تاج/٥ ل/٨٤ ز/١١- ف/٢- باسی: مەزناهی تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا...).

---

(٢٣١)اخرجه مسلم في فضائل الصحابة،باب:من فضائل طلحة و الزبير(رَضِيَ اللهُ عَنهُما). رقم: ٢٤١٤

١٤٦٦- عنْ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ قَالَ سَمِعْتُ سَعْدًا يَقُولُ جَمَعَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ابَوَيْهِ يَوْمَ احُدٍ (الحديث: ٣٧٢٥، اطرافه في: ٤٠٥٥، ٤٠٥٦، ٤٠٥٧)(٢٣٢).

سەعدی کوڕی ئەبووەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای ئوحود دا پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) تیردانەکەی خۆی بۆم هەڵڕشت و باوك و دایکی خۆی پێکەوە کرد بە قوربانم و خۆش خۆش دیفەرموو: تێریان پێوە نێ، باوك و دایکم بە قوربانت بێ!). (تاج/٥ ل/٨٦ ز/١٢ ف/١ - مەزناهی سەعد).

١٤٦٧- عَنْ الْمِسْوَرِ بْنَ مَخْرَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهُ) قَالَ: انَّ عَلِيًّا (رَضِيَ اللَّهُ عنهُ) خَطَبَ بِنْتَ ابِي جَهْلٍ فَسَمِعَتْ بِذلِكَ فَاطِمَةُ فَاتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: يَزْعُمُ قَوْمُكَ انَّكَ لا تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ وَهَذا عَلِيٌّ نَاكِحٌ بِنْتَ ابِي جَهْلٍ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ يَقُولُ: امَّا بَعْدُ انْكَحْتُ ابا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ فَحَدَّثَنِي وَصَدَقَنِي وَانَّ فَاطمَةَ بَضعَةٌ مِنِّي وَانِّي اكْرَهُ انْ يَسُوءَهَا وَاللَّهِ لا تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبِنْتُ عَدُوِّ اللَّهِ عِنْدَ رَجُلٍ وَاحِدٍ فَتَرَكَ عَلِيٌّ الْخِطبَةَ. (الحديث: ٣٧٢٩، اطرافه في: ٩٢٦، ٣١١٠، ٣٧١٤، ٣٧٢٩، ٣٧٦٧، ٥٢٣٠، ٥٢٧٨)(٢٣٣).

میسوەری کوڕی مەخرەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبوتالیب، خوازبێنی کچێکی ئەبوجەهلی کرد بۆ خۆی، کەبەسەر فاطیمەی کچی موحەممەد بهێنێ، کاتا حەزرەتی فاطیمە بەمەی زانی، ڕۆیشت بۆ خزمەتی باوکی و سکالای لەم بارەیەوە لە دەست ئیمامی عەلی مێردی کرد و عەرزی کرد: خزمانی تۆ، بەقەسەی ئەوان بێ، تۆ لەسەر کچەکانت ناکەیتەوەو، ئەگەر مێردەکانیان ژنیان بەسەر بهێنن، تۆ لەسەریان هەڵنادەیتێ و لەم لایەنەوە دەربەست نایەیت، هەر لەم بۆ چوونەو بیرو باوڕەوەیە، کە

(٢٣٢) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل سعد... رقم: ٢٤١٢ .

(٢٣٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل فاطمة بنت النبي... رقم: ٢٤٤٩ .

ئەوە تا عەلی دەیەوێ هەوێ بەسەرم بهێنێ و جەمیلەی کچی ئەبو جەهل مارە بکا بۆ خۆی جا ئایا ڕاستە کەتۆ لەسەر ئێمە ناکەیتەوەو لە مێردەکانمان شتیوا قەبوولّ دەکەن هەوێمان بەسەر بهێنن؟

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەڵسایەوە لەم بارەیەوە، وتارێکی فەرموو، بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر دوانگە، وتارێکی داو شایەتمانی هێناو ئەو جا فەرمووی: (لەپاش ئەمە، من ژنم دابە ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع، ئەو پیاوە گفتی داپێم، کەژن بەسەر زەینەبی کچم نەهێنێ، ئەو پیاوە ڕاستی لەگەڵ کردم و قسەی خۆی پیاوانە بردە سەر، فاطیمەی کچی موحەممەد پارچەیەکە لە من، بەڕاستی حەزناکەم کەس دڵی بڕەنجێنێ و تووشی سەراسێی بکا، ئەوەی ڕاست بێ سوێندم بەیەزدانی پاك هەرگیز شتی وا نابێ، کە کچی پێغەمبەری خواو کچی ئەبو جەهلی دوژمنی خودا لەلای یەك پیاو کۆببنەوەو ببن بەهەوێی یەکتر) ئیتر عەلی وازی لە خوازبێنیێیەکەی هێنا. (تاج/٥ ل/١٠٨ ز/١٩ ف/١+٢).

١٤٦٧ م- وعنهُ قال سَمِعْتُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَذَكَرَ صِهْرًا لَهُ مِنْ بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ فَاثنَى عَلَيْهِ فِي مُصَاهَرَتِهِ ايَاهُ فَاحْسَنَ قَالَ حَدَّثنِي فَصَدَقَنِي وَوَعَدَنِي فَوَفَى لِي)(٢٣٤).

دیسان میسوەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) باسی زاوایەکی خۆیی زۆر بە جوانی دەکرد، کەلە نەوەی عەبدی شەمس بوو، فەرمووی: (قسەی بۆم کردو قسەکەی ڕاست دەرچوو، بەڵێنی پێم داو بە لێنەکەی بردە سەر لەگەڵما).

ئەم دوو فەرموودەیە جوانترن بەلگەن لەسەر ئەوە ژن یان وەلی و هەقداری ژن لەپێش مارەبڕین دا مافی ئەوەی هەیە: کە بەڵێن لەمێرد وەربگرێ کە هەوێی بەسەر نەهێنێ.

---

(٢٣٤) لاحظ رقم: ١٤٦٧ .

١٤٦٨- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْثا وَامَّرَ عَلَيْهِمْ اسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ فَطعَنَ بَعْض النَّاسِ فِي امَارَتِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انْ تَطعُنُوا فِي امَارَتِهِ فَقَدْ كُنْتُمْ تَطعُنُونَ فِي امَارَةِ ابِيهِ مِنْ قَبْلُ وَايْمُ اللّٰهِ انْ كَانَ لَخَلِيقًا لِلامَارَةِ وَانْ كَانَ لَمِنْ احَبِّ النَّاسِ الَيَ وَانَّ هَذا لَمِنْ احَبِّ النَّاسِ الَيَ بَعْدَهُ (الحديث: ٣٧٣٠، اطرافه في: ٤٢٥٠، ٤٤٦٨، ٤٤٦٩، ٦٦٢٧، ٧١٨٧)[٢٣٥].

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەشکرێکی ناردو ئوسامەی کوڕی زیدی کرد بە سەر لەشکریان، هەندێ کەس تانووتیان لە فەرمانـدەیی ئوسامە دەدا، گوایە منالْکارە و کۆنە کۆیلەیە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (خۆ ئە گەر ئێوە ئیستا تانەو تانووت لە فەرماندەیی، ئوسامە بدەن، ئەوە شتێکی تازەنییە، چونکە لە مەپێش تانووتتان لەسەر کردەیی زەیدی کوڕی حارسەی باوکیشی دەدا، گوایە دەیانگوت: زەید بەندەی ئازاد کراوە، چۆن دەبێ ببێ بەسەر لەشکری سوپایی، کە زۆرینەیان پیاوی بەتەمەن و ئازادن! دەسا بەهەقێ کەهەقی خودایە، باوکیشی وەك خۆی شایستەی فەرمانڕەایی و سەرکردەیی بوو، وە زۆر زۆرۆیش خۆشەویستم بوو، وەلە پاش خۆی ئەم کو ڕەیم زۆر زۆر خۆش دەوێ) (تاج/٥ ل/١٢٣ ز/٢٣ ف/١- گەورەیی زەیدی کوڕی حاریسە) + (ژ: ١١١٣تەجرید = ١٣٩ فەتحولباری = بەرگی یەکەم ل/١٣٧).

١٤٦٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) قَالَتْ دَخَلَ عَلَيَ قَائِفٌ وَالنَّبِيُّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَاهِدٌ وَاسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ مُضطجِعَان فَقَالَ: انَّ هَذِهِ الاقْدَامَ بَعْضهَا مِنْ بَعْض قَالَ فَسُرَّ بِذلِكَ النَّبِيُّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاعْجَبَهُ فَاخْبَرَ بِهِ عَائِشَةَ(الحديث: ٣٧٣١، اطرافه في: ٣٥٥٥، ٦٧٧٠، ٦٧٧١)[٢٣٦].

---

(٢٣٥) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضل زيد بن حارثة واسامة بن زيد ، (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُما) . رقم: ٢٤٢٦ .

(٢٣٦) والحديث اخرجه مسلم في النكاح (عيني /١٦ص١١٠) - المترجم .

عائیــشه (رەزای خــودای لــێ بــێ) فــەرمووی: ڕۆژێ حــەزرەت (درودی خــودای لــێ بــێ) تەشـریفی هـات بـۆ لام زۆر کـەیفی خـۆش بـوو، لـە خۆشیانا نـوور لـە ڕووی دەبـاری، فـەرمووی: ئـەی عائیـشە! دەزانیـت کـە موجـەززیزی مودلـەجی، کـە شێوە ناسێکی بەناوبانگ بوو هات بۆلام، لەوکاتەدا ئوسامەو زەیدی بـاوکی لـە ژێر پارچەیەك قەدیفەدا ڕاکشابوون، سەری خۆیان داپۆشیبوو، بـەڵام قاچیان بـەدەرەوەبوو، موجـەززیز لەسـەر ئـەم حاڵـە کـە چاوی پێیـان کـەوت، گوتی: خاوەنی ئەم قاچانە بـاوك و کـوڕن! (تـاج +٣ ل/١٣٧ ز/٧٢ ف/١- ش/ د/ ت/ ن- ئەمە گێڕانەوەی تاجە، کە باشترین ڕاڤەو ڕوونکەرەوەیـە بـۆ ئـەم گێڕانـەوەی ئێرە).

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

ئوسـامەی کـوڕی زەیـدی کـوڕی حاریـسە، خـۆی ڕەشـکەڵە بـوو، بـەڵام زەیدی باوکی سپی بوو، لەبەر ئەوە لەسەردەمی نەزانیـدا تانـەی خراپیـان لـە ئوسامە دەدا، گوایـە کـوڕی بـاوکی خـۆی نییـە) چـۆن دەبـێ خـۆی ڕەش بـێ و باوکی سپیکە لە بێ؟ بڕوانە ژمارە:١١٣ ت =١٣٩ فـ= بەرگی یەکـەم لاپـەڕە: ١٣٧- ١٣٨. باسی شێوەناسی (ئـائیف)والـە بـەرگی سـێیەمی تـاجول ئوصـووڵ دا ل/١٧ ز/٧٢).

١٤٧٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) انَّ امْـرَاةً مِـنْ بَنِـي مَخْـزُومٍ سَـرَقَتْ فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) فَلَـمْ يَجْتَـرِئْ احَـدٌ انْ يُكَلِّمَـهُ فَكَلَّمَهُ اسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ فَقَالَ انَّ بَنِي اسْرَائِيلَ كَانَ اذا سَـرَقَ فِـيهِمْ الـشَّرِيفُ تَرَكُـوهُ وَاذا سَرَقَ فِيهِمْ الضعِيفُ قَطعُوهُ لَوْ كَانَتْ فَاطمَةُ لَقَطعْتُ يَدَهَا (الحديث: ٣٧٣٣، اطرافــــه في: ٢٦٤٨، ٣٤٧٥، ٣٧٣٢، ٣٧٣٣، ٤٣٠٤، ٦٧٨٧، ٦٧٨٨، ٦٨٠٠)[٢٣٧].

---

(٢٣٧) واخرجه مسلم في الحدود(عيني /١٣ص٢١١ —الحديث/١٤) انظر: (صم/١١ص١٨٦ = صحيح مسلم بشرح النووي ج/١١ص ١٨٦ - المترجم .

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێکی مەخزوومی دزی کردبوو، قورەیش زۆر بەتەنگیەوە بوون، گوتیان: بەکێ بڵێین کەلەبارمیەوە لەگەڵ پێغەمبەردا قسەبکا، هەتا داری حەددی دزیی لێ نەدرێ، جا گوتیان: کێ پرکێشی ئەوە دەکا لە ئوسامەی کوڕی زەیدبە و لاوە، کە خۆشەویستی پێغەمبەرە.

جاکاتێ کە ئوسامە ئەوەی عەرزی کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) تووڕە بوون، فەرمووی: (چۆن هەڵەی وا دەکەی؟ چۆن تکادەکەی بۆ جێ بەجێ نەکردنی حەددێکی شەرعی، کە خودا خۆی دایناوە) ئەو جا هەستاوە دوانێکی لەم بارەیەوە فەرموو، فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! دەزانن بۆچی نەتەوەکانی پێش ئێوە لە ناوچوون؟ چونکە کاتێ کەسێکی خانەدان لەناویان دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، بەڵام ئەگەر لازمبوون و بانەواکانیان دزی بکردایە حەددیان لێ دەدا، جوولەکەکان وابوون، حەددیان لە ئاغا و بەگەکانیان نەدەدا، بەڵام هەژارێکیان دزی بکردایە دەستیان دەبڕی.

جا سوێندم بەیەزدانی پاك من ناهەقی وا قەبووڵ ناکەم، گریمان فاطیمەی کچیشم دزی بکا، بەپێی یاسانامەی خوا دەستی دەبڕم!). (تاج/٣ ل/٢٦٤ ز/١٠٠ ف/٧).

**ڕونکردنەوە:**

ئەم ژنە ناوی فاطیمەی کچی ئەسوەد بوو، لە غەزای فەتح دا هەندێ خشڵی دزی، کاتێ مەسەلە کە گەیشتەوە بە پێغەمبەر، وەبەپێی شەرع چەسپاکە دزی کردووە، وە هەموو مەرجەکانی دەست بڕین هاتنەتەجێ، فەرمانی فەرموو دەستیان بڕی.

لەوەدوا تەوبەیەکی جوانی کرد، وەشووی کرد، وە زۆر جار کارا، شتێکی ببوایە، دەهات بۆلای حەزرەتی عائیشە، ئەویش داخوازییەکەیی عەرزی پێغەمبەر دەکرد و ئەویش بۆی جێ بە جێ دەکرد.

ئەم جۆرە کەسانە باگوناهی گەورەشیان لێ بقەومێ، بەلام هەربە صەحابە دادەنرێن و بۆگێڕانەوەی فەرموودەو حەدیث (عەدل) دەژمێرێن.

١٤٧١- عَنْ اسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) حَدَّث عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انَّهُ كَانَ يَاخُذهُ وَالْحَسَنَ فَيَقُولُ اللَّهُمَّ احِبَّهُمَا فَانِّي احِبُّهُمَا (الحديث: ٣٧٣٥، طرفاه في: ٣٧٤٧، ٦٠٠٣)[٢٣٨].

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) من وحەسەنی کوڕی عەلی هەڵ دەگرتو منی دەخستە سەر ڕانێکی و حەسەنیشی دەخستەسەر ڕانەکەی تری و دەیفەرموو: (ئەی خودایە! تۆ بەشایەت بە کە من ئەم دوانەم خۆش دەوێ، خودایە! تکام وایە کەتۆش خۆشت بوێن!).

١٤٧٢- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهما) عَنْ اخْتِهِ حَفْصَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهَا انَّ عَبْدَ اللَّهِ رَجُلٌ صَالِحٌ. (الحديث: ٣٧٤٠، اطرافه في: ١١٢١، ١١٥٦، ٣٧٣٨، ٧٠١٥، ٧٠٢٨، ٧٠٣٠) و (الحديث: ٣٧٤١، اطرافه في: ١١٢٢، ١١٥٧، ٣٧٣٩، ٧٠١٦، ٧٠٢٩، ٧٠٣١)[٢٣٩].

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: حەفصەی خوشکم کە هاوسەری پێغەمبەرە، بۆی گێڕامەوە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پێی فەرمووم: (عەبدوڵلا پیاوی چاکە).

---

(٢٣٨) لم يستثنه العسقلاني عن الاحاديث المتفق عليها (خاتمة احاديث المبحث و ما بعدها ج/٧ ص٢٧٨) — المترجم .

(٢٣٩) راجع(رقم: ٥٥٩ت = ١١٢١ف +١١٢٢ ف)- المترجم .

١٤٧٣ - عَنْ عَلْقَمَةُ رحمه اللهُ تعالى، قال: قدمتُ الشّامَ، فصلّيتُ ركعتين، ثمّ قلتُ: اللّهُمَّ يَسِّرْ لِي جَلِيسًا صَالِحًا فاتيتُ قوما، فجلستُ اليهم، فاذا شيخٌ قد جاء، حتّى جلس الى جنبِي. قلتُ: منْ هذا؟ قالوا: ابُو الدَّرْدَاء فقلتُ: انّي دعوتُ الله ان ييسّرَ لي جليسا صالحا، فيسّرَكَ لي، فقالَ ابُو الدَّرْدَاء (رَضيَ اللهُ عنهُ): مِمَّنْ انتَ؟ قَالَ: مِنْ اهْلِ الْكُوفَةِ قَالَ: الَيْسَ فِيكُمْ اوْ مِنْكُمْ صَاحِبُ السِّرِّ الّذي لا يَعْلَمُهُ غَيْرُهُ يَعْنِي حُذَيْفَةَ قَالَ: قُلْتُ: بَلَى قَالَ: الَيْسَ فِيكُمْ اوْ مِنْكُمْ الّذي اجَارَهُ اللّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَعْنِي مِنْ الشَّيْطَانِ يَعْنِي عَمَّارًا قُلْتُ: بَلَى قَالَ: الَيْسَ فِيكُمْ اوْ مِنْكُمْ صَاحِبُ السِّوَاكِ وَالْوِسَادِ اوْ السِّرَارِ؟ قَالَ: بَلَى قَالَ: كَيْفَ كَانَ عَبْدُ اللّهِ يَقْرَا وَاللّيْلِ اذا يَغْشَى وَالنَّهَارِ اذا تَجَلّى؟ قُلْتُ: وَالذكَرِ وَالانْثى قَالَ: مَا زَالَ بِي هَؤُلاء حَتَّى كَادُوا يَسْتَزِلُونِي عَنْ شَيْء سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ). (الحديث: ٣٧٤٢، اطرافه في: ٣٢٨٧، ٣٧٤٣، ٣٧٦١، ٤٩٤٣، ٤٩٤٤، ٦٢٧٨)[٢٤٠].

عەلقەمە (سۆزو میهرەبانی خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ شام، کاتێ گەیشتمە دیمەشق چوومە مزگەوت، دووڕکات نوێژم تیا کرد و گوتم: ئەی خودایە! هاونشینێکی باشم بۆ بڕەخسێنە، جا کۆمەڵێ لەوێ بوون، چووم لەلایان دانیشتم، جا زۆری نەبرد چاوم لێ بوو پیرەمێردێ هات، لەتەنیشتمەوە دانیشت، پرسیم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەبو دەردایە (بڕوانە: ژمارە: ٨٩٧ت = ١٩٤٥ف= بەرگی/٢ ل/٢٨٣). گوتم: ئومێدە خودا نزاکەی گیراکردبم.

پێم گوت: کاتێ هاتم بۆ ئێرە لەخوا پاڕامەوە هاونشینێ خاسم بۆ بڕەخسێنێ، ئەوە تا تۆی بۆم ڕەخساند، ئەبودەرداء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: تۆ

(٢٤٠) ووقع في رواية داود بن ابي هند عن الشعبي عن علقمة في هذا الحديث: (وان هؤلاء يريدون ان ازولَ عمّا اقرأني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ويقولون لي: اقرا: ﴿وما خلق الذكر والانثى﴾واني والله لااطيعهم اخرجه مسلم (فتح/٨ص٧٠٧ ، رقم: ٤٩٤٤) - المترجم .

خەڵکی کوێیت؟ گوتم: خەڵکی کووفەم، فەرمووی: لەقسەتەوە وادیارە کە فێرخوازی و وێڵی بەشوێن زانینا خۆ ئەوپیاوە داناو زانایەی کەناوداره بەرازگری پێغەمبەر (صاحب سر النبی بروانە: ژمارە:١٦٣ تەجرید=٢٢٤فەتح =بەرگی/ ١ ل/١٨٣) وا لەناو ئێوە دا، کە ئەو نهێنی و رازانەی کە پێغەمبەر گوتونی پێی، هەر خۆیدەیانزانی واتە:حوزەیفەی کوڕی یەمانتان لەناودایە، هەرچی پرسیارێکتان هەبێ دەتوانن لەو بپرسن. منیش گوتم: بەڵێ وایە فەرموویەوە: خۆ ئەو پیاوە زانایەشتان وا لەناودا، کە لەسەر زمانی پێغەمبەرخۆی، خودا پەنای داوە لەشەیتا، واتە: عەمماری کوڕی یاسیر (بڕ: ژ:١٤٥١ ت=٣٦٦١ف= بەرگی/٤ ل ).

منیش گوتم: بەڵێ فەرمووی:خۆ خاوەنی سیواك، یاخاوەنی سڕو رازیشتان والە ناودا، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود؟ گوتم: بەڵێ واتە: زانای گەورە گەورە لەلای خۆتان زۆرە، ئیتر چ پێویست شت لە کەسی تر بپرسن.

لە پاشدا فەرمووی: ئەرێ پێم بڵێ: ئیبنو مەسعوود ئەم ئایەتەی چۆن دەخوێند: ﴿والليل اذا يغشى والنهار اذا تجلى﴾ی چۆن دەخوێندەوە؟ منیش گوتم: ئاوای دەخوێندەوە: ﴿والليل اذا يغشى والنهار اذا تجلى والذكر والانثى﴾. ئەوجا ئەبودەرداء فەرمووی: (پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەزاری پیرۆزی خۆی ئەم سوورەتەی پێ گووتم و ئەم سوورەتەم بە دەمی خۆم لە دەمی پێغەمبەر خۆی لەسەر ئەم شێوەیە: ﴿والليل اذا يغشى والنهار اذا تجلى و الذكر والانثى﴾ وەر گرتووە، کەچی ئێستە ئەمانە هەر وازیان لێ نەدەهێنام و دەیانویست کە منیش ببەنە سەرقیرائەت و شێوە خوێندنەوەی خۆیان و، لە باتی ڕستەی: (والذكر والانثى) منیش وەك شێوە خوێندنەوەی ئەوان بخوێنمەوە: ﴿وما خلق الذكر والانثى﴾. (تاج/٥ ل/١٣٤ ز/٢٨- چاکێتی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود).

**ڕوونکردنەوە:**

کێشەی شێوە خوێندنەوەکانی قورئان ئێستا بووە بە زانستێکی سەربەخۆ، لە عولومی قورئان و لەعولومی حەدیث دا بەدوور و درێژی قسە و گفتۆگۆی چڕو پڕو خەست و خۆڵی لەسەر کراوەو سوودو بەهریەکی زۆری ئوصوڵی و فیقهی لێ وەرگیراوە. عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودایان لێ بێ) یەکێکە لە گەورە هاوڕێ یانی پێغەمبەر، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، دوو کۆچی کردووە، یەکێ بۆ حەبەشە و یەکێ بۆ مەدینە، ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگاکانی پاشی بووە، هەمیشە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، مەگەر چۆنها خزمەتی چۆڵ بکردایە، خزمەتی پێلاوەکانی پێغەمبەری دەکرد، لەکاتی هەستانا پێلاوەکانی دادەنا بۆی، وەکی ترسۆلەکانی دەکردە قۆڵی خۆی، هەشت سەدو چل وهەشت فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، چلو چواریان بۆخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە، بیست و یەکیان تەنها لە بوخاریدا هەن، لە موسلیم دانین، سیی و پێنجیشیان تەنها لە صەحیحی موسلیم دا هەن لە صەحیحی بوخاریدا نین.

دەفەرموێ: لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لێ بێ) حەفتا سوورەتی قورئانم لە بەرکردووە. یەکەم کەس بوو کە لە مەککە بە ئاشکرا قورئانی دەخوێند، ئیبنومەسعوود ئەوەندە لەگەڵ ماڵی پێغەمبەردا تێکەڵ بوو، لەخەڵکی وایە کە یەکێکیە لەخێزانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ناوداربووبە صاحیبی سیواکی پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) مۆژدەی بەهەشتی پێ داوە، بکوژی ئەبو جەهل بوو، لە مەدینە، ساڵی سیءودووی کۆچی لەتەمەنی شەست و هەندێکا ئەمری هەقی بە جێ هێنا، ئیمامی عوسمان نوێژی تەرمی لەسەر کرد.

مامۆستایەکی قورئانزان و فەرموودەزان بوو، قوتابی و فەقێی زۆر هەیە لەم دوو بوارەدا، ژنەکەی ناوی زینەب بوو، بۆ زیاترشارەزا بوون لە

ژینامەی ئەم هاوڕێ مەزنەی پێغەمبەر، بڕوانە: تاج/٥ ل/١٢٣ ز/٢٨ - باسی: گەورەیی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود.

١٤٧٤- عَنْ انس بْن مَالِكٍ انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: انَّ لِكُلِّ امَّةٍ امِينًا وَانَّ امِينَنَا ايَّتُهَا الامّة ابُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ. (الحديث: ٣٧٤٤، طرفاه في: ٤٣٨٢، ٧٢٥٥)[٢٤١].

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هەموو نەتەوەیێ ئەمینداریێکی هەیە) ئەمینداری ئێمەیش ئەی ئۆمەتی موحەممەد! ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحە) (تاج/٥ل- ٩١ز- ١٣ف- ١- ش/ت- باسی: گەورەیی ئەبو عوبەیدە..).

١٤٧٥- عن الْبَرَاء (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ: (رَايتُ النَّبِيَ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْحَسَنُ بْنُ عَلِيّ عَلَى عَاتِقِهِ يَقُولُ: اللّٰهُمَّ انِّي احِبُّهُ احِبَّهُ). (الحديث: ٣٧٤٩). (انظر: رقم: ٩٦٠ = بەرطی/٣ ل/٣٣)[٢٤٢].

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەرم بینی، حەسەنی کوڕی عەلی بە قەلاندۆشکانەوەبوو، دەیفەرموو: (خودایە! من ئەمەم خۆش دەوێ، سا تۆیش خۆشت بوێ!). (تاج/٥ ل/١١٤ ز/٢٠ ف/٣- ش/ت- باسی گەورەیی حەسەن و حوسەین).

١٤٧٦- عن ابْن عُمَرَ وَسَالَهُ عَنْ الْمُحْرِمِ قَالَ شُعْبَةُ احْسِبُهُ يَقْتُلُ الذباب؟ فَقَالَ: اهْلُ الْعِرَاقِ يَسْالُونَ عَنْ الذبابِ وَقَدْ قَتَلُوا ابْنَ ابْنَةِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هُمَا رَيْحَانَتَايَ مِنْ الدُّنْيَا (الحديث: ٣٧٥٣، طرفه في: ٥٩٩٤)[٢٤٣].

---

(٢٤١) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل ابي عبيدة، رقم: ٢٤١٩ .

(٢٤٢) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل الحسن و الحسين رضي الله عنهما، رقم: ٢٤٢٢.

(٢٤٣) لم اعثر على مصدر يشير الى اخراج مسلم لهُ وقال العسقلاني في خاتمة كتاب مناقب الانصار ج/٧ص٥٥٠ ط.ج ، لم يوافقه مسلم على اخراج حديث ابن عمر فيهما — المترجم.

ئەم فەرموودەیە لە تاج دا ئاوایە: پیاوێکی خەڵکی غێراق لە ئیبنو عومەری پرسی: ئەگەر کەسێ لەئیحرام دا بێ و مێش بکوژێ چی فیدیەیەکی لەسەرە؟ ئیبنو عومەریش فەرمووی: خەڵکی عیراق، حسێنی کچەزای پێغەمبەر دەکوژن و لەمێش کوشتن دەپرسن! وەلحاڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (حەسەن و حوسیەن دوو چڵە ڕێحانەی منن لەدنیای ڕۆشن دا!). (بڕوانە: تاج/٥ل- ١١٣ز- ٢٠ف- ١) + (بڕوانە: ژمارە/١١٢٩ تجرید).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

١- کەسانێ هەن کورد گوتەنی لە مازواناتێ دەشکێن و دەیانەوێ لە گزگلانا هەڵبسنەوە، جا لەسەر ئەم بنیاتە، ئیبنو عومەر سەرسامی پیشان داوە، کە خەڵکی عیراق تاوانی گەورە تێ دەگوشن، وەك کوشتنی حەزرەتی حوسەینی کچەزای پێغەمبەر بێ، کەچی لەهەمان کاتدا وەرع لە کوشتنی مێش دەکەن!

٢- بۆیە منالّ بەرەیحانە دەچوێنرێ، چونکە منالّیش وەك ڕێحانە بۆنی دەکرێ و دەنرێ بە سینگەوەو چاوو دڵی پێ ڕۆشن دەبنەوە.

٣- گەرچی گەلێ جار ئەوانەی کە نیسبەتی کارێکیان لێ دەدرێ، هەموویان ئەو کارە ئەنجام نادەن، و هەیانە لە دڵەوە ئەوکارە دە کەرهێنێ، بەلاّم زۆر جار هەندێ کار دەدرێتە پالّ زۆرینەی کۆمەڵێ، کە ناسرابن بەو جۆرە شتە، بەلاّم بەبێ گومان کوردستانی خۆمان، بەهەموو بەشەکانیەوە، بەر ئەم عیراق و مەشریقە ناکەوێ کە لەفەرموودەی پیرۆزدا، باسی خراپی کراوەو هەواڵ دراوەکە شەڕ لەویوە سەر هەڵ دەدا، چونکە سوپاس بۆ خودا کوردستان ئەوەتی چووە تە باوەشی قورئانەوە، خزمەتی ئیسلامی کردووە، هەروەك لەپەنای ئیسلاما گەشەی کردووە و خودا پەنای داوە، کەم

گەل و نەتەوە هەیە کە بەقەد گەلی کورد خزمەتی ئیسلامی کردبێ، ئەوەندە مزگەوت و پەرستگاو شێخ و مەلا و فەقێ و قورئان وموسولمانی پاك و پیرۆزی تیابێ! سوپاس بۆ خودا. لەئەهلی دلم بیستووە هەتا ئیسلام لەچیاکانی مەککەو مەدینە ئاوانەبێ، لەچیاکانی کوردستانیش ئاوا نابێ، کە ئەوەش بەر لەهەلهاتنی قیامەت دەبێ.

١٤٧٧ - عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُما) قَالَ ضَمَّنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى صَدْرِهِ وَقَالَ: اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ وفي رواية عَلِّمْهُ الْكِتَابَ (الحديث: ٣٧٥٦، طرفه في: رقم: ٦٦ تجريد =٧٥ فتح= بەرگی یەکەم ل/٨٩)[٢٤٤].

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) گوشیمی بە سنگیەوەو فەرمووی: (اللهم علمه الحكمة: ئەی خودایە! فێری دانایی و زانستی بالای بفەرموو).

١٤٧٨ - عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَعَى زَيْدًا وَجَعْفَرًا وَابْنَ رَوَاحَةَ لِلنَّاسِ قَبْلَ انْ يَاتِيَهُمْ خَبَرُهُمْ فَقَالَ اخَذ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَاصِيبَ ثمَّ اخَذها جَعْفَرٌ فَاصِيبَ ثمَّ اخَذ ابْنُ رَوَاحَةَ فَاصِيبَ وَعَيْنَاهُ تَذرِفَانِ حَتَّى اخَذها سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللَّهِ حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ. (الحديث: ٣٧٥٧، طرفه في: ٦٠٤ تجريد= ١٢٤٦ فتح)[٢٤٥].

واتاو وەرگەڕاوەکەی لە ژمارە: (٤٠٦) دا، بە تەواوی ڕابورد.

١٤٧٩ - عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُما) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اسْتَقْرِئُوا الْقُرْآنَ مِنْ ارْبَعَةٍ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَبَدَا بِهِ وَسَالِمٍ مَوْلَى ابِي حُذيْفَةَ وَابَيِّ بْنِ كَعْبٍ وَمُعَاذ بْنِ جَبَلٍ قَالَ لا ادْرِي بَدَا

---

(٢٤٤) راجع رقم:٦٦ت= ٧٥ف=بەرگی یەکەم ، لاپەڕە:٨٩ - المترجم .

(٢٤٥) راجع رقم:٦٠٤ت=١٢٤٦ف=بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٢٦- المترجم وراجع ايضا رقم: ١٥٨٠ تجريد .

بابَيّ اوْ بِمُعَاذ بْنِ جَبَلٍ (الحديث: ٣٧٥٨، اطرافه في: ٣٧٦٠، ٣٨٠٦، ٣٨٠٨، ٤٩٩٩)(٢٤٦).

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی خۆشەویستم بیستووە دەیفەرموو: (لەلای ئەم چوار کەسە قورئان بخوێنن و فێری‌قورئان ببن: لەلای عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودو سالمی ئازادکراوی ئەبو حوزەیفەو ئوبەییەی کوڕی کەعب و موعازی کوڕی جەبەل). پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لە پێش دا ناوی ئیبنومەسعوودی هێنا، بۆ گرنگی پێدانی پتر پێی). (تاج/٥ ل/١٣٢ ز/٢٨ ف/١).

١٤٨٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) انَّهَا اسْتَعَارَتْ مِنْ اسْمَاء (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قِلادَةً فَهَلَكَتْ فَارْسَلَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَاسًا مِنْ اصْحَابِهِ فِي طَلَبِهَا فَادْرَكَتْهُمْ الصَّلاةُ فَصَلَّوْا بِغَيْرِ وُضوء فَلَمَّا اتَوْا النَّبِيَ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَكَوْا ذلِكَ الَيْهِ فَنَزَلَتْ ايَةُ التَّيَمُّمِ فَقَالَ اسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ جَزَاكِ اللّهُ خَيْرًا فَوَاللّهِ مَا نَزَلَ بِكِ امْرٌ قَط الا جَعَلَ اللّهُ لَكِ مِنْهُ مَخْرَجًا وَجُعِلَ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ بَرَكَةٌ(الحديث: ٣٧٧٣، طرفه في: ٢١٦ت = ٣٣٤ف= بەرگی یەکەم لاپەڕە/٢٢٣ وەرگەڕاوەکەشی لەوێ رابوورد)(٢٤٧).

١٤٨١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (كَانَ يَوْمُ بُعَاث يَوْمًا قَدَّمَهُ اللّهُ لِرَسُولِهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَدِمَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ افْتَرَقَ مَلَؤُهُمْ وَقُتِلَتْ سَرَوَاتُهُمْ وَجُرِّحُوا فَقَدَّمَهُ اللّهُ لِرَسُولِهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي دُخُولِهِمْ فِي الاسلامِ). (الحديث: ٣٧٧٧، طرفاه في: ٣٨٤٦، ٣٩٣٠)(٢٤٨).

---

(٢٤٦) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل عبدالله بن مسعود وامه ... رقم: ٢٤٦٤ .

(٢٤٧) اخرجه مسلم في الحيض، باب: التيمم ، رقم: ٣٦٧ .

(٢٤٨) لم يستثنه العسقلاني من الاحاديث المتفق عليها – المترجم .

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی بوعاس، ڕۆژێك بوو، خودای گەورە لە بەرخاتری پێغەمبەری خوا (درودی خودای لێ بێ) وەپێشی خستبوو، جاکاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) هات بۆ مەدینە، کۆمەڵەیان بلاو بوو بۆوە، شاپیاوەکانیان کوژرابوون، وە زامار و پەککەوتە بوو بوون، لەبەر ئەوەکەس نەمابوو لە مەدینە لافی سەرۆکی لێ بداو مل بۆ پێغەمبەر کەچ نەکا، جا خودا ئەو ڕۆژەی قەومان پێش هاتنی پێغەمبەر بۆ ئەوێ بەچەند ساڵێ، وە ئەو بارو دۆخەی ئەم شەڕە سازاندی، بوو بە هۆی ئەوەکە خەڵکی مەدینە بە ئاسانی بچنە ژێر ئالای ئیسلام).

**ڕوونکردنەوە:**

ڕۆژی بوعاس شەڕێ بوو، لە نێوانی دوو هۆزی سەرەکی مەدینەدا ڕووی دا، کە هۆزی ئەوس و خەزرەج بوون، بوعاس قەلایەکی هۆزی ئەوس بوو، دوومیل لە مەدینەوە دوور بوو، بە پێنج ساڵ لە پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) بۆ مەدینە، ئەم هەرایە قەوماوە، زۆرینەی سەرکردەکانی ئەم دوو هۆزە لەم شەڕە دا کوژران، وە جۆرە پاشاگەردانی یەك و بێ یاسایی و بێسەرکردەیی یەك لە مەدینەدا دروست بوو بوو، ئەوە بوو بەهۆی ئەوەکە ئیسلام بە ئاسانی جێ پای خۆی بکاتەوەو ئەوبۆ شایی یە پڕ بکاتەوە.

ارهاصاتێکی زۆر پێش لە دایکبوونی پێغەمبەرو لە پاش لەدایك بوونی و لەپێش بوونی بەپێغەمبەرو بەر لە کۆچ کردنی ڕووی داوە، وەك ڕووداوی ئەصحابول فیل و لەتکردنی سینگی پێغەمبەر بە منداڵی و پیرۆزی و پیتەو فەڕی کاتی لە دایکبوونی و مۆری پێغەمبەرایەتی بە ناوشانیەوە و بەردو دار سلاوی لێ کردووەو گەلێ هەواڵی تری لەم بابەتە، کە بە موجلیان دەگەنە حەددی تەواتور بڕوانە: بەرگی چوارەمی تاجول ئوصوول، لاپەڕە/٢٨٠- ٢٨٨ ز/٩٢، ٩٣، ٩٤).

١٤٨٢- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَوْلا الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَا مِنْ الانْصار(الحديث: ٣٧٧٩، طرفهُ في: ٧٢٤٤) (٢٤٩)

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (یاریدەدەران واتە: ئەنصار لە هەرشیوو هەردێکەوە بڕۆن منیش لەگەڵ ئەوانا دەڕۆم وخۆم لەوان جیا ناکەمەوە، لەبەر ئەوە نەبێ کە کۆچکار و موهاجیرم، دەنا بابایێ دەبووم لەیاریدەدەران، کەناسراون بە ئەنصار). (تاج/٥ ل/١٧٦ ز/٤٤ ف/٥).

١٤٨٣- عنْ الْبَرَاء (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الانْصار لا يُحِبُّهُمْ الا مُؤْمِنٌ وَلا يُبْغِضُهُمْ الا مُنَافِقٌ فَمَنْ احَبَّهُمْ احَبَّهُ اللَّهُ وَمَنْ ابْغَضَهُمْ ابْغَضَهُ اللَّهُ). (الحديث: ٣٧٨٣)(٢٥٠).

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (موسوڵمان یاریدەدەران (ئەنصار)ی خۆش دەوێ، ناپاك (دوو ڕوو=مونافیق)یش رقی لێیانە، ئیتر ئەوەی ئەنصاری خۆش دەوێ خودایش ئەوی خۆش دە وێ، وە ئەوەی ڕقی لەوانە خوداش ڕقی لەوە!). (تاج/٥ ل/١٦٧ ز/٤٤ ف/١- ش/ت).

ڕونکردنەوە:

کۆمەڵگای ئیسلام لەسەرتاوە لە مەدینە بە شێوەی سەرەکی برێتی بوو، لە دوو کۆمەڵەی گەورە:

(٢٤٩) لم يستثنه العسقلاني من الاحاديث المتفق عليها— المترجم .

(٢٥٠) اخرجه مسلم في الايمان ، باب : الدليل على ان حبَّ الانصار وعلي رضي الله عنه من الايمان، رقم: ٧٥ .

یەکەم: کۆمەڵەی کۆچکاران کە ئەو موسوڵمانانە بوون، لەمەککەوە، لە تاو دەستدرێژیی ناموسوڵمانەکان لێیان، کۆچ و باریان کرد بۆ مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خۆشییەکێ بوو لەم کۆچبەرانە.

دووەم: کۆمەڵەی یاریدەدەران کە بریتی بوون لەوانەی کە خەڵکی مەدینە بوون و موسوڵمان بوو بوون، کۆمەڵەی یەکەم ناسراون بە موهاجیرین، واتە: کۆچکاران، کۆمەڵەی دووەم ناسراون بە ئەنصار، واتە: یاریدەدەران.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ ڕوونکردنەوەی بەرزیی پلەو پایەی ئەنصار ئەم فەرموودەیەی فەرموو، لەگەڵ چەند فەرموودەیەکی تری لەم بابەتە.

١٤٨٤- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: رَاى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النِّسَاء وَالصِّبْيَانَ مُقْبِلِينَ مِنْ عُرُسٍ فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُمْثِلا فَقَالَ: اللَّهُمَّ انْتُمْ مِنْ احَبِّ النَّاسِ الَيَّ قَالَهَا ثلاث مِرَارٍ(الحديث: ٣٧٨٥، طرفه في: ٥١٨٠)[٢٥١].

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کۆمەڵێ ژن‌و منالی یاریدەدەرانی دی لە شایی و زەماوەند دەگەڕانەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ تەعبیر لەهەستی جوانی و ڕێزو نرخزانی خۆی بەرامبەربەم دوو چین و توێژەی کۆمەڵگا، ڕێك هەڵسایە سەرپاو ڕاست ڕاوەستاو سێ جار فەرمووی: (خودا ئاگای لێیە کە ئێوە لە خۆشەویسترین کەسانن لای من). (تاج/٥ ل/١٦٧ ز/٤٤ ف/٣- ش).

١٤٨٥- وعنهُ في روايةٍ، قَالَ: جَاءتْ امْرَاةٌ مِنْ الانْصار الَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَكَلَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

(٢٥١) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل الانصار ﷺ .. رقم: ٣٥٠٨ .

فَقَالَ: (وَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ انَّكُمْ احَبُّ النَّاسِ الَيَّ مَرَّتَيْنِ) (الحديث: ٣٧٨٦، طرفاه في: ٥٢٣٤، ٦٦٤٥)(٢٥٢).

دیسان ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتێ لەهۆزی یاریدەدەران (ئەنصار)هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) منالێکی خۆیی پێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) قسەو گوفتوگۆی لەگەڵ دا کرد، وەفەرمووی: (بەو کەسە کەگیانی من وا لەدەسیا، ئێوە ئەی دەستەی یاریدەدەران! خۆشەویسترین کەسن لە لای من). سێ جار ئاوای فەرموو. لەگێڕانەوەی ئێرەدا دوو جار ئاوای فەرموو. (تاج/٥ ل/١٦٧ ز/٤٤ ف/٤).

١٤٨٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ ارْقَمَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قالَ: قَالَتْ الانْصار: يَا رَسُولَ اللّٰهِ لِكُلِّ نَبِيّ اتْباعٌ وَانَّا قَدْ اتَّبَعْنَاكَ فَادْعُ اللّٰهَ انْ يَجْعَلَ اتْباعَنَا مِنَّا فَدَعَا بِهِ. (الحديث: ٣٧٨٧، طرفه في: ٣٧٨٨)(٢٥٣).

زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: یاریدەدەران (ئەنصار) فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! هەموو پێغەمبەرێ لەکاتی خۆیا لایەنگیرو پەیڕەوانی تایبەتی خۆی بووە، ئێمەیش پەیڕەوانی تۆین و شوێن ڕێبازی پیرۆزی تۆ کەوتووین و خودا دەستی ڕێز و قەدری لێ ناوین و ناوی ناوین ئەنصار، جابۆ ئەوەی ئەم ڕێزو قەدرو بەهرەو سەربەرزییە، بەردەستو دەستو پێوەندو هاوپەیمانو سوێن خۆرە کانیشمان بگرێتەوە، دەی تۆ بفەرموو نزاو دوعامان بۆبکە، ئەویش ئەو نزایەی بۆکردنو فەرمووی: (خودایە! پەیڕەوان و شوێن کەوتوانیشیان لەخۆیان بن). (تاج/٥ ل/١٦٨ ز/٤٤ ف/٨).

(٢٥٢) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل الانصار ﷺ .. رقم: ٢٥٠٩ .

(٢٥٣) لم يوافقه مسلم (فتح/٧ص٥٥٠) خاتمة انظر صحيح مسلم ج/١٦ ص٦٨- ٧١ —مبحث فضائل الانصار ﷺ - المترجم .

١٤٨٧- عَنْ ابي حُمَيْدٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: انَّ خَيْرَ دُورِ الانْصار دَارُ بَنِي النَّجَّارِ ثمَّ عَبْدِ الاشْهَلِ ثمَّ دَارُ بَنِي الْحَارِث ثمَّ بَنِي سَاعِدَةَ وَفِي كُلِّ دُورِ الانْصار خَيْرٌ فَلَحِقَنَا سَعْدُ بْنُ عُبادَةَ فَقَالَ: ابواسَيْدٍ الَمْ تَرَ انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيَرَ الانْصار فَجَعَلَنَا اخِيرًا؟ فَادْرَكَ سَعْدٌ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ خُيِّرَ دُورُ الانْصار فَجُعِلْنَا اخِرًا؟ فَقَالَ: اوَلَيْسَ بِحَسْبِكُمْ انْ تَكُونُوا مِنْ الْخِيَارِ. (الحديث: ٣٧٩١، طرفه في: ٧١٣ت = ١٤٨١ فتح = بەرگی دووەم لاپەڕە/١٣٥)(٢٥٤).

لێرەدا لەکۆتاوە دەفەرموێ: جا گەیشتین بە سەعدی کوڕی عوبادە، ئەبو ئوسەید پێی فەرموو: ئایا دەزانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پلەو پایەی یاریدەدەرانی، لە باشیدا دیاری کرد، بەڵام ئێمەی بەنی ساعیدەی خستە دواوە؟ سەعدیش ڕۆیشت هەتا پێغەمبەری گرتەوەو عەرزی کرد: پێغەمبەری خوا ! ریزبەندی باشی پلەو پایەی یاریدەدەرانت دیاری کردووە، کەچی پلەی باشی خێڵی ئێمەت خستۆتە دواوە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (بەس نیە کەوان لە ریزی باشانا).

١٤٨٨- عَنْ اسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ انَّ رَجُلا مِنْ الانْصار قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ الا تَسْتَعْمِلُنِي كَمَا اسْتَعْمَلْتَ فُلانًا؟ قَالَ: سَتَلْقَوْنَ بَعْدِي اثرَةً فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الْحَوْض. (الحديث:٣٧٩٢، طرفه في: ٧٠٥٧)(٢٥٥).

ئوسەیدی کوڕی حوزەیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! منیش وەك فیسارەکەس بکە بەسەرکاری کارێ و لەسەر ئیشا دام بنێ، فەرمووی: (ئێوە دوای خۆم تووشی خۆ خۆیی و خۆپەرستی دەبن و نازی ئەم و ئەو دەدەن بەسەرتانا، جالەکاتی وادا ددان بە

(٢٥٤) راجع رقم: ٧١٣ ت = بەرطی / ٢ل — ١٣٥ ، اخرجه مسلم ، رقم: ١٠٣٩ — المترجم .

(٢٥٥) اخرجه مسلم في الامارة ، باب: الامر بالصبر عند ظلم الولاة و استئثارهم ، رقم: ١٨٤٥ .

خۆتانا بگرن و صەبرو ئارام بکەن بە پیشەی هەمیشەتان و لەسەر پرۆپیتی جیهان ئاژاوە مەنێنەوە، تالە بەهەشتا، لەسەر حەوزی کەوسەر بەخۆم دەگەنەوە) (تاج/٥ ل/١٧٢ ز/٤٤ ف/١٦).

١٤٨٨م– وعَنْ انَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ)، في رواية وَمَوْعِدُكُمْ الْحَوْض(الحديث: ٣٧٩٣، طرفه في: ١٢٧٠ت = ٣١٤٧ ف = بەرگی سێیەم لاپەڕە/٣٩٤ + ١٢٧١ ت = ٣١٤٧ = بەرگی سێیەم ل/٣٩٤).

١٤٨٩– عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَجُلا اتَى النَّبِيَ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَبَعَثَ الَى نِسَائِهِ فَقُلْنَ مَا مَعَنَا الا الْمَاء فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ يَضمُّ اوْ يُضيفُ هَذا فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الانْصار انَا فَانْطلَقَ بِهِ الَى امْرَاتِهِ فَقَالَ: اكْرِمِي ضَيْفَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: مَا عِنْدَنَا الا قُوتُ صِبْيَانِي فَقَالَ هَيِّئِي طعَامَكِ وَاصْبِحِي سِرَاجَكِ وَنَوِّمِي صِبْيَانَكِ اذا ارَادُوا عَشَاء فَهَيَاتْ طعَامَهَا وَاصْبَحَتْ سِرَاجَهَا وَنَوَّمَتْ صِبْيَانَهَا ثمَّ قَامَتْ كَانَّهَا تُصْلِحُ سِرَاجَهَا فَاطفَاتْهُ فَجَعَلا يُرِيَانِهِ انَّهُمَا يَاكُلانِ فَبَاتَا طاوِيَيْنِ فَلَمَّا اصْبَحَ غَدَا الَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ضَحِكَ اللَّهُ اللَّيْلَةَ اوْ عَجِبَ مِنْ فَعَالِكُمَا فَانْزَلَ اللَّهُ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى انْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَاولَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ﴾. (الحديث: ٣٧٩٨، طرفه في: ٤٨٨٩)(٢٥٦).

لەتاج دا ئاوایە: دەیکەین بەشەرحی ئێرە: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتەخزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبرسانا لاکەی سەرم دێ! ئەویش یەکە یەکە ناردی بۆ خواردن بۆ لای هاوسەرەکانی خۆی - رەزای خودایان لێبێ- بەلاّم هیچی لێ هەلّنەکراندن، ئەوجا فەرمووی: ئای بۆ پیاوێ ئەم شەو دالّدەی ئەم پیاوە بداو میوانداریی پێ بکا، پیاوێ لەیاریدەدەران (ئەنصار) هەلّسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من میوانداریی بۆ دەکەم.

---

(٢٥٦) اخرجه مسلم في الاشربة ، باب: اكرام الضيف وفضل ايثاره، رقم: ٢٠٥٤ .

جا ڕۆیشتنەوەو لە ماڵەوە بەژنەکەی گوت: ئەمە میوانی پێغەمبەرە (دروودی خودای لێ بێ) هیچ درێغی لەگەڵ مەکە، ژنەکەی گوتی: بە خودا بەس خۆراکی منداڵەکان گومان دەبەم، گوتی: کاتێ منداڵەکان داوای شێویان کرد، گورگانە شەوێیان بۆ بکەو بیانخەوێنەو کە نانەکت بۆ ئێمە دانا، بە بیانووی چرا چاککردنەوە خۆشت وەرەو چراکە بکوژێنەوە، ئەم شەوخۆمان بەسکی خاڵی شەو دەکەینەوە با میوانەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بێ خزمەت نەبێ و نانەکەی بە تێروتەسەلی بخوا شەوێ هەر شەوێکە، هەرچۆنێ بێ دەڕوا، ژنەکەیشی وای کرد.

جا بۆ بەیانی کەپیاوەکە ڕۆیشتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (بەڕاستی خودای باڵا دەست و شکۆدار ئەم شەو، سەیری هات لەکاری ئەم پیاوەو ژنەکەی، یافەرمووی: خودا پێکەنینی لەکاری شیرین و جوانیان هات ئەوەندەی پێ خۆش بوو، جا خودای گەورەیش ئەمەی بەم بۆنەیەوە ناردە خوارەوە: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ (٩/٥٩) واتە: هەرچەند خۆشیان نەداراو کەم دەستن و دەستیان کورتە لەگەڵ ئەوەشا بەرچاویان تێرەو لەپیاوەتی و خێرکردن نەترساوە). (تاج/٧ ل/١٨٩ ز/٤٢ ف/٧- سوورەتی حەشر).

١٤٩٠- عنْ انَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: مَرَّ ابُو بَكْرٍ وَالْعَبَاسُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) بِمَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ الانصار رضي الله عنهم وَهُمْ يَبْكُونَ، فَقَالَ: مَا يُبْكِيكُمْ؟ قَالُوا: ذَكَرْنا مَجْلِسَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَّا، فَدَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاخْبَرَهُ بِذلِكَ قَالَ فَخَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ عَصَبَ عَلَى رَاسِهِ حَاشِيَةَ بُرْدٍ، قَالَ: فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ وَلَمْ يَصْعَدْهُ بَعْدَ ذِلكَ الْيَوْمِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَاثنى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ اوصيكُمْ بالانصار فَانَّهُمْ كَرِشِي وَعَيْبَتِي وَقَدْ قضوْا الَّذي عَلَيْهِمْ وَبَقِيَ الَّذي لَهُمْ فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ وَتَجَاوَزُوا عَنْ

مُسِيئِهِمْ(الحديث: ٣٧٩٩، طرفه في: ٣٨٠١). (انظر صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٦ص ٦٨)(٢٥٧).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو بەکرو عەباسی مامەی پێغەمبەر، (درودی خودای لێ بێ) دەچنە ناو کۆڕێ لە کۆڕی یاریدەدەران (ئەنصار) دەڕوانن دەگرین، یەکێکیان دەپرسێ: ئەوە بۆ دەگرین؟! دەڵێن: یادی ئەو کاتانەمان کردۆتەوە کە لە خزمەتی پێغەمبەردا کۆڕمان دەبەست و، لەناو ئێمەدا دادەنیشت، جا ئێستایش مەترسی ئەوەمان هەیە کە حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) بەم نەخۆشییەی ئێستای بمرێ و ئێمە باناز بکەوین ! ئەویش دەچێ بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) و ئەمە باس دەکا بۆی، حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) لەماڵ دەردەچێ، سەری بە پەڕاوێزی عاباکەی دەپێچێ، سەردەکەوێتە سەر دوانگە، کە ئەو جارە دواجار بوو تەشریفی بچێتە سەر دوانگە، لە پێشا سوپاس و ستایشی خوای کردو فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! ئامۆژگاری و ڕاسپێریتان دەکەم کە زۆر باش بن بۆ یاریدەدەران، چونکە لە ڕاستیدا ئەوان جەرگ و هەنای منن و بۆخچەی ڕازو نیاز و جێگەی باوەڕومتمانەی منن، ئەوان زۆر بەجوانی ئەرکی سەرشانی خۆیان بەمەردانە بەجێهێناوە، ماوەتەوە ئەوە کەهەقیان بۆ بکرێتەوە و تۆڵەی چاکە یان بدرێتەوە! دەی کوایە ڕێزو قەدری چاکیان بگرن و چاو پۆشیش لە خراپیان بکەن). (تاج/٥ ل/١٧٠ ف/١٣ ز/٤٤ - باسی پاکژی و هورەیی یاریدەدەران (ئەنصار) (ڕەزای خودایان لێ بێ).

١٤٩١– عنْ ابْنَ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) يَقُولُ: (خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَلَيْهِ مِلْحَفَةٌ مُتَعَطِّفًا بِهَا عَلَى مَنْكِبَيْهِ وَعَلَيْهِ عِصَابَةٌ دَسْمَاء حَتَّى

(٢٥٧) والحديث اخرجه مسلم في الفضائل عن ابي موسى (العيني/١٦ ص٢٦٧ حديث رقم: ٢٨٩ وهو رقم:٣٨٠١ في فتح الباري) انظر صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٦ص٦٨ - المترجم .

جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَاثنَى عَلَيْهِ ثمَّ قَالَ امَّا بَعْدُ ايُّهَا النَّاسُ فَانَّ النَّاسَ يَكْثرُونَ وَتَقِلُّ الانْصار حَتَّى يَكُونُوا كَالْمِلْحِ فِي الطعَامِ فَمَنْ وَلِيَ مِنكُمْ امْرًا يَضرُّ فِيهِ احَدًا اوْ يَنْفَعُهُ فَلْيَقْبَلْ مِنْ مُحْسِنِهِمْ وَيَتَجَاوَزْ عَنْ مُسِيئِهِمْ). (الحديث: ٣٨٠٠)(٢٥٨).

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لیّ بیّ) لەنەخۆشینی سەرەمەرگا، لەماڵ هاتە دەرێ، ساقۆیەکی ئالاند بوو بە خۆیەوە، دابووی بەسەر هەر دووشانیدا، سەرپێچێکی ڕەشیشی پێچابوو بەسەریەوە، ڕۆیشت تاچوو لەسەر مینبەرەکە دانیشت و، سوپاس و ستایشی خودای کردو فەرمووی: (لەپاش سوپاس و ستایش، ئەی موسوڵمانینە! بزانن تادێ خەڵکی تر زۆر دەبن، بەڵام یاریدەدەران بەرە بەرە کەم دەبنەوە، چونکە لەهەر چوار لاوە خەڵك دێن و ئیسلام دەبن، بەڵام یاریدەدەران چینێکی تایبەتین، کەیەکێکیان لێ مرد، یەکێکی‌تر نایەتە جێگەی، هەتا وای لێ دێ ڕۆژا دێ وەك خۆیی ناو چێشتیان لێ دێ. جا ئەگەر کەسێ لە ئێوەبوو بەسەرەوکاری کارێ وە دەیتوانی کە زیان یاسوود بەخەڵك بگەیەنێ ئەوە باچەکەی چاکیان وەربگرێ و چاو پۆشی لە خراپەی خراپیان بکات). (تاج/٥ ل/١٧١ ز/٤٤ ف/١٤).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە لە ئەفرادی بوخارییە، موسلیم لە ئیبنو عەباسەوە دەری نەهێناوە، لەگەڵ ئەوەیشا موسیم ئەصڵی فەرموو دەکەی لە ئەنەسەوە دەرهێناوە. کەواتە: تەرەفی حەدیث بەشێکە لەو حەدیثە کە صەحابی یەك دەیگێڕێتەوە، کە هەموو تەرەفەکانی لەیەك کەسەوەبن، وە دووریانزیك

(٢٥٨) انظر صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٦ص٦٨ طرفه في: (٤٨٩ت= ٣٦٢٨ف= بەرطی/١ ل/٤٦٢) - المترجم .

لەیەك بابەتن، یاپەیوەندی یان بەیەك ڕووداوەوە هەیە، بۆنەی گوتنەکەی و شوێنی گوتنەکەی و زۆر لایەنی تری یەکن، گەرچی گەڵێ جار تەرەفا لەگەڵ تەرەفەکەی تری بەدیمەن زۆر لە یەکتر دوورن، وایش دەبێ جاروبار تەرەف لە صەحابییەکی ترەوە دەبێ.

گرنگ لێرەدا ئەمەیە: ئاماژە بۆ تەرەفەکانی فەرموودەکەو ئاماژە بۆ ئەوە: کەکێ دەری هێناوە ئەمانەو وێنەی ئەم وردەکارییانە بۆ ئەوەیە کە بۆ تێگەیشتننی تەواو، سوود و بەهرە لە شەرح و زیادە و فەوائیدی هەموو وەجەو طورەوق و تەرفەکان وەربگێرێ، بەتایبەتی بۆ پسپۆڕانی زانستی فەرموودە، یا لەکاتی ماناکردنی فەرموودەکەدا.

١٤٩٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) سَمِعْتُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ اهْتَزَّ الْعَرْشُ لِمَوْتِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذ (الحديث: ٣٨٠٣)[٢٥٩].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رمزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم ژنەوتم لە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (تەخت و بارەگای خودای میهرەبان، لەبەر خاتری مردنی سەعدی کوڕی موعاز کەوتە لەرزەلەرز). (تاج/٥ ل/١٧٤ ف/٢ ز/٤٥ - باسی گەورەیی سەعدی کوڕی موعاز).

١٤٩٣- عَنْ انَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لابَيّ انَّ اللَّـهَ امَرَنِي انْ اقْرَا عَلَيْكَ ﴿لَمْ يَكُنْ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ اهْلِ الْكِتَابِ﴾ قَالَ: وَسَمَّانِي قَالَ: نَعَمْ فَبَكَى). (الحديث: ٣٨٠٩، اطرافه في: ٤٩٥٩، ٤٩٦٠، ٤٩٦١)[٢٦٠].

---

(٢٥٩) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل سعد بن معاذﷺ ، رقم: ٢٤٢٦ .

(٢٦٠) اخرجه مسلم في صلاة المسارفين وقصرها، باب: استحباب قراءة القران على اهل الفضل و الحذاق فيه، وفي فضائل الصحابة ... رقم: ٧٩٩ .

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لیٚ بیٚ) بە ئوبەیی کوڕی کەعبی فەرموو: (خودای گەورە فەرمانی پێم کردووە، کەسوورەتی: ﴿لم يكن الذين كفروا من اهل الكتاب﴾ لەلای تۆ بخوێنم).

ئوبەیی فەرمووی: بەناوی خۆم ناوی هێنام بۆت؟ فەرمووی: (بەڵێ) جاله خۆشیانا ئوبەیی دەستی کرد بە گریان (تاج/٥ ل/٢٩١ ف/٢ ز/٧٩ - دەبێ بەهۆش و گۆشەوە گوێ بۆ خوێندنی قورئان شل بکرێ.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگێڕین:

١- فەزڵو گەورەییو بەهرەمەندیی ئوبەی.

٢- دەور کردنـــەوەو خوێنـــدنی قورئـــان و پـــەراوەکانی شـــەریعەتو ڕەوانکردنیان لەلای مامۆستاو پسپۆڕان، سوننەتێکی گەورەیە.

٣- مامۆستا لای فەقێی خۆی بخوێنێ، کارێکی جوانی پەسەندە، لەبەر ئەوە نابێ کەس شەرم لە شتی وا بکا، بەڵکوو مایەی شانازییە بۆ هەردوولا.

١٤٩٤- عَنْ انَسٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قالَ: جَمَعَ الْقُرْآنَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ارْبَعَةٌ كُلُّهُمْ مِنْ الانْصار ابَيٌّ وَمُعَاذ بْنُ جَبَلٍ وَابُو زَيْدٍ وَزَيْدُ بْنُ ثابِتٍ قُلْتُ لانَسٍ: مَنْ ابُو زَيْدٍ؟ قَالَ احَدُ عُمُومَتِي (الحديث: ٣٨١٠، اطرافه في: ٣٩٩٦، ٥٠٠٣، ٥٠٠٤)[٢٦١].

ئەنەس (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: بەسەرینیی پێغەمبەر (دروودی خودای لیٚ بیٚ) چوارکەس لەیاریدەدەران هەموو قورئانیان لەبەر بوو: ئەبویی کوڕی کەعب و موعازی کوڕی جەبل و ئەبوزەید و زەیدی کوڕی سابیت. بەئەنەسم گوت: ئەبوزەید کێیە؟ فەرمووی: (یەکێکە لە ئامۆزاکانی من). (تاج/٥ ل/٣٢٤ ز/٩٢- ١)

(٢٦١) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل ابيّ... رقم: ٢٤٦٥ .

١٤٩٥- عَنْ انَسٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمَ احُدٍ انْهَزَمَ النَّاسُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابُو طَلْحَةَ بَيْنَ يَدَيْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُجَوِّبٌ عَلَيْهِ بِحَجَفَةٍ لَهُ وَكَانَ ابُو طَلْحَةَ رَجُلا رَامِيًا شَدِيدَ القَدِّ يكسرَ يَوْمَئِذ قَوْسَيْنِ اوْ ثلاثا وَكَانَ الرَّجُلُ يَمُرُّ مَعَهُ الجَعْبَةِ مِنْ النَّبْلِ فَيَقُولُ: انْثرْهَا لابِي طَلْحَةَ.
قَالَ: وَيُشْرِفُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْظرُ الَى الْقَوْمِ فَيَقُولُ ابُو طَلْحَةَ: يانبي الله بابِي انْتَ وَامِّي لا تُشْرِفْ يُصِيبُكَ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ الْقَوْمِ، نَحْرِي دُونَ نَحْرِكَ، وَلَقَدْ رَايْتُ عَائِشَةَ بِنْتَ ابِي بَكْرٍ وَامَّ سُلَيْمٍ وَانَّهُمَا لَمُشَمِّرَتَان ارَى خَدَمَ سُوقِهِمَا تُنْقِزَانِ الْقِرَبَ عَلَى مُتُونِهِمَا تُفرِغَانِهِ فِي افْوَاهِ الْقَوْمِ، ثمَّ تَرْجِعَانِ فَتَمْلانِهَا ثمَّ تَجِيئَانِ فَتُفْرِغَانِهِ فِي افْوَاهِ الْقَوْمِ وَلَقَدْ وَقَعَ السَّيْفُ مِنْ يَدَيْ ابِي طَلْحَةَ امَّا مَرَّتَيْنِ وَامَّا ثلاثا (الحديث: ٣٨١١، اطرافه في: ٢٩٠٢، ٢٨٨٠، ٤٠٦٤)[٢٦٢].

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی هەرای ئوحود خەڵکەکە لە دەوری پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەڵهاتن، بەڵام ئەبوتەلحە لەو کاتەدا بەقەڵخانەکەیەوە خۆی دەکا بەسوپەرو دەبێ بەسەنگەر بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەبو تەلحە پیاوێکی تیر ئەندازی ژێی کەوان کرژو قایم و توندبوو، ئەو ڕۆژە ئەوەندە بە توندی تیر دەهاوێژێ دوو کەوان، یاسێ کەوان دەشکێنێ، پیاو هەبوو تیردانەکەی پڕ بوو لە تیر، بەوێدا ڕادەبورد، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پێی دەفەرموو: (تیرکەشەکەت بۆ ئەبوتەلحە هەڵ بڕێژە).
پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ناوبەناوا خۆی بەرزەوە دەکردو سەری دەکێشا، هەتا تەماشای هەڵویست بکاو تێک ڕژانی هەردوو لا بەراورد بکا، تاتێ بگا لە بارو دۆخی جەنگ و بەیەکادانی پیاوان و لەڕەوت و بەڕێوە چوونی شەڕ، ئەبوتەلحە بە پەرۆشەوە پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا!

---

(٢٦٢) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: غزوة النساء مع الرجال ، رقم: ١٨١١ .

باوك و دايكم به قوربانت بن، وامه‌كه، سه‌رمه‌كێشه، مه‌بادا تیرێكی دوژمن بت پێكێ، سینگی من قه‌ڵغانی سینگی تۆیه، من له‌شی خۆم كردووه به قه‌ڵغان و سه‌نگه‌ری تۆ.

عائیشه‌ی كچی ئه‌بو به‌كرو ئوموسوله‌یمی دایكمم دی، زۆر زۆر خێراو به‌ده‌ست و برد بوون، به كۆڵ به‌كونده ئاویان ده‌هێناو قۆلیان هه‌ڵكردبوو، خڕخاڵ و پاوانه‌كانیان له قوله‌پێیان دا دیاربوو، به هه‌ڕاكردن ده‌هاتن و ده‌چوون و له ناو كۆڕی شه‌ڕه‌كه‌دا، له جه‌نگه‌ی شه‌ڕه‌كه‌دا ئاوه‌كه‌یان ده‌گێڕا به‌سه‌ر جه‌نگاوه‌ره‌كاندا، به هه‌نگڵی كونده‌كان ئاوه‌كه‌یان ده‌كرد به‌ده‌می پیاوه غه‌زاكاره‌كانه‌وه، هه‌ر له‌گه‌ڵ كونده‌و جه‌وه‌نده‌كان خاڵی ده‌بوونه‌وه، به‌بێ وچان دیسانه‌وه به قه‌ڵه‌مبازو به‌گومه‌ته ده‌گه‌ڕانه‌وه‌و پڕیان ده‌كردنه‌وه له ئاوو، ده‌هاتنه‌وه بۆ شه‌ڕگاكه‌و ئاوه‌كه‌یان ده‌كرده‌وه به‌ده‌می پیاوه‌كانه‌وه، هه‌تا دووباره خاڵی ده‌بوونه‌وه، وه هه‌روه‌ها، وه ئه‌و رۆژه له‌و جه‌نگه بێ سامانه‌دا دووجار یاسێ جار شمێشێر له‌ده‌ستی ئه‌بو ته‌لحه ده‌كه‌وێته خواره‌وه، چونكه پاش ترس و بیمه‌كه‌ی ڕۆژی ئوحود خودا به لوتفی خۆی ئه‌من و ئاسایشی نارد بۆیان، به ڕه‌نگێكی وا سه‌ره‌وه‌نه‌وز (نوعاس)گرتنی، ئه‌بو ته‌لحه‌ش به‌هۆی ئه‌و سه‌ره‌وه‌نه‌وزه‌وه چه‌ندجارێ شمشێره‌كه‌ی له‌ده‌ست ده‌كه‌وته خواره‌وه) (تاج/٥ ل/١٧٩ ز/٤٩ ف/١- باسی: چاكی ئه‌بوته‌لحه+ تاج/٨ ل/٧٩ ز/٢٢ ف/١).

١٤٩٦- عَنْ سَعْدِ بْنِ ابِي وَقَّاصٍ عَنْ ابِيهِ (رضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (مَا سَمِعْتُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لاحَدٍ يَمْشِي عَلَى الارْض انَّهُ مِنْ اهْلِ الْجَنَّةِ الا لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلامٍ قَالَ: وَفِيهِ نَزَلَتْ هَذهِ الايَةُ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِي اسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ الايَة. (الحديث: ٣٨١٢)[٢٦٣].

---

(٢٦٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل عبدالله بن سلام رضي الله عنه، رقم: ٢٤٨٣.

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (لە پێغەمبەرم نەبیستووە بەکەسێ کە هێشتا لەسەر دینابێ و لەسەر عەرد بگەڕێ، کەپێی بفەرموێ: (ئەم کەسە بەهەشتییە، جگە لە عەبدوڵلای کوڕی سەلام، فەرمووی: ئەم ئایەتەیش دەربارەی عەبدوڵلا هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿وشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِي اسْرائيلَ عَلى مِثْلِهِ﴾ ٤/١٠- واتە: شایەتێکی ڕاستگۆی قسە ڕەوایوا کە خودای گەورە ڕێز و بایەخی بۆ شایەتییەکەی داناوە، کە لە نەوەی یەعقوب پێغەمبەرە، شایەتی دا لەسەر ئەوە کە ئەم قورئانە فەرموودەی خودایە، نامەی نێراوی خودایە).(تاج/٥ ل/٢١١ ز/٦١ ف/١- باسی: فەزڵی عەبدوڵلای کوڕی سەلام (ڕەزای خودای لێ بێ)).

١٤٩٧- عنْ عَبْدُ اللّهِ بْنُ سلام (رضيَ اللهُ عنهُ) قالَ رَايْتُ رُؤْيَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَصَصْتُهَا عَلَيْهِ وَرَايْتُ كَانِّي فِي رَوْضَةٍ ذكَرَ مِنْ سَعَتِهَا وَخُضرَتِهَا وَسْطهَا عَمُودٌ مِنْ حَدِيدٍ اسْفَلُهُ فِي الارْض وَاعْلاهُ فِي السَّمَاء فِي اعْلاهُ عُرْوَةٌ فَقِيلَ لِي: ارْقَهْ قُلْتُ: لا اسْتَطِيعُ فَاتَانِي مِنْصَفٌ فَرَفَعَ ثِيَابِي مِنْ خَلْفِي فَرَقِيتُ حَتَّى كُنْتُ فِي اعْلاهَا فَاخَذتُ بالْعُرْوَةِ فَقِيلَ لي: اسْتَمْسِكْ فَاسْتَيْقَظتُ وَانَّهَا لَفِي يَدِي فَقَصَصْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تِلْكَ الرَّوْضَةُ الاسلامُ وَذلِكَ الْعَمُودُ عَمُودُ الاسلامِ وَتِلْكَ الْعُرْوَةُ عُرْوَةُ الْوُثْقَى فَانْتَ عَلَى الاسلامِ حَتَّى تَمُوتَ(الحديث: ٣٨١٣، طرفاه في: ٧٠١٠، ٧٠١٤)(٢٦٤).

قەیسی کوڕی عوبادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (لەناو کۆڕێکا بووم، سەعدی کوڕی مالیك و ئیبنو عومەریان تیادا بوو، عەبدوڵلای کوڕی سەلام هات، گوتیان: ئەم پیاوە بەهەشتییە، عەبدوڵلا کەهاتە ناو مزگەوتەوە دوو ڕکات نوێژی کرد، ئەوجا منیش هەڵسام چووم بۆ لای و پێم گوت: ئەوانە واوا دەڵێن و دەڵێن تۆبەهەشتیت؟ گوتی: سوبحانەڵلا! چۆن قسەی وادەکەن؟

(٢٦٤) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل عبدالله بن سلام ﷺ ، رقم:٢٤٨٤ .

نـەدەبوو شـتێ کـە بەباشـی ئاگایـان لێـی نییـە بێڵـێن و بـلاوی بکەنـەوە، شتەکەخۆی ئاوابوو:

(لەسـەردەمی پێغەمبـەر خۆیـدا (دروودی خـودای لـێ بـێ) خـەونێکم بینـی، گێرامـەوە بـۆی، لەخـەوما وەك لـەناو باخێکـابم، زۆر گـەورەو پـانو پۆڕبـوو، کۆڵەکەیەکی ئاسن لەناو یا بـوو، بنەکـەی لـەناو زەوییەکـەدا بـوو، نووکەکـەی چوو بوو بە حەوادا، قوڵفەێی بەنووچکە کەیـەوە بـوو، نۆکـەرێ لـە بنیابوو، پێیـان گـوتم: ئـادەی پیـادا سـەرکەوە، گـوتم: نـاتوانم، جـا نۆکەرەکـە هـات، جلەکانمی لە پشتەوە بەرزەوە کرد، ئیتر پیا سەرکەوتم، هـەتا سـەری سـەرەوە چووم قوڵفەکەیم گرت، گوتیان: دەسـت مەحکـەم بگـرە، کەخەبـەر بوومـەوە، ئەڵقەکە لەناو دەستمابوو!

جا کە ئەمەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فـەرمووی: (ئـەو باخە ئیسلامەو ئەوکۆڵەکەیەش کۆڵەکـەی ئیـسلامە، کـە برێتـی یـە لـە پێـنج ڕوکنەی ئیسلام: شەهادەو نوێـژو زەکـات و ڕۆژوو و حـەج، ئـەو قوڵفەیـەیش قوڵفـەی قایمـە واتـە: عوروەتـول ووسـقایە، کـەبریتی یـە لـە ئیمـان و بـاوەڕی تەواوی دامەزراو بەخودا و بەئایینی پیرۆزی ئیسلام، وەك خودا لە قورئـان دا دەفەرموێ: ﴿فمن یکفر بالطاغوت ویؤمن بالله فقـد اسـتمك بـالعروه الـوثقی﴾ (البقره/ ٢/٢٥٦).

واتە: دەی هەرکەسـێ بـاوەڕی بەشـەیتان و بەدەسـتەی شـەیتان نـەبێ و حاشایان لێ بکاو لە هەمان کاتا باوەڕی تەواوی بەخودا خـۆی هـەبێ و ڕێگـەی هـەق بگـرێ، کەڕێگـەی خـوداو پێغەمبـەرەو بـەس، ئـەوە بەڕاسـتی دەسـتی بەدەستە بەندێکی ئەستوری مەحکەم و قایمی وا گرتووە، کە هەرگیز پسانو پچڕانی بۆ نییە).

خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) ماڵ و مناڵ و هەست و نەست بە قوربانی گـەردی بـەرپێی دێنیکـەرانی گـۆڕی پیرۆز و نـازاداری بـێ فەرمووشـی: (ئـەی

عەبدوڵلا! تۆ لەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەژیت و دەمریت و زیندوودەبیتەوە!). (تاج/٥ ل/٢١١ ز/٦١ ف/٢ - گەورەیی عەبدوڵلای کوڕی سەلام).

١٤٩٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عنها) قَالَتْ: (مَا غِرْتُ عَلَى احَدٍ مِنْ نِسَاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ وَمَا رَايْتُهَا وَلَكِنْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُكْثِرُ ذِكْرَهَا وَرُبَّمَا ذَبَحَ الشَّاةَ ثُمَّ يُقَطِّعُهَا اعْضاء ثُمَّ يَبْعَثُهَا فِي صَدَائِقِ خَدِيجَةَ فَرُبَّمَا قُلْتُ لَهُ كَأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ فِي الدُّنْيَا امْرَاةٌ الا خَدِيجَةُ فَيَقُولُ انَّهَا كَانَتْ وَكَانَتْ وَكَانَ لِي مِنْهَا وَلَدٌ) (الحديث: ٣٨١٨، اطرافه في: ٣٨١٦، ٣٨١٧، ٥٢٢٩، ٦٠٠٤، ٧٤٨٤)[٢٦٥].

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: رقەم نەکیشاوە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر هیچ ژنێکی، وەکوو لەسەر خەدیجەی هاوسەری رقەم لێ دەکێشاو هەستم بە هەوێباریی دەکرد، خەدیجەشم هەرگیز نەدیووە، چونکە سێ ساڵ بەرلەوەی پێغەمبەر من بگوێزێتەوە، خەدیجە مردووە، هۆی ئەم رقەکێشان وهەست بە هەوێبارییەم ئەوەبوو: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) زۆر باسی خۆشەویستیی ئەوی دەکرد و زۆر ناوی دەهێنا، بگرە گەلێ جار کەمەڕێکی سەردەبڕی، پارچە پارچەی دەکرد و ئەوجار دەینارد، بۆ دۆست و خۆشەویستان و دەستە خوشك و ئاشنا و ڕۆشناکانی خەدیجە، بۆ وەفادریی بۆ ماف و یادی خەدیجە. گەلێ جار عەرزی پێغەمبەرم دەکرد: ئەوە چییە ئەوەندە دەڵێی: خەدیجە، خەدیجە، دەڵێی ئەم جیهانە کەسی تری تیادانییە ئەو نەبێ، ئەویش دەیفەرموو: (ئافرەتێکی فرەباش بوو، وە هاوەها باش بوو، سەرەڕای ئەوەیش منالم لێی

---

(٢٦٥)- اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل خديجة ام المؤمنين (رَضيَ اللهُ عنها)، رقم: ٢٤٣٥ .

هـەبووا). (تـاج/٥ ز/٣٦ ل/١٤٩ ف/١- چـاكێتى و بـەهرەى خـاتوو خەديجـەى هاوسەرى پێغەمبەر).

١٤٩٩- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ: (اتَى جِبْرِيلُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ اتَتْ مَعَهَا انَاء فِيهِ ادَامٌ اوْ طَعَامٌ اوْ شَرَابٌ فَاذا هِيَ اتَتْكَ فَاقْرَا عَلَيْهَا السَّلامَ مِنْ رَبِّهَا وَمِنِّي وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لا صَخَبَ فِيهِ وَلا نَصَبَ). (الحديث: ٣٨٢٠، طرفه في: ٧٤٩٧)(٢٦٦).

ئـەبو هـورەيرە (رەزاى خوداى لـێ بێ) فـەرمووى: جوبرائيـل (سـەلامى خـواى لـێ بێ) لەئەشكەوتى حيراء دێتـە خزمـەتى پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لـێ بێ) دەفـەرموێ: ئەى پێغەمبەرى خودا! ئەوە خەديجەى هاوسـەرتە، وا بـەرێوە واهـات بـۆ لات، دەفرێكـى پێيـە پێخـۆرى واتيـادا، هێناويـەتى بـۆت يافـەرمووى: خـۆراك ياخواردنەوەى تيادا هێناوە بۆت، جاكە گەيشتەلات لەلايـەنى خـوداى گـەورەو سەروەرەوە و لە لايەنى منيشەوە، سلاوى لێ بكەو، مزگێنى ئەوەيشى پێ بـدە، كە خودا لە بەهەشتا كۆشكێكى بـو دانـاوە، لـەمروارى هۆڵۆڵ دروسـت كـراوە، نەدەنگە دەنگ‌و قرە قرى واتيـاداو نەنارەحـەتى و شـەكەتى و مانـدوو بـوون. (تاج/٥ ل/١٥١- سەروەريى خاتوو خەديجە. ف/٢).

١٥٠٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنها) قَالَـتْ اسْـتَاذَنَتْ هَالَـةُ بِنْـتُ خُوَيْلِـدٍ اخْتُ خَدِيجَةَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَعَـرَفَ اسْـتِئْذَانَ خَدِيجَـةَ فَارْتَاعَ لِذلِكَ فَقَالَ اللَّهُمَّ هَالَةَ قَالَتْ فَغِرْتُ فَقُلْتُ مَا تَذكُرُ مِنْ عَجُـوزٍ مِـنْ عَجَـائِزِ قُرَيْشٍ حَمْرَاء الشِّدْقَيْنِ هَلَكَتْ فِي الـدَّهْرِ قَـدْ ابْـدَلَكَ اللَّـهُ خَيْـرًا مِنْهَـا(الحـديث: ٣٨٢١)(٢٦٧).

---

(٢٦٦) اخرجـه مـسلم في فـضائل الـصحابة، بـاب: فـضائل خديجـة ام المـؤمنين(رَضِـيَ اللّٰهُ عنها)برقم: ٢٤٣٢

(٢٦٧) اخرجـه مـسلم في فـضائل الـصحابة، بـاب: فـضائل خديجـة ام المـؤمنين (رَضِـيَ اللّٰهُ عنها)برقم: ٢٤٣٧

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: هالەی کچی خووەیلیدی خوشکی خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر، داوای ڕێگەی کرد، کە بێتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بە دەنگی ئەودا دەنگی خەدیجەی بیرکەوتەوەو وایزانی ئەوە، چونکە دەنگیان لەیەك دەچوو، لەبەر ئەوە ڕاچەنی و فەرمووی: ئەی خودایە! دەی هالەی کچی خووەیلیدبێ! منیش دەمار گرتمی و گوتم: ئەوە چییە ئەوەندە یادی ئەم پیرێژنە قوڕەیشییە کەپووە، لالغاوە سوورە، ددان لە دەمانەماوە دەکەیتەوە، کە سەردەمێکی دوور و درێژە لەناو چووەو مردووە، کە لەگەڵ ئەوەیشدا خودا لە جیاتی ئەو ژنی باشتری پێ بەخشیوی!). (تاج/٥ ز/٣٦ ل/١٥١ ف/٤).

**ڕوونکردنەوە:**

خەدیجەی کچی خووەیلید (رەزای خودای لێ بێ) یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بووە، لە پشتەوە بە چوارپشت دەگاتەوە بە پێغەمبەر، بەپێی ڕەگەز نزیکترین ژنیەتی لێیەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر ڕای جەماوەر، تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بووە کە خەدیجەی هێناوە، خووەیلیدی باوکی لێی مارە کرد، لەپێش داژنی ئەبو هالە بوو، لە پاش ئەو شووی کرد بە عەتیقی کوڕی عائیز، پاش ئەو شووی کرد بە پێغەمبەر، وەلە لای پێغەمبەرما هەتا مرد، بەر لە پازدە ساڵ لە پێغەمبەرایەتی شووی کردبە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ژنێکی دارای دەوڵەمەندبوو، یەکەم کەس بووە کە ئیسلام بووە، زۆر زۆر دڵنەوایی پێغەمبەری دەکرد، دڵی دەدایەوە، هانی دەدا لەسەر خۆگریو تێکۆشان و پەخشی داواکەی، هەمیشە پشتیوانێکی جوان بوو بۆ پێغەمبەر، لەم لایەنەوە، ئەوسەردەمەی پێغەمبەر لە ئەشکەوتی حیراء، لە پێش سەردەمی پێغەمبەرایەتی خەڵوەی دەکێشاو خواپەرستی لەسەر ئایینی ئیبراهیم دەکرد، خەدیجە نان و ئاوی بۆ دەبرد.

دەڵێن: پازدە ساڵ لە پێغەمبەر گەورەتر بووە، لە تەمەنی چل ساڵی دا شووی پێکردووە، هەموومناڵەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) بەبێ ڕاجیایی لە خەدیجەن بێجگەلە دوا منالی، کە ئیبراهیمە، کە لە ماریەی قیبطییەیە، کە کەنیزی پێغەمبەر بوو، بیست و چوار ساڵ لەگەڵ پێغەمبەردا ژیاوە، بە گوێی دەنگ پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لەخەدیجە چوارکچی بووە، کەهەرچواریان ئیسلام بوونو کۆچیان کردووە لەگەڵیا، لەمەککەوە بۆ مەدینە، کە فاطیمەو زەینەب و روقیەو ئوم کەلپووم بوون، بەکۆی دەنگ کوڕێکیشی لێ بووە ناوی قاسم بووە، لەبەرئەوە بە پێغەمبەریان دەگوت: ئەبولقاسم، واتە: باوکی قاسم.

هەتا خەدیجە لە ژیانا بوو، پێغەمبەر ژنی تری نەهێناوە لە پێش کۆچ دا بەسێ ساڵ کۆچی دوایی کردووە، لەمانگی ڕەمەزانا، لەمەکە وەفاتی کرد، لەپێش فەرزبوونی نوێژدا، بەر لە پەیدابوونی کردنی نوێژی مردوو لەسەر تەرم، تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو، لەمەککە لە حەجوون نێژراوە، دەڵێن: مەرگی خەدیجە لەپاش مەرگی ئەبوتالیب بەسێ ڕۆژ بووە، پێغەمبەر خۆی چووە ناو گۆڕەکەیو دایهێلایە ناوگۆڕەکەیەوە. گۆڕەکەی هەتا ئێستا لەمەککە ماوە، بەخزمەت گۆڕی پیرۆزی گەیشتووم، وابەقەد لاپاڵێکەوە، گۆڕستانەکە ناوی گۆڕستانی خەدیجەی کوبرایە گۆڕەکەی تا ئێستاش دەناسرێ.

فەرموودەیەکی زۆر سەبارەت بە فەزڵ و مەزناهیی خاتووخەدیجە هەیە، وە فەرموودەی ژمارە: ١٤٩٨، ١٤٩٩، ١٥٠٠. هەروا بڕوانە: ٦١٦، ١٤٦٢، هەروا بڕوانە: تاج/٥ ل- ١٤٩ ز- ٣٦ ف١+٢ +٣ +٤ + ٥+ تاج/٤ ل/٢٩١ ف/١).

١٥٠١ – عنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (جَاءتْ هِندٌ بِنتُ عُتبَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّهِ مَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ الارْض مِنْ اهْلِ خِباء احَبُّ اليَّ انْ يَذلُّوا مِنْ اهْلِ خِبائِكَ ثمَّ مَا اصْبَحَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الارْض اهْلُ خِباء احَبَّ اليَّ انْ يَعِزُّوا مِنْ اهْلِ

خِبائِكَ قَالَتْ: وَايْضا وَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللّهِ انَّ ابا سُفْيَانَ رَجُلٌ مِسِّيكٌ فَهَلْ عَلَيَّ حَرَجٌ انْ اطعِمَ مِنْ الَّذي لَهُ عِيَالَنَا قَالَ: لا اراهُ الا بالْمَعْرُوفِ) (الحديث:٣٨٢٥، طرفه في: ٩٩٠ت= ٢٢١١ ف = بةرطى/٣ ل - ٥٧)(٢٦٨).

عائيشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هیندی کچی عوتبە، کە دایکی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانە، کە یەکێك بوو لە دوژمنە سەر سەختەکانی پێغەمبەر، کەلەغەزای ئوحودا، سکی حەمزەی مامی پێغەمبەری هەڵ دڕی و ویستی جەرگەکەی بخوات.

ئەم هیندە پاش ئەوەی کەئیسلام بوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەرو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرلە ئیسلامبوونم، لەسەر رووی زەوی بنەماڵەیەك نەبوو کە بەقەد بنەماڵەو کۆمەڵەی تۆرقم لێی بێ و حەزبکەم کە کەساس و داماو بن، بەڵام ئێستا کە ئیسلام بووم، لە پیتو فەڕی ئەم ئایینە پیرۆزەوە، لەسەر رووی زەوی هیچ کۆمەڵێ گومان نابەم کە حەز بکەم سەربەرزو سەرومربن، وەك کۆمەڵەی تۆ! پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی هیند! سوێندم بە خودا، بەرەبەرە زیاتریش ئیسلامت لەلا خۆشەویست دەبێ و زیاتر حەز بەسەر کەوتنی دەکەیت!). باقی مەندەی ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لەژمارە (٩٩٠)دا رابورد.

١٥٠٢- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما): (انَّ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَقِيَ زَيْدَ بْنَ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ باسْفَلِ بَلْدَحٍ قَبْلَ انْ يَنْزِلَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْوَحْيُ فَقُدِّمَتْ الَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُفْرَةٌ فَابَى انْ يَاكُلَ مِنْهَا ثمَّ قَالَ زَيْدٌ: انِّي لَسْتُ اكُلُ مِمَّا تَذبَحُونَ عَلَى انْصَابِكُمْ وَلا اكُلُ الا مَا ذكِرَ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَانَّ زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو كَانَ يَعِيبُ عَلَى قُرَيْشٍ ذبائِحَهُمْ وَيَقُولُ: الشَّاةُ خَلَقَهَا اللّهُ وَانْزَلَ لَهَا مِنْ السَّمَاء الْمَاء وَانْبَتَ لَهَا مِنْ الارْض ثمَّ

(٢٦٨) اخرجه مسلم في الاقضية، باب: قضية هند ، رقم: ١٧١٤ .

تَذبَحُونَهَا عَلَى غَيْرِ اسْمِ اللّٰهِ انْكَارًا لِذٰلِكَ وَاعْظَامًا لَهُ). (الحديث: ٣٨٢٦، طرفه في: ٥٤٩٩)[(٢٦٩)]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لە پێش ئەوە داکە ببێ بەپێغەمبەر و سروش (وەحی)ی بۆ بێت، لە خوار شیوی بەلدەحەوەکە شیوێکە، والە ڕێگەی تەنعیم کە دەچێ بۆ مەککە، ئالەو شوێنە دەگا بەزەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل، لەسەر سفرەیێ نان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دادەنرێ، خوڵکی زەیدیش دەکرێ، کەنان بخوا، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو گۆشتەی لەسەر خوانەکە بووهی ئاژەڵا بوو، کە لەکاتی سەربڕینیدا ناوی بت و شتی وای لێ هێنرابوو، زەید لێی نەخواردو گوتی: من لە گۆشتی ئەو ئاژەلانەی ئێوە ناخۆم کەسەریان دەبڕن بۆبتان و پەیکەرەکانیان وە ئەوەی کە ناوی خودای لێ نەهێنرێ لێی ناخۆم، بەڵام هەر لەو ئاژەڵە سەربڕاوانە دەخۆم کە لەکاتی سەربڕین دا ناوی خودایان لێ هێنراوەو بەس!

لەهەمان کاتدا زەیدی کوڕی عەمر، سەبارەت بە سەر بڕاوەکانی قورەیش ڕەخنەی لێ دەگرتن و دەیگوت: ئەم مەڕو بزنە، خودا دروستی کردوون، لە ئاسمانەوە بارانی بۆ ڕەحساندوون، لە زەمین داگیاو لە وەڕی بۆ یان ڕواندووە، بەرزقی خوای گەورە دەژین و گەورەدەبن، کە چی ئێوە لەکاتی سەربڕین دا ناوی غەیری خودایان لێ دەهێنن، نیعمەت نیعمەتی خودایە کەچی ئێوە دەیکەن بەهی یەکێکیتر کە بەهیچ جۆرێ نەشایانی ئەوەیە و نەڕادەی ئەوەی دەکەوێ، ڕەخنەی لەم کارمیان دەگرتو هەروا ڕێزی گەورەیی خودای باس دەکرد).

---

(٢٦٩) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث زيد بن عمرو (فتح/٧ص٥٥٠ ط.ج) - المترجم.

١٥٠٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ الا مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلا يَحْلِفْ الا باللّٰهِ فَكَانَتْ قُرَيْشٌ تَحْلِفُ بابائِهَا فَقَالَ لا تَحْلِفُوا بابائِكُمْ. (الحديث: ٣٨٣٦، طرفه في: ١١٢٥ت = ٢٦٧٩ ف = بەرطى/٣ ل/٢٣٠)(٢٧٠).

ئیبنوعومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هۆشیار بن! کەسێ دەیەوێ سوێند بخوات باسوێند نەخوات مەگەر بەخوا، بەغەیری خودا سوێند نەخوات)، دەستووری قورەیش وا بوو لە سەردەمی نەزانی دا سوێندیان بەسەری باو باپیریان دەخوارد، وەك ئەوە دەیانگوت: سوێندم بە باوکم، یا بەسەری باوکم، یا بە چاوی تۆو وێنەی ئەمانە پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (سوێند بە باو باپیرانتان مەخۆن).

١٥٠٤- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: الا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلا اللَّهَ باطِلٌ وَكَادَ امَيَةُ بْنُ ابي الصَّلْتِ انْ يُسْلِمَ. (الحديث: ٣٨٤١، طرفاه في:٦١٤٧، ٦٤٨٩)(٢٧١).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ڕاسترین گوتەیێ کە هۆنەر واتە: هەستیار: شاعیر: گوتبێتی، ئەم گوتەیەی لەبیدە کە دەڵێ:

الا كُلّ شيئ ما خلا الله باطلُ
وكُلّ نَعِيم لا محالة زائل

---

(٢٧٠) والحديث اخرجه مسلم في الايمان و النذور (العيني١٦ ص٢٩٢) انظر صحيح مسلم بشرح النووي ج/١١ ص١٠٦ - المترجم .

(٢٧١) اخرجه مسلم في كتاب الشعر (صحيح مسلم بشرح النووي جلد /١٥ص ١٢) - المترجم.

واته:

ئـەم دنيايـە كـاو و بايـە
هـيچو پـووچو بـێ بەهـايە
نـازو بەهـرەی بـێ بەقـايـە
ئـەوەی ڕاسـت بـێ بـەس خوايـە !

(تاج/٥ ل/١٧٤ ز/٦٩ ف/٣).

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەروا فەرمووشی: ئومەییی کوڕی صەلتیش لە شیعرەکانیەوە، وا دەردەکەوێ خەریك بووە ئیسلام ببێ - ش/ت).

**ڕوونکرنەوە:**

لەسـەر فەرمايـشی فـەتحولباری ئيـسلام بـووە، وە ئيمـامی بوخـاری بـە صـەحابەی دانـاوە. ئيمـامی عومـەر لـەبارەی شـيعر گوتنـەوەی پـاش ئيسلامبوونی پرسيـاری لێ دەكـا، دەڵـێ: خـودا لـە جيـاتی شـيعربە سـوورەتی بەقەرە هـەقی بـۆ كـردوو مەتـەوە، لـە كووفـە دادەنيـشت، هـەر لـەوێ دەمـرێ لەسەردەمی جێنشينی عوسماندا، سەدو پەنجا ساڵ ژياوە.

## پايانـێ (خاتِمَة)

مامۆستای عەسقەلانی لێرەدا دەفـەرموێ:(نامـەی فـەضائيلی صـەحابە هەتا ئێـرە دووسـەدو سـی و سـێ فـەرموودەی لـە خـۆ گرتـووە، دووبارەكانيـان سـەدو سـی و هەشـت فـەرموودەن، پوختـەكـەيان (٢٣٣- ١٣٨=٩٥)نـەوەدو پێـنج فـەرموودەن موسـليميش ئـەم پوختـەيـەی هـەموو دەرهێنـاوە، وەك بوخـاری بێجگە لەمانەيان:

١. فەرموودەکەی عائیشە و ئەبو سەعید و ئیبنوعەباس (رەزای خودایان لێ بێ) کە دەفەرموون: (وكان ابوبكر مع النبى (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فى الغار) رێك وا لە پێش ژمارە/٣٦٥٢ فەتحەوە. لە تەجریدەکە دا نییە.

٢. ژمارە: ٣٦٥٥ف لە (ت) نییە = (كُنا نُخيّرُ).

٣. ژمارە: ٣٦٥٨ف = (لَوْ كُنت مَتخِذا خُليلا).

٤. ژمارە:١٤٥٠ت =٣٦٦٠ ف= فەرموودەکەی عەممار: (وُ ما مَعَهُ الا خَمْسةُ اعْبُدٍ).

٥. ژمارە: ١٤٥١ـ = ٣٦٦١ف= فەرموودەکەی ئەبودەرداء: (اما صاحِبُكم فقَد غَامَرَ..).

٦. ژمارە: ٣٦٦٨ف = حديث عائشة فى طرفٍ مِنْ حديث السقيفة.

٧. ژمارە: ٣٦٧١ ف = حديث علي: (خير الناس).

٨. ژمارە: ٣٦٧٨ف = حديث عبدالله بن عمرُ: (اشَدَّ مَا ضَنِعَ الْمُشرِكُونَ).

٩. ژ: ٣٦٨٤ فتح. ابن مسعود: (ما زلنا اعزّة منذ اسلم).

١٠. ژمارە: ٣٦٨٧ فتح: ابن عمر: (كانَ اجَدَّ وَ اجْوَدَ..).

١١. ژمارە:٣٦٩٤ف=عبدالله بن هشام: (كنا مَعَ النبى (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)) وهو اخذ بيد عُمَرَ.

١٢. ژمارە: ٣٦٩٦ف = حديث عثمان: (بايعتُ).

١٣. ژمارە: ٣٧٠٧ ف = حديث علي: (اقْضوا كَما كُنْتم تَقضونَ).

١٤. ژمارە: ٣٧١٣ف = حديث ابي بكر: (ارقبوا محمدا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فى اهل بيته).

١٥. ژمارە: ٣٧١٢ف = حديث ابي بكر: (لَقَرابة رسول الله احب الى).

١٦. ژمارە: ٣٧٠٨ ف = ئەبوهوریرە في جعفر.

١٧. ژمارە: ٣٧٠٩ف= ابن عمر في جعفر.

١٨. ژماره: ٣٧١٧ف = حديث عثمان في الزبير.

١٩. تەعليقەكەی ئيبنوعەباس لەبارەی فەزلی زوبەيرەوە، وا لە پێش ژمارە: ٣٧١٧ف = (هُوَ حَوارِىُ النبى (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)).

٢٠. ژماره: ٣٧٢١ف = حديث الزبير في اليرموك.

٢١. حديث طلحه وسعد ژماره:١٤٦٤ت= حديث رقم:٣٧٢٢ف+ حديث ٣٧٢٣ف= (لم يبق مع النبى (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)...).

٢٢. ژماره: ١٤٦٥ت =٣٧٢٤ ف=حديث مس يد طلحه.

٢٣. ژماره:٣٧٢٦ف= حديث سعد في اسلامه =انا ثلث الاسلام.

٢٤. ژماره: ٣٧٢٧ف= حديث سعد في اسلامه =انا ثلث الاسلام.

٢٥. ژماره: ٣٧٣٤ف= هذا محمد بن اسامة = حديث ابن عمر فى ابن اسامة

٢٦. ژماره: ١٤٧١ت = ٣٧٣٥ف=حديث اسامة انى احبهما.

٢٧. ژماره: ٣٧٤٨ف= حديث انس فى الحسين.

٢٨. ژماره: ٣٧٥٢ف= حديث انس فى الحسن.

٢٩. ژماره: ٣٧٥٤ف= حيدث عمر فى بلال.

٣٠. ژماره: ٣٧٦٢ف= حديث حذيفه فى ابن مسعود.

٣١. ژماره: ٣٧٦٥ف= حديث معاوية فى الوتر.

٣٢. ژماره: ٣٧٧١ف= حديث ابن عباس فى عائشة.

٣٣. ژماره: ٣٧٧٢ف= حديث عمار فى عائشة.

٣٤. ژماره: ٣٧٧٨ حديث انس في الانصار. انظر رقم: ١٢٧١ تجريد = ٣١٤٧ ف = بەرگی/ ٣ ل/٣٩٤.

٣٥. ژماره: ٣٧٨٧ ف= حديث زيد بن ارقم في الانصار.

٣٦. ژماره: ٣٨١٢ ف= ١٤٩٦ ت=حديث سعد في عبدالله بن سلام.

٣٧. ژماره: ٣٨١٤ ف= حديث ابن سلام مع ابي بردة.

٣٨. ژماره: ١٥٠٢ ت= ٣٨٢٦ف=حديث ابن عمر في زيد بن عمرو.

٣٩. ژماره:٣٨٢٨ فـ= حديث اسماء في زيد بن عمرو.

٤٠. ژماره: ٣٨٣٠ فـ= حديث ابن الزبير في بناء المسجد الحرام.

٤١. ژماره: ٣٨٣٣ فـ= حديث جدّ سعيد بن المسيب.

٤٢. ژماره: ٣٨٣٤ فـ= حديث ابى بكر مع امراة من احمس.

٤٣. ژماره: ٣٨٣٧ فـ= حديث عائشة في القيام للجنازة.

٤٤. ژماره: ٣٨٤٠ فـ= حديث ابن عباس في كاسا دهاقا.

٤٥. ژماره: ٣٨٤٢ فـ= حديث ابى بكر مَعَ الذى تكهنَ.

٤٦. ژماره: ٣٨٤٥ فـ= حديث ابن عباس في القسامة.

٤٧. ژماره: ٣٨٤٧ فـ= حديث ابن عباس في السعى.

٤٨. ژماره: ٣٨٤٨ فـ= حديث ابن عباس في الحطيم.

٤٩. ژماره: ٣٨٤٩ فتح = حديث عمرو بن ميمون فى القردة.

٥٠. ژماره: ٣٨٥٠ فتح= حديث ابن عباس: (ثلاث من خلال الجاهيلة).

شێخى عەسقەلانى (رەحمەتى خوداى لێ بێ) دەفەرموێ: (كۆى ئەم فەرموودانەى كە موسليم لەم پوختەى نەوەدو پێنج فەرموودەيەى ئەم باسانە، ريوايەتى نەكردوون، پەنجا و دوو فەرموودەن، چونكە فەرموودەى يەكەم سێ فەرموودەيە عائيشە، ئەبو سەعيد، ئيبنو عەباس. كۆى ئەوانەى كە موسليميش وەك شێخى بوخارى لەم پوختەيە گێراونيەتەوە، چل‌و سێ فەرموودەن ئاوا: (٩٥- ٥٢=٤٣). وە دەفەرموێ: حەفدە بيستراوى سەحابەو كەسانى دوا ئەوانيشى واتيادا. وەهەر خودا بۆ خۆى زۆر باشى لێ دەزانێ.

## (باسی دەستپێکردنی ڕەوانە کردنی پێغەمبەر)
## باب مبعث النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطلِبِ بْنِ هَاشِمِ بْنِ عَبْدِ مَنَافِ بْنِ قُصَيٍّ بْنِ كِلابِ بْنِ مُرَّةَ بْنِ كَعبِ بْنِ لؤَيٍّ بْنِ غالِبِ بْنِ فِهْرِ بْنِ مَالِكِ بْنِ النَّضرِ بْنِ كِنَانَةَ بْنِ خُزَيْمَةَ بْنِ مُدْرِكَةَ بْنِ الْيَاسَ بْنِ مُضرَ بْنِ نِزَارِ بْنِ مَعَدٍّ بْنِ عَدْنَانَ.

واتە: موحەمەدی کوڕی عەبدولای کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم، کوڕی عبدمناف، کوڕی قوصەی کوڕی کیلابی کوڕی موڕڕە کوڕی کەعب کوڕی لوئەی کوڕی غالیب کوڕی فیهر کوڕی مالیك کوڕی نەزر کوڕی کینانە کوڕی حوزەیفە کوڕی مودریکە کوڕی الیاس کوڕی موزەر کوڕی نیزار کوڕی مەعەدد کوڕی عەدنان.

١٥٠٥- عَنْ ابْنِ عَبَاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (انْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ ابْنُ ارْبَعِينَ فَمَكَثَ بِمَكَّةَ ثَلاث عَشْرَةَ سَنَةً ثُمَّ امِرَ بالْهِجْرَةِ فَهَاجَرَ الَى الْمَدِينَةِ فَمَكَثَ بِهَا عَشْرَ سِنِينَ ثمَّ تُوُفِّيَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث: ٣٨٥١، اطرافه في: ٣٩٠٢، ٣٩٠٣، ٤٤٦٥، ٤٩٧٩)[٢٧٢].

بڕوانە: تاج/ ٤ ز/٩٩ ل/٢٩٧ ف/١- باسی: تەمەنی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئیبنو عەباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: تەمەنی پیرۆزی خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) چل ساڵ بوو، کاتێ سرووش (وەحی)ی بۆهاتو بوو بە پێغەمبەر، جا لە مەککە، کە زێدی خۆی بوو سیازدە ساڵ مایەوە، لەو ماوەیەدا سەرگەرمی پەخشی ئیسلام بوو، هەتاخەڵکێکی زۆر موسوڵمان بوون و ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئاشکرا بوو، وە ناموسوڵمانەکان دەستیان کرد بە دوژمنایەتی پێغەمبەرو موسوڵمانان، سەرەنجام خودای گەورە فەرمانی کرد

(٢٧٢) انظر صحيح مسلم بشرح النووي ج١٥/ص١٠١- ١٠٢ مبحث قدر عمره (صلى الله عليه وسلم) واقامته بمكة و المدينة - المترجم .

به پیغه‌مه‌رو موسوڵمانان: كه كۆچ بكه‌ن بۆ مه‌دینه‌ی نازادار، وه‌كۆچیان كرد بۆ ئه‌وێ و له‌وێش ماوه‌ی ده‌ساڵ درێژه‌ی دابه‌خه‌بات و تێكۆشان له‌ پێناوی په‌خشی نووری ئیسلاما، ئه‌وجا له‌ ته‌مه‌نی شه‌ست و سێ ساڵیدا مرد).

١٥٠٦- عنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ رحمه الله تعالى قَالَ: سَالْتُ ابْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضيَ اللهُ عنهُ) اخبِرْنِي باشَدِّ شَيْءٍ صَنَعَهُ الْمُشْرِكُونَ بالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي فِي حِجْرِ الْكَعْبَةِ اذ اقْبَلَ عُقْبَةُ بْنُ ابِي مُعَيْط فَوَضعَ ثوْبَهُ فِي عُنُقِهِ فَخَنَقَهُ خَنْقًا شَدِيدًا فَاقْبَلَ ابُو بَكْرٍ حَتَّى اخَذ بِمَنْكِبِهِ وَدَفَعَهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ﴿اتَقْتُلُونَ رَجُلا انْ يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ﴾الايَةَ. (الحديث:٣٨٥٦، طرفه في: ٣٦٧٨، ٤٨١٥)[٢٧٣]

عورووه‌ی كوڕی زوبه‌یر (ره‌حمه‌تی خودای لێ بێ) فه‌رمووی: له‌ عه‌بدولای كوڕی عه‌مری كوڕی عاصم پرسی: سه‌بارەت به‌ سه‌خترین شت كه‌ هاوەڵ په‌یدا كه‌ران بۆ خودا، ده‌رحه‌ق به‌پێغه‌مبه‌ر كردبێتیان چی بوو؟ فه‌رمووی: (جارێ پێغه‌مبه‌ر له‌ناوحیجری كه‌عبه‌دا نوێژی ده‌كرد، له‌وكاته‌دا له‌پڕعوقبه‌ی كوڕی ئه‌بوموعه‌یت هات، پۆشاكه‌كه‌ی خۆی خسته‌ ملی پێغه‌مبه‌رو توندتوند له‌ملیدا بای‌داو تاساندی له‌وكاته‌دا ئه‌بوبه‌كر په‌یدابوو، شانی عوقبه‌ی گرت و پاڵێكی پێوه‌ ناو له‌كۆڵ پێغه‌مبه‌ری كرده‌وه‌، ئه‌وجا فه‌رمووی: ﴿اتقتلون رجلا ان يقول ربي الله﴾ تاكۆتایی ئایاته‌كه‌، كه‌ مه‌به‌ست لێی ئه‌مه‌یه‌: (ئه‌وه‌ چۆن حاڵێكه‌ پیاو ده‌كوژن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ كه‌ بڵێ: ته‌نیا خودا خودای منه‌و به‌س؟! ئه‌مه‌ له‌ كاتێكا كه‌ ئه‌و پیاوه‌ موعجیزه‌و به‌ڵگه‌ی ڕۆشن و گه‌وره‌ گه‌وره‌ی هێناوه‌ له‌لای خوداوه‌ كه‌ هه‌موونیشانه‌و به‌ڵگه‌ی ڕاست و دروستن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ كه‌ داواكه‌ی ڕاسته‌ و پێغه‌مبه‌ری ڕه‌وانه‌ كراوی خودایه‌).

---

(٢٧٣) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عمرو بن العاص (اشدّ ما صنعهُ المشركون)(فتح/٧ص ٦٩٨) خاتمة احاديث المبعث وما بعدها . ط . ج المترجم .

١٥٠٧- عنْ عبدالله بنْ مسعود (رَضيَ اللهُ عنهُ)، وقد سئل: مَنْ اذنَ النَّبِـيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بالْجِنِّ لَيْلَةَ اسْتَمَعُوا الْقُرْانَ؟ فَقَالَ: انَّهُ اذنَـتْ بِهِـمْ شَـجَرَةٌ (الحديث: ٣٨٥٩)(٢٧٤).

پرسـيار لـه عهبـدولاى كـوڕى مهسـعوود كـرا: ئـهو شـهوهى وهفـدى جنۆكهكان گوێ له قورئانهكهى پێغهمبـهر دهگرن، كـێ پێغهمبـهر (دروودى خوداى لێ بێ) ئاگادار دهكاتهوه لهوه؟ فـهرمووى: درهختـێ جنۆكـهكان ئاشكرا دهكا لـه پێغهمبهر (دروودى خوداى لێ بێ) (تاج/٧ ل/١٤١ ف/٥ ز/٢٩).

١٥٠٨- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ كَانَ يَحْمِـلُ مَـعَ النَّبِـيِّ (صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اداوَةً لِوَضوئِهِ وَحَاجَتِهِ فَبَيْنَمَا هُوَ يَتْبَعُهُ بِهَا فَقَالَ: مَنْ هَـذا؟ فَقَـالَ: انَا ابُو هُرَيْرَةَ فَقَالَ: ابْغِنِي احْجَارًا اسْتَنْفِض بِهَا وَلا تَـاتِنِي بِعَظـمٍ وَلا بِرَوْثَـةٍ فَاتَيْتُـهُ باحْجَارٍ احْمِلُهَا فِي طرَفِ ثوْبِي حَتَّى وَضعْتُهَا الَى جَنْبِهِ ثمَّ انْصرَفْتُ حَتَّـى اذا فَـرَغَ مَشَيْتُ فَقُلْتُ مَا بالُ الْعَظمِ وَالرَّوْثةِ؟ قَالَ هُمَا مِنْ طعَامِ الْجِنِّ وَانَّهُ اتانِي وَفْـدُ جِـنِّ نَصِيبِينَ وَنِعْمَ الْجِنُّ فَسَالُونِي الزَّادَ فَدَعَوْتُ اللّهَ لَهُمْ انْ لا يَمُـرُّوا بِعَظـمٍ وَلا بِرَوْثَـةٍ الا وَجَدُوا عَلَيْهَـا طعَامًـا). (الحـديث: ٣٨٦٠، طرفـه في: ١٢٢ت = ١٥٥ف= بةرطى يةكةم، لاثةرِة/١٤٦) (برِوانة: بةرطى٣ ل/٩٩ ذ: ١٠١٦)(٢٧٥).

ئەبو هورەیره (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار مـەتارەێی ئـاوم هـەڵ دەگرت، له خزمەت پێغەمبەردا، بۆ دەسنوێژ و تاراتی، جارێ بەمەتارەکه وه له دوایەوه دەڕۆیستم، کەهەستی پێم کرد کەوا شوێنی کـەوتووم، فـەرمووی: (ئەوه کێیه؟) گوتم: منم ئەبو هورەیرەم ئـەی پێغەمبـەری خودا! فـەرمووی: (هەوڵی چەند بەردێکم بۆ بده خۆمیان پـێ پـاك دەکەمـەوه بـەڵام ئێـسقان و

(٢٧٤) اخرجـه مـسلم في الـصلاة ، بـاب: الجهـر بـالقراءة في الـصبح و القـراءة علـى الجـن، رقم/٤٥٠ .

(٢٧٥) راجع (رقم:١٢٢ تجريد=١٥٥ فەتح =بەرگی /ال - ١٤٦)- المترجم .

تەپاڵەم بۆ مەهێنە) منیش چەند بەردێکم برد بۆی، لە چاکی جلەکانم دا هەڵم گرتن و بەبێ دەنگ بە ئەدەبەوە لەتەنشتیەوە هەڵم رشتن و ئیتر خۆم لێی دوورکەوتمەوە.

هەتا لە سەراوەکەی لێ بووە و خۆی بەبەردەکان پاك کردەوە، چووم بۆ خزمەتی، عەرزیم کرد: بۆ ئێسقان و تەپاڵە چیانە، کە بەکەڵکی خۆپاك کردنەوە نایەن؟ فەرمووی: (ئەم دووە لە خۆراکی جنۆکەن، لەبەر ئەوە واباشە پیس نەکرێن) خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووشی: (شاندێ لە جنۆکەکانی نەصیبین هاتن بۆلام، داوای خۆراکیان لێ کردم، منیش لە خودا پاڕامەوە بۆیان کە بەلای هەرئێسك و تەرسێکا بڕۆن لە خوداوە خۆراك بگرن بۆیان و وەك کاتی پێش خواردنیان لێ بێتەوە، ئێسکەکە پڕبێ لەگۆشت و تەپاڵەکەش ببێتەوە بەدانەوێڵەکەی جاران و بۆیان ببێ بە خۆراکێکی باش) پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کەناوی جنۆکەکانی نەصیبینی هێنا فەرمووی: (بەڕاستی ئەو جنۆکانە جنۆکەی چاك بوون). (تاج/٧ ل/١٤١ ز/٢٩ ف/٦+٤-سوورەتی ئەحقاف).

**ڕوونکردنەوە:**

جیهانی نادیار کە ناسراوە بە عالەمی غەیب جیهانێکی تایبەتە، بە پێوەری ئەم جیهانەی ناپێورێ، باشترین سەرچاوە بۆ لێ تێگەیشتنی، سەرچاوە ئایینیەکانە، شەیاتینی و جنۆکە و فریشتەو زۆر دروستکراوی تری خودای گەورە لەم جۆرە بابەتەن. (بڕوانە:١٠١٦ تجرید).

١٥٠٩- عَنْ امِّ خَالِدٍ بِنْتِ خَالِدٍ قَالَتْ قَدِمْتُ مِنْ ارْض الْحَبَشَةِ وَانَا جُوَيْرِيَةٌ فَكَسَانِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَمِيصَةً لَهَا اعْلامٌ فَجَعَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمْسَحُ الاعْلامَ بِيَدِهِ وَيَقُولُ سَنَاهْ سَنَاهْ يَعْنِي

حَسَنٌ حَسَنٌ). (الحديث: ٣٨٧٤، طرفه في: ٣٠٧١ف = ١٢٥١ تةجريد= بەرگی یەکەم، لاپەڕە/ ٣٧٢)[٢٧٦].

مەبەست لەم فەرموودەیە لە ژمارە: ١٢٥١تەجریدەکەدا رابورد.

**ڕوونکرنەوە:**

ئوم خالید ناوی ئەمەتە کچی خالدە، خۆی و باوکیو دایکی لە هاوڕێیانی پێغەمبەرن، لە مقدمەی فەتحولباریدا، لەبەشی ئافرەتاندا، لەناوی ئوم خالیدا، لە لاپەڕە/٤٧٦دا، دەفەرموێ: (ئومەیمەی کچی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە).

١٥١٠- عن الْعَباس بْنُ عَبْدِ الْمُطلِبِ (رَضيَ اللّهُ عنهُ) قَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا اغْنَيْتَ عَنْ عَمِّكَ فَانَّهُ كَانَ يَحُوطكَ وَيَغْضبُ لَكَ؟ قَالَ: هُوَ فِي ضحْضاحٍ مِنْ نَارٍ وَلَوْلا انَا لَكَانَ فِي الدَّرَكِ الاسْفَلِ مِنْ النَّارِ). (الحديث: ٣٨٨٣، طرفاه في: ٦٢٠٨، ٦٥٧٢)[٢٧٧].

عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب (رەزای خودای لێ بێ) کەحەق مامەی پێغەمبەر بوو عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا هیچ کەڵکا، سوودێکت هەبوو بۆ ئەبو تالیبی مامەت، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە لەکاتی خۆیدا، هەتا لە ژیانا بوو، داڵدەی تۆی دەداو، لەسەری دەکردیتەوە؟ خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (بەڵێ، والە ناو تەنکاوی ئاگرەکەدا، خۆ ئەگەر من نەبوومایە جێگەی بن بنەوەی ناخی دۆزەخ دەبوو).

لەگێڕانەوەیەکی تاج دا: (بەڵێ خۆی لەناو گێژاو و نێرینەی ئاگرەکەدا بوو، بەڵام من لەوا دەرم هیناو بردمە ناوتەنکایییەوە!). (تاج/٦ ل/٢١٣ ف/٢٢ ز/١٠- باسی: سوورەتی تەوبە- ش).

---

(٢٧٦) لم يوافقه مسلم على تخريجه (راجع: ١٢٥١ تجريد) - المترجم .

(٢٧٧) اخرجه مسلم في الايمان ، باب: شفاعة النبي (صلى الله عليه وسلم) لابي طالب ، رقم: ٢٠٩.

**ڕاڤەو شیکرنەوە:**

عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب مامەی پێغەمبەر بوو، نازناوی ئەبولفەضل بوو، دووساڵ لە پێغەمبەر گەورە تربوو، بەمناڵی بزردەبێ دایکی ئاه (نەزر)دەکا، ئەگەر دۆزییەوە بەرگی ئاوریشم بۆ کەعبە بکا، وە دەیدۆزێتەوە، جانەزرەکەی جێ بە جێ دەکا، ئەو یەکەم کەس بووە کە بەرگی بۆ کەعبە کردووە، لە غەزای بەدردا دیل دەکرێ، بەسەرانە موسوڵمانان ئازادی دەکەن، بەڵام لەو ماوەیەدا ئیسلام دەبێ وە لە پێش ئازاد کردنی مەککە دا واتە: لەپێش فەتح دا، کۆچ دەکا بۆ مەدینە، لەغەزای فەتحی مەککەدا بەشداری دەکا، لە ڕۆژی حونەین دا، یەکێ بوو لەو موسوڵمانانەی کە هەڵ نەهاتن و دەوری پێغەمبەریان چۆڵ نەکرد.

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (هەرکەسێ ئازاری عەباس بدا ئەوە ئازاری من دەدا، چونکە مامی مرۆڤ لەجێگەی باوکێتی) عەباس کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێراوەتەوە، عەباس زۆر سەخی بوو، زۆر خزم دۆست بو، لە پاش ئەبوتالیب لەناو مامەکانی پێغەمبەردا عەباس لەوانی تریان زیاتر یاریدەی پێغەمبەری ئەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) زۆر ڕێزی عەباسی دەگرت، دەیفەرموو: (عەباس مامەمە، هاوخەڵفی باوکمە) عەباس (ڕەزای خودای لێ بێ) هۆشمەند بوو، نزای گیرابوو، لە ساڵی حەفدەی کۆچیدا، بێ بارانی بوو، عومەر لەخوا داوای کرد کە لەبەر خاتری عەبباسی مامەی پێغەمبەر، بارانیان بۆ ببارێنێ، وە خودا بارانی بۆ باراندن.

عەباس پیاوێکی بالابەرزی سپیکە لەی جوان بوو. لەتەمەنی (٨٧) ساڵیدا، لەمانگی ڕەجەب یارمەزاندا لەمەدینە مەرگی خودایی بوو بەمیوانی لە ئیستیعابا دەفەرموێ: (عەباس پیاوێکی جوانی سپیو سووری لەش ناسکی بالا ناوەنجی بوو، دووپەلکەی هەبوو... لە مەدینە، لەڕۆژی هەینی دا لەشەوی دوازدەی ڕەجەبدا، لە پێش شەهید بوونی ئیمامی عوسماندا بەدوو

ساڵ، بەمردنی خوا مردووە) هەندێ دەڵێن: لە ڕەمەزانی ساڵی سیی و دووی کۆچی لەتەمەنی (٨٨)ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، لەبەقیع نێژراوە، ئیمامی عوسمان نوێژی مردووی لەسەر کردووە .

سیو دوو ساڵ لەسەردەمی ئیسلام دا ژیاوە، لەسەردەمی نەزانیش دا پەنجاو شەش ساڵ ژیاوە، کە دەکاتە: (٥٦+ ٣٢ = ٨٨) ساڵ، عەبدوڵلای کوڕی دایهێلایە ناو گۆڕەکەیەوە) (رمزای خودای لێ بێ). (بڕوانە: تاج/٥ ز/١٧ ل/ ١٠٣- باسی: گەورەیی عەبدولای کوڕی عەباس + تاج/٥ ز/٢١ ل/١٢١- باسی: گەورەیی عەبدوڵلای کوڕی عەباس + ژمارە/٥ بەرگی یەکەمی تەجرید لاپەڕە/١٩ + ژمارە/ ٧٢١ ل- ١٤٩ + ژمارە/٧٦١ ل/١٨٨ بەرگی دوو + بەرگی دووەم ژمارە/٧٨٨ - ٢٠٦) .

دوا گوتە: لە موقەدیمەی فەتحولباریدا دەفەرموێ: (عەبباس پێنج فەرموودەی هەیە لە بوخاریدا) (بڕوانە: ژمارە:١٢١٨تجرید).

١٥١١– عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ سَمِعَ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَذُكِرَ عِنْدَهُ عَمُّهُ فَقَالَ لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُجْعَلُ فِي ضحْضاحٍ مِنْ النَّارِ يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ يَغْلِي مِنْهُ دِمَاغُهُ. (الحديث: ٣٨٨٥، طرفه في: ٦٥٦٤)[٢٧٨] .

ئەبو سەعیدی خودری (رمزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا، باسی ئەبو تالیبی مامەی کرا، گوێم لێ بوو فەرمووی: (هیوام وایە کە لە ڕۆژی زیندووەدا تکاو شەفاعەتی من سوودی هەبێ بۆی، سابەشکوو بخرێتە ناو ئاگرێکی تەنکەوە، دەگاتە قولەپێی، مێشکی دەکوڵێ پێی). (تاج/٦ ز/١٠ ف/٢١ ل/٢١٣- ش ).

(٢٧٨) اخرجه مسلم في الايمان ، باب: ذكر المسيح بن مريم و المسيح الدجال ، رقم: ٢١٠ .

# فەرموودەکەی ئیسراو میعراج

١٥١٢- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللّهُ عَنْهُما) انَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (لَمَّا كَذبَتْنِي قُرَيْشٌ قُمْتُ فِي الْحِجْرِ فَجَلا اللَّهُ لِي بَيْتَ الْمَقْدِسِ فَطفِقْتُ اخْبِرُهُمْ عَنْ ايَاتِهِ وَانَا انْظرُ الَيْهِ). (الحديث: ٣٨٨٦، طرفه في: ٤٧١٠)[٢٧٩] .

جابیری کوڕی عەبدولا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (کاتێ کە قوڕەیش بۆ مەسەلەی ئیسراء (واتە: شەوڕەوی) باوەڕیان پێ نەکردم، لە حیجری ئیسماعیلا ڕاوەستام، کە شوێنێکە دەکەوێتە ئاستی پلووسکی ڕەحمەت، لەڕووی شامەوە لە حەوشەی کەعبەدا، ئیتر خودا بەیتولەقدیس (خانەی پیرۆزی)ی بەتەواوی و بەبێ پەردەهێنایە بەرچاوم، ئیتر نیشانە بە نیشانەی و شوێن بە شوێنی، وەك بەموجەسسەمی لەبەر چاوم بێ، ئاوا بەچاوی خۆم تەماشام دەکرد و باس و وەصفیم دەکرد بۆیان) (تاج/٤ ز/١٠٠ ل/٣٠٥ ف/٢- باسی: ئیسرا) .

**ڕوونکردنەوە:**

کاتێ پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ)تەشریفی چوو بۆ ئیسراو هاتەوەو باسی ئەوەی بۆ خەڵکی مەککە کرد، خەڵکەکە بوون بەسێ بەشەوە: بەشی یەکەم باوەڕیان پێ کردو گوتیان: محمد پێغەمبەری خودایە، پێغەمبەرو درۆیان نەگوتوە، یەکێ لەم زاتانە ئەبو بەکری صەدیق بوو، بەشی دووەم: یەکسەر ئەمەیان بەدرۆیەکی پەتی زانی و گوتیان: شتی وا جێگەی باوەڕنییە، بەشی سێیەم: گوتیان ئێمە شارەزای بەیتولەقدیسین، موحەمەد لەم بابەتەدا نەشارەزایی هەیە، نەچووە بۆ قودس، کەواتە: ئێمە داوای ناونیشان و شتی

(٢٧٩) اخرجه مسلم في الايمان ، باب: ذكر المسيح بن مريم و المسيح الدجال ، رقم: ١٧٠ .

وای لێدەکەین، ئەگەر زانی ئەوە دیارە ڕاست دەکاو شتی وایش واتای وایە کەموحەممەد پێغەمبەرە .

جا چەند پرسیارێکیان لە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) کرد، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لەسەرتاوە نەیزانین، زۆر بۆ ئەمە پەرۆش و خەمبار بوو، بەلام دوایی خودا پەردەی لەنێوانی پێغەمبەرو بەیتول مەقدیس دا هەلگرت، باسی هەرچییان لێ دەپرسی ڕێك وەك خۆی پێی دەگوتن، وەك بەچاوی سەر تەماشای بەیتولمەقدیس و کون‌و قوژبنی بکا. جا ئەم فەرموودە پیرۆزەیە ئەم هەڵویستە ڕوون دەکاتەوە!

١٥١٣- عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) انَّ نَبِيَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) حَدَّثهُمْ عَنْ لَيْلَةِ اسْرِيَ بِهِ بَيْنَمَا انَا فِي الْحَطيمِ وَرُبَّمَا قَالَ: فِي الْحِجْرِ مُضطجِعًا اذ اتَانِي اتٍ فَقدَّ قَالَ: وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ فَشَقَّ مَا بَيْنَ هَذهِ الَى هَذهِ قَالَ الراوي: مِنْ ثغْرَةِ نَحْرِهِ الَى شِعْرَتِهِ فَاسْتَخْرَجَ قَلْبِي ثمَّ اتِيتُ بِطسْتٍ مِنْ ذهَبٍ مَمْلُوءةٍ ايمَانًا فغُسِلَ قَلْبِي ثمَّ حُشِيَ ثمَّ اعِيدَ ثمَّ اتِيتُ بِدابَّةٍ دُونَ الْبَغْلِ وَفوْقَ الْحِمَارِ ابْيَض فَقَالَ الراوي: هُوَ الْبُرَاقُ يَضعُ خَطوَهُ عِنْدَ اقْصَى طرْفِهِ فَحُمِلْتُ عَلَيْهِ .

فَانْطلَقَ بِي جِبْرِيلُ حَتَّى اتَى السَّمَاء الدُّنْيَا فَاسْتَفْتَحَ فَقِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ ، قَالَ: نَعَمْ ، قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَفَتَحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ فَاذا فِيهَا ادَمُ فَقَالَ: هَذا ابُوكَ ادَمُ فَسَلّمْ عَلَيْهِ فَسَلّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ السَّلامَ ثمَّ قَالَ: مَرْحَبا بالابْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى اتَى السَّمَاء الثانِيَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَفَتَحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ اذا يَحْيَى وَعِيسَى وَهُمَا ابْنَا الْخَالَةِ قَالَ: هَذا يَحْيَى وَعِيسَى فَسَلّمْ عَلَيْهِمَا فَسَلّمْتُ فَرَدَّا ثمَّ قَالا مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ .

ثمَّ صَعِدَ بِي الَى السَّمَاء الثالِثةِ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء

جَاء فَفُتِحَ فَلَـمَّا خَلَصْتُ اذا يُـوسُفُ قَالَ: هَذا يُوسُفُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَـلَّمْتُ عَلَيْـهِ فَرَدَّ ثمَّ قَـالَ: مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثمَّ صَعِدَ بِي حَتَّـى اتَـى الـسَّمَاء الرَّابِعَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيـلَ: اوَ قَدْ ارْسِلَ الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَـجِيء جَاء فَفُتِحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ الَـى ادْرِيسَ قَالَ: هَذا ادْرِيسُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَـلَّمْتُ عَلَيْهِ فَـرَدَّ ثـمَّ قَـالَ: مَرْحَبـا بـالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ .

ثمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى اتَى السَّمَاء الْخَامِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيـلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ ، قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ؟ ، قَالَ: نَعَمْ قِيـلَ: مَرْحَبـا بِـهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَلَمَّا خَلَصْتُ فَاذا هَارُونُ قَالَ: هَذا هَارُونُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَـسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثمَّ قَالَ: مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الـصَّالِحِ ثـمَّ صَـعِدَ بِـي حَتَّـى اتَـى السَّمَاء السَّادِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: مَنْ مَعَكَ قَـالَ: مُحَمَّـدٌ قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَلَمَّا خَلَصْتُ فَـاذا مُوسَى قَالَ: هَذا مُوسَى فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثمَّ قَالَ: مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ فَلَمَّا تَجَاوَزْتُ بَكَى قِيلَ لَهُ: مَا يُبْكِيكَ قَالَ: ابْكِـي لانَّ غُلامًـا بُعِـث بَعْدِي يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ امَّتِهِ اكْثرُ مِمَّنْ يَدْخُلُهَا مِنْ امَّتِي .

ثمَّ صَعِدَ بِي الَى السَّمَاء السَّابِعَةِ فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ بُعِث الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قَـالَ: مَرْحَبـا بِـهِ فَـنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَلَمَّا خَلَصْتُ فَاذا ابْرَاهِيمُ قَالَ: هَذا ابُوكَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ قَـالَ: فَـسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ السَّلامَ قَالَ: مَرْحَبا بالابْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثـمَّ رُفِعَـتْ الَـيَ سِـدْرَةُ الْمُنْتَهَـى فَـاذا نَبْقُهَـا مِثـلُ قِـلالِ هَجَـرَ وَاذا وَرَقُهَـا مِثـلُ اذانِ الْفِيَلَـةِ قَـالَ: هَـذِهِ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى وَاذا ارْبَعَةُ انْهَارٍ نَهْرَان باطنَان وَنَهْرَان ظاهِرَان فَقُلْـتُ مَـا هَـذان يَـا جِبْرِيلُ قَالَ: امَّا الْباطنَان فَنَهْرَان فِي الْجَنَّةِ وَامَّا الظاهِرَان فَالنِّيلُ وَالْفُـرَاتُ ثـمَّ رُفِـعَ لِي الْبَيْتُ الْمَعْمُورُ يدخُلُه كلّ يومٍ سبعونَ الفَ ملكٍ ثمَّ اتِيتُ باناء مِنْ خَمْـرٍ وَانَـاء مِنْ لَبَنٍ وَانَاء مِنْ عَسَلٍ فَاخَذتُ اللَّبَنَ فَقَالَ: هِيَ الْفِطرَةُ الَّتِي انْتَ عَلَيْهَا وَامَّتُكَ .

ثمَّ فُرِضتْ عَلَيَ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ فَمَرَرْتُ عَلَى مُوسَى فَقَالَ: بِمَا امِرْتَ قَالَ: امِرْتُ بِخَمْسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ قَالَ: انَّ امَّتَكَ لا تَسْتَطِيعُ خَمْسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ وَانِّي وَاللّٰهِ قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ وَعَالَجْتُ بَنِي اسْرَائِيلَ اشَدَّ الْمُعَالَجَةِ فَارْجِعْ الَى رَبِّكَ فَاسْالْهُ التَّخْفِيفَ لامَّتِكَ فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ الَى مُوسَى فَقَالَ: مِثْلَهُ فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ الَى مُوسَى فَقَالَ: مِثْلَهُ فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ الَى مُوسَى فَقَالَ: مِثْلَهُ فَرَجَعْتُ فَامِرْتُ بِعَشْرِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ فَقَالَ: مِثْلَهُ فَرَجَعْتُ فَامِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ الَى مُوسَى فَقَالَ: بِمَ امِرْتَ قُلْتُ: امِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ قَالَ: انَّ امَّتَكَ لا تَسْتَطِيعُ خَمْسَ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ وَانِّي قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ وَعَالَجْتُ بَنِي اسْرَائِيلَ اشَدَّ الْمُعَالَجَةِ فَارْجِعْ الَى رَبِّكَ فَاسْالْهُ التَّخْفِيفَ لامَّتِكَ قَالَ: سَالْتُ رَبِّي حَتَّىاسْتَحْيَيْتُ وَلَكِنِّي ارْضى وَاسَلِّمُ قَالَ: فَلَمَّا جَاوَزْتُ نَادَى مُنَادٍ امْضَيْتُ فَرِيضَتِي وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبَادِي). (الحديث: ٣٨٨٧، اطرافه في:٣٢٠٧، ٣٣٩٣، ٣٤٣٠ )[٢٨٠] .

**مالیکی کوڕی صەعەصەعە** (رمزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **باسی ئەو شەوەی بۆ کردین، کەبرد برویان بۆ ئیسراو میعراج، فەرمووی: (لەلای بەیت، لە حەطیم، یا لە حیجردا، لە نێوانی حەمزەی مامم و جەعفەری ئامۆزاما ڕاکشا بووم، لەبەینی خەوتوو و بیداردا بووم، لەو کاتەدا تەشتێکی زێڕینیان هێنا، پڕبوو لەدانایی (حیکمەت)و باوەڕ (ئیمان) ئینجا جوبرائیل ومیکائیل و ئیسرافیل،لەدانەی سەرسینگمەوە لەتیان کرد هەتا بەرمووسڵدانم، وەدڵیان دەرهێنام و بە ئاوی زەمزەم شۆردیانەوەو ئەنجا پڕ پڕیان کرد لە حیکمەتو لە ئیمان و زانست، ئەوجا نایانەوە شوێنی خۆی.**

---

**(٢٨٠) اخرجه مسلم في الايمان، باب: الاسراء برسول الله** (صلى الله عليه وسلم) **رقم: ١٦٤.**

جـا ولاخێکـی سـپییان هێنـا بـۆم، لەهێـستر بـچکۆلەترو لەگوێدرێـژ گـەورەتر بـوو، نـاوی بـۆراق بـوو، چـونکە دەچریـسکایەوەو لەبـەر خێرایـا دەتگوت بەرقـە، واتـە: بروسـکە، چـەندە چاوی بـڕی دەکـرد دەیکـرد بەیـەك هەنگاو،جاسـواری ئـەو ولاخـە بـووم و لەگـەڵ جوبرائیـل دا ڕۆیـشتم هـەتا گەیـشتینە ئاسمانیـیەکـەم، جـا جوبرائیـل داوای کردنـەوەی دەرگـای کـرد، لـەناوەوە گـوترا: ئەوەکێیـە؟ گـوترا: جوبرائیـل گـوترا: کێـت لەگـەڵ دایـە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بە شوێنیدا؟ فەرمووی: بەڵێ: گـوترا: بـەخێر بـێ و هاتنەکـەی خێـری پێـوەبێ، جـا دەرگـا کرایـەوەو ڕۆیـشتینە ژوورەوە. کاتێ گەیـشتمە جێ لـەئاسمانی یەکـەم، دەڕوانم وا ئـادەم تەشریفی والـەوێ، جوبرائیـل فـەرمووی: ئەمـە حـەزرەتی ئـادەمی باوکتـەن بفـەرموو سلاوو چاك و چۆنی لەگەلا بکە، منـیش سلاو و ڕۆژ باشـیم لێ کـرد، ئـەویش وەلامـی سـەلاوەکەی دامـەوە، لەپاشـا فـەرمووی: خـۆش هـاتی ئـەی کـوڕی شیرینم! مەرحەبات لێ بێ ئەی کوڕی باسم و ئەی پێغەمبەری باش و خاس! (لەگێڕانەوەیەکی تاج دا دەفەرموێ: کاتێ سەرکەوتینە سـەر ئاسمـانی یەکـەم، تەماشام کرد واپیـاوێکی نـوورانی والـەوێ، لـە ڕاسـت و لەچـەپیەوە پـۆل پـۆل تارمـایی عەشـامات دیـارن، پیاوەکـە کەسـەیری لای ڕاسـتی خـۆی دەکـرد پێدەکەنی، بەڵام کەسەیری لای چەپی خۆی دەکرد دەگریـا، فـەرمووی بـەمن: مەرحەبا لە پێغەمبەری باش و لە کوڕی باشم، گوتم: ئـەی جوبرائیـل! ئەمـە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە باوە ئادەمەو ئـەو تارمـایی و عەشاماتەیش کـەوان لـە ڕاسـت و لـە چـەپیەوە، گینانگـەلی وە چـەکانیەتی، ئەوانـەیان کـەوان لـەلای ڕاستیەوە ئەوانە بەهەشتین، بەڵام ئەوانـەیان کـەوان لـەلای چـەپیەوە ئەوانـە دۆزەخـین، جـا بۆیـە کـە تەماشای لای ڕاسـتی دەکـا، لـە خۆشـیانا پێدەکـەنێ، کەتەماشای لای چەپی دەکا، لە خەم و خەفەتا دەگری).

ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی دووەم، لەدەرگای دا، گوتیان: ئەوەکێیـە؟ فـەرمووی: جوبرائیـل، گوتیـان: کێـت لەگـەڵ دایـە؟ فـەرمووی موحەممـەد،

گوتیان: نێردراوە بە شوێنیاکە تەشریف بهێنێ بۆ میعراج و بۆ گەشت کردن بەناو ئاسمانەکاندا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: بەخێربێ و خێر و خۆشی هێنابێ، دەرگایان کردەوە، لەوێش چوومە لای عیساو یەحیا، کە دوو پێغەمبەرن و پوورزای یەکترین، فەرمووی: ئەمە یەحیا و عیسایە، سلاو و ڕۆژ باشی یان لێ بکە، منیش سلاوم لێ کردن و ئەوانش وەلامی سلاوەکەیان دامەوە ئەوجا فەرموویان: مەرحەبا لە برای چاك و لە پێغەمبەری چاك. ئەوجا بەرزەوە بووین بۆ ئاسمانی سێیەم، داوای کردنەوەی دەرگای کرد، گوترا: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل: گوترا: کێت وا لەگەڵ دا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە شوێنی دا..؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: بەخێربێ، لەوێ ڕۆیشتم بۆلای یوسف و سلاوم لێ کرد وەلامی سلاوەکەی دامەوە، فەرمووی: مەرحەبا لەبرای باش و لە پێغەمبەری باش. ئەوجا بەرزەوە بووین بۆ ئاسمانی چوارەم، داوای کردنەوەی دەرگای کرد، گوترا: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت وا لەگەلا؟ فەرمووی: موحەممەد؟ گوترا: نێردراوە بە شوێنیدا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوترا: بەخێربێ، هاتنەکەی خێری پێوەبێ، دەرگا کرایەوە لەوێ گەیشتم بە ئیدریس، فەرمووی: ئەمە ئیدریسە، سلاوی لێبکە، سلاوم لێ کرد، وەلامی دایەوەو فەرموی: مەرحەبا لە برای باش و لە پێغەمبەری باش .

ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی پێنجەم داوای کردنەوەی کرد گوتیان: ئەوە کێیە؟ فەرمووی جوبرائیل. گوتیان: کێت وا لەگەڵ دا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بەشوێنی دا؟ فەرمووی: بەڵێ گوتیان: بەخێربێ، لەوێ چووین بۆ لای پێغەمبەر هاروونی برای پێغەمبەر مووسا (سەلامی خوای لا با) فەرمووی: ئەمە هاروونە، سلاوی لێ بکە، سلاوم لێ کرد، وەلامی دامەوە . ئەوجا فەرمووی: مەرحەبا لەبرای باش و لە پێغەمبەری باش .

ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی شەشەم، داوای کردنەەی دەرگای کرد، گوترا: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل. گوترا: کێ وا لەگەڵ تا؟ فەرمووی:

موحەممەد، گوترا: نێردراوە بە شوینی دا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوترا: بەخێربێ و خێرو خۆشی هێنابی، لەوێ گەیشتم بـە مووسا فـەرمووی: ئـەوە مووسایە، سـلاوی لێ بکـە، سـلاوم لێ کـرد، وەلامـی سـلاوی دامـەوە ئـەوجا فـەرمووی: مەرحەبا لە برای باش و لە پێغەمبـەری بـاش، کـاتێ لەمووسا تـێ پـەڕ بـووم دەستی کرد بەگریان، گوترا: ئـەوە بۆدەگریـت؟ فـەرمووی: بـۆ ئـەوە دەگـریم، کە ئەم کوڕە جەهێڵەی کە لە پاش من ڕەوانە کراوەو کراوە بە پێغەمبەر، لـە ئۆمەتی ئەو زیاتر دەچنە بەهەشت هەتا لە ئۆمەتی من.

ئـەنجا چـووین بـۆ ئاسمـانی حەوتـەم گـوترا: ئەوەکێیـە؟ فـەرمووی: جوبرائیـل، گوتیـان: کێـت وا لەگـەڵ دا؟ فـەرمووی:موحەممـەد، گوتیـان: نێـردراوە بەشـوێنی دا؟ فـەرموی: بـەڵێ. گـوترا: بـەخێربێ، لـەوێ چـوومە خزمـەتی بابـە ئیـبراهیم، فـەرمووی: ئەمـە ئیراهیمـی باوکتـە سلاوی لێ بکـە، فەرمووی: سلاوم لێ کرد، وەلامی سلاوەکەی دامەوەو فـەرمووی: مەرحـەبا لـە کوڕی باش و لە پێغەمبەری باش ئینجا بەیتولەعموور (خانـەی ئـاوەدان)یـان پێ نیشان دام، کە لە جوبرائیلم پرسی، فـەرمووی: ئەمـە بەیتولەعموورەکـە لـە قورئـان دا، لەسـەرەتای سـوورەتی طـوورەوە خـودا سـوێندی پـێ دەخـواو دەفەرموێ: ﴿والبيت المعمور﴾ هەموو ڕۆژا حەفتا هەزار فریشتە نوێـژی تیـادا دەکەن، کە لێی چوونە دەرەوە ئیتر جارێکی تر ناگەڕێنـەوە بـۆی، وسـەردان و دینـی ئـەم ماڵی ئاوەدانە دوا ئەرکی سەرشانیانە.

هەروا سیدرەتول مونتەهام بۆ دەرخرا، واتە: دارمـۆردی هـەرە ئەوپـەڕ، کە ئەو درەختەیە، زانستی فریشتەکان هەتا ئەوی بڕدەکاو لـەوێ کۆتـایی دێ، وەکەس ئەو پەڕی نەکەوتووە و لەڵی ڕەت نەبووە بێجگە لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لێ بێ) کە تەماشام کرد وا دەنکە مۆردەکانی واتـە: بەرەکـەی بـە قـەد کـوو پەڵەی گوندی هەجەر گەورە بوون، کە ئەم جۆرە کووپەیـە ناسـراو بـوون لای گوێگران، وەگەلاکەی وەك گوێچکەی فیل وابوو، وە چوار ڕوبار لەبنیەوە هەڵ

دەقولان، دوانیان دەچوونەوە بەناوداو دەرنەدەکەوتن، وە دوانیان بەدەرەوە بوون، لە جوبرائیلم پرسی: ئەمانە چین؟ فەرمووی: ئەو دوو جۆگەیەیان کە دەڕۆنە ناوەوە ئەوە دوو جۆگەن وان لە بەهەشتا، وە ئەم دوو جۆگەیەیان کەوان بەدەرەوە دوو ڕووباری نیل‌و فوراتن، نیل وا لە ناوخاکی میسراو فورات واله ناو خاکی عێراقدا .

(لە گێڕانەوەیەکدا، کەوا لە (التاج الجامع للاصول في احاديث الرسول) دا دەفەرموێ: ئەنجا بەرزکرامەوە بۆ شوێنێ کەوا لەسەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە، هەروا وا لەسەرووی سیدرە تولمونتەهاشەوە، گوێم لەجیڕەی قەڵەمەکان بوو، کە چارەنووسی هەموو شتێکیان دەنووسی، کە ڕوودەدەن لە لەوحول مەحفوظ، لەلای کورسی، لە نزیك تەخت و بارەگا (عەرش)ی خودای گەورەو میهرەبان، ئەنجا لە لایە نی خوداوە، فریشتەکان قاپێ شیرو قاپێ مەی و قاپێ هەنگوێنیان بۆم هێنا منیش قاپە شیرەکەم وەرگرت و خواردمەوە، جوبرائیل فەرمووی: (ئەم شیرە ئەو سروشتە پاك و پیرۆزەیە، کە خۆت و ئۆمەتت وان لەسەری).

(ئەنجا لە لایەنی خوداوە پەنجا نوێژ لە سەر خۆم و یەکە یەکەی گەلی ئیسلام دانرا، لەماوەی هەموو شەو و ڕۆژێکا، جا بەرەو دوا گەڕامەوە هەتا گەیشتمەوە لای مووسا، فەرمووی: چ ئەرکێکت لەسەر دانرا؟ گوتم: پەنجا نوێژم لەسەر فەرزکراوە، لەماوەی هەموو شەو و ڕۆژێکا. فەرمووی: من لە تۆ باشتر شارەزاییم هەیە لە ڕەفتاری ئەو خەڵکە، چونکە من لە پێش تۆدا زۆربە زەحمەت خەریکی نەوەی ئیسرائیل بووم و، بەراووردم کردوون، جا بۆیە دەزانم کە ئۆمەتی تۆ تەوانایی ئەوەیان نیە، کەواتە: بگەڕێرەوە بۆ لای خودا، داوای لێ بکە کە ئەم نوێژانە لەسەر ئۆمەتت سووك بکا.

منیش گەڕامەوە و داوای ئەوەم لێکردو ئەویش لەپەنجاوە کردنی بەچل نوێژ ، جا گەڕامەوە بۆ لای مووسا و دووبارە وەك جاری پێشووی پێ

فەرمووم، جا چۆومەوە بۆلای پەروەردگارم، جا دەنوێژی تری لێ داشکانن و کردنی بە سیی نوێژ، دیسان گەرامەوە بۆلای مووسا دیسان هەمان شتی فەرموو، جا هەمدیسان گەرامەوە بۆلای پەوەردگار، دیسان دەی تری لێداشکانن و کردنی بە بیست نوێژ، دیسان گەڕامەوە بۆ لای مووسا و چوار بارەوەك جاری پێشووی فەرموو، ئینجا خودا کردنی بە دەنوێژ.

دیسانەوە گەڕامەوە بۆلای مووسا و هەم دیسان وەك جاری پێشووی فەرموو: ئەنجا خودا کردنی بەپێنج نوێژ، دیسان کەچوومەوە بۆلای مووسا فەرمووی: هاچیت کرد؟ گوتم: کردنی بە پێنج نوێژ دیسان مووسا فەرمووی: نەتەوەی تۆ توانای ئەوەیشی نییە، چونکە من لەم بارەیەوە خاون ئەزموونم و بەتایبەتی لەگەڵ گەلی خۆما کەنەتەوەی جوولەکەیە، کە ناسراون بە نەوەی ئیسرائیل، واتە: ڕۆڵەکانی یەعقووب پێغەمبەر بەراودی زۆرم هەیە، کەواتە دیسانەوە بڕۆرەوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای بار سووکی و کار ئاسانی لێبکە، بۆ نەتەوەکەت منیش گوتم: بەڕاستی ئەوەندە دووبارەو سێبارە لەم بارەیەوە لە پەروەردگارم داوام کردووە ئیتر شەرم دەکەم کەرووی لێ نێم و لەڕووم نایەت، بەلاّم رازیم بەمەو کاری خۆم دەسپێرم بەخوا فەرمووی: جاکاتێ لەوا تێ پەڕبووم، بانگکەرێ بانگی کرد: وافەرزی خۆمم بڕیار دا، وەباری بەندەکانی خۆمم سووك کردو ئەرکی سەرشانم سووك کردن). (تاج/٤ ز/١٠٠ ل/٢٩٨ ف/١- باسی : شەوڕەوی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەهرەی زۆری واتیادا، لێکۆڵینەوەیەکی وردی دوورو درێژی دەوێ مامۆستای عەینیو مامۆستای عەسقەلانی لەم بارەیەوە درێغی یان نەکردووە، خودا پاداشی باشیان بداتەوە، بەروونی ئەم بەهرەو سوودانە لەم فەرموودەیەداو لە فەرموودەکانی صەحیحەین و پەڕاوە گەورەکانی تری صەحیحی سوننەتدا ڕەنگ دەدەنەوە:

١- پێغەمبەران و پیاوچاکان لەژیانی بەرزەخدا زیندوون، وە پەیوەندی بەیەکتری یەوە دەکەن، هاموشۆی ئاسمانەکان و شوێنانی تردەکەن، هەروەك پەیوەندیان بەگۆڕەکانیانەوە دەمێنێ، وە هەروەها بەشداری لە بۆنەو ڕووداوە گرنگەکانی جیهاندا دەکەن، لەجیهانی دوو هەمیشا هەست بەخۆشی و ناخۆشی خۆیان و گەلەکانیان دەکەن، بەخۆشیوباشی نەتەوەکانیان شادمان دەبن، بەکزی و بێ نازی و کەساسی و لاوازی یان دلگران دەبن، کەیفخۆش دەبن، تووڕە دەبن، پێدەکەنن، دەگرین، ئاگایان لە حاڵی ئوممەتیان هەیە.

لە ژیانی بەرزەخا، خواپەرستی و پەرستش و عیبادەتی جۆراو جۆر دەکەن، وەك نوێژو جەماعەت و حەج و تەوافی بەیت و زیکری خوداو نزای باش و ئامۆژگاری خێرو سلاوو ڕۆژ باشی و چاکۆ چۆنی لە یەکتری و وەلام دانەوەی سلاو. وەزۆر لە ڕەفتارو خوو وعادەت و باوی کۆمەلایەتی جوانی دنیایی لەناو یان دەمێنێ و پەیرەوی دەکەن، وەك ئەوە ئادەم و ئیبراهیم شانازی بەوەوە دەکەن کە کوڕی خانەدان و نەجیبزادەو پایە بەرزی وەك موحەممەدیان هەیە، وەك دەستووری بەیەکتری ناسین، وەك گریان و خەم خواردن بۆ جێماوی و کەساسی گەلی خۆت، وەك پێشوازی و چوون بەپیری مێوان و چاك و چۆنی، هەروا مردوو دەتوانێ پەیوەندی و قسەو گفتوگۆو چاك و چۆنی و تەفاهوم لەگەڵ زیندوو بکا، وەجیاوازیی زمان و ڕەگەزو نیشتمان و نەتەوە، نابێ بەرێگر لە تێگەیشتن لە یەکتری، وەمردوو لە ژیانی بەرزەخیدا جۆرە پەیوەندییەکی دەمێنێ بە گۆڕەکەیەوە.

لە فەرموودەیەکی ئیمامی موسلیما: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەو شەوە کە چووم بۆ ئیسرا، لەلای مووساوە ڕەت بووم، لەشام لە لای تەپۆڵکە لە سوورەکەدا بوو، لەناو گۆڕەکەیدا ڕاوەستابوو، بەپێوە نوێژی دەکرد). (بڕوانە: تاج/٤ ل/٣٨٢ ف/٢).

لەهەمان کاتدا زۆر بە ئاسانی دەتوانن گۆڕەکەیان بەجێ بهێڵن و بۆکاری شیاو خۆیان بۆ ئەم لاو لا بڕۆن، وەك ئەوەحەزرەتی مووسا لە هەمان شەو لە مەسجیدو لئەقصا نوێژی بەجەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا کرد، وە لەهەمان شەویشالە ئاسمانی شەشم چوو بەپیریی پێغەمبەرەوە، وە ڕاوێژو ئامۆژگاری و گفتوگۆیەکی بە سوودی لەگەڵ پێغەمبەردا، سەبارەت بە ژمارەی نوێژە فەرزەکان، ئەنجامدا، کە پێغەمبەرو نەتەوەی ئیسلام سوودیان لەو فەرمایشتا نەی حەزرەتی مووسا (سەلامی خوای لێ بێ) وەرگرت، وە زۆر شتی تری لەم بابەتە لە سوننەتی ساخی پێغەمبەردا هەیە، کە بەلگە و نیشانەی ئەوەن کە پێغەمبەران و شەهیدان و ئەولیاکانی خودا لە هەردوو جیهانا جێگەی قەدرو ڕێزی خودان و شیاوی ئەوەن کە خودابیان کات بەمایەی خێرو خۆشیو ڕەحمەت بۆ خەلکی سەرزەوی ﴿ومالك ذلك على الله بعزيز﴾.

(بڕوانە: بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٧٨، فەرموودەی ژمارە: ١٥٩ تەجرید=٢١٦ فەتحولباری + تاج/٤ ل/٣٧٨ ف/٤ + ل/٣٨١ ف/٢ + ل/٣٨٣ ف/١ + ٢+ ل/٣٨٧ ف/١).

٢- مالیکی کوڕی صەعصەعە ئەنصارییە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو، داستانی ئیسراو میعراجی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، کە ئەم فەرموودەیە لە بورخاری دا، ئیمامی موسلیمیش گێڕاویەتەوە، عەسقەلانی لە فەتح دا دەفەرموێ: (لە بوخاری و لە غەیری بوخاریدا هەر ئەم فەرموودەیەی هەیە و بەس، جگە لە ئەنەسی کوڕی مالیکیش، نەزانراوە کە کەسێتر ریوایەتی لێوەبکات) بەغەویش لەسەر فەرمایشی ئیصابە دەفەرموێ لەمەدینە نیشتە جێ بوو، تەنیا دوو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە هەیە). خەتیبیش لە موبهەماتا دەفەرموێ: (ئەم مالیکی کوڕی صەعصەعەیە، ئەو پیاوەیە کە پێغەمبەر کردبووی بەسەرکاری سەرخەیبەرو دوایی پێی فەرموو: (اكل تمر خيبر هكذا؟).

٣- كورت و پوخت: (زۆرشت لە جیهانی دووهەمەدا بە پێوەری ئەم جیهانی یەکەمە ناپیورێ، بگرە زۆر شت لەو جیهان رێك بە پێچەوانەی پێوەرەکانی ئەم دنیایە !). (بڕوانە: ژمارە: ٩٨٨ تەجرید=٢٢٠١ فەتح = بەرگی/٣ ل/٥٤).

٤- زۆر لەم وشانەو وێنەی ئەم وشانە کەلەم فەرموودەیە و لەوێنەی ئەم فەرموودەیەدا هەیە، کەقسە لە باسوخواسی جیهانی بالا و جیهانی بەرزەخ و ئەو جیهانی ترو جیهانی غەیب دەکا، وەك وشەی تەشت و دەرگاکردنەوەو شۆردنی دڵ و..تاد، زۆر لەم وشانە و لە وێنەیان لەبازنەی ئەم فەرمایشتەی مامۆستای عەسقەلانی دا دەبێ لێیان تێ بگەین و واتایان بکەین، کە دەفەرموێ لەم جێگەیەدا: (وجميعُ ماوردَ من شقِّ الصدر واستخراج القلبِ وغيرِ ذلك منْ الامور الخارقةِ للعادةِ، ممّا يجبُ التسليمُ لهُ دونَ التعرّض لصرفه عنْ حقيقته، لصلاحيَة القدرة، فلايستحيلُ شيء منْ ذلك). واتە: هەموو ئەو وشەو بێژەو دەربڕینانەی کەلەم فەرموودەیەدا هاتوون، وەك:لەتکردنی سینگ و دەرهێنانی دڵ وشتی تری لەم بابەتە، لەوشتانەن کەسنووری باری ئاسایی دەبەزێنن و، لەبارودۆخی ئاساییدا شتیوا ستەمەو کاری نەکردنییە، ئەمانە هەموو پێویستە بەبێ چەندوچوون قەبووڵیان بکەین وباوەڕیان پێ بکەین، نابێ لە واتای ڕاستەقینەی خۆیان، لایان بدەین، بە تەئویل و شتی وا، چونکە ئەم جۆرە شتانە لەسەر ڕووی ڕاستی و لەسەرەوەجهی حەقیقەت لە توانای خوادا هەن، وە هیچ شتێ لەمانە بۆ توانایی خودا نەستەمن و نەموستەحیل) .

بەندە لەم لایەنەوە گوتوومە:

بەبێ شیاوی تەواو
لە دەریای بێ پەی قەت مەنێ هەنگاو
جیهانی غەیب و جیهانی بەرزەخ
جیهانی بالاو بەهەشت و دۆزەخ
دەریای بێ پەین، فیکرو هۆش تیایا
کوڵ و داماون، ناچن بەلایا!!
ڕازی خودایی لە ژمارە نایە
زیاتر لەکەفی ناوی دەریایە
چەندی و چۆنی یان، یاساکەی جیایە
بەپێچەوانەی کاری دنیایە
رازو نهێنیو تەسلیمی ناو ژین
هەروا هەواڵی هەردوو دنیا و دین
مەر لەژێرخاکا پەیی پێ بەرین
نێمە تا نەمرین زۆر بێ خەبەرین!
لەپەڕەی دڵت لەجێکەی دەفتەر
بنووسە بڵێ ( الله اکبر! )
فارمایشتی خوا، قسەی پێغەمبەر
بەبێ چەن وچوون، وەک تاجی گەوهەر
دەنێمە بان چاو، دەنێمە سەرسەر
قسەیێ دەکەم بیکە بە پێوەر
بەقەد نیسکێکە دیسکی کۆمپیتەر
بەقەد سەد مەلا عیلمی وا لەبەر!

١٥١٤- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) فِي قَوْلِهِ تَعَالَى وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي ارَيْنَاكَ الا فِتْنَةً لِلنَّاسِ قَالَ: هِيَ رُؤْيَا عَيْنٍ ارِيَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةَ اسْرِيَ بِهِ الَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ قَالَ: وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرْانِ قَالَ: هِيَ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ(الحديث: ٣٨٨٨، طرفاه في: ٤٧١٦، ٦٦١٣)[٢٨١] .

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی فەرمایشتی خوداوە ﴿وما جعلنا الرؤيا التي اريناك الافتنة للناس﴾ . واتە: ئەوبینینەی کە نیشانی تۆمان دا کردمان بەفیتنەو ئاژاوە بۆ هەندێ کەس، کەباوەڕیان لاوازە، هەرواباسی ئەو درختە ناهەموارەش کە دوور لە ڕەحمەتی خودایە، کە لەناو ئاگری دۆزەخ دا دەیرِوێنین، ئەویشمان کردووە بە فیتنەو ئەزموون بۆ بازێ بێ عەقڵ و نەفام).

ئیبنو عەباس فەرمووی: ئەم نیشاندان و روئیایە کە لەم ئایەتەدا هەیە، برێتی بووە لە دیتنی ڕاستی بەچاوی سەر، نەك بەخەون وخەیاڵ، ئەوەیش لەو شەوەدا ڕووی داوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) برابوو بۆ شەو ڕەوی و ئیسرا، کە بەچاوی یەقین وبێداری گەلێ شتی سەیر سەیری بینیبوو، لەخوداوە پیشانی درابوو، ئەو درەختەیش کەلەم ئایەتەدا ناوی براوە بە (الشجرة الملعونة = درەختە نەفەرت لێکراوەکە) درەختی زەقنەمووتە).

(تاج/٦ ل/٢٧٠ ز/١٨ - سوورەتی ئیسراء ف/١١) .

١٥١٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَانَا بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَنَزَلْنَا فِي بَنِي الْحَارِث بْنِ خَزْرَجٍ فَوُعِكْتُ فَتَمَرَّقَ شَعَرِي فَوَفَى جُمَيْمَةً فَاتَتْنِي امِّي امُّ رُومَانَ وَانِّي لَفِي ارْجُوحَةٍ وَمَعِي صَوَاحِبُ لِي فَصَرَخَتْ بِي فَاتَيْتُهَا لا ادْرِي مَا تُرِيدُ بِي فَاخَذَتْ بِيَدِي حَتَّى اوْقَفَتْنِي

---

(٢٨١) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عباس (رَضيَ اللهُ عَنهما) في قوله: ﴿وما جعلنا الرؤيا﴾ -فتح /٧ص ٦٩٨ - خاتمة.ط.ج - المترجم .

عَلَى بابِ الدَّارِ وَانِّي لانْهجُ حَتَّى سَكَنَ بَعْض نَفسِي ثمَّ اخَذتْ شَيْئًا مِنْ مَاء فَمَسَحَتْ بِهِ وَجْهِي وَرَاسِي ثمَّ ادْخَلَتْنِي الدَّارَ فَاذا نِسْوَةٌ مِنْ الانْصار فِي الْبَيْتِ فَقُلْنَ عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ وَعَلَى خَيْرِ طائِرٍ فَاسْلَمَتْنِي الَيْهِنَّ فَاصْلَحْنَ مِنْ شَانِي فَلَمْ يَرُعْنِي الا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ضحًى فَاسْلَمَتْنِي الَيْهِ وَانَا يَوْمَئِذ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ (الحديث: ٣٨٩٤، اطرافه في: ٣٨٩٦، ٥١٣٣، ٥١٣٤، ٥١٥٦، ٥١٥٨، ٥١٦٠)[٢٨٢].

**عائیشه** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **مارەی کردم،تەمەنم شەش ساڵ بوو، ئەوکاتە ماڵمان لەمەککەبوو، لەپاشان کۆچمان کردو چووین بۆ مەدینە لەناو خێڵی نەوەی حاریسی کوڕی خەزرەجا دابەزین، کە تەمەنم بوو بە نۆ ساڵ، ڕۆژا دایکم هات بۆلام، لەوکاتەدا لە نەخۆشینی لەرزوتا هەڵسا بوومەوە، قژەکەم ڕووتا بۆوە، بەلاّم بەشی پەلکۆلکەیەکی لێ پەیدا بوو بوو، کەدایکم هات بمبات بە بووکی، من لەوکاتەدا لەگەڵ چەند دەستە خوشکێکما بووم جۆلانێمان دەکرد، جاکە هات قاوی کردم و منیش چووم بۆلای دایکم، نەشم دەزانی دایکم چی لێم دەوێ.**

**جا پەلی گرتم و بردمی هەتا گەیشتینە بەردەگای ماڵ، لەوێ ڕاوەستاین، هەتا پشووێی بدەم، چونکە هەناسە بڕکێم بوو، جا کەنەختێ هەناسەم نیشتەوە، ئەو جانەختێ ئاوی هەلگرت و سوویی لەدەموچاو وسەرم، ئەنجا بردمیە ژوورەوە بۆ ناو ماڵ کە سەرنجم دا واکۆمەڵێك ژن لەیاریدەدەران وان لە ماڵەکەدا، چاوەڕوانی من دەکەن کە بمکەن بەبووك، گوتیان: (عَلَى الخير و البركة وعلى خير طائرٍ)، واتە: لەسەر خێرو خۆشی، خوا پیرۆزی کا، بەبەختی باش).**

---

(٢٨٢) اخرجه مسلم في النكاح ، باب: تزويج الاب البكر الصغيرة، رقم: ١٤٢٢ .

ئیتر ئوم ڕۆمانی دایکم منی دایه دەست ژنە ئەنصارییەکان، ئەوانیش نەختی ڕێکیان خستم، ئیتر ئاگام لێ نەبوو، وەهەر ئەوەندەم زانی بەو چێشتەنگاوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دایچەڵەکانم و هاتە ژوورەوە بۆلام، ئیتر ژنەکانیش منیان دایە دەستی و بەجێیان هێشتم و پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەدەستی گرتم. وە ئەو کاتە تەمەنم نۆ ساڵ بوو) (تاج/٣ ل/٨٨ ز/٣٨ ف/٣ - باسی: نزاکردن بۆ بووك وزاوا) .

١٥١٦– عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) انَّ النَّبِيَ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ لَهَا: (ارِيتُكِ فِي الْمَنَامِ مَرَّتَيْنِ ارَى انَّكِ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ وَيَقُولُ: هَذِهِ امْرَاتُكَ فَاكْشِفْ عَنْهَا فَاذا هِيَ انْتِ فَاقُولُ: انْ يَكُ هَذا مِنْ عِنْدِ اللّهِ يُمْضِهِ (الحديث: ٣٨٩٥ ، اطرافه في: ٥٠٧٨، ٥١٢٥، ٧٠١١، ٧٠١٢)[٢٨٣] .

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پێی فەرمووم: (سێ شەو، یافەرمووی دووشەو لە خەوما، لەخەوا تۆم پێ نیشان درا، جوبرائیل (سەلامی خوای لێ بێ) وێنەی تۆی لەناو دەسما لێکی ئاورێشما بۆم دەهێنا و دەیفەرموو: ئەمە ژنی تۆیە، منیش ڕووی ئەو وێنەیەم هەڵ دەدایەوەو تەماشایم دەکرد، ئەوا ئێستا دەرکەوت کە خاوەنی ئەو وێنەیە تۆ بووی! ئەو کاتە دەمگوت: ئەگەر ئەمە لەخواوە بێ دەیکاو دەیهێنێتە دی! ئەوەتا ئێستا هێناویەتە دی) . (تاج/٥ ل/١٠٥ ف/١ - باسی گەورەیی عائیشە).

---

(٢٨٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: في فضل عائشة (رَضيَ اللهُ عنها) ، رقم: ٢٤٣٨ .

## باسی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺو هاوڕێکانی بۆ مەدینە
## هجرة النبي ﷺ واصحابه الى المدينة

١٥١٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: لَمْ اعْقِلْ ابَوَيَ قَط الا وَهُمَا يَدِينَانِ الدِّينَ وَلَمْ يَمُرَّ عَلَيْنَا يَوْمٌ الا يَاتِينَا فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَرَفَيْ النَّهَارِ بُكْرَةً وَعَشِيَّةً فَلَمَّا ابْتُلِيَ الْمُسْلِمُونَ خَرَجَ ابُو بَكْرٍ مُهَاجِرًا نَحْوَ ارْضِ الْحَبَشَةِ حَتَّى اذا بَلَغَ بَرْكَ الْغِمَادِ لَقِيَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ وَهُوَ سَيِّدُ الْقَارَةِ فَقَالَ: اينَ تُرِيدُ يَا ابا بَكْرٍ؟ فَقَالَ ابُو بَكْرٍ: اخْرَجَنِي قَوْمِي فَارِيدُ انْ اسِيحَ فِي الارْضِ وَاعْبُدَ رَبِّي. قَالَ ابْنُ الدَّغِنَةِ: فَانَّ مِثْلَكَ يَا ابا بَكْرٍ لا يَخْرُجُ وَلا يُخْرَجُ انَّكَ تَكْسِبُ الْمَعْدُومَ وَتَصِلُ الرَّحِمَ وَتَحْمِلُ الْكَلَّ وَتَقْرِي الضَّيْفَ وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ فَانَا لَكَ جَارٌ ارْجِعْ وَاعْبُدْ رَبَّكَ بِبَلَدِكَ فَرَجَعَ وَارْتَحَلَ مَعَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ فَطَافَ ابْنُ الدَّغِنَةِ عَشِيَّةً فِي اشْرَافِ قُرَيْشٍ فَقَالَ لَهُمْ: انَّ ابا بَكْرٍ لا يَخْرُجُ مِثْلُهُ وَلا يُخْرَجُ اتُخْرِجُونَ رَجُلا يَكْسِبُ الْمَعْدُومَ وَيَصِلُ الرَّحِمَ وَيَحْمِلُ الْكَلَّ وَيَقْرِي الضَّيْفَ وَيُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ فَلَمْ تُكَذبْ قُرَيْشٌ بِجِوَارِ ابْنِ الدَّغِنَةِ وَقَالُوا: لابْنِ الدَّغِنَةِ مُرْ ابا بَكْرٍ فَلْيَعْبُدْ رَبَّهُ فِي دَارِهِ فَلْيُصَلِّ فِيهَا وَلْيَقْرَا مَا شَاء وَلا يُؤْذِينَا بِذلِكَ وَلا يَسْتَعْلِنْ بِهِ فَانَّا نَخْشَى انْ يَفْتِنَ نِسَاءنَا وَابْنَاءنَا فَقَالَ ذلِكَ ابْنُ الدَّغِنَةِ لابِي بَكْرٍ فَلَبِثَ ابُو بَكْرٍ بِذلِكَ يَعْبُدُ رَبَّهُ فِي دَارِهِ وَلا يَسْتَعْلِنُ بِصَلاتِهِ وَلا يَقْرَا فِي غَيْرِ دَارِهِ.

ثمَّ بَدَا لابِي بَكْرٍ فَابْتَنَى مَسْجِدًا بِفِنَاء دَارِهِ وَكَانَ يُصَلِّي فِيهِ وَيَقْرَا الْقُرْانَ فَيَنْقَذِفُ عَلَيْهِ نِسَاء الْمُشْرِكِينَ وَابْنَاؤُهُمْ وَهُمْ يَعْجَبُونَ مِنْهُ وَيَنْظُرُونَ الَيْهِ وَكَانَ ابُو بَكْرٍ رَجُلا بَكَّاء لا يَمْلِكُ عَيْنَيْهِ اذا قَرَا الْقُرْانَ وَافْزَعَ ذلِكَ اشْرَافَ قُرَيْشٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَارْسَلُوا الَى ابْنِ الدَّغِنَةِ فَقَدِمَ عَلَيْهِمْ فَقَالُوا: انَّا كُنَّا اجَرْنَا ابا بَكْرٍ بِجِوَارِكَ عَلَى انْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ فَقَدْ جَاوَزَ ذلِكَ فَابْتَنَى مَسْجِدًا بِفِنَاء دَارِهِ فَاعْلَنَ بالصَّلاةِ وَالْقِرَاءةِ فِيهِ وَانَّا قَدْ خَشِينَا انْ يَفْتِنَ نِسَاءنَا وَابْنَاءنَا فَانْهَهُ فَانْ احَبَّ انْ

يَقْتَصِرَ عَلَى انْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ فَعَلَ وَانْ ابَى الا انْ يُعْلِنَ بِذلِكَ فَسَلْهُ انْ يَرُدَّ الَيْكَ ذِمَّتَكَ فَانَّا قَدْ كَرِهْنَا انْ نُخْفِرَكَ وَلَسْنَا مُقِرِّينَ لابِي بَكْرٍ الاسْتِعْلانَ .

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَاتَى ابْنُ الدَّغِنَةِ الَى ابِي بَكْرٍ فَقَالَ قَدْ عَلِمْتَ الَّذي عَاقَدْتُ لَكَ عَلَيْهِ فَامَّا انْ تَقْتَصِرَ عَلَى ذلِكَ وَامَّا انْ تَرْجِعَ الَيَّ ذِمَّتِي فَانِّي لا احِبُّ انْ تَسْمَعَ الْعَرَبُ انِّي اخْفِرْتُ فِي رَجُلٍ عَقَدْتُ لَهُ فَقَالَ ابُو بَكْرٍ: فَانِّي ارُدُّ الَيْكَ جِوَارَكَ وَارْضى بِجِوَارِ اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَئِذ بِمَكَّةَ فَقَالَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِلْمُسْلِمِينَ: انِّي اريتُ دَارَ هِجْرَتِكُمْ ذاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لابَتَيْنِ وَهُمَا الْحَرَّتَانِ فَهَاجَرَ مَنْ هَاجَرَ قِبَلَ الْمَدِينَةِ وَرَجَعَ عَامَّةُ مَنْ كَانَ هَاجَرَ بارْض الْحَبَشَةِ الَى الْمَدِينَةِ وَتَجهَّزَ ابو بَكْرٍ قِبَلَ الْمَدِينَةِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رِسْلِكَ فَانِّي ارْجُو انْ يُؤْذَنَ لِي فَقَالَ ابُو بَكْرٍ وَهَلْ تَرْجُو ذلِكَ بابِي انْتَ قَالَ: نَعَمْ فَحَبَسَ ابُو بَكْرٍ نَفْسَهُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيَصْحَبَهُ وَعَلَفَ رَاحِلَتَيْنِ كَانَتَا عِنْدَهُ وَرَقَ السَّمُرِ وَهُوَ الْخبَط ارْبَعَةَ اشْهُرٍ .

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَبَيْنَمَا نَحْنُ يَوْمًا جُلُوسٌ فِي بَيْتِ ابِي بَكْرٍ فِي نَحْرِ الظهِيرَةِ قَالَ قَائِلٌ لابِي بَكْرٍ: هَذا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُتَقَنِّعًا فِي سَاعَةٍ لَمْ يَكُنْ يَاتِينَا فِيهَا فَقَالَ ابو بَكْرٍ فِدَاء لَهُ ابِي وَامِّي وَاللّٰهِ مَا جَاء بِهِ فِي هَذهِ السَّاعَةِ الا امْرٌ قَالَتْ: فَجَاء رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسْتَاذنَ فَاذنَ لَهُ فَدَخَلَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لابِي بَكْرٍ: اخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ فَقَالَ ابو بَكْرٍ انَّمَا هُمْ اهْلُكَ بابِي انْتَ يَارَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: فَانِّي قَدْ اذنَ لِي فِي الْخُرُوجِ فَقَالَ ابُو بَكْرٍ: الصَّحَابَةُ بابِي انْتَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): نَعَمْ ،قَالَ ابُو بَكْرٍ فَخُذ بابِي انْتَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ احْدَى رَاحِلَتَيَّ هَاتَيْنِ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): بالثمَنِ .

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَجَهَّزْنَاهُمَا احَبّ الْجِهَازِ وَصَنَعْنَا لَهُمَا سُفْرَةً فِي جِرَابٍ فَقَطعَتْ اسْمَاء بِنْتُ ابِي بَكْرٍ قِطعَةً مِنْ نِطاقِهَا فَرَبَطتْ بِهِ عَلَى فَمِ الْجِرَابِ فَبِذلِكَ سُمِّيَتْ ذاتَ النِّطاقَيْنِ قَالَتْ ثمَّ لَحِقَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابُو بَكْرٍ

بِغَارٍ فِي جَبَلِ ثَوْرٍ فَكَمَنَا فِيهِ ثلاث لَيَالٍ يَبِيتُ عِنْدَهُمَا عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ ابِي بَكْرٍ وَهُوَ غُلامٌ شَابٌّ ثَقِفٌ لَقِنٌ فَيُدْلِجُ مِنْ عِنْدِهِمَا بِسَحَرٍ فَيُصْبِحُ مَعَ قُرَيْشٍ بِمَكَّةَ كَبائِتٍ فَلا يَسْمَعُ امْرًا يُكْتَادَانِ بِهِ الا وَعَاهُ حَتَّى يَاتِيَهُمَا بِخَبَرِ ذلِكَ حِينَ يَخْتَلِط الظَّلامُ وَيَرْعَى عَلَيْهِمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ مَوْلَى ابِي بَكْرٍ مِنْحَةً مِنْ غَنَمٍ فَيُرِيحُهَا عَلَيْهِمَا حِينَ تَذْهَبُ سَاعَةٌ مِنْ الْعِشَاء فَيَبِيتَانِ فِي رِسْلٍ وَهُوَ لَبَنُ مِنْحَتِهِمَا وَرَضِيفِهِمَا حَتَّى يَنْعِقَ بِهَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ بِغَلَسٍ يَفْعَلُ ذلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ تِلْكَ اللَّيَالِي الثلاث وَاسْتَاجَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابُو بَكْرٍ رَجُلا مِنْ بَنِي الدِّيلِ وَهُوَ مِنْ بَنِي عَبْدِ بْنِ عَدِيٍّ هَادِيًا خِرِّيتًا وَالْخِرِّيتُ الْمَاهِرُ بِالْهِدَايَةِ قَدْ غَمَسَ حِلْفًا فِي الِ الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ وَهُوَ عَلَى دِينِ كُفَّارِ قُرَيْشٍ فَامِنَاهُ فَدَفَعَا الَيْهِ رَاحِلَتَيْهِمَا وَوَاعَدَاهُ غَارَ ثَوْرٍ بَعْدَ ثلاث لَيَالٍ فاتاهما بِرَاحِلَتَيْهِمَا صُبْحَ ثلاث وَانْطَلَقَ مَعَهُمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ وَالدَّلِيلُ فَاخَذَ بِهِمْ طَرِيقَ السَّوَاحِلِ. (الحديث: ٣٩٠٥، اطرافه في: ٢١٣٨، ٢٢٦٣، ٢٢٦٤، ٢٢٩٧، ٤٠٩٣، ٥٨٠٧، ٦٠٧٩).

قَالَ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ المدْلجِيِّ (رضيَ اللّٰهُ عنهُ): جَاءَنَا رُسُلُ كُفَّارِ قُرَيْشٍ يَجْعَلُونَ فِي رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابِي بَكْرٍ دِيَةَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَنْ قَتَلَهُ اوْ اسَرَهُ فَبَيْنَمَا انَا جَالِسٌ فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ قَوْمِي بَنِي مُدْلِجٍ اقْبَلَ رَجُلٌ مِنْهُمْ حَتَّى قَامَ عَلَيْنَا وَنَحْنُ جُلُوسٌ فَقَالَ: يَا سُرَاقَةُ انِّي قَدْ رَايْتُ انِفًا اسْوِدَةً بالسَّاحِلِ ارَاهَا مُحَمَّدًا وَاصْحَابَهُ قَالَ سُرَاقَةُ: فَعَرَفْتُ انَّهُمْ هُمْ فَقُلْتُ لَهُ: انَّهُمْ لَيْسُوا بِهِمْ وَلَكِنَّكَ رَايْتَ فُلانًا وَفُلانًا انْطَلَقُوا باعْيُنِنَا.

ثُمَّ لَبِثْتُ فِي الْمَجْلِسِ سَاعَةً ثُمَّ قُمْتُ فَدَخَلْتُ فَامَرْتُ جَارِيَتِي انْ تَخْرُجَ بِفَرَسِي وَهِيَ مِنْ وَرَاء اكَمَةٍ فَتَحْبِسَهَا عَلَيَّ وَاخَذتُ رُمْحِي فَخَرَجْتُ بِهِ مِنْ ظَهْرِ الْبَيْتِ فَحَطَطتُ بِزُجِّهِ الارض وَخَفَضتُ عَالِيَهُ حَتَّى اتَيْتُ فَرَسِي فَرَكِبْتُهَا فَرَفَعْتُهَا تُقَرِّبُ بِي حَتَّى دَنَوْتُ مِنْهُمْ فَعَثَرَتْ بِي فَرَسِي فَخَرَرْتُ عَنْهَا فَقُمْتُ فَاهْوَيْتُ يَدِي الَى كِنَانَتِي فَاسْتَخْرَجْتُ مِنْهَا الازْلامَ فَاسْتَقْسَمْتُ بِهَا اضُرُّهُمْ امْ لا فَخَرَجَ الَّذِي اكْرَهُ فَرَكِبْتُ فَرَسِي وَعَصَيْتُ الازْلامَ تُقَرِّبُ بِي حَتَّى اذا سَمِعْتُ قِرَاءةَ رَسُولِ اللّٰهِ

(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَهُوَ لا يَلْتَفِتُ وَابُو بَكْرٍ يُكْثِرُ الالْتِفاتَ ساخَتْ يَدا فَرَسِي فِي الارْض حَتَّى بَلَغَتا الرُّكْبَتَيْنِ فَخَرَرْتُ عَنْهَا ثُمَّ زَجَرْتُها فَنَهَضتْ فَلَمْ تَكَدْ تُخْرِجُ يَدَيْهَا فَلَمَّا اسْتَوَتْ قَائِمَةً اذا لاثر يَدَيْهَا عُثانٌ ساطِعٌ فِي السَّمَاء مِثْلُ الدُّخَانِ فَاسْتَقْسَمْتُ بالازْلام فَخَرَجَ الَّذي اكْرَهُ فَنادَيْتُهُمْ بالامَانِ فَوَقَفُوا فَرَكِبْتُ فَرَسِي حَتَّى جِئْتُهُمْ وَوَقَعَ فِي نَفْسِي حِينَ لَقِيتُ مَا لَقِيتُ مِنَ الْحَبْسِ عَنْهُمْ انْ سَيَظْهَرُ امْرُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقُلْتُ لَهُ انَّ قَوْمَكَ قَدْ جَعَلُوا فِيكَ الدِّيَةَ وَاخْبَرْتُهُمْ اخْبارَ مَا يُرِيدُ النَّاسُ بِهِمْ وَعَرَضتُ عَلَيْهِمْ الزَّادَ وَالْمَتاعَ فَلَمْ يَرْزَانِي وَلَمْ يَسْالانِي الا انْ قَالَ اخْفِ عَنَّا فَسَالْتُهُ انْ يَكْتُبَ لِي كِتابَ امْنٍ فَامَرَ عَامِرَ بْنَ فُهَيْرَةَ فَكَتَبَ فِي رُقْعَةٍ مِنْ اديمٍ ثُمَّ مَضى رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) .

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ فَاخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ انَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لَقِيَ الزُّبَيْرَ فِي رَكْبٍ مِنْ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا تِجَارًا قَافِلِينَ مِنْ الشَّامِ فَكَسَا الزُّبَيْرُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَابا بَكْرٍ ثِيابَ بَيَاض وَسَمِعَ الْمُسْلِمُونَ بالْمَدِينَةِ مَخْرجَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مِنْ مَكّةَ فَكَانُوا يَغْدُونَ كُلَّ غَدَاةٍ الَى الْحَرَّةِ فَيَنْتَظِرُونَهُ حَتَّى يَرُدَّهُمْ حَرُّ الظهيرَةِ فَانْقَلَبُوا يَوْمًا بَعْدَ مَا اطالُوا انْتِظارَهُمْ فَلَمَّا اوَوْا الَى بُيُوتِهِمْ اوْفَى رَجُلٌ مِنْ يَهُودَ عَلَى اطمٍ مِنْ اطامِهِمْ لامر يَنْظرُ الَيْهِ فَبَصُرَ بِرَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَاصْحابِهِ مُبَيَّضِينَ يَزُولُ بِهِمْ السَّرَابُ فَلَمْ يَمْلِكْ الْيَهُودِيُّ انْ قَالَ باعْلَى صَوْتِهِ يَا مَعَاشِرَ الْعَرَبِ هَذا جَدُّكُمْ الَّذي تَنْتَظِرُونَ فَثارَ الْمُسْلِمُونَ الَى السِّلاحِ فَتَلَقَّوْا رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بِظَهْرِ الْحَرَّةِ فَعَدَلَ بِهِمْ ذاتَ الْيَمِينِ حَتَّى نَزَلَ بِهِمْ فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ وَذَلِكَ يَوْمَ الاثْنَيْنِ مِنْ شَهْرِ رَبِيعِ الاوَّلِ فَقَامَ ابُو بَكْرٍ لِلنَّاسِ وَجَلَسَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) صَامِتًا فَطفِقَ مَنْ جَاء مِنَ الانْصار مِمَّنْ لَمْ يَرَ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يُحَيِّي ابا بَكْرٍ حَتَّى اصابَتْ الشَّمْسُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَاقْبَلَ ابُو بَكْرٍ حَتَّى ظَلَّلَ عَلَيْهِ بِرِدَائِهِ فَعَرَفَ النَّاسُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عِنْدَ ذلِكَ فَلَبِثَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فِي بَنِي عَمْرِو

بْنِ عَوْفٍ بِضعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً وَاسِّسَ الْمَسْجِدُ الَّذِي اسِّسَ عَلَى التَّقْوَى وَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ فَسَارَ يَمْشِي مَعَهُ النَّاسُ حَتَّى بَرَكَتْ عِنْدَ مَسْجِدِ الرَّسُولِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْمَدِينَةِ وَهُوَ يُصَلِّي فِيهِ يَوْمَئِذ رِجَالٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ وَكَانَ مِرْبَدًا لِلتَّمْرِ لِسُهَيْلٍ وَسَهْلٍ غُلامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِ اسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ هَذَا انْ شَاءَ اللَّهُ الْمَنْزِلُ ثُمَّ دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْغُلامَيْنِ فَسَاوَمَهُمَا بِالْمِرْبَدِ لِيَتَّخِذَهُ مَسْجِدًا فَقَالا لا بَلْ نَهَبُهُ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَابَى رَسُولُ اللَّهِ انْ يَقْبَلَهُ مِنْهُمَا هِبَةً حَتَّى ابْتَاعَهُ مِنْهُمَا ثُمَّ بَنَاهُ مَسْجِدًا وَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْقُلُ مَعَهُمْ اللَّبِنَ فِي بُنْيَانِهِ وَيَقُولُ وَهُوَ يَنْقُلُ اللَّبِنَ:

هَذَا الْحِمَالُ لا حِمَالَ خَيْبَرْ     هَذَا ابَرُّ رَبَّنَا وَاطْهَرْ

وَيَقُولُ:

اللَّهُمَّ انَّ الاجْرَ اجْرُ الاخِرَهْ     فَارْحَمْ الانْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ

(الحديث: ٣٩٠٦)[٢٨٤].

عائیشه (رهزای خودای لێ بێ) فهرمووی: بهبیرهوهریی من باوك ودایكم بهم ئایینی پیرۆزی ئیسلامه ڕهفتاریان كردووه و ئهوهتی من له بیرم بێئهوان ههر موسوڵمان بوون، ههموو ڕۆژێكیش پێغهمبهر (درودی خودای لێ بێ) سهرلهبهیانیان و سهر لهئێواران تهشریفی دههات بۆماڵمان.كاتا كه موسوڵمانان دووچاری چهوسانهوهی دهستی بابڕواكانی هۆزی قوڕهیش بوون و لهتاو زوڵم و زۆری ئهوان،ههریهكهیان بهلایهكا پهردهوازه بوون، ئهبوبهكریش بهرهو خاكیحهبهشه سهری نایهوه و كۆچی كرد، دهڕوات ههتا دهگاته بهركولغیمار، لهوێ تووشی ئیبنودوغهننه دهبێ كهسهر گهورهی هۆزی ئهلقاڕه بوو. پێی دهڵێ: ئهی ئهبوبهكر! ئهوه خێره بۆكوێ دهچێت؟

(٢٨٤) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/١ص ٥٩٤)- خاتمة - المترجم .

دەڵێ:خزمەکانم دەریان پەڕاندووم ودەمەوێ بەولاتانا بگەڕێم و بەبێ پەروا، بۆخۆم خودایخۆم بپەرستم و بەندەیی بۆبکەم ئیبنودوغوننەش دەڵێ: ئەی ئەبوبەکر! تۆو دەرکردن؟ شتیوا چۆن دەبێ، شتیوا نەبووەو نەئەبێ، پیاوەتی و مەردایەتی تۆ بێوینەیە، تۆ پیاوێکی خزم دۆستیت و، دالدەی پیاوی هەژار وبێنەوایت و، خاوەن نان و دیوەخانیت و، لەکاتی لێقەومانا تۆ پشتو پەنایت، جا ئەوا من بۆت دەبم بە دالدە، کەواتە بگەڕێرەوە لە ولاتیخۆت خودای خۆت بپەرستە.

جا ئەویش دەگەڕێتەوە، ئیبتو دوغوننەش لەگەڵیادێ، وە ئێوارەێی ئیبنو دوغوننە سووڕایەوە بەناو پیاوماقوولان وخانەدانەکانی هۆزی قورەیش دا، پێی گوتن: ئەبو بەکر پیاوێکی پیاوانەیە،پیاوی ئەوە نییە کە لەخۆیەوە بڕوا، یا ئێوە بە زۆر دەری بکەن، پیاویوا باش وجوانمەرد چۆن دەردەکرێ، پیاوێکی نانبدەو بەخشندەو کەم وێنەیە، خزم دۆست و خزم پەرستە، پشت و پەنای زەبوونان و پیاوی ناشیو کۆڵیە، خاوەن قۆناخ ودیوەخانەو، لەکاتی سەختی و لێ قەو مانا، فریاڕەسی پەنا بەرانە!

ئیتر قورەیش قسەی ئیبنودوغوننەیان نەشکان ودالدەدانو پشتگرتنەکەی ئەو یان قەبووڵ کردو، پێیان گوت: بەئەبوبەکر بڵێ: کە لەماڵەکەی خۆیدا، خودای خۆی بپەرستێ و نوێژی تیا بکاو، چەندە ئارەزوو دەکا قورئانی تیا بخوێنێ، بەڵام ئەوەندە هەیە ئازاری ئێمەی پێ نەداو بە ئاشکرا نەیکا(٢٨٥).

چونکە مەترسی ئەوەمان هەیە کەژن و منالّ و خێزانمان لە خشتە بەرێو لەرێ دەرکا! جائیبنو دوغەننەش ئەمەی بە ئەبو بەکر گوت، ئەبو بەکریش بەم پێیەو لەسەر ئەم حاڵە ماوەیی مایەوەو لەماڵەوە خۆدای خۆی

---

(٢٨٥) ڕەحمەت لەوکەسەی کە دەڵێ:

سەری دەنێشی بە بۆی ڕێحانە        قالونچەی ئەشقی بۆی ئاودەسخانە

دەپەرستو نوێژی دەکرد بەڵام بەپێی مەرجەکە، ئاشکرای نەدەکرد، وەهەر لەماڵەوەیش قورئانی دەخوێند، پاشان ئەبوبەکر بڕیاری داو، لەبەردەم خانوەکەیدا ، مزگەوتێکی دروست کردو نوێژی تیادا دەکردو، قورئانی تیادا دەخوێند.

جا ژنان و کوڕان و منالانی بتپەرستەکانی لێ خڕ دەبوونەوەو، تەماشای ئەبو بەکریان دەکردو، پێیان سەیربوو، ئەبوبەکر پیاوێکی گرینووکی دڵنەرمی خوشگریان بوو، کە قورئانی دەخوێند گریانی بۆ ڕاگیرنەدەکرا، جا خانەدانەکانی قوڕەیش لەبتپەرستەکان لەم حاڵە تۆقین ون ناردیان بە شوێنی ئیبنودو غوننەدا، کاتێ هات بۆ لایان پێیان گوت: ئێمە لەبەر خاتری تۆو بەداڵدەی تۆ، پەنای ئەبو بەکرمان دا، بەو مەرجە کە لە ماڵی خۆی دا بە باقرە خودای خۆی بپەرستا، کەچی ئەو لەم ڕادەیە ڕەتی کردووەو، ئەوەتانێ لە بەردەم ماڵەکەیدا مزکەوتی دروست کردووەو بە ئاشکرا نوێژی تیادا دەکاو قورئانی تیادا دەخوێنێ، ئێمەش لەوە دەترسین کە ژنان و خاوو خێزانمان لەڕێ دەرکا.

جا پێی بڵێ باوانەکا، ئەگەر حەز دەکا باهەر لەماڵی خۆی دا خودای خۆی بپەرستێ ئەوا بابیکاو، کەسا هەقی نییە بەسەریەوە، دەنا داوای لێبکە کە لە پەنای تۆ دەرچێ، چونکە ئێمە حەزناکەین کە پەیمانی تۆ بشکێنین، وە قاییلیش نابین کە ئەبو بەکر ئاوا ئاشکرای بکا، ئیبنو دوغننە هات بۆلای ئەبو بەکر، گوتی: خۆت دەزانیت کە من لەسەر چی پەیمانم لەگەڵ تۆدا بەستووە، جادەبێ هەر ئەوە بکەیت یادەبێ پەیمانەکەمان پووچ بکەینەوەو من لە زامنیت دەردەچم، چونك حەزناکەم کە عەرەبان ببیستنەوەکە من پەیمانم داوە بە پیاوێك و لە پاشابێ پەیمان دەرچووم ئەبو بەکریش گوتی: ئەوا منیش لە پەناو داڵدەی تۆ دەرچووم و ڕازیم بە پەنای خودای گەورەو سەروەر ئەو حەلەش پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هێشتا لەمەککە بوو، فەرمووی بە موسوڵمانان: (هەواری کۆچتانم، لەخەودا، پێ

نیشان درا، شوێنێ بوو باخە خورمای زۆر بوو، لە نێوانی دوو شوێنێ بەردەلانی ڕەش دا بوو، واتە: دوو جێگەی بەردەلان، کەبەردی ڕەشیان زۆربێ، ئیتر موسوڵمانان ڕووەو مەدینە کۆچیان کردو، زوربەی ئەوانەی کە کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە گەڕانەوەو چوون بۆ مەدینە، ئەبوبەکریش بەرەو مەدینە تەدارەکی کردو تفاقی خست، بەڵام خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) پێی فەرمووی: (هێواشکە و پەلەمەکە، چونکە من خۆشم بە هیوام کە خودا ڕێگەم پێ بدات و کۆچ بکەم، ئەبوبەکریش گوتی باوکم و دایکم لەدەورت گەڕێن، بۆچی تۆیش هیوای کۆچ کردنت هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ).

ئیتر ئەبو بەکر خۆی گل دایەوە بەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لێ بێ) هەتا لەم سەفەری کۆچەدا ببێ بەهاوڕێی، وە دوو وشتری خۆی هەبوو، بەمەبەستی ئاگادارکردنیان بۆ ئەم سەفەرە چوار مانگ ئالیکی گەڵای دار (سەمورە- السمر)ی دانێ، کە بە قەڵەنگ دەیوەرێنن و دەیکەن بەگەڵ. (تاج/٤ ل/٣٠٩ ف/١) .

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوا ڕۆژا لەماڵی ئەبوبەکر دانیشتبووین، قرچەی نیوەڕۆ بوو، لەوکاتەدا یەکێ بە ئەبو بەکری گوت: ئەوە پێغەمبەرە (دروودی خودای لێ بێ) دەم و لووتی خۆی هەڵبەستووە، تا نەناسرێتەوە ، جارانیتر لە کاتێوادا نەدەهات بۆ ماڵمان بۆیە ئەبو بەکر فەرمووی: باوك و دایکم بە قوربانی بێ، بەخودا دیارە کارێکی گرنگی هەیە بۆیە لەم کاتەدا هاتووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) گەیشتەجێ و داوای ڕێگەپادانی: کرد کە بێتە ژوورەوەو ڕێگەی پێ دراو هاتە ژوورەوەو بە ئەبوبەکری فەرموو: (کێت لەلایە بابچنە دەرەوە) ئەبو بەکریش فەرمووی:(ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ غەریبەمان تیادا نییە، هەرکە سوکارەکەی خۆمن، کە کەسوکاری خۆتن فەرمووی: (دەی من خودا ڕێگەی پێ داوم کە دەربچم و کۆچ و باربکەم) ئەبوبەکر فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بە قوربانت بێ بمکە بەهاوڕێی خۆت لەم

سەفەرە پیرۆزەدا، فەرمووی: (بەڵێ باشە، ئەبو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! یەکێ لەم دوو وشترەی من هەڵبگرە بۆ سواریی ڕێگەت. پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (باشە بەڵام بە کرێ) .

عائیشە - رەزای خودای لێبێ – فەرمووی: جا تفاقێکی زۆر جوانمان بۆ ئامادەکردن و تۆێشوومان لەتۆیشە بەرمیەکا بۆیان کرد، کە بریتی بوو لە مەڕێکی قاوورمە، وە ئەسمای خوشکم پارچەیەکی لە پشتێنەکەی خۆی دادڕی و دەمیتوێشەبەرکەی پێ بەست، جالەمەوە ناونرا: (ذاتونطاقەین واتە: خاوەنی دوو پشتێن) فەرمووی: ئەو جا پێغەمبەرو ئەبو بەکر چوونە ناو ئەشکەوتێ لەکێوی سەور، وەسێ شەو لەوێ خۆیان حەشار دەدەن، عەبدوڵلا کوڕی ئەبوبەکر کە جەهێڵێکی وشیاری وریابوو شەوی لە لایان دەکردەوە، بەڵام شەوەکی شەوی دەگرت بەدەمەوە و لە لای ئەوانەوە دەگەڕایەوە بۆ مەککە، بەیانی لە قوڕەیش و خەڵکی مەککە وابوو، کە عەبدوڵلا شەوی لە مەککە کردۆتەوە، جا عەبدوڵلا هەرچی بەرگوێ دەکەوت لەو پیلان و فڕو فێڵانەی کە بێ بڕواکانی مەککە دەیانکرد، لە پێغەمبەرو ئەبو بەکر، وەری دەگرت و کەتاریك دادەهات هەواڵی ئەوانەی بۆیان دەبردەوە.

وە عامیری کوڕی فوهەیرەیش،کە نۆکەری ئەبو بەکربوو، لە دەورو بەری ئەوان ڕوانکەی ئەبوبەکری دەلەوەڕاندو بە تاوێ لە پاش شێوان، مێگەلەکەی لەدەرگای ئەشکەوتەکەدا مۆڵ دەدا، ئیتر شیری مەڕیان دەدۆشی و لەگڵێنەیەکا بەبەردی داخی بەرخۆر شلەتێنیان دەکرد، واتە: بەردە داخەکەیان دەخستە ناو جامە شیرەکەوە، تا تۆزێ گەرمی بکا، هەتا خاویی و لیقنی یەکەی نەمێنێ، وەهەموو شەوێ تیرو پڕیان لەو شیرە جوانە دەخواردەوە!

وەسەر لە بەیان واتە: دەمەو بەیان بەتاریك ولێڵەکە، عامیر ڕانەکەی ڕادەداو پیرکەی لێ دەکرد، هەرسێ شەوەکە عامیر ئەمە کاری بوو، پێغەمبەرو ئەبو بەکر، کابرایەکی بەنی دیلیان بەکرێ گرتبوو، ڕێزانێکی بەدرەق و شارەزا بوو، سوێند خوارو هاوپەیمانی بنەماڵەی عاصی کوڕی وائیلی ئەل سەهمی بوو، وەلە ئەمانی ئەوان دابوو، وەلێ لەسەر ئایینی بێبڕواکانی قوڕەیش بوو، بەلام پێغەمبەرو ئەبوبەکر بتمانەی پێ دەکەن و هەردوو وشترەکەی دەدەنێو بەڵێن دەدەن بەیەکتر کە لەپاش ساشەو لەئەشکەوتەکەی چیای سەور یەك بگرنەوە، جا لەکاتی ناوبراودا لەبەیانی شەوی سێیەم دا، هەردووو وشترەکەیان بۆ دەبات، عامیری کوڕی فوهەیرەیش لەگەڵیان دەچێ، وە ڕێزانە شارەزاکەش لە ڕێگەی پێ دەشتە وە دەیان بات، ئەوەك لە شارێوە لەبەر شوێنە گومکێ (تاج/٤ ل/٣١٣ ز/١٠١- باسی کۆچ کردن، فەرموودەی ژمارە/٣ ) .

سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوص مودلیجی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕابەرو فروستادەکانی بێبڕواکانی قوڕەیش هاتن بۆ ناومان، جاڕیان دەداو گوتیان: هەرکەسێ پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) یا ئەبو بەکر بکوژێ، یادیلیان بکا، خەلاتی دەکەین و لە باتی هەریەکێکیان خوێنبایی خۆیی خەلات دەدەینێ، کە دەکاتە سەد وشتر، منیش لەناو کۆڕی دانیشتنی هۆزی بەنی مودلیج دا دانیشتبووم کە خزمانی خۆم بوون لەپڕ پیاوێ دەرکەوت، هات بەدیارمانەوە وەستا، ئێمەیش هەر بە دانیشتنەوە گوێ قولاخ بووین، کە بزانین چی هەواڵێکی واپێ، پیاوەکە گوتی: ئەی سوراقە! ئێستا لە پادەشتەکە ڕەشاییی چەند زەلامێکم بەدی کرد، وابزانم کە موحەممەدو هاوڕێکانی بوون، سوراقە گوتی: خۆم زانیم کە ئەوانە خۆیان بوون، بەلام خۆم لێ هەڵە کردو ویستم ئەوانیش چەواشە بکەم ، بۆیە گوتم: ئەوانە ئەوان نەبوون، بەلام ئەوانەی کە تۆدیوتن و بەوانت زانیون ئەوانە، فیسارەکەس و فیسارە کەس بوون، کەتۆزێ لەمەوبەر بەبەرچاوی خۆمانەوە دەرچوون، ئەنجا تاوێ

لـه كۆڕەكـەدا مامـەوە، هـەتا نەيانخەمەسـەر شـەك و تـەواو لـە هەواڵەكـە چەواشـەيان بكـەم، ئينجـا هەڵـسام و چـوومەوە بەكەنيزەكـە كـەمم گـوت: ماينەكـەمم بـۆ ببـە لەپـشت ئـەو ياڵـەوە ڕاى بگـرە بـۆم، ئـەنجا ڕمەكـەمم هـەلگرت و لەپـشت ماڵـەوە بـەكوورە كـووڕە، بەدزكـەوە دەرچـووم، نـووكى ڕمەكەم دەخشاند لە زەوى و سەرەكەيم شۆڕ كردەوە، هەتا كەس هەستى پـێ نەكاو پێم نـەزانن، كەوامن بـەنيازى خەلاتەكـەى قوڕەيش دەچـم بـە شـوێن پێغەمبەرو ئەبوبەكردا.

ڕۆيشتم هەتا چوومە لاى ماينەكـەم و سوارى بـووم وتـێم تەقانـد، بـە چـوار ناڵـە بردمـى هـەتاليێيان نزيـك بوومـەوە، ماينەكـەمم سـەرسمێكى داو گلانـدمى، جـا هەڵسامەوە دەسـتم بـرد لەتيردانەكـەم دانـە (ئـەزلام) كـەمم دەرهێنـاو، دانەيـەكم پـێ گرتـەوە، تـا بـزانم زيـانم دەبـێ بۆيـان يانـا، جاكـە دانەكەم گرتەوە ئەوەى هێنا كە من پـێم نـاخۆش بـوو، كـە ئـەوە بـوو: زيـانم نابێبۆيان، بەڵام بەگوێى دانەم نەكردو سوارى ماينەكەم بوومـەوەو بـە چـوار ناڵـە بردمـى هـەتا والێيـان نزيـك بوومـەوە، گوێم لـە دەنگـى پێغەمبـەر بـوو قورئانى دەخوێند.

پێغەمبـەر (دروودى خوداى لێ بێ) ئـاوورى نەدەدايـەوە، بـەڵام ئەبوبـەكر زۆر ئاوورى ئەدايەوە، جا ديسان ماينەكەم لەو زەوى‌يە ڕەقەنـەدا هـەر دوودەسـتى هـەتا ئـەژنۆكانى داچـوون و هەمديـسانەوە لێـى بەربوومـەوە، لەپاشـاتێم خـوڕى، بـەڵام زۆر بـەگران هەڵـسايەوە، زۆر بـە زەحمـەت دەسـتەكانى لـە زەويەكەدا دەرهێنا!

جاكـاتێ كەهەڵـسايەوە سـەرپێ شـوێنى هەردوودەسـتى گـەردێكى شـەوقدارى لێ هەڵـسا بـەئاسمانا، وەك دووكـەڵ، هەمديـسان بەدانەكـە دانەيەكىترم گرتەوە، دووبارە ئەوە دەرچووەوە كەبـەدڵم نـەبوو، ئيتر بانگم كـردن و ئـەمانم پێيـان دا، ئـە و جـا وەسـتان، منـيش سـوارى ماينەكـەم بوومـەوەو چـووم بۆلايـان، بـەهۆى ئەوەوەكـە بەسـەرم هـات بـەهۆى

ئەوانەوەوبەهۆی ئەوەشەوە کەدەستم نەگەیشت پێیان هات بەدڵما: کە کاری پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) سەردەگرێ و حەزرەت سەردەکەوێ، وە عەرزیم کرد: کە هۆزەکەت بڕیاریان داوە هەرکەسێ بەزیندوویی یا بەمردوویی تۆیان بدا بەدەستەوە، خوێنبایی پیاوێ خەلات و مزگێنێ پێ دەدەن! وەتێم گەیاندن کە ئەو خەڵکە چییان لێیان دەوێ، تۆیشە وشت ومتم پێشکەش کردن، بەلام نەهیچیان لێ وەرگرتم و نەهێچیان لێ داوا کردم، جگە لەوەکە فەرمووی: ئاشکرامان مەکە منیش داوام لێ کرد کە نامەی ئەمانم بۆ بنووسێ، جا فەرمانی کرد بە عامیری کوڕی فوهەیرە لەپارچەیێ چەرما نامەی ئەمانی نووسی بۆم، ئەوجا پێغەمبەرو ئەوان ڕۆیشتن و منیش گەڕامەوە بۆ شوێنی خۆم.

ئیبنو شەهاب فەرمووی: لە ڕێگە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەگات بەزوبەیری کوڕی عەوام، عورەوەی کوڕی زوبەیر بۆیگێڕامەوە، فەرمووی: پێغەمبەرو ئەبو بەکر، لەم سەفەری کۆچەدا لەرێ دەگەن بەزوبەیرو کاروانێ لە موسوڵمانان، کە بازرگان بوون و لەشام گەڕابوونەوە، زوبەیر سەرودەست بەرگی سپی لە بەر پێغەمبەرو ئەبو بەکردەکا، لەو لاشەوە موسوڵمانەکان لە مەدینە دەبیستنەوە کە وا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەمەککە دەرچووە، جا هەموو بە یانیانێ دەهاتن بە پیریەوە هەتا بەردەلانی یەکە، کەناو دارە بە(ئەلحەڕە) ئیتر لەوێ چاوەڕوانیان دەکرد، تا گەرمای نیوەڕۆ زۆری بۆ دەهێنان، ئەوجا دەگەڕانەوە، جا ڕۆژا زۆر چاوەنوارِ دەکەن، کە هیچ نابێ دەگەڕێنەوە، هەرکە دەگەنە ماڵەوە پیاوێکی جوو دەچێتە سەر قەلایەکی خۆیان بۆ تەماشاکردنی شتێ، جا بە ڕێکەوت لە دوورەوە پێغەمبەرو هاوڕێکانی بەدی دەکا: بەرگەکانیان لە دوورەوە سپی دەکاتەوە، تارماییەکەیان لە ناو ڕێکی بیابان (سەراب)دا، کەروێشکە دەکاو دەردەکەوێ!

جا کابرای جووە خۆی پێ ناگیرێ و بەهەموو دەنگیخۆی بانگەواز دەکاو دەڵێ: ئەی کۆمەڵەی عەرەب! ئەمە ئەو شانازییەتانە کە چاوەنوارِی

دەکەن! جا موسـولمانەکان پـەلاماری چـەك دەدەن و دەچـن بـە پـیری پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لـێ بێ) وە لـە پـشت بەردەلانەکـەوە پێـی دەگـەن، جابەلای ڕاستا دەیانبات هەتا دەچێتە ناو بنەماڵەی عـەمری کوڕی عـەوف و لـەوێ دا دەبـەزن، ئەمـەش ڕۆژی دووشـەمە بـوو، لـەمانگی مـەولوود (مـانگی ڕەبیعـول ئـەووەل) وە ئەبوبـەکر دەچـوو بـە پـیر خەڵکـەوەو لـە جیـاتی پێغەمبەر چاك و چۆنی لەگەڵ دەکردن، بـەڵام پێغەمبـەر (دروودی خودای لێ بێ) خـۆی بـێ دەنـگ دانیشتبوو، جا ئەوانـەی لـە یاریـدەدەران کـە پێغەمبـەریان نەدیبوو کە دەهاتن ڕۆژ باشییان لە ئەبوبەکر دەکرد.

هەتا هەتاوەکە دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) و ئـەبو بـەکر دەچـێ بەپۆشاکەکەی خۆی سێبەری بۆ دەکا، ئەو ساکە خەڵکەکە پێغەمبەردەناسـن، جا پێغەمبـەر(دروودی خودای لـێ بێ) دەشـەو زیـاتر لـەناو بنەماڵـەی عـەمری کوڕی عـەوف دادەمێنێتـەوە، وە ئـەو مزگەوتـە دا دەمـەزرێنێ کـە بناغـەی لەسـەر تـەقوا دامـەزراوە بـە پێـی ئایـەتی قورئـان، وەخـۆی نوێـژی تیادەکات ، ئینجا سـواری ولاخەکـەی دەبـێ و لەگـەڵ خەڵکەکـەدا دەڕوا هـەتا وشـترەکەی لـەلای شـوێن مزگەوتەکـەی ئێـستای پێغەمبـەردا لەمەدینـە چۆك دادەدا، کـە لـەو سەردەمەدا چەند پیاوێ لەموسوڵمانان لەوێدا نوێـژیان دەکـرد، کـە لـەوەپێش جێگـە مـشتاخی خـەرمانی خورمـابوو، هـی دوو کوڕ بـوو، ناویـان سوهەیل و سەهل بوو، هەتیو بوون، ئەسعەدی کوڕی زوڕارە سەرپەرشتی دەکردن.

جا پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) کەوشـترەکەی لـە ژێـر خۆیـا چۆکی داداو لەوێ دا پاڵ کەوت و سینگی دادا، فەرمووی: (خودا حەزکا ئەمـە جێگەیـەتی! لە پاشا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بێ) هـەردوو کوڕەکـەی بـانگ کـردو سـەودای شـوێن مـشتاخەکەی لێ کـردن هـەتا بیکـات بـە مزگـەوت گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بـەڵکوو دەیبەخـشین پێـت. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بێ) قاییل نەبوو، کە بەبەخشین لێیان وەربگرێ، لە ئەنجامدا لێـی کـڕین و کـردی بەمزگەوت، پێغەمبـەر (دروودی خودای لێ بێ) خۆشی لەگەڵ هاوڕێ یاناخـشتی کاڵی

دەگواستەوە بۆ دروست کردنەکەی، وەبەدەم خشت گواستنەوەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) سۆزی دەکردو دەیفەرموو:

(هذا الحمال لا حمال خيبر هذا ابرّ ربنا واطهر

واتە:

کۆڵ ئەم کۆڵەیە، نەک کۆڵی خەیبەر

چاکترەو پاکترە، خودای بانی سەر

حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) دەشی فەرموو:

(اللهم ان الاجر اجرُ الاخِرة فارحم الانصار والمهاجرة)

واتە:

خێر ئەو خێرەیە سبەی لەخوانە! ڕەحمەت لە ئەنصار، لەکۆچکارانە!

ئیبنو شەهاب واتە: ئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە فەرموودەو فەرمایشتدا نەمان بیستووە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هۆنراوەی تەواوی خوێندبێتەوەو بیکا بەنموونەو سەرمەشق بێجگە لەم هۆنراوانە (تاج/٤ ل/٣١٦ ز/١٠١- باسی کۆچکردن- ف- ٤) بڕوانە: ژمارە: ٢٦٤ تەجرید = ٤٢٨ فەتح - بەرگی یەك لاپەڕە/٢٧٤.

ڕوونکردنەوە:

ئەم بەهرانەو چەند بەهرەی تریش وان لەم فەرموودەیەدا:

١- موسوڵمانان لە پێناوی بیرو باوەڕی خۆیاندا تووشی سەختەتیو مەینەتو زیانی گیانی و سامانی دەبن و، دەبێ خۆیان ئامادە بکەن بۆ شتی واو، پشت بە ستنی گەورەیان لە سەر خوابێ.

٢- دروستە موسوڵمان پەنای ناموسوڵمان قەبوولْ بکات. ئەمڕۆ ئەم جۆرە ئەمانە و جیوارو پەنا وەر گرتنە هەر زۆر زۆرە، جێگەی داخە ئێستا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، زۆرینەی موسوڵمانان، لە دەست سەرۆکە بەناو

موسوڵمانه ملهوڕەکان هەڵ دێن و، لەناو ولاتانی ناموسوڵمان دا دەبن بە پەنابەر.

٣- عامیری کوڕی فوهەیره موسوڵمان بوو، وه موسوڵمانێکی جوانی لێ دەرچوو. وه ئامادەی غەزای بەدرو ئوحود بووه، لە ڕۆژەکەی بیری مەعوونەدا کوژراوه، لەتەمەنی چل ساڵی دا، عامیری کوڕی طوفەیل دەیکوژێ، خۆی دەڵێ: یەکەم زام کە لە عامیری کوڕی فوهەیرەم کرد نوورێکم بینی لەدەمی زامەکەیەوه دەرچوو، دەڵێن: پاش شەهید بوونی جەستەکەی ون دەبێ و فریشته دەینێژن ڕووداوەکەی ڕۆژی بیری مەعوو نە لە ساڵی چواری کۆچی دابوو.

٤- سوراقەی کوڕی مالیکی مودلیجی، یەکێکە لەهاوڕێ ناودارەکان، کۆمەڵ هەواڵی لەناو دەقی فەرموودەکەدا رابورد، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئای لەو ڕۆژەی کە بازیبەنەکانی کیسرا لەقۆڵ دەکەیت) وەلەسەردەمی پێشەوا عومەردا کاتێ تاج و پشتین و بازیبەنەکانی کیسرایان هێنا بۆ عومەر، سوراقەی بانگ کردو بازیبەندەکانیکردە هەر دووقۆڵی. سوراقە شاعێرێکی جوان بوو، کۆمەڵ لەهاوڕێیان فەرموودەکانی ئەو دەگێڕنەوه، وەك: ئیبنوعەباس و جابیر، لەبیست و چواری کۆچی دا کۆچی دوایی کرد (رەزای خودای لێ بێ)، یەك فەرموودەی لە بوخاریدایه.

١٥١٨- عَنْ اسْمَاء (رَضيَ اللهُ عَنْها) انَّهَا حَمَلَتْ بِعَبْدِ اللّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَتْ فَخَرَجْتُ وَانَا مُتِمٌّ فَاتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَنَزَلْتُ بِقُباء فَوَلَدْتُهُ بِقُباء ثمَّ اتَيْتُ بِهِ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَضَعْتُهُ فِي حَجْرِهِ ثمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ فَمَضَغَهَا ثمَّ تَفَلَ فِي فِيهِ فَكَانَ اوَّلَ شَيْء دَخَلَ جَوْفَهُ رِيقُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثمَّ حَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ ثمَّ دَعَا لَهُ وَبَرَّكَ عَلَيْهِ وَكَانَ اوَّلَ مَوْلُودٍ وُلِدَ فِي الاسلامِ (الحديث: ٣٩٠٣، طرفه في: ٥٤٦٩)[٢٨٦].

(٢٨٦) اخرجه مسلم في الاداب، باب: استحباب تحنيك المولود عند ولادته ... ، رقم: ٢١٤٦ .

ئەسمای کچی ئەبوبەکر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سکم بەعەبدوڵلای کوڕی زوبەیر پڕبوو، وەپێ و مانگی خۆم بوو، چووم بۆ مەدینە، لەقوباء لام دا، لەوێ عەبدوڵلام بوو، ئەنجا درێژەم بە سەفەری کۆچم دا و چووم بۆ مەدینە، پێغەمبەریش (درودی خودای لێ بێ) لە(قەبائەو)ە گواستبوویەوە بۆ مەدینەو گەیشتبۆ ئەوێ، جا بەخودی خۆم عەبدوڵلام برد بۆ خزمەتی، وەلەکۆشیدا دامنا، جاپێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) داوای دەنکێ خورمای کردو خۆی جوویی و، ئەوجا بەتەڕایی دەمیەوە تفانیە ناودەمی عەبدوڵلاوە، یەکەم شت کەچووە ناو دیوی دەروونی عەبدوڵلای کوڕم تەڕایی دەمی پێغەمبەر بوو، ئەوجا بەدەنکێ خورما مەلاشووی هەنوو، وەدەمی شیرین کرد، وە دووعاو نزای باشی بۆیکردو نزای پیرۆزی وپیت و فەڕی بۆی کرد. عەبدوڵلای کوڕم یەکەم منالێ بوو، لە کۆچکاران، کەلە مەدینە لە دایك ببێ) (بڕوانە: تاج/٤ ل/٣٣ ف/٥ ز/١١- باسی حەوتم و ئەوەی کە دەستووره دەکرێ بۆ منالێ) + (تاج/١٠ ل/١٦٠ ز/٦٤ ف/٣،٤ - باسی ناونانی منالی تازە بوو، گۆشکردنی و شیرن کردنی مەلا شووی بە خورما، یا بە شیرینی تر) .

١٥١٩- عَنْ ابِي بَكْرٍ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْغَارِ فَرَفَعْتُ رَاسِي فَاذا انَا باقْدَامِ الْقَوْمِ فَقُلْتُ يَا نَبِيَ اللّٰهِ لَوْ انَّ بَعْضهُمْ طاطا بَصَرَهُ رَآنَا قَالَ اسْكُتْ يَا ابا بَكْرٍ اثْنَانِ اللّٰهُ ثالِثهُمَا (الحديث: ٣٩٢٢، اطرافه في: ٣٦٥٣، ٤٦٦٣)[٢٨٧] .

ئەبو بەکر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، لە ناو ئەشکەوتەکەی چیای سەور بووین لەکاتی کۆچکردنمانا ئەو دەستەیەی کە لە ناموسوڵمانەکانی مەککە شوێنمان کەوتبوون، کەبمانکوژن، سەرکەوتبوونە سەر سەربانی ئەشکەوتەکەو بەسەر سەرمانەوە ڕاوەستابوون،

(٢٨٧) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل ابي بكرضي الله عنه، رقم: ٢٣٨١.

کە تەماشام کردو سەرم هەڵبڕی وا قاچی ئەو دەستەیە دیارن لەمنەوە، عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەگەر یەکێکیان تەماشای خوار خۆی بکا دەمان بینێ و کەشف دەبین و دەمانکوژن!

فەرمووی: (دروودی خودای لێ بێ) (ئەی ئەبوبەکر! بێ دەنگ بە، ئێمە دووکەسین، خودا خۆی کەسی سێهەمیانە! ) واتە: خەمت نەبێ خودای گەورە خۆی لە زیانی ئەمانە دەمانپارێزێ) (تاج/٦ ل/٢٠٥ ز/١٠- تەفسیری سوورەتی تەوبە).

١٥٢٠- عَنْ الْبَرَاء بْنَ عَازِبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ اوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ امِّ مَكْتُومٍ وَكَانَا يُقْرِئَانِ النَّاسَ فَقَدِمَ بِلالٌ وَسَعْدٌ وَعَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ ثمَّ قَدِمَ عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ فِي عِشْرِينَ مِنْ اصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثمَّ قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَا رَايْتُ اهْلَ الْمَدِينَةِ فَرِحُوا بِشَيْءٍ فَرَحَهُمْ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى جَعَلَ الامَاءُ يَقُلْنَ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَا قَدِمَ حَتَّى قَرَاتُ سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الاعْلَى فِي سُوَرٍ مِنْ الْمُفَصَّلِ(الحديث: ٣٩٩٢٥، طرفاه في: ٣٩٢٤، ٤٩٤١، ٤٩٩٥)[٢٨٨].

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: یەکەم کەس لەهاوڕێیانی پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) کە لەمەککەوە کۆچیان کرد بۆلای ئێمە لەمەدینە، موصعەبی کوڕی عومەیرو ئیبنو ئوممومەکتووم بوو، جا دەستیان کرد بە خوێندنی قورئان بە ئێمەی ئەنصار، ئەو جا بیلال و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس و عەمماری کوڕی یاسیر هاتن و کۆچیان کرد بۆ مەدینە، لە پاشا عومەری کوڕی خەطاب بە خۆی و بیست کەسەوە هاتن، ئینجا پێغەمبەریش هات، نەمدیوە کەخەڵکی مەدینە بەهیچ شتێکی تر ئاوا شادمان بن، وەك بەهاتنی پێغەمبەر کەیفخۆش بوون، تەنانەت کەنیزەك ومندالانیش بە

---

(٢٨٨) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث البرّاء في اوّل من قدم المدينة (فتح/٧ص٦٩٨ ط.ج)خاتمة احاديث المبعث- المترجم .

چاوی خۆم دەمدین دەیانگوت: ئۆخەی پێغەمبەری خودا تەشریفیهێنا! جا هەرکە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) تەشریفی هێنا، ئیتر بەبێ درەنگ دەستم کرد بەخوێندنی قورئان هەتا لەلای خۆی (درودی خودای لێ بێ) سوورەتی ﴿سبح اسم ربك الاعلى﴾ و چەند سوورەتێکی تری لەم چەشنەیەم لە خزمەتیدا لە بەر کرد) (تاج/٧ ل- ٢٤٩- ز- ٧٠- سوورەتی ئەعراف/١) .

١٥٢١- عَنْ الْعَلاء بْنَ الْحَضرَمِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثلاث لِلْمُهَاجِرِ بَعْدَ الصَّدَرِ(الحديث: ٣٩٣٣) .

عەلای کوڕی حەزرەمی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (لەپاش تەوافی ئیفازە، کە لەپاش گەڕانەوە لە مینا ئەنجام دەدرێ، کۆچەری مافی سێ شەوی هەیەکە لە مەککە بمێنێتەوە) .

١٥٢٢- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ ( رضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَوْ امَنَ بِي عَشَرَةٌ مِنْ الْيَهُودِ لامَنَ بِي الْيَهُودُ(الحديث: ٣٩٤١)[٢٨٩] .

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (دەکەس هەن لەناو داران و زانایانی جوولەکەن ئەگەر ئەو دەکەسە باوەڕم پێ بکەن وئیمانم پێ بهێنن، جوولەکە هەموویان ئیمانم پێ دەهێنن).

## پایانێ (خاتمة)

یەکەم- عەلای حەزرەمی (رەزای خودای لێ بێ) ناوی عەبدوڵلای کوڕی عمادبوو، عەلاو چەند برایەکی هەبوو، یەکێکیان ناوی عەمری کوڕی حەزرەمی بوو، یەکەم کوژراوی شەڕی ئیسلام و نا موسوڵمانان بوو، بە ناموسوڵمانی موسوڵمانێ کوشتی،ماڵەکەی یەکەم تالانی بوو، کەدەست موسوڵمانان کەوت و پێنج یەکی لێ دەرکرا، ئەوە بوو بە هۆی شەڕی بەدر،

(٢٨٩) اخرجه مسلم في المنافقين واحكامهم ، باب: نزّل اهل الجنة . رقم: ٢٧٩٣ .

لەناو پەراوەكانی فوتاحاتا مەشهوورە: كە عەلا نزاگیرابووە، چەند وشەو نزای تایبەتی خوێندووەو بەسەر دەریادا بەپێ ڕۆیشتووە! پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) عەلای كرد بە سەركاری سەرولاتی بەحرەین، لەسەردەمی جێنشینێی ئەبو بەكرو عومەردا هەر بەردەوام بوو، تالە ساڵی چواردەدا فەرمانی هەقی بەجێهێنا، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا.

دووەم- مامۆستای پایە بەرز شێخی عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەم پایانەدا دەفەرموێ: (باسەكانی مەبعەس و باسەكانی پاشی هەتا ئێرە، سەدو بیست فەرموودەی بەرزەوە بووی واتیادا، پەیوەست مەوصوول)ە كانیان سەدو سێ فەرموودەن، ئەوانی تریان بیرشتە و موتابە عاتن، دووبارکانیان حەفتاو حەوت فەرموودەن، پوختەكەیان دەكاتە: (١٢٠- ٧٧= ٤٣) چل و سێ فەرموودە: پێشەوا موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەویش پوختەكەی هەموو گێڕاوەتەوە، بێجگە لەمانەیان:

١. فەرموودەكەی خەباب (لقد كان من قبلكم يمشط...) ژمارە: ٣٨٥٢ فەتح = ١٤٣٧ تەجرید .
٢. ژمارە: ١٥٠٦ت = فەرموودەكەی عەمری كوڕی عاص: (اشد ما صَنَعه المشركون) = ٣٨٥٦ فەتح .
٣. ژمارە: ١٥٠٧ تەجرید = ٣٨٥٩ فەتح = فەرموودەكەی ئیبنو مەسعوود: (اذنت بالجنّ شجرة) بەلام ئەم فەرموودەیە موسلیمیش دەری هێناوە، بڕوانە: بەرگی چوارەم صەحیحی موسلیم بەشرحی نەوەی ص ١٧١ بڕوانە پەراوێزی ژمارە: ١٥٠٧ تەجرید.
٤. ژمارە: ٣٨٦٤، ٣٨٦٥ فەتح. باسی ئیسلامبوونی عومەر.
٥. ژمارە: ٣٨٦٦ فەتح فەرموودەكەی سوادی كوڕی قارب = تاج/٤ ل- ٢٨٦ز- ٩٥ف- ١ لەتەجریدەكەدا نیە.
٦. فەرموودەكەی عومەر: (یاجلیح) = ٣٨٦٦ فەتح .

٧. ژمـاره: ٣٨٦٨ فـەتح، فەرموودەکـەی سـەعیدی کـوڕی زەیـد، لـەبارەی ئیسلامبوونی خۆیەوە.

٨. فەرموودەی ژمـاره: ١٥٠٩ تەجریـد = ٣٨٧٤ فـەتح = (حـديث ام خالـد بنـت خالد في الخميصة) بڕوانە: ژماره: ١٢٥١ تـەجریـد =٣٠٧١ فـەتح = بـەرگی/٣ل-٣٧٢: ئەوەی کە لە پەراوێزی ئەم ژمارەوە، لە بەرگی سێ دا ئاوا نوسـراوە (راجع رقم: ٦٧٠ ت = ١٤٠٢ف = مجلد/٢ ل- ٩٥) پەیوەنـدی بـەم ژمارەیـەوە نییـە، بـەڵکوو پەیوەنـدی بـەژمارەی: ١٥٥٢ ت= ٣٠٧٣ فـەتح ەوە هەیـە، هەروەك لە کۆتایی ژماره: ١٢٥٢ ت وە ئەم ئاماژەیە نووسراوە.

٩. ژمـاره: ١٥١٤ت = ٣٨٨٨ف. تەماشـای پـەراویزی ئـەم ژمارەیـە بکـە، کـە لـە پێشەوە، لەم باسەدا رابوورد (حديث ابن مسعود في قوله تعالى: ﴿وما جعلنـا الرؤيا﴾.

١٠. ژماره: ٣٨٩٠ فەتح = (شَهِدَ بی خَالایَ العَقَبَةَ).

١١. ژماره: ٣٨٩٩، ٣٩٠٠ فەتح، فەرموودەکەی ئیبنو عومەرو عائیشە: (لاهجـرة بعد الفتح).

١٢. ژماره: ٣٩٠٥ فـەتح= (ان الزبير لقي النبـيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فى ركـب كانوا تجارا) + ژماره: ٣٩٠٦ فەتح =١٥١٧ تەجرید .

١٣. ژماره: ٣٩١١ فەتح = فەرموودەکەی ئەنەس، سەبارەت بەکۆچ، داسـتانەکەی سوراقەی واتیادا، بەڵام بەناو، ناوی ناهێنێ.

١٤. ژماره: ٣٩١٥ فەتح = باسی کۆچ، کەعومەر و ئەبوموسا دەیگێڕنەوە.

١٥. ژمـــاره: ٣٩١٦ فـــەتح = فەرموودەکـــەی ئیبنـــو عومـــەر، ســـەبارەت بەپەیمان و بەیعەت.

١٦. ژماره: ٣٩٢١ فەتح = (ان ابا بكر تزوج امراة من كليب) .

١٧. ژماره: ١٥٢٠ تەجرید = فەتح (اول من قدم) .

١٨. ژماره: ٣٩٣٤ ف (ماعدّوا من مبعث النبي ولامن وفاتِهِ) .

١٩. ژماره: ٣٩٤٥ ف = (جَعَلُوا القران عِضين) .

٢٠. ژماره: ٣٩٤٦، ٣٩٤٧،٣٩٤٨ فەتح. هەروا دەفەرموێ: چوار یا پێنج بیستراو — ئەثەر- یشی واتیادا.

تێبینی:

لەم پوختەیە، حەڤدەیان لە تەجریدەکەدا هاتووە، لەژمارە (١٥٠٦هەتا ١٥٢٢) واتە: ١٥٢٢- ١٥٠٥ = ١٧ فەرمووده.

سێیەم: حەزدەکەم لە دوا ئەم بابەتانەی کەڕابووردن کورتەیەکی پۆختیش لە ژیانی پێغەمبەر بنووسین هەتا ببێ بە تەواوکەری ژیاننامەی هاوڕێکانی:

یەکەم: پاکیو خاوێنی و خانەدانیی ڕەسەنی پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خۆشەویست خۆی (دروودی خودای لێ بێ) سەرو ماڵ و مناڵ و هەست و نەست بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ لەم بارەیەوە بۆ (تَحدُّث)بە نیعمەتی خودا دەفەرموێ: (چەرخ بەچەرخ وپشت بە پشت بە پاکی و پیرۆزی، لەپشتی باوك و دایکی پاك و پاك دامەن پاك هاتوومەتە خوارەوە، لە ئادەمەوە هەتا باوك و دایکی خۆم) (بڕوانە: ژمارە: ١٦٢١ هەتا ١٦٢٩ لەدواوە دێت)کە پەیوەندییان بەژیانی خۆشەویستەوە هەیە .

دووەم: زاناکان (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) دەفەرموون: (یەکەم ئەرکی پێویست لەسەردایك و باوك: کەفێری مناڵی فامیدەی خۆیانی بکەن ئەمەیە: الله خودای ئێمەیە، موحەممەد پێغەمبەرمانە، لەمەککە لەدایك بووە، هەر لە مەککە خودا کردوویەتی بە پێغەمبەرو، پەیامی ئیسلامی پیادا نارد، لە مەدینەی نازدار وەفاتی کردووە، گۆڕی پیرۆزی وا لەوێ لە مەدینە).

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ناوی (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی عەبدول موتەلیب، کوڕی هاشم)ە دایکی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ناوی

ئامینـەی كـچی وەهەبـە، دایـك و بـاوكی پێغەمبـەر لـە هـۆزی قورەیـشن، لـە باپیرەی شەشەم دا كە ناوی كیلابە ڕەچەڵەكی باوك و دایكی یـەك دەگرنـەوە، پێغەمبەر بەنەتەوە عەرەبە، لەنەوەی ئیسماعیلی كوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە (سەلامی خوادایان لـێ بێ).

پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لەساڵی عامولفیلدا لـە دایـك بـووە، لـە ڕۆژی دووشەممەدا، لە شەوی دوازدەی مـانگی مـەولوودا (ربیع الاول) بـە چـل ڕۆژ لـە دوا ڕووداو و (واقیعـە)ی فیـل، لەسـاڵی: (٥٧٠) ی زاینیـدا، لـە سـەردەمی پادشـای ئەنەوشـیرەوانی دادپـەروەردا، لـە شـاری مەككـە لـەدایك بـووە ، كـە لـەدایك بـووە پووەیبـە یەكـەم جـار شـیری پـێ دا، لـەدوای ئـەو حەلیمـەی سەعدییە شیری پێ داو بوو بەدایەنی، و ئوم ئەیمەن لەلەی بوو .

ئـەوەی كـە گومـانی تیـادا نییـە: پێغەمبـەر (درودی خودای لێ بێ) لەهـەموو كاتێكی ژیانیـدا، جێگـەی چاودێری تایبـەتی خـودای گـەورە بـوو، وە زۆربـەی ژیانی پڕبووە لە موعجیزات و ئیرهاسـات، لەسـەرەتای لـە دایكبوونیـەوە هـەتا كاتی وەفاتی، خەواریق و موعجیزاتی لێبینـراوەو، لە سوننـەتی ساخدا تۆمـار كراوە.

وەكی تریش بەپێی دەقی ڕۆشنی قورئان، لە دایكبوونی مووساو عیـساو یەحیاو مەریەم، سەر ئاساو مـوعجیزە ئـامێز بـوون، دەی دەبێـت پێغەمبـەری خۆمان چی لـەوان كـەمتربێت، هـەتا ئـەوەی بـۆ ئـەوان دروسـت بێـت بـۆ ئـەو دروست نـەبێ.

سـێیەم: پێغەمبـەر (درودی خودای لێ بێ) هـەتا بڵێـی شـێوەی شـیرین بـوو، قەڵـەمێكی ڕێكـی هـەبوو، سـوورو سـپی یـەكی زۆر جـوان بـوو، ڕواڵـەتێكی نوورانی هەبوو، باڵای ناوەندی بوو، ناو قەدی باریك بوو، لەشی قەبە نـەبوو، بەڵام لە ڕو لاوازیش نەبوو، سەرو كەللەی قەوی بوو، ناوچەوانی پان و جوان و نوورانی بوو، لاجانگەكانی پان بوون، برۆی باریك و كـەوانی و درێـژ کوولـە

و پڕبوون، برژانگی درێژو پڕو جوان بوو، چاوەکانی قەوی و نەخشین و ئەکحەل بوون، ڕەشێنەی چاوەکانی گەورەو ڕەش بوون ، بەشەو لەپێش خەوتنا بەکل چاوی دەڕێژا ، هەر چاوەی سێ جار سپێنەی چاوی خاڵخاڵی سووری تیادا بوو، لووتی کەمێ درێژ بوو، ناوەڕاستی لووتی کەمێ کووڕ بوو، سەری لووتی کەما باریك بوو، دەمی گەورە بوو، بەڵام زۆرنا، ددانی ورد بوون وەك سەدەف بریقە دارو ئاودار بوون، کەما ددانەکانی بلاوبوون، بەڵام شاش نەبوون، لەکاتی قسە کردندا قوببە قوببە نوور لەزاری دەباری!

سەرکوڵمەکانی ساف بوون، دەموچاوی گووپن نەبوو، ڕوومەتی پان بوو، ئەمە تەختی ڕوومەتی بوو، ناوشان و سینگی گەورەو پان بوون دەستی نەرم وشل بوو، باسکەکانی قەوی بوون، مووی ڕەش بوو، قژەسەری زۆر پڕ بوو، زۆر جار قژەسەری دەیدا لەناو شانی، جارو باریش سەری خۆی دەتاشی، قژی کەمێ لوول بوو، بەڵام لوولێکی کرژی وەك هی قولە ڕەشەکان نا، جاروبار مووی سەری دەگرتە خەنە، یان بە ڕەنگی زەرد بۆیەی دەکرد، جاروبار پرچی دەهۆنییەوەو دەیکرد بە پەلك .

مووی ریشی ڕەش و پڕبوو، نەتەنك بوو، نەدرێژ ، لەپانی و درێژیی ریشی دەگرت، هەمیشە ریش و قژەسەری شانەدەکردو بۆنی خۆشی لێدەدان، بەڕاستی شێوەی شیرین بوو، سیمای نوورین بوو، هەتا بڵێی ڕەفتاری جوان و شیرین بوو، کرداری جوان بوو، کاتێ سرووش (وەحی)ی بۆهات و بوو بە پێغەمبەر، تەمەنی چل ساڵ بوو، کات مانگی ڕەمەزان بوو، شوێن ئەشکەوتی حیراو بوو حەزرەتی جوبرائیل سەرەتای سوورەتی عەلەقی بۆ هێنا، ڕۆژی دووشەممە بوو، حەفدەی مانگی ڕەمەزان بوو، لە پاش هاتنی سرووش بۆی سیازدە ساڵ لە مەککە مایەوە، سەرو مڕ، بەبێ وچان سەرگەرمی ڕاگەیاندنی پەیامەکەی بوو، لە پاشا بۆ هەمان مەبەست کۆچی کر دبۆ شاری مەدینەی پیرۆز، دەساڵیش لەمەدینە مایەوە، دەڵێن: پێکەنینی قاقای نەبووە، هەروا باوێشك و ئیحتیلامی نەبووە، قەتیش کوڕنووشی بۆبت نەبردووە، مۆری

پێغەمبەرایەتی بەناو شانیەوە بوو، بەقەد دووگمەی پەردە کوللەێی دەبوو، وەك هێلکەی کەو نەخشین بوو، لەشێوەی دەستی نووقاودا بوو، وردەخاڵی زۆری پێوە بوو، لە چەشنی وردە بالووکە. هەمیشە رووی خۆش بوو، زۆر جاران زەردەخەنە دەیگرت، ددانە چوارینەکەی لە ڕیزی خوارەوە، لەلای ڕاستەوە، لە غەزای ئوحودا شکا بوو، دەنگی گەورەبوو، دەنگی زۆر خۆش بوو، زۆرکاریگەر و بە تەئسیر بوو.

چوارەم: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) زۆر گرنگی بە پاك و خاوێنی دەدا، بەتایبەتی هی جلو بەرگ و خواردن و خواردنەوەو جێگە و شوێن، هەر واگرنگی دەدا بە بۆنی خۆش ، بۆنی خۆشی زۆر بەکار دەهێنا، خۆشی بۆنی زۆر خۆش بو، گەلێ جار ئارەقی پێغەمبەریان دەگرت و دەیان کردە ناو گولاوەوە هەتا بۆن خۆش تری بکا! حەزی لە دەنگە دەنگ و قرە قڕ نەبوو، حەزی لە ئارامی و هێمنی بوو، بۆنی ناخۆشی زۆر پێ ناخۆش بوو، وەك بۆنی سیرو پیاز و شتی تری وا.

پێنجەم: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) هێمن و لەسەرخۆ بوو، بەتایبەتی لە قسە کردندا، زۆربەی فەرمایشتەکانی کورت و پوخت و پڕواتاو ڕەوان و ئاسان بوون، لە شێوەی قسەی نەستەق و پەندی پێشینان، گەلێ جار کەوتەیەکی دەفەرموو سێ جار دووبارەی دەکردەوە، ڕۆژانی هەینی و جەژنەکان خۆی ووتاری دەخوێندەوە ، لەبۆنەو موناسەبەکاندا ووتاری شیرین و بەرزی دەخوێندەوە . خۆشەویست کەم دوو وکەم خۆرو کەم خەو بوو، بەسێ پەنجەنانی دەخوارد، زۆر بێ دەنگ بوو، زۆر بەشەرم و شکۆ بوو شەو نوێژی زۆری دەکرد، ڕۆژووی سوننەتی زۆری دەگرت.

شەشەم: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) بەچاو دەخەوت بەڵام بەدڵ وریا بوو، هەرگیز دڵی نەدەخەوت، هەمیشە دڵی لای خوابوو، بەهەناسە لە خوا غافڵ نەبوو، هەموو شەوا لەخەو هەڵدەسا بۆ شەو نوێژو بۆ پاڕانەوەو نزا،

جاروبار بەرۆژیش دەخەوت، گەلێ جار لە خەوندا وەحی بۆ دەهات، گەلێ خەونی جوان جوانی دیوە لە سوننەتدا تۆمار کراون.

حەوتەم: ڕەفتارە شیرینەکانی: ڕەفتاری زۆر بەرز بوو، ڕەفتاری ڕەنگدانەوەی ئایەتەکانی قورئان بوو، کاتی خۆی قەت بە فیڕۆ نەدەدا، هەمیشە سەرگەرمی تێکۆشان و هەوڵ دانو خواپەرستی جوان بوو، حەزی لەکارو فرمان بوو، لەشی زۆر سووك بوو، دژی تەمەڵی وتەوەزەلی بوو، قەت لەیادی خودای گەورە بێ ئاگا نەبوو، هەمیشە نوێژی بە جەماعەت دەکرد، وەخۆی بەرنوێژی بۆ یارانی دەکرد، شەونو یژێکی زۆری کردبوو بەپیشەی هەمیشەی شەوی ئەوەندە لە شەو نوێژدا ڕاوەستا بوو، هەردوولاقەکانی پەنەما بوون، زۆر زۆر ڕۆژووی سوننەتی دەگرت، زۆربەی کات دووشەممان و پێنج شەمان بەڕۆژوو دەبوو، هەتا بڵێی دەست بە خێرو سەخی بوو.

هەموو ڕەمەزانێ دە ڕۆژ لەناو مزگەوتدا خەڵوەی دەکێشا، هەموو ڕەمەزانێ جوبرائیل گوێی لە پێغەمبەر دەگرت، یەك خەتمی پێ دەکرد، لەوماوەیەدا فێری تەجویدو قیرائاتی دەکرد، خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) هەتا بڵێی دڵ و دەروونی گەورە بوو، ڕاستگۆ بوو، قسە ڕاستی وەك خۆی نەبوو، زۆر نەرم و نیان بوو، چەندە بڵێی ڕووخۆش و قسە شیرینو مامەڵە خۆش بوو، زۆر هێمن و بەسەبر بوو، لەو پەڕی ئازایی و دڵێریدا بوو، لەخوا نەبێ لەکەسی تر نەدەترسا، زۆر بەڕەحم بوو، زۆر بەتەنگی نەتەوەی ئیسلامەوە بوو، زۆر بە پەرۆش بوو بۆ گەلی ئیسلام.

زۆرجار لەترسی خودا دەگریا، بەتایبەتی لە کاتی نزاو پاڕانەوەو شەو نوێژو قورئان خوێندن دا، گەلێ جار فەرمانی دەکرد بە دەنگ خۆشەکانی یارانی لەناو مەجلیسەکەدا قورئانیان بەدەنگی خۆش دەخوێند وە قورئانەکە کاری تێدەکردو دەگریا، زۆر هێمن و سەلار و بێ هەوا بوو، زۆر بەتەوەککول بوو، خاوەنی چاو پۆشیو لێبوردن بوو، زۆر ڕووخۆش بوو، مرقن و مۆن و دڵڕەق نەبوو، زۆر بەوەفا بوو، زۆر بەقنیات بوو، گوزەرانی خۆی و خێزانی

زۆر سادەبوو، بەنان و ئاو هەڵیان دەکرد، لەگەلا خێزان و ماڵ و منالّی خۆیدا زۆر مەشەرەب خۆش بوو، گەلێ جار لەماڵەوە ئیشی ماڵەوەی دەکرد ، منالّی خۆی ماچ دەکرد، سەری منالّی تریشی ماچ دەکرد، دەستی دەهێنا بەسەریاندا، نزای باشی بۆ دەکردن، سلاوی لە کۆمەڵی ژنان دەکرد.

بەڕاستی هاوسەرەکانی و منالّەکانیو کەس وکارە خواپێداوەکانی ماڵ و منالّی ڕەحمەت بوون، نموونەیی بوون لەپێغەمبەر خۆی، لەناو یاران و هاوڕێ یانیدا وەك برایان وابوو، خۆی جیا نەدەکردە وەلێیان، قەبووڵی نەدەکرد کە کەس لەبەری هەڵسێ، زۆر میوان پەروەر بوو، پیشەی هەمیشەی چاکەکردن بوو، خۆشەویست کەمەکەمە لەگەڵ هاوەلانیدا سوعبەت و قسەی خۆشی دەکرد، جارو بار مەتەڵی لێیان دەپرسی، گوێی لە قسەو باس و سەرگوزەشتەی یارانی دەگرت، هەروا گوێی لە شیعری جوانی یارانی دەگرت، هەروا هی سەردەمی پێش ئیسلام جارجاریش خۆی بەلگەی بە شیعر دەهێنایەوە.

هەشتەم: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لە ژیانیدا خەباتگێڕو تێکۆشەر بوو، پتر لەحەڤدە غەزای گەورە خۆی سەرکردەی سوپای ئیسلام بووە، هەر لەمنالّیەوە لەسەر بێشکەوە عینایەت و چاودێری خوای گەورەی لەگەڵدا بوو، لەبەر ئەوە قەت عیبادەت و سوجدە و کوڕنووشی بۆ غەیری خودا نەبردووە . لەژیانیدا خۆشی و ناخۆشی دیوە، کارو کاسپی حەلالّی کردووە، شوانی کردووە، کاروانی کردووە، بازرگانیی کردووە، سەفەری کردووە، لەسەرفەرێکا گەیشتۆتە شام، ناوی دەرکردووە ببوو بەموحەمەدی هێمن و بێوەی و ئەمیندار، سێ حەجی کردووە، عەمرەی زۆری کردووە. جیهاد وغەزای زۆری کردووە، بەمندالّی لە ناو منالانا یاری کردووە، خێرو قوربانی زۆر زۆری کردووە، موسابەقەو پێشبڕکێی لەگەڵ یارانیدا دەکرد . نەخۆش کەوتووە، دەرمانی بەکارهێناوە، کەلّەشاخی لەخۆی گرتووە، زامداربووە، ددانی لەغەزادا شکاوە، پەنجەی زامار بووە، لەغەزادا سەرکەوتن و

ژێرکەوتنی بەخۆیەوە دیووە (بڕ: ژمارە ١٥٤٨ تەجرید، لەم بەرگەدا ) سەرئێشەیەکی لەگەڵدا بوو: لایی لەسەری دەئێشا، پێی دەڵێن: (شقیقة) سەری لەنەخۆش دەدا، دووعاو نزای شیفای بۆ نەخۆش دەکرد، خەڵکی هان دەدا کەخۆیان دەرمان بکەن و سەر لە پزیشك بدەن.

لەگەڵ تەرمی‌مردوودا دەچوو بۆسەرگۆڕستان، نوێژی لەسەرمردوو دەکرد، سەردانی گۆڕستانی دەکردو، سلاوی لێیان دەکردو بۆیان دەپاڕایەوە، سێ ڕۆژ تازێی بۆ مردووی خۆی دەگرت، وەك لەکاتی مەرگی ئیمامی جەعفەردا، لە مزگەت بەغەمباری دانیشت بۆ قەبووڵی پرسەو سەرخۆشی.

بایەخی چاکی بەڕۆشنبیری دەدا، خەڵکی هان دەدا کە فێری خوێندەواری ببن، بەڵام خۆی خوێندەوار نەبوو، لەکاتی ڕۆیشتندا کەمێ بەبەردا دەینواند، دەتگوت: تەنگی زەوی بۆ دەکێشرێت، ئەمە کورتەیەکی پوخت بوو لە ژیاننامەی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) گشتی لەفەرمایشتی ڕاست و دروست و لەسەرچاوەی باوەڕپێکراو وەرگیراوە، خوایاربێ ئەم کورتەیە بۆکەسی خۆی، بۆ ئاشقانی ژین نامەی خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) دەبێ بەهۆی ناسینی پێغەمبەر، ئەوەش گەورەترین ئاواتی مرۆی موسوڵمانی هۆشیارە، چونکە هەم دەبێ بەهۆی خۆشەویستی‌ی پێغەمبەر و هەم دەبێ بەسەرمەشق بۆ موسوڵمانان هەتا لەبەری فێری کاری شیرین و ڕەفتاری جوان ببن، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللّٰهِ اسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللّٰهَ﴾، ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِاوْلِي الالْبابِ﴾.

**کۆتایی:**

پێغەمبەری خودا (درودی خودای لێ بێ) نۆبەرەو تاقانەی باوك و دایکی بووە، براو خوشکی نەبووە، لەتەمەنی (٢٥)ساڵیدا ژنی هێناوە، دوو کوڕو چوار کچی بووە، هەموویان لەیەکم ژنی بوون، کەخاتوو خەدیجەی کچی خووەیلیدە، بێجگە لە ئیبراهیم کە لەمارییەی قیبتی یەبووە، مناڵەکانی

پێنجیان لەپێش خۆیەوە بەمردنی خوا مردوون، تەنیا فەتمەی کچی شەش مانگ لەپاش خۆی ژیاوە باوکی خۆی نەدیوە پێنج شەش مانگان بووە لەسکی دایکی دا کە باوکی مردووە، باپیرەی بەخێوی کردووە هەتا تەمەنی بووە بەهەشت سالّ، باپیرەیشی دەمرێ، ئەبو تالیبی مامەی کە برای باوك و دایکی عەبدوڵلای باوکی بووە بەخێوی کردووە.

یازدە مامەی بووە، تەنیا دوانیان ئیسلام بوون، کە حەمزەو عەباس بوون، شەش پووری باوکی بووە، صەفی یەیان ئیسلام بووە، لەتەمەنی چل سالّیدا خودا کردی بە پێغەمبەر، ماوەی پێغەمبەرایەتییەکەی بیست و سێ سالّ بووە، لەتەمەنی شەست وسێ سالّیدا کاتێ نەخۆش کەوت، لە پێش مەرگیدا بەچەند ڕۆژێ لەماڵی عائیشەی هاوسەری مایەوە هەتا گیانی پاکی سپارد، ئەوجا بەشالّی یەمەنی دایان پۆشی، ئەوسا عەلی و فەزل و ئوسامەی کوڕی زەید شۆردیان، وەلەسێ لۆ جلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکەدا کفن کرا، شەقرانی نۆکەری، پارچەیێ قەیفەی لەناو گۆڕەکەی دا بۆ تەرمەکەی ڕاخست، عەلی و فەزل و ئوسامەی کوڕی زەید دایان هێلایە ناو گۆڕەکەیەوە.

موسوڵمانان هەرکەس بۆ خۆی بەتەنها نوێژی مردوویان لەسەر تەرمەرکەی کرد، ئەوجا لەناو ئەو هۆدەیەدا کەتیادا وەفاتی کرد ناشتیان، ئێستا گومەزێکی سەوزی لەسەرکراوە، ناودارە بە (القبّة الخضراء) ئەو ماڵەی کە پێغەمبەری تیالە دایك بووە هەتا ئێستاش هەرماوە، بەلاّم هەندێ دەسکاری تازە کراوە، وەلەلایەنی حوکومەتەوە کراوە بەمەکتەبە کاتێ وفاتی کرد، دەوری بیست مووی سپی لەسەروو ڕێشیدا هەبوو، بەلاّم پێشە سەری و چالّی چەناگەی کەمێك بۆز بووبوون.

سەرنج بفەرموون: ئەم گشتە دەوڵەتو کۆمەڵ و گەل و نەتەوە موسوڵمانان و ئەم حەمکە ولات و نیشتمان و جێگە پیرۆزانە، ئەم گشت فێرگاو زانستگاو زانکۆو نامەخانە و لایەن و ڕێکخراوە ئیسلامییانە، ئەم حەمکە مزگەوتە، پتر لەیەك ملیار موسوڵمان، زیاتر لەپەنجا دەوڵەتی

ئیسلامی، کە ئەمانە ئێستا هەموو وەك گوڵی بەهار پەخش و پرشن لەسەر ڕووی گۆی زەوی، ئەم هەمکە ڕەحمەتە، ئەم هەمووخێرو بیری دین و دنیایە، هەمووی بەری خەبات و تێکۆشانی بیست و سێ ساڵی تاقەیەك کەسەوبەس، کەحەزرەتی موحەممەدی خۆشەویستە (دروودی خودای لێ بێ) پێغەمبەری خۆشەویست و نازدار حەزی لە سیواك کردن و بۆنی خۆش و شەونوێژ بوو، هەستێکی ناسکی هەبوو، حەزی لە پاکی و تەمیزی بوو، حەزی لەپیس و پۆخڵی نەبوو، کەمە کەمە لەماڵەوە ئیشی دەکردو یاریدەی خێزانی دەدا، جلی کۆنەو نوێی لەبەر دەکرد، مێزەری لەسەر دەکرد، جلی خۆی پینە دەکرد، هەروا پێڵاوی پینە دەکرد، گەلێ جار جل و بەرگی خۆی دەدا بە موسوڵمانانی تر ، هەتا بیکەن بەکفن و ژێر کفن لە پاش مردن.

مەگەر لە حەج و عەمرەدا دەنا قەت سەری ڕووت نەکردووە، مەگەر لەبەر هۆیەك، وەك بەسەری ڕووت چووبێتە بەریەکەم باران، پاسەری تاشیبێ هەتا ئێستاش لەلای گەورە پیاوان و لە مۆزەخانەکانا ئاسەواری پێغەمبەر ماوە، وەك مووی ڕیشی، پابەرماڵ و شتی وای، لە بیارەی شەریف چەن موویەکی پێغەمبەری لێ بوو، زۆر بەڕێزو قەدرەوە هەلگیرابوو، لەناو شووشەیەکا بوو، لە ناو سندووقێکا، سندووقەکەش لەناو تاقێکا بوو، تاقەکە دەرگایەکی ئاسنی هەبوو، بە قفڵێکی ئاسنی گەورە داخرا بوو، لە بۆنەو موناسەبەتەکاندا، دەریان دەهێنا، وەك کاتی بێ بارانی، پێیان دەگوت: مەحاسینی شەریف! لەکەرکووك لەماڵی شێخ عەلی خادم السجادە، سەجادەیەکم دی، دەیانگوت هی پێغەمبەر بووە، ئەو بنەماڵەیە زمیوانی ئەو سەجادەیە بوون، و بەهۆی ئەوەوە گەورەترین ڕێزو قەدری دین و دنیایان هەبوو، هەمیشە وەك تەکیە و خانەقا دیوانیان گەرم بوو.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٦٧- نامەی کوشتو کوشتارەکان
# (كِتَابُ المغازي)

## (غزوة العُشَيرة)

١٥٢٣- عنْ زَيْدِ بْنِ ارْقَمَ (رضيَ اللهُ عنهُ) فَقِيلَ لَهُ:(كَمْ غَزَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ غَزْوَةٍ؟ قَالَ: تِسْعَ عَشْرَةَ قِيلَ: كَمْ غَزَوْتَ انْتَ مَعَهُ؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ ، قُلْتُ: فَايُّهُمْ كَانَتْ اوَّلَ؟ قَالَ: الْعُسَيْرَةُ اوْ الْعُشَيْرُ فَذَكَرْتُ لِقَتَادَةَ فَقَالَ: الْعُشَيْرُ). (الحديث: ٣٩٤٩، طرفاه في: ٤٤٠٤، ٤٤٧١)[٢٩٠] .

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: تووشی زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خودای لێ بێ) بووم، عەرزیم کرد: پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) چەند غەزای کردووە؟ فەرمووی: نۆزدە غەزا، گوتم: لەچەند غەزایان تۆخۆت لەگەڵیا بووی؟ فەرمووی: لەحەڤدە غەزایاندا لەگەڵی دا بووم و بەشداریم کردوون گوتم: کامەیان یەکەم غەزای بوو؟ فەرمووی: غەزای عوشەیر، یافەرمووی: غەزای عوسەیر (تاج/٨ ل/١٩٥ ز/٨٣ ف/٢ - باسی غەزاکان).

## داستانی غەزای بەدر (قصَّة غزوةِ بدرٍ)

١٥٢٤- عن عبدالله بنَ مَسعُودٍ يَقُولُ شَهِدْتُ مِنْ الْمِقْدَادِ بْنِ الاسْوَدِ (رضيَ اللهُ عنهُ) مَشْهَدًا لانْ اكُونَ صَاحِبَهُ احَبُّ الَيَ مِمَّا عُدِلَ بِهِ اتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَدْعُو عَلَى الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ:(لانَقُولُ كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى: اذهَبْ انْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا وَلَكِنَّا نُقَاتِلُ عَنْ يَمِينِكَ وَعَنْ شِمَالِكَ وَبَيْنَ يَدَيْكَ وَخَلْفَكَ

---

(٢٩٠) اخرجه مسلم في الحج، باب: بيان عدد عمر النبي (صلى الله عليه وسلم) وزمانهن، وفي الجهاد و السيَر باب عدد غزوات النبي (صلى الله عليه وسلم)، رقم: ١٢٥٤ .

فَرَايْتُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)اشْرَقَ وَجْهُهُ وَسَرَّهُ يَعْنِي قَوْلَهُ). (الحديث: ٣٩٥٢، طرفه في: ٤٦٠٩)[٢٩١] .

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەڵویستێکی مەردانەم لە میقدادی کوڕی ئەسوەد دیوە، حەز دەکەم کە من خاوەنی ئەو هەڵوێستە پیاوانە بوومایە، بەهەرچی شتا کە بەبەها گران بێ و بەکێش سووک بێ: جارا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خەریك بوو نزای شەڕی لەفرەخواکان دەکرد، میقداد لەم کاتەدا هات، عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە وەك گەلی مووسا ناکەین، کە وەك قورئان دەیگێڕێتەوە، بە مووسایان گوت: ﴿فاذهَبْ انتَ وَرَبُّك فَقَاتِلا انَّا هَهنا قاعِدونَ﴾ – مائیدە– ٥/٢٤. واتە: (ئەی مووسا! ئێمە بەهیچ جۆرێ ناچین بۆ غەزا، بۆ سەر ئەم هۆزە ملهوڕە زەبەللاحانە، کەوان لەخاکی پیرۆزی بەیتولمەقدیس دا، هەتا ئەوان لەوێ بن ئێمە سەری پیا ناکەین، ئەوە بۆ خۆت و خواکەت دوو بەدوو ناچن بۆ ئەم شەڕەی کەخۆت دەڵێی، ئێمەیش ئالێرەدا بۆ خۆمان دادەنیشین، دەی فەرموون بڕۆن ئێمەیش وا لێرەدا چاوە نۆڕتان دەکەین!) عەرزی کرد: قوربان! حاشا ئێمە هەڵەی وا گەورە ناکەین بەڵام ئێمە لە هەر چوار لاتەوە بۆت دەبین بە شووورای پۆلایین، لە ڕاستتەوە، لە چەپتەوە، لەبەردەمتەوە، لە پشتتەوە، جەنگ دەکەین و بەری هێرشی دوژمن دەگرین. کە ئەو وای فەرموو، تەماشام کرد ڕووی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بە هۆی ئەم قسانەی میقدادەوە، وەك گوڵ گەشایەوەو، وە ئەوەی زۆر پێ خۆش بوو!). (تاج/٨ ل/١٩٦ ز/٨٤- ٢) .

١٥٢٥– عنْ الْبَرَاء (رَضِيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ: حَدَّثَنِي اصْحَابُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا: (انَّهُمْ كَانُوا عِدَّةَ اصْحَابِ طَالُوتَ الَّذِينَ جَازُوا

---

(٢٩١) لم يوافقه مسلم على تخريجه (خاتمة كتاب المغازي ج/٨ص١٥٤ - فتح) - المترجم .

مَعَهُ النَّهَرَ بِضعَةَ عَشَرَ وَثلاث مِائَةٍ قَالَ الْبَرَاء: لا وَاللّٰهِ مَا جَاوَزَ مَعَهُ النَّهَرَ الا مُؤْمِنٌ). (الحديث: ٣٩٥٧، طرفاه في: ٣٩٥٨، ٣٩٥٩)[٢٩٢].

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هاوڕێیانی موحەممەد (دروودی خودای لێ بێ) قسەیان بۆ کردووم و جاران لەناوخۆمانا دەماودەم دەمانگێڕایەوە بۆ یەکتری، بەتایبەتی ئەوانەیان کە ئامادەی جەنگی بەدر بوون، دەیانفەرموو: کە ژمارەی ئەو هاوڕێیانەی موحەممەد (دروودی خودای لێ بێ) کە لە غەزای بەدردا لە گەڵی دا بوون، سێ سەد و دەوچەن کەسێ بوون، دەق بە قەد ژمارەی هاوڕێکانی تالووت کە کاتی خۆی لەگەڵیا لە ڕووبارەکە پەڕینەوە، ئەوەیشی کە موسوڵمان نەبێ لەگەڵیا لە ڕووبارکە نەپەڕی یەوە) (تاج/٨ ل/١٨١ ز/٩ سوورەتی ئەنفال ف/٢) ئەم فەرموودەیە دانارێ بەمورسەلی صەحابی، چونکە گەرچی بەراو بەدری نییە و ئامادەی غەزای بەدر نەبووە، بەڵام بەڕاشکاوی خۆی دەفەرموێ: کە هاوڕێیانی موحەممەد ئەمەیان بۆم گێڕاوەتەوە.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە پەیوەندی بەم داستانی تالووت و جالووتەوە هەیە کە لەسوورەتی بەقەرەدا باسکراوە، بڕوانە تەفسیری سوورەتی بەقەرە ئایەتی: ١٤٦ هەتا ٢٤٩ بڕوانە: تەفسیری نامی زێڕین بەرگی یەکەم لەلاپەڕە: ٥٢٨ وە هەتا لاپەڕە: ٥٣٩).

١٥٢٦ – عنْ انس قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ يَنْظُرُ مَا صَنَعَ ابُو جَهْلٍ فَانْطَلَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَوَجَدَهُ قَدْ ضرَبَهُ ابْنَا عَفْرَاء حَتَّى بَرَدَ قَالَ االْتَ ابُو جَهْلٍ قَالَ فَاخَذ بِلِحْيَتِهِ قَالَ وَهَلْ فَوْقَ رَجُلٍ قَتَلْتُمُوهُ اوْ رَجُلٍ قَتَلَهُ قَوْمُهُ (الحديث: ٣٩٦٢ ، طرفاه في: ٣٩٦٣، ٤٠٢٠)[٢٩٣]

---

(٢٩٢) و الحديث من افراده (العيني/١٧ص٨٣) - المترجم .

(٢٩٣) قال العينى و اخرجه مسلم في المغازي (العيني /١٧ص٨٥ راجع صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٢ص١٥٩ - المترجم .

ئەنەس (رەزای خوودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوودای لێ بێ) فەرمووی: (کێ دەچێ بزانێ کە ئەبو جەهل ماوە یاکوژراوە؟) جا ئیبنو مەسعوود دەچێ، تەماشا دەکا وا دووکوڕەکەی عەفراء، کەناویان مەعازو موعەوویز بوو، بەشیر لێیان داوەو لە پەل‌و پۆیان خستووەو خەریکە سارد دەبێتەوەو دەمرێ، جا ئیبنو مەسعوود (رەزای خوودای لێ بێ) ڕیشی دەگرێ و پێی دەڵێ: تۆ ئەبو جەهلیت؟ دەڵێ: بەڵێ ئەوم جا چی تیایە، پیاوێ ئێوە بیکوژن، نەبۆ ئەو شوورەیی‌یەو نەبۆ ئێوە شانازییە، یا دەڵێ: چی تیادایە، پیاو هۆزی خۆی بیکوژێ، بەڵام خۆزیا پیاوێکی پیاوانە بیکوشتمایەو، بەدەستی وەرزێرو سەپان نەکوژرامایە، بە ئیبنومەسعوود دەڵێ لەوکاتەدا کەپێ دەنێتە سەر بۆتەقەی لاملی هەتا سەری لە لاشەی بکاتەوە لەو کاتەدا پێی دەڵێ: ئەی شوانە بچکۆلەی ڕان! ئەی بەرخەلەوان! چوویتە سەر جێگەیەکی بەرزی سەخت! دواتر ئیبنو مەسعوود هەندێ قسەی تری لەگەڵ دەکاو ئەوجا بە تەواوی دەیکوژێ و بەدۆزەخی شاد دەکاو، سەرەکەی لێ دەکاتەوەو دەیهێنێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوودای لێ بێ) (تاج/٢٠٨/٨ ز/٨٦ ف/١- کوشتنی ئەبو جەهل لە غەزای بەدردا) .

فەرمایشی دروست ئەوەیە، کە ئەم فەرموودەیە لەمور سەلی صەحابی نییە، چونکە گەرچی لە کاتی غەزای بەدردا ئەنەس منالکار بووە، بەلام مامۆستای عەینی دەفەرموێ: بەرشتیەکی دروست، لە ئەبو داوو دەوە دەگێڕنەوە: کە ئەنەس فەرموویەتی: (لە ڕۆژی غەزای بەدردا ئاوم دەگێرا بەسەر هاوڕێکانمەوە) .

١٥٢٧- عَنْ ابِي طَلْحَةَ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) انَّ نَبِيَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) امَرَ يَوْمَ بَدْرٍ باربَعَةٍ وَعِشْرِينَ رَجُلا مِنْ صَنَادِيدِ قُرَيْشٍ فَقُذِفُوا فِي طَوِيّ مِنْ اطوَاء بَدْرٍ خَبِيث مُخْبِث وَكَانَ اذا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ اقَامَ بالْعَرْصَةِ ثلاث لَيَالٍ فَلَمَّا كَانَ بِبَدْرٍ الْيَوْمَ الثالِث امَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَشُدَّ عَلَيْهَا رَحْلُهَا ثمَّ مَشَى وَاتَّبَعَهُ اصْحَابُهُ

وَقَالُوا: مَا نُرَى يَنْطَلِقُ الا لِبَعْض حَاجَتِهِ حَتَّى قَامَ عَلَى شَفَةِ الرَّكِيِّ فَجَعَلَ يُنَادِيهِمْ باسْمَائِهِمْ وَاسْمَاء ابائِهِمْ يَا فُلانُ بْنَ فُلان وَيَا فُلانُ بْنَ فُلان ايَسُرُّكُمْ انَّكُمْ اطعْتُمْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَانَّا قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا) قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تُكَلِّمُ مِنْ اجْسَادٍ لا ارْوَاحَ لَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا انْتُمْ باسْمَعَ لِمَا اقُولُ مِنْهُمْ) (الحديث: ٣٩٧٦)[٢٩٤].

**ئەبو طەلحە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) لە ڕۆژی بەدردا، فەرمانی فەرموو لاشەی بیست و چوارکەسیان لەگەورە پیاوانی قوڕەیش، کە لەغەزای بەدردا کوژرا بوون، برك دایە ناو بیرێ لەبیرەکانی بەدرەوە کە بەبەرد هەڵچنرابوون، بەڕاستی تابڵێی بیرێکی پیس و چەپەڵ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەستووری وابوو کە خودا سەری دەخست بەسەر هۆزێکا سێ شەو لەو مەیدانەدا، لەدەشتایی بەرمالان دا دەمایەوە، لە غەزای بەدریش دا لە ڕۆژی سێیەمی زاڵبوونی دا، فەرمانی فەرموو وشترەکەیان بۆ کۆپان کرد، ئەوسا سواربوو و ڕۆیست و، یارانی شوێنی کەوتن و گوتیان: ببێ و نەبێ بۆ کارێکی تایبەتی خۆی دەچێ، خەشەویست (دروودی خودای لێ بێ) سواربوو، ڕۆیشت هەتا چووە سەر لێواری بیرەکەو، لەوێ ڕاوەستاو دەستی کرد بە بانگ کردنی کافرە کوژراوەکانی ناو بیرەکەو یەکە یەکە ناوی خۆیان و بەناوی باوکیانەوە بانگی دەکردن و دەیفەرموو: (ئەی فیساری کوڕی فیسار! ئەی ئەوەو ئەی ئەوە! ئایا پەشیمانیتان حاسڵ کردو، ئێستا خۆزگە دەخوازن کە ئەم پەندەتان بەخۆتان نەدایە، وە لە دنیادا موسوڵمانان ببونایەو، لە فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا دەرنەچوونایەو، ئەم ڕۆژی ڕەشەتان بەسەرخۆتان نەهێنایە، دەی بزانن ئەوا ئێمە لە سایەی خواوە بە

---

(٢٩٤) اخرجه مسلم في الجنة وصفة نعيمها واهلها ، باب: عرض مقعد الميت من الجنة و النار عليه ، رقم: ٢٨٧٥ .

ئاواتی خۆمان گەیشتین و ئەو مژدەو بەڵێنەی کە خودای خۆمان وا دەی پێ دابووین دەستمان کەوت و بە چاوی خۆمان دیمان، دیارە ئێوەش بەتۆڵەی سەختی کاری بەدی خۆتان گەیشتوون و ئەو هەڕەشەو ئێش و ئازارەی کە خودا وادەی ئەوەی پێیتان دابوو، بەچاوی خۆتان دیتان، عومەر(رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قوربان! قسەی چی لەگەڵ جستەی بێ گیاندا دەکەی؟ فەرمووی: (بەو خودایەی کەرۆحی من واله دەستیدا، ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لەم قسانەی منە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ناتوانن وەلام بدەنەوە) (تاج/٨ ل/٢٠٠ ز/٨٤ ف/٦- باسی غەزای بەدر) .

١٥٢٨- عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ الزُّرَقِيِّ عَنْ ابِيهِ وَكَانَ ابُوهُ مِنْ اهْلِ بَدْرٍ قَالَ جَاء جِبْرِيلُ الَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ مَا تَعُدُّونَ اهْلَ بَدْرٍ فِيكُمْ قَالَ مِنْ افْضَلِ الْمُسْلِمِينَ اوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا قَالَ وَكَذلِكَ مَنْ شَهِدَ بَدْرًا مِنْ الْمَلائِكَةِ (الحديث: ٣٩٩٢، طرفه في: ٣٩٩٤)[٢٩٥] .

ریفاعەی کوڕی رافیعی زورەقی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جوبرائیل (سەلامی خوای لێ بێ) هاتەلای پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) پێی فەرموو: ئێوە لەناو خۆتانا ئەوانەی کە لە غەزای بەدردا بەشداری یان کردووە چی پایەیەکیان بۆ دادەنێن؟ فەرمووی (درودی خودای لێ بێ) (لە ڕیزی هەرەباشی موسوڵمانانیان حسێب دەکەین) یا خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) ووشەیەکی ئاوای فەرموو: جوبرائیلیش دەفەرموێ: (هەروەها ئێمەیش لەناو خۆماندا ئەو فریشتانەی کە بەشداری یان کردبێ لەم جەنگەدا، لە ڕیزی فریشتەهارە باشەکانیان دادەنێین!). (تاج/٨ ل/٢٠٢ ز/٨٥- گەورەیی پایەی یارانی بەشدار بوانی غەزای بەدرو ژمارەیان . ف- ١)

---

(٢٩٥) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث رفاعة بن رافع في فضل اهل بدر (فتح – خاتمة كتاب المغازي ج/٨ص١٥٤) - المترجم .

**تێبینی:**

بەسەرنجەوە ئەوەی کە لەتاجول ئوصول دا، لە بەرگی هەشتەم دا، لە لاپەڕە/٢٠٢دا، لەم جێگەیەدا نووسراوە هەتا لاپەڕە /٢٠٧ بفەرموو بخوێنەرەوە. بەڵام ئێستا سەرەڕای ئەو گلەیی یانەی کە لەوێ لەبارەی هەڵەی چاپییەوە کراوە، کۆمەڵێ هەڵەی گەورەتر لە چاپەمەنی کوردیدا پەیدا بووە، جاران برای چاپکار عەرەبی بەغدادیی بوو، چی نووسرابوو، ئەوەی چاپ دەکرد بەبێ زیادو کەم، بەڵام ئێستا چاپکار کوردە، هەر لەخۆیەوە بەبێ ئەهلیەت، دەقەکان دەگۆڕێ، دەسکاری شت دەکەن، لەوان وایە کەدانەر، یانووسەری خاوەنی کتێبەکە هەڵەی کردووە، کوردی نەزانیوە ئەوان بۆی ڕاست دەکەنەوە.

جا لەبەر ئەوەکە ئەم بەڕێزانە خۆیان لەدەقەکە تێناگەن، چونکە لە اختصاصی ئەوان نییە، هەر لە خۆیانەوە سلب دەکەن بە ایجاب و ڕەش دەکەن بەسپی . لە هەمووی سەیرتر دەسکاری نەظمی شعریش دەکەن، کەشتی وا کاریگەری لە کێش و سەرواى چامەو شیعرەکەش دەکا، بەڵام ئەوان هەڵە کە بەڕاست دادەنێن و ڕاستە کە بەهەڵە ﴿انا لله وانا الیهِ راجعون﴾ بەهەر حاڵ مەرج نییە کە لەمەدا هەموو کەس وابێ.

**١٥٢٩ – عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ يَوْمَ بَدْرٍ هَذا جِبْرِيلُ اخِذ بِرَاسِ فَرَسِهِ عَلَيْهِ ادَاةُ الْحَرْبِ (الحديث ٣٩٩٥ – طرفه في :٤٠٤١)[٢٩٦] .**

**ئیبنوعەباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: ڕۆژی بەدر پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (ئەوە جوبرائیلە، جڵەوی ئەسپەکەی خۆی گرتووەو، بەرگ وتفاقی جەنگی پۆشیوە). (تاج/٨ ل/٢١٣ ز/٨٧ ف/٤- باسی غەزای ئوحود).**

---

(٢٩٦) لم یوافقه مسلم علی تخریج حدیث ابن عباس : (هذا جبریل اخذ براس فرسه) (خاتمة کتاب المغازي ج/٨ص٥٠٤ ط . ج) —المترجم.

١٥٣٠- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ ابِيهِ عروة بن الزبير رحمه الله تعالى قَالَ: قَالَ الزُّبَيْرُ(رضيَ اللهُ عنهُ): (لَقِيتُ يَوْمَ بَدْرٍ عُبَيْدَةَ بْنَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ وَهُوَ مُدَجَّجٌ لا يُرَى مِنْهُ الا عَيْنَاهُ وَهُوَ يُكْنَى ابُو ذاتِ الْكَرِشِ، فَقَالَ: انَا ابُو ذاتِ الْكَرِشِ فَحَمَلْتُ عَلَيْهِ بالْعَنَزَةِ فَطعَنْتُهُ فِي عَيْنِهِ فَمَاتَ قَالَ هِشَامٌ: فَاخْبِرْتُ: انَّ الزُّبَيْرَ قَالَ: لَقَدْ وَضعْتُ رِجْلِي عَلَيْهِ ثمَّ تَمَطاتُ فَكَانَ الْجَهْدَ انْ نَزَعْتُهَا وَقَدْ انْثنى طرَفَاهَا قَالَ عُرْوَةُ: فَسَالَهُ ايَاهَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ) فَاعْطاهُ فَلَمَّا قُبِض رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ) اخَذهَا ثمَّ طلَبَهَا ابُو بَكْرٍ فَاعْطاهُ فَلَمَّا قُبِض ابُو بَكْرٍ سَالَهَا ايَاهُ عُمَرُ فَاعْطاهُ ايَاهَا فَلَمَّا قُبِض عُمَرُ اخَذهَا ثمَّ طلَبَهَا عُثمَانُ مِنْهُ فَاعْطاهُ ايَاهَا فَلَمَّا قُتِلَ عُثمَانُ وَقَعَتْ عِنْدَ ال عَلِيّ فَطلَبَهَا عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ الزُّبَيْرِ فَكَانَتْ عِنْدَهُ حَتّٰى قُتِلَ). (الحديث: ٣٩٩٨)[٢٩٧].

هێشامی کوڕی عوروە، لە باوکیەوە، کە عورووەی کوڕی زوبەیرە، (ڕەحمەتی خودای لێ بێ)، فەرمووی: زوبەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی جەنگی بەدر، تووشی عوبەیدەی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص بووم، بەرگی جەنگی پۆشی بوو، زریەو کلاوزریەی لە بەردا بوو، بەس هەردوو چاوی بەدەرەوە بوو، لەبەرچەك ئەندامی تری بەدەرەوە نەبوو، وەپێیان دەگوت: تەنگە قەوی، خۆی بۆ شانازی دەیگوت: من ئەو پاڵەوانەم کە ناوم دەرکردووە بە تەنگە قەوی (کێ خۆی بە ئازا دەزانێ بابێتە مەیدان بۆم) زوبەیر فەرمووی: جامنیش بەنێزەوە شالاوم بردەسەری و نێزەکەم کردبە چاویا و پێی مرد.

هیشام فەرمووی: هەواڵم پێ دراوە: کەزۆربەیر فەرموویەتی:(جا پێم نایە سەر تەرمەکەی و بەحوجەت خۆم ڕاپسکاندو هەوڵم دا کەنێزەکە دەربکێشم تاماندوو بووم ئەوسا بەجەخت دەرم هێنا لەکالانەی چاوی، وە ڕمەکە دوو نووکی هەبوو هەردوو نووکەکەی چەمابوونەوە، گیرابوون

(٢٩٧) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث الزبير في قتله عبيدة بن سعيد بن العاص (خاتمة كتاب المغازي فتح ج / ٨ ص١٥٤) - المترجم .

لەئەڵقەی زرێو شتی وا، عوروە فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) داوای ئەو نێزەیەی لە زوبەیر کردو لێیخواست، ئەویش پێی دا، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) مرد، زوبەیر نێزەکەی بردەوە، لەپاشا ئەبوبەکریش لێی خواست لە لای ئەویش بوو تامرد، دیسان زوبەیر نێزەکەی بردەوە، عومەریش هەروا، لە پاشا عوسمان داوای نێزەکەی لەزوبەیر دەکا و دەیداتێ، هەتا کاتێ عوسمان شەهید دەکرێ، ئیتر نێزەکە دەکەوێتە لای عەلی و کەسوکارەکەی، هەتا عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر داوای کردەوە و وەری گرتەوە، وەلە لای خۆی مایەوە هەتا شەهیدبوو.

١٥٣١- عَنْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذ (رضيَ الله عنها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَدَاةَ بُنِيَ عَلَيَ فَجَلَسَ عَلَىفِرَاشِي كَمَجْلِسِكَ مِنِّي وَجُوَيْرِيَاتٌ يَضرِبْنَ بالدُّفِّ يَنْدُبْنَ مَنْ قُتِلَ مِنْ ابائِهِنَّ يَوْمَ بَدْرٍ حَتَّى قَالَتْ جَارِيَةٌ وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاتَقُولِي هَكَذا وَقُولِي مَاكُنْتِ تَقُولِينَ (الحديث:٤٠٠١،طرفه في:٥١٤٧)[٢٩٨] .

روبەیعی کچی موعەوویز (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەچووم بە بووکی، بەیانی شەوی بووکێنیم، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەم بۆنەیەوە، بۆ پیرۆزی، تەشریفی هات بۆلام، لەم جێگەی تۆدا، ئەی خالیدی کوڕی زەکوان، وەك ئێستای تۆ لەسەر نوێنەکەی من دانیشت، چەند کەنیزەکێکمان هەبوون، دەستیان کردبە سۆزو دەف لێدان و ئەوانەی لە باوانم و لەباوانیان، لەڕۆژی بەدردا شەهید بوو بوون ئەوانەیان دەلاوانەوەو گۆرانییان پیادا هەڵ دەدان، هەتا یەکێکیان گوتی: پێغەمبەرێکی وامان تیاهەڵکەوتووە دەزانێ کە سبەی چی دەقەومێ! پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: کچێ! وامەڵێ، لە

---

(٢٩٨) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث الربيع بنت معوذ في الضرب بالدف فتح (خاتمة كتاب المغازي ج/٨ ص١٥٤) - المترجم .

پێش داچیت دەوت هەر لەو بابەتە بڵێ)، (تاج/٣ ل/٨٦ ز/٣٧ ف/١ - سوننەتە ژنهێنان بە ئاشکرابێ، وەشایی بۆبکرێ).

**ڕوونکردنەوە:**

١- روبەیعی کچی موعەوویز، یەکێکە لەهاوڕێکانی پێغەمبەر یەکێکە لەو ژنانە کە لە ژێر شەجەرەتی ریضوان (درەختی خۆشنوودی) دا بەیعەت و پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەردا بەست، جارێ لەماڵی خۆیا بەفەرمانی پێغەمبەر خۆی، ئاوی دەسنوێژی کرد بەدەستی پێغەمبەرا، لەبەر ئەوە ئیبنو عەباس چوو بۆ خزمەتی و لە بارەی چۆنیتی دەسنوێژ گرتنی پێغەمبەرەوە پرسیاری لێ کرد.

ڕێزێکی زۆری تایبەتی لەلای پێغەمبەر هەبوو، خۆشی ژنێکی شاژن بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا دەچوو بۆ غەزا، لەگەڵ چەند ژنێ تردا، ئاویان دەدا بەجەنگاوەرەکان و خزمەتیان دەکردن و زامداریان دەرمان دەکردو کوژراو وزامداریان دەبردەوە بۆ مەدینە، لەبوخاری نازداردا سێ فەرموودەی هەیە، ئەم زاتانە لە پەیڕەوان (تابیعین) فەقێی بوون، واتە گێڕانەوەی فەرموودەیان لەوەوە ئەنجام داوە: سلێمانی کوڕی یەسار وعبادی کوڕی وەلید و موحەممەدی کوڕی عەماری کوڕی یاسیرو کەسانیتریش. (بڕوانە: ژمارەك ١١٨٦- = بەرگی/١ ل/٣١٣).

٢- هۆی ئەوەی کە پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) ڕێگەی نەدا کەبڵێن: (پێغەمبەر غەیب دەزانێ وشت لە پێش ڕوودانی دا چۆن با دەیزانێ) هۆی ئەمە ئەوەبووە: کە نەبا بە اطراء (بڕوانە: ژمارە: ١٣٧٣ ت = ٣٤٤٥ فتح. لەم بەرگەدا) وەنەبێ بە پێ لێ هەڵبڕینی ناڕەوا، دەنا یەکێ لەموعجیزەکانی پێغەمبەر ئەوە بووە، کە هەواڵی لەغەیب داوەو چۆنیشی فەرمووە وا

دەرچووە: ( بڕوانە: تاج /٤ ل/٣٦٢ —٣٧٢ + ژمارە: ١٥٥١ تەجرید، کە لەدواوە لەم بەرگەدا دێت).

٣- چەند فەرموودەیی لەم بابەتە، سەبارەت بەگۆرانی و ئامێری ڕەوای ئاواز و لەهوی بریێ لەهەر بابەتێ بێ، وەك: جەژن گۆرانی، هەڵپەڕکێ، یاری بەچەك، پێشبڕکێ، مۆسیقا، شمشاڵ و بلوێر، شایی، لەسوونەتی ڕاست و دروست داهەیە. (بڕوانە: ژمارە: ١٣٥٦) وەلەبەر ئەوەی کە ئەم بابەتە زۆر گرنگە، وە زۆر بەزەقی لەسەر ئاستی جیهانی و لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی، سەری هەڵ داوە، وە بووە بە جۆرەکێشەیی، بەتایبەتی بۆ کۆمەڵەی لاوان، لەهەردوو ڕەگەزی نێرو مێ.

وەخۆدزینەوە لەدۆزینەوەی چارەسەری ئایینیو کۆمەلایەتی بۆ ئەم جۆرە کێشانە خۆدزینەوەیە لەئەرکی ئایینی سەرشانی زانایانی موسوڵمانان ، وە لەبەر ئەوەی ئەم بابەتانە لەکۆن دا، زانایانی مەزهەبەکان، بەدوورودرێژی لێیان کۆلیونەتەوە، وە فەتوای جۆراو جۆریان لە بارەیانەوە دەر کردووە، وەبە پێی سەردەم و چاخ و کاتی ئەوان ئەو فەتوایانە برەودا و کاریگەربوون، ڕای ئیمامی نەوەوی سەبارەت بەچەند جۆرێکی گۆرانی و ئامێری ڕابواردن و گوێگرتن لەمانە، لەبەرگی چوارەمی مغنی المحتاج دا، لەسەر باسی (کتاب الشهادات) یدا، لە لاپەڕە (٤٢٨) دا تۆمار کراوە. وە پێشەوا غەزالی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە (احیاء علوم الدین) دا، لە بەرگی دووەمدا، لە لاپەڕە: ٢٣٦دا، لەسەرباسی (کتاب اداب السماع والوجد) دا، باسێکی زۆر جوان و لەباری لەم بابەتانە نووسیوە، هەتا لاپەڕە: ٢٦٩ لەبەر ڕووناکی ئەمانە هەموو ئەم لێکۆڵینەوەیە دەنووسم: لەڕاستیدا گەرچی زۆرینەی بابەتەکان راجیایی جۆراو جۆری بەهێزیان واتیادا، کە لە بازنەی تەحریم و اباحەو کراهەو حەلالدا دەخولێنەوە، بەلام لەبارترینیان بۆ ئەمڕۆی ئیمە، فەتوای ئیمامی غەزالیە، جاوا بەندەیش بۆ سوودی گشتی، بەپێی توانای سنوورداری خۆم، چەند سەرنجێ لەم بارەیەوە دەردەبڕم:

ا/ پێشەکی تکام وایە لەخەمخۆرانی پسپۆڕانی ئەم بابەتە بەوردی فەتوا و بۆچوونەکانی ئیمامی غەزالی لەم شوێنەدا، لە (احیاء العلوم) دا رەچاو بکەن و بەهرەو سوودی بەکردەوە لێ وەربگرن بۆ بەرژەوەندی گشتی .

ب/ پاش ئەمە، بەبێ گومان زۆر لەگۆرانی و هۆکارەکانی بەزم و ڕەزم، بەتایبەتی ئەوانەی کە ئەمڕۆ باون، بەبێ گومان حەرامن و بەرمەنگووقی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە دەکەون: ﴿ومن الناس من يشتري لهوَ الحديث لِيُضلَّ عن سبيل الله بغير علم ويتخذها هُزوا﴾ - لوقمان/٣١- ٦.

ج/ بەڵام دەبێ ئەوەشمان لەبەر چاوبێ، کە دنیا گۆڕاوە، ئەو خەڵکە بمانەوێ و نەمانەوێ، پریشکی مەدەنییەت و عەلمانیەت و ماددیەت دەیانگرێتەوە، وەزۆرینەیخەڵك، بەتایبەتی کۆمەڵەی لاوان، چ نێر، چ مێ، تێکەڵی کۆمەڵگای خۆیان دەبن، خوو و عادات ورەفتارو نەریتی ئەوان دەگرن، وە ئەوەی کە لەبەرچاوە ئەم کۆمەڵگا بەناو شارستانی یانە بەگەندەڵێ و بەربەرەلایی و بێ دینی گۆشکراون، وە بەئاشکرا هەوڵی (حيونة الانسان)یان تیادەدرێ، بەتایبەتی لەڕووی تێرکردنی ئارەزووی نێرو مێییەوە! وەزۆرینەی کاتیش مەردوم بەهەموچین و توێژو گووروپەکانیانەوە لەفەراغا دەژین و کاتێکی زۆریان هەیە کە بێ ئیش وکارن و موستەهدەفن بۆ ئەوە: کەببن بە بەندو داوی لایەنە نەیارەکانی ئایینەوە، وەلەم ڕۆژگارەی ئێمەدا کۆمەڵگا نائاپینی یەکان، ئەو بۆشاییە، بەگۆرانیو مۆسیقاو بەزم ورەزم و سەماو هەڵپەرکێ وەمەی و بادەو یارو وازی و وەرزش و شتی تری وا پڕ دەکەنەوە، وە نەوەك دەربەستی ئەوەنین، بەڵکوو زۆر مەبەستیانە، لە زۆرینەی کات، ئەم جۆرە (لهو)و لەعبە، سەربکێشێ بۆ ڕەفتاری گەندەڵ و گەندەڵی کۆمەڵ، وەئەو حمایەو پاراستن و بەرگرییەی ئەمڕۆ بەناوی سەربەستی وئازادی و شارستانیەتەوە، لەتاوانی ڕەوشتی و، لەبەربەرەلایی نێرومێیی دەکرێ، مەگەر لەکورسی و ڕژێمی دیکتاتۆرەکان بکرا!

د/ جا کاتێ تەماشای هۆو بایستی قەدەغەکردن و نادروست بوونی گۆرانی وبیستن و مۆسیقاو ئامێرەکانی ئەم جۆرە بابەتانە دەکەین، دەبینین دەگەڕێنەوە، بۆ چەندشتێ، کە گرنگترینیان ئەم دووشتەیە: یەکەم: دڵ تووشی بێ ئاگایی و ئاژەڵی و لەخوا دووری دەکەن .دووەم: ئەوانەی کە گۆرانی و شتی وا دەڵێن و ئامێرەکانی مۆسیقاو ڕابواردن بەکاردەهێنن، مرۆڤی پایە نزمن، لەناو کۆمەڵ دا بەچاوی سووک تەماشا دەکرێن، وەزۆرینەی ئامێرەکانیش تایبەتن بە بەدکارو شەلاتی ولۆتی و چەقەنەبازو سەرسەرییەکانەوە.

ه/ بەڵام پاش ئەم پێشەکییە، دەڵێم:

١- مەرج نییە کە هەموو جۆرێ لە گۆرانیو ئاواز سەربکێشێ بۆ دڵڕەقیو بێ ئاگایی لەخوا، بگرە هەیانە دڵ نەرم دەکا، مرۆڤ لە خواوە نزیک دەکاتەوە، وەك غەزالی دەفەرموێ.

٢- ئێستا مۆزیك و مۆسیقارومۆسیقاژەن و گۆرانیبێژو ئاواز سازو ئەمانە، وەك کۆن نەماون، لەناو کۆمەڵگەدا ڕێزی تایبەتیان هەیە، وە دەرچووی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان و زانستگا بەرزەکانن، وەخەڵك بەچاوی ڕێزەوە تەماشایان دەکەن، بگرە زۆر لە ئەهلی دین، لەلای کاربەدەستان و پاشاو سەرۆکەکانمان خۆشەویست ترن هەمیشە پێشوازییان لێدەکەن و خەلات و دیاری و دەسەنەی شایانیان پێ دەبەخشن! وەك وتراوە: قەل وا قەل و کۆتر وا کۆتر وەکی تریش هەیانە نوێژ دەکەن، ڕۆژوو دەگرن، حەج دەکەن، خێردەکەن، ئەندامێکی کارای بەڕێزی کۆمەڵگای خۆیانن.

٣- جا پاش ئەم ڕێگە خۆشکردنە، بە استناد لەسەر ڕاوفەتوای ئیمامی غەزالی، بەدڵنیایەوە دەڵێم:

(کورت و پۆخت، بەکوردی پەتی: ئەرکی ئایینی سەرشانی هەموو خەمخۆران و پسپۆڕانی ڕاگەیاندنی ئایینییە، لەهۆیکی بەرێ پێشکەش بکرێ، بەکۆمەڵگای موسوڵمانان، بەتایبەتی بەجەماوەری لاوان، بەکوڕو

کــچيانەوە، هەتالايەنــە نــەيارەکان لەمــەزياتر نەيانقۆزنــەوەو، زيــاتريش لەخـشته يـان نەبـەن! ئـيتر ئـەو (لهـوه بەريئـە)خـواى گـۆرانى بـێ، خـواه سروودبێ، وەچ وەرزش و يارىو نمايشو شانۆگەرىو شـتى تـرى وابـێ قەيـديى نييـە و دروسـتەو، بـەپێى نيـازو نيـەتى خـاوەنى بـۆى دەبـێ بـەهۆى پاداشـى باشى لاى خواى گەروەو ميهرەبان و دانـاو زانـا و ڕەحـيم وەرەحمـان تەنانـەت ئەگـەر ئـامێرى دەنگـى و دەنگـى ژن و مـێ يينـە يـشى تيـادابێ، بەمـەرجێ لەسنورى شەرم و شكۆ دابێ، نادروست نييەو هەر هيچ نەبێ بەر ئەو ئەصڵە ئوصووڵىيە دەكەوێ كە دەفەرموێ: (ناچارى حەرام حەلاڵ دەكا).

يادەفـەرموێ (خۆتـان باشـتر لـەكاروبارى دنياتـان دەزانـن) چـونكە بەڕاستى كارى نەكردە نىيە، كە تـۆ هـەر لەبەيانىيـەوە هـەتا نيـوە شـەو، لـە كەناڵەكانى ڕاگەياندنەوە، هەرباسـى دۆزەخ و قـەبر و بڤـەو دووكـەڵ و ئـاگرو خەم و خەفەت و باوكەڕۆيان بۆ بكەى!) بڕوانە: رياض/٢ ل/٢١٩ ز/٩١- ژمـارە: ٦٩٩/١ .

ئيمـامى غـەزالى (رەحمـەتى خـوداى لـێ بـێ) لەمــەعرەزى باسـى ڕەوا بـوونى گوێگرتن لەگۆرانى و مۆسيقا، لەسنوورى شـەرعا، دەفـەرموێ: (... وقـد فعـل ذلك كثير مـن الـسلف الـصالح، صـحابي و تـابعي باحـسان... وقـال: ولم يـزل الحجازيّون عندنا بمكة يسمعون السماع في افضل ايّام السّنة وهي الايام المعدودات التي امر الله عباده فيها بذكره كايام التشريق ، ولم يزل اهل المدينة مواظبين كاهـل مكة على السّماع الى زماننا هذا ، فادركنا ابا مروان القاضي وله جواري يُسْمِعن الناس التلحين قد اعدهنَّ للصوفية) وقال الغـزاي: وقـال ابوطالـب المكـى ايـضا: (وكان لعطاء جاريتان تلحنان، فكان اخوانه يستمعون اليهما).

وەلحاصل ئيمامى غەزالى (رەحمەتى خوداى لێ بێ) بەعـەقڵ و بەنـەقڵ ئيـسپاتى دەكا كە گۆرانى و دەنگى خۆش و ئاواز و هۆرەو گوێگرتن و ئەم جۆرە شـتانە موبـاح وڕەوان، مەگـەر دەقـێ تايبـەتى هـەبا لەسـەر حـەرامى ئـەو ئـامێرى

مۆسیقایه، یاخود ئەو ئەوازو گۆرانی و دەنگەخۆشە سەربکێشێ بۆ ئاژاوەو فیتنەو ببێ بەبەریدی بێ ڕەوشتی وبێ دینی، دەناڕەوایە وبیستنی دروستە، وەئیمامی غەزالی بۆڕەوا بوونی ئەم بابەتە بەدەق دەفەرموێ:

١- (... بطل القول بتحريمه، وبقي فعلا لاحرج فيه كسائر المباحات، ولايدلّ على تحريم السّماع نصٌّ ولاقياسٌ...).

٢- (قال النبيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) في مدح ابي موسى الاشعري: لَقَدْ اعطي مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ الِ دَاوُدَ) وقول الله تعالى: ﴿انّ انكر الاصواتِ لصوتُ الحمير﴾ يدلّ بمفهومه على مدح الصوت الحسن !

٣- ولم يزل الحداء من وراء الجِمَال من عادة العرب في زمان رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وزمان الصحابة (رَضيَ اللهُ عنهُم) وماهو الا اشعار تُؤدّى باصوات طيّبة والحانٍ موزونة ولم ينقلْ عن احدٍ من الصّحابة انكاره، بلْ ربّما يلتمسون ذلك، تارة لتحريك الجِمَال وتارة للالتزاز....)

٤- (السّماع في اوقات السرور....مباح، ان كان ذلك السّرور مباحا ، كالغناء في ايام العيد و في العرس وفي وقت قدوم الغائب وفي وقت الوليمة والعقيقة وعند ولادة المولود وعند ختانه وعند حفظه القران العزيز، وكلّ ذلك مباحٌ لاجل اظهار السرور به ، ووجه جوازه انّ من الالحان مايثير الفرح و السّرور و الطرب فكلّ ما جاز السرور به جاز اثارة السّرور فيه، ويدلّ على هذا منْ النقل انشاد النساء على السّطوح بالدّف والالحان عند قدوم رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):

**طلع البدر علينا من ثنيات الوداع      وجب الشكر علينا مادعا لله داع)**

٥- (فهذه المقاييس و النّصوص تدل على اباحة الغناء و الرقصِ و الضرب بالدّف و اللعب بالدرق و الحراب و النظر الى رقص الحبشة و الزنوج في اوقات السّرور كلّها قياسا على يوم العيد...).

٦- بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتی لەهوی بەریئە بڕوانە: ( فیقهی ئاسان/٢ ل- ٦٤٤) + (بەرگی/ ٣ ل/٩٤٣ هەتا ٩٤٨ + ل/٩٩٢) + (تەجرید بەرگی/ ١ ل/٨٧ ژ: ٦١، ژ: ٢٦٤ ل/٢٧٤ ، ژ: ٢٦٩ = ل/٢٧٨، ژ: ٢٧٧ ل/٢٨٥ ، ٢٧٨ ل/٢٨٦، ژ: ٥٠٩ ل/٤٨٤، ژمارە: ٤٩٨ ل/٤٧٦ + بەرگی/٢ ل/٢٨٧ ژمارە: ٩٠٥ + بەرگی/٣ ل/١٣٥ ژمارە: ١٠٤٣ + ژمارە: ١٥٦٨ تەجرید = ٤١٩٦ فتح واطرفه + رقم: ٣٢- باب هل تكسَرُ الدنان... فتح رقم: ٢٤٧٧ ).

٧- لە فەتحولباریش دا زۆر شتم وەبەرچاو کەوتووە لەم بارەیەوە، وەك ئەم فەرموودانە و ئەگرافەکانیان، لە فەرموودەی ژمارە: (٦١٤٧)دا، لە شەرحەکەدا، دەفەرموێ: (ومانعه اي الحداء محجوج بالاحاديث الصحيحة، ويلحق بالحداء الحجيج المشتمل على التشوق الى الحج بذكر الكعبة و غيرها من المشاهد ، ونظيره ما يحرض اهل الجهاد على القتال ، ومنه غناء المراة لتسكين الولد في المهد) .

٨- بڕوانە: تاج الاصول بەرگی دووەم ص١٠٣ مبحث اعلان النكاح واللهو فيه هەتا ص٣٠٨+ بەرگی/٣ ل- ٨٥ ز- ٣٦، ز- ٣٧، ز- ٣٨، ز- ٣٩، ز- ٤٠، ز- ٤١، ز- ٤٢.

٩- سەرەنجی ئەم فەرموودەیەی بوخاری بفەرموون، کەدانەری تاجول ئوصوول (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەبەرگی/٢ص/٣٠١دا راگوێزی دەکا:

عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنها) انَّهَا زَفّتْ امْرَاةً الَى رَجُلٍ مِنْ الانْصار فَقَالَ نَبِيُّ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَا عَائِشَةُ مَا كَانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ فَانَّ الانْصار يُعْجِبُهُمْ اللّهْوُ. رواهُ البخاري و احمد . وفي رواية منقولة في الشرح ج/٢/ص١٠٣ :

فهلْ بعثتم جاريةً تضربُ بالّدفّ وتغنّي؟ قالتْ: ماذا تقولُ يارسول الله؟ قال: تقولُ:

اتيناكم اتيناكمْ فحيّانا وحيّاكم

ولولا الذهبُ الاحمر ماحلّتْ بواديكم

ولولا الحنطة السّمراء ما سمنتْ عذاريكم .

١٠- واباشــه بەرنامــەی ئــەفلام كـارتۆنی خـۆش و پـەڕاوی مەتــەڵ و داستانی منالانەی سەرنج ڕاكێش، پێشكەش بەمنالان بكرێ و موتوربـه بكـرێ بەداسـتان و چـیرۆك و پەنـدی پێـشینان هـەتا بـبن بـەهۆی شـیرن كـردن و خۆشویـستكردنی خـواو پێغەمبـەرو ئـایینی ئیـسلامی پـیرۆز لـە بەرچـاوی منالان، چونكه هەر زانستێكی جوان له دڵ و دەروونـی منـالا چەسـپ بـوو، وه جێـی خـۆی گـرت، وەك نەخشی بـەرد وایـه، هـەتا هەتایـه دەمێنـیٚ و سوودو كەڵكی دەبیٚ.

مەبەسـتی بەنـده خزمـەتی ئـایینی ئیـسلامی پـیرۆزه، نـەك پەخـشی هـەواو هـەوەس. بیـستوومەله مامۆسـتاكانی خـۆم دەیـان فـەرموو: لـەپاش جـەنگی جیهـانی یەكـەم، كـاتیٚ سـوپای انگلیـز، بەنـدەری بەصـرەی گـرت، مامۆستا مەلا حوسـەینی پیسكەندی بەمـەلاكانی شاری سلێمانی دەفـەرموێ: مەلاینـە! زوو یـا درەنـگ ئەمانـە دەگەنـە ئێـرەیش، ومبـەبیٚ گومـان بـۆ ساردكردنەوەی ئێمه لەدین و نیشتمانمان، جۆرەها پڕوپاگەنـدەی زەهراویمـان له دژدەكەن، یەكیٚ لەو بابەتانه باسی خولانەوەی زەوییه بەدەوری خـۆی داو، چۆنێتی ڕوودانی دیاردەی خۆر گیران و مانـگ گیران و زۆر دیـاردەی تـری لـەم بابەتانه، كـه لەكتێبـەكانی خۆمانـدا، بەچـەند شێوەیێی باسـیان لێكراوه، جا ئەگـەر شـتیٚ لـەم بابەتانـه ڕووی دا، مەپەشـۆكێن و واز لـەو درۆ ودەلەسـانه بهێنن كەوان لـه (دقائق الاخبـار) و (نزهـة النـاظرين) و ريوايەتـه لاوازەكـانی خـازینو حـەیاتی حـەیوان و عەصفوری یـەو ئەمانـەدا، بـەڵكوو بڵـێن: لـه (تشريح الافلاك) و لـه (اسطرلاب) و لـه (تهـذيب الكلام)ی ئێمـەش دا هـەروا دەڵیٚ و بەدوو رو درێژی و زۆربه وردی باسـی ئـەم جۆره دیاردانـەكراوه، ئـەم زانستانه ئێوه له ئێمەتان دزیوەو كردووتانه بەهی خۆتان!) .

كـاتیٚ مامۆسـتا مـەلا حوسـیەینی پیـسكەندی ئـەم قـسه جوانـەو ئـەم وەلامه دەمكوته، پێشنیار دەكا بۆ مەلاكان، بـۆ ئـەو قۆناغـه، مـەلاكان بەیـەك

دەنگ دەڵێن: (پەکوو لەم حەلاماتەی!! ئینگلیز هێشتا لە فاوە، مەلاحوسەین هەر لە ئێستاوە لێرەوە چووتەسەر دینەکەی!) .

جا ئازیزان بەخوا، نە ماموٚستا مەلاحوسەین، نەمن، نەچووینەتە سەردینی ئەوان و نەدەچین، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین، کە هەرکات و سەردەمێ، اعلام و ڕاگەیاندنی خۆی هەیە، کە دەبێ پسپۆڕانی دڵسۆز ڕەنگرێژی بکەن و سەرپەرشتی بکەن، چونکە موخاتەبەی خەڵکی سەدەی بیست و یەکەم، بەهەمان شێوەو ئامێرو شێوازی سەدەی بیستەم، وەك ئەوە وایە لەم سەدەیەدا بەهۆکارەکانی گواستنەوەی سەدەی پێشوو، لە نێوان شارو ولاتان دا هاتو چۆ بکەی!

**نوری فارس حەمە خان**

١٥٣٢- عنْ ابِي طَلْحَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) صَاحِبُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انَّهُ قَالَ: (لا تَدْخُلُ الْمَلائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلا صُورَةٌ يُرِيدُ التَّمَاثِيلَ الَّتِي فِيهَا الارْوَاحُ). (الحديث: ٤٠٠٢، اطرافه في: ٣٢٢٥، ٣٢٢٦، ٣٣٢٢، ٥٩٤٩، ٥٩٥٨)[٢٩٩].

ئەبوطەلحە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (فریشتە ناچنە ناو ماڵا سەگ و وێنەی تیادا بێ، یایەکێ لەم دووەی تیادابا) مەبەستی وێنەی ئەو پەیکەرانەیە کە ڕۆحیان واتیادا. (بڕوانە: ژمارە: ٩٥٥ تەجرید).

١٥٣٣- عنْ عَبْدَ اللّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) قالَ: تَأيَمَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنها) مِنْ خُنَيْسِ بْنِ حُذافَةَ السَّهْمِيِّ وَكَانَ مِنْ اصْحَابِ رَسُولِ اللّهِ

(٢٩٩) قال العيني: (واخرجه مسلم في اللباس- عيني /١٥ص١٣٩) (راجع صحيح مسلم بشرح النووي (ج/١٤ص٨٤)- المترجم .

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ شَهِدَ بَدْرًا تُوُفِّيَ بِالْمَدِينَةِ قَالَ عُمَرُ فَلَقِيتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَفْصَةَ فَقُلْتُ انْ شِئْتَ انْكَحْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ قَالَ سَانْظُرُ فِي امْرِي فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ فَقَالَ: قَدْ بَدَا لِي انْ لا اتَزَوَّجَ يَوْمِي هَذَا قَالَ عُمَرُ فَلَقِيتُ ابا بَكْرٍ فَقُلْتُ: انْ شِئْتَ انْكَحْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ فَصَمَتَ ابُو بَكْرٍ فَلَمْ يَرْجِعْ الَيَّ شَيْئًا فَكُنْتُ عَلَيْهِ اوْجَدَ مِنِّي عَلَى عُثْمَانَ فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ ثمَّ خَطَبَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَانْكَحْتُهَا ايَاهُ فَلَقِيَنِي ابُو بَكْرٍ فَقَالَ: لَعَلَّكَ وَجَدْتَ عَلَيَّ حِينَ عَرَضْتَ عَلَيَّ حَفْصَةَ فَلَمْ ارْجِعْ الَيْكَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: فَانَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي انْ ارْجِعَ الَيْكَ فِيمَا عَرَضْتَ الا انِّي قَدْ عَلِمْتُ انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ ذَكَرَهَا فَلَمْ اكُنْ لافْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَوْ تَرَكَهَا لَقَبِلْتُهَا). (الحديث: ٤٠٠٥، اطرافه في: ٥١٢٢، ٥١٢٩، ٥١٤٥)[٣٠٠]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خونەیسی کوڕی حوزافەی ئەل سەهمی، کە یەکێك بوو لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لە مەدینە مرد، وە حەفصەی ژنی کە کچی عومەر بوو بێوەژن کەوت، عومەر(رەزای خودای لێ بێ) دەیگوت: گەیشتم بە عوسمانی کوڕی عەففان، حەفصەم پێشکەش کرد، پێم گوت: ئەگەر حەزدەکەی حەفصەی کچمت لێ مارە دەکەم، فەرمووی: با بیرێ لە کاری خۆم بکەمەوە، ئەو ساوەلامت دەدەمەوە، جا لەپاش چەند شەوێ عوسمانم پێ گەیشت، گوتی: وابە باشی دەزانم کە ئێستا ژن نەهێنم. جا ئەبوبەکری صەدیقم بینی، چیم گوت بە عوسمان ئەوەیشم بەو گوت ئەبوبەکر بێ دەنگ بوو، قسەی نەکرد، جا منیش لەدڵی خۆمەوە لەئەبوبەکر زیاتر دلگیر بووم تاعوسمان.

هەتا چەند ڕۆژێکی پێچوو، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) داخوازی حەفصەی کرد بۆخۆی، منیش مارەم بڕی لێی، ئەنجا ئەبو بەکرم بینی، فەرمووی: ڕەنگە دلگیر بووبیت لێم لەسەر ئەوەکە حەفصەت

(٣٠٠) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح- خاتمة كتاب المغازي ج/٨ص١٥٤) - المترجم .

پێشکەش کردپێم و من وەلامم نەدایتەوە؟ منیش گوتم: بەڵێ وایە، فەرمووی: دەسا من لەبەر ئەوە وەلامم نەدایتەوە بۆ ئەو مەسەلەیە چونکە دەمزانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەتەمایەتی، خۆ ئەیش دەبوو کە نهێنی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئاشکرابکەم، ئەگینا من لە دڵی خۆمەوە بە تەمابووم ئەگەر ئەونەیەوێ من بۆخۆم بیخوازم (بڕوانە: ریاض الصالحین، بەرگی دووەم ل- ٢٠٢ فەرموودەی ژمارە: ٢/ ٦٦٨ )، (تاج/ ٣ ل –٦٤ ز – ٢٨- دروستە ژن پێشکەش بکرێ بە پیاوی باش) .

١٥٣٤– عَنْ ابِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الايَتَانِ مِنْ اخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَاهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ (الحديث: ٤٠٠٨، اطرافه في:٥٠٠٨، ٥٠٠٩، ٥٠٤٠، ٥٠٥١ )[٣٠١] .

ئەبو مەسعوودی بەدری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بەشەو دوو ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی بەقەرەبخوێنێ ئەو شەوە ئەوەی بەسە). (تاج/٥- ش/ د/ ت ل- ٣٠٣ ف- ٥ز- ٨٢+ ریاض/ بەرگی / ٣ لاپەڕە : ٨١٧ ژ: ٩ زنجیرەی ١٨٣ .

**ڕوونکردنەوە:**

ئەمە دوو ئایەتەکەن: ﴿ امَنَ الرَّسُولُ بِمَا انزِلَ الَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ امَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ احَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا: سَمِعْنَا وَاطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَالَيْكَ الْمَصِيرُ۝ لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا الا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا انْ نَسِينَا اوْ اخْطانَا رَبَّنَا وَلا تَحْمِلْ عَلَيْنَا اصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلا تُحَمِّلْنَا مَا لا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا انْتَ مَوْلانَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾ .

---

(٣٠١) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب:فضل الفاتحة وخواتيم سورة البقرة، رقم: ٨٠٧ .

واتـه: هەركەسێ بـه شـەو بيكا بـه عـادەت ئـەم دوو ئايەتـه بـه نيـازى پاراستن بخوێنێ، خوا له شەڕى ئەو شەوە دەيپارێزێ.

**تێبينى:**

تەخريجى فەرموودەكان له موسليم داو، ئاماژە كـردن بـۆ ئـەو باسـانەى كـەوان تيـادا لـه موسـليم دا، باشـترين ئامـاژەو بەڵگـەن بـۆ دەسـتدانى ئـەم فەرموودانه بۆ ئەو سەرباسانەيش (بڕوانە: ژمارە: ٥١ه = ٥٥ف =/١ل- ٧٧).

١٥٣٥- عَنْ الْمِقْدَاد بْن عَمْرٍو الْكِنْدِيَ وَكَانَ حَلِيفًا لِبَنِي زُهْرَةَ وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ارَايْـتَ انْ لَقِيـتُ رَجُـلا مِـنْ الْكُفَّـارِ فَاقْتَتَلْنَـا فَـضرَبَ احْـدَى يَـدَيَّ بالسَّيْفِ فَقَطَعَهَا ثُمَّ لاذَ مِنِّي بِشَجَرَةٍ فَقَالَ: اسْلَمْتُ لِلَّهِ اقْتُلُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ بَعْدَ انْ قَالَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لا تَقْتُلْهُ فَقَالَ: يَا رَسُـولَ اللَّـهِ انَّـهُ قَطَعَ احْدَى يَدَيَّ ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ بَعْدَ مَا قَطَعَهَا فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): لا تَقْتُلْهُ فَانْ قَتَلْتَهُ فَانَّهُ بِمَنْزِلَتِكَ قَبْلَ انْ تَقْتُلَهُ وَانَّكَ بِمَنْزِلَتِـهِ قَبْـلَ انْ يَقُـولَ كَلِمَتَهُ الَّتِي قَالَ. (الحديث: ٤٠١٩، طرفه في: ٦٨٦٥)[٣٠٢].

ميقـدادى كـوڕى عـەمرى ئـەل كينـدى (رەزاى خوداى لێ بێ) كـه سـوێندخوار (حەليـف)ى هۆزى بەنى زوهرەبوو، وەله خزمەت پێغەمبەرا (دروودى خوداى لێ بێ) ئامادەى جەنگى بەدر بوو بوو، فەرمووى: عەرزى خۆشەويستم كرد: قوربـان! ئـه ى پێغەمبـەرى خـودا! پـێم بفـەرموو: ئەگـەر تووشـى كابرايـەكى بێبـڕوا (كـافر)بـووم و چـووين بەگـژ يـەكا، بەشمـشێرداى لەدەسـتێكم وە دەسـتى پەڕانـدم و ئـەنجا خـۆى لـێم دايـه پـاڵ درەختێـك (ياشـتێ وا)و گـوتى: ئـەوا موسوڵمان بووم و باوەڕم هێنا بەخودا، جا ئايا له پاش گوتنى ئەم وشەيە، لـه هەل و مەرجێكى واوايىدا بيكوژم يانا؟ پێغەمبەر (دروودى خوداى لێ بێ) فـەرمووى

---

(٣٠٢) اخرجه مسلم في الايمان ، باب: تحريم قتل الكافر بعد ان قال: لااله الا الله ، رقم: ٩٥ .

(مەیكوژە) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو پاش ئەوەی كە دەستێكی پەڕاندووم ئەوجا وا دەڵێ؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: مەیكوژە، خۆ ئەگەر بیكوژیت، ئەوە ئەو دەچێتە پایەی تۆ بەر لە وەی كە ئەو بكوژیت و وەك ئەو كاتەی تۆ، ڕشتنی خوێنی حەرام و ناڕەوا دەبێ، وە تۆیش دەچێتە پایەی ئەو، بەر لەوەی كە موسوڵمان ببا و، وەك ئەوكاتەی ئەو ڕشتنی خوێنت حەلاڵ دەبێ، بەلاّم لەبەر شلۆقی هەڵوێست بەهانەت هەیەو تۆڵەت لێ ناسێنرێ). (ت/- ٨ ل/١١٥ ف/٤ ز/٤٣ - خەبات و غەزالە بنەڕەتدا دەبێ لەبەر ڕەزای خودابێ).

مەبەستی سەرەكی لەم فەرموودەیە ئەوەیە: (كوشتنی كەسێ وشەی شایەتمان بڵێ و بەدیمەن موسوڵمان بێ، تاوانێكی گەلێ گەورەیە، هەركەسێ تاوانی وا گەورە ئەنجام بدا خۆی لە كوفرو بێبڕوایی نزیك دەكاتەوە) ژینامەی میقداد لە دوا ئەم فەرموودەی ترەوە دێت.

دەنا بە هیچ جۆرێ مەبەست ئەوە نییە، كە لەكاتی شەڕدا، موسوڵمان بە فڕو فێڵی جەنگی كافران تەفرەبخوات، چونكە جەنگ خۆی فڕو فێڵ و تەفرەدان و هەڵخەڵەتانە!) بڕوانە: ژمارە: ١٥٨١ تجريد كە لەم بەرگەدا لە دواوە دا .

١٥٣٦- عَنْ جُبَيْر بن مطعم (رَضيَ اللهُ عنهُ): (انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ فِي اسَارَى بَدْرٍ: لَوْ كَانَ الْمُطعِمُ بْنُ عَدِيّ حَيًّا ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هَؤُلاء النَّتْنَى لَتَرَكْتُهُمْ لَهُ)، (الحديث: ٤٠٢٤، اطرافه في:٧٦٥، ٣٠٥٠، ٤٠٢٣، ٤٨٥٤ )[٣٠٣] .

جوبەیری كوڕی موطعیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی دیلەكانی بەدرەوە ، پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی:(ئەگەر موطعیمی كوڕی عەدی

(٣٠٣) انظر هامش رقم: ٤١٦ ت = ٧٦٥ ف= بەرطی یەكەم ل- ٤٠٠ - المترجم .

ئێستا زیندوو بوایەو لەبارەی ئەم بۆگەنانەوە، تکای لێبکردمایەو، داوای لێ بکردمایە کە بە خۆڕایی، بەبێ سەرانە بەریان بدەم، تکا کەم دەگرت و بەبەلاش بەرم دەدان).

## ڕوونکردنەوەو هێنانەوەی تەرم لە دوورە وڵاتەوە:

١- هۆی هاتنی ئەم فەرموودەیە ئەوەبوو، موطعیم گەرچی بە ناموسوڵمانیش مردووە، زۆر باش بووە بۆ پێغەمبەرو هەڵوێستی لەگەڵ ئیسلام دا زۆرمەردانە بووە،موتعیم لەتەمەنی نەوەدبەرەو ژوورتردا، لەپێش ڕووداویبەدردا مردووە.

٢- میقدادی کوڕی عەمری کیندی، کە میقدادی کوڕی ئەسوەدیشی پێ دەگوترێ (رەزای خودای لێ بێ) ، یەکێکە لە ناو دارە فرەباشەکانییارانی پێغەمبەر، پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) داینـاوە بەیەکێ لە وەزیرە بە ڕێزەکانی خۆی، میقداد ئامادەی ئازاد کردنی میصربووە، وە لەوێش مردووە، بەڵام لەوێوە، تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ مەدینە، لەمەدینە ناشتیان، حەزرەتی عوسمان نوێژی مردووی لە سەری کرد، لەساڵی سیو سێی کۆچیدا بوو. دوو کۆچی کردووە، کۆچا بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینە ، ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگاکانی دوای بەدر بووە، بۆیەکێ لە سەر بەرزییەکانی میقداد بڕوانە فەرموودەی ژمارە: (١٥٢٤ ت = ٣٩٥٢ف)لەم بەرگەدا ڕابوورد لەپێشەوە .

خۆی دەفەرموێ: کە هاتین بۆ مەدینە، پێغەمبەر دەکەس، دەکەس دابەشیکردین بەسەر ماڵەکانا، من لەو دەکەسە بووم کەلەگەڵ پێغەمبەردا بوون، تەنیایەك مەڕمان هەبوو،شیرەکەیمان لەناو خۆمانا بەش دەکرد، بەوە دەژیاین! یەك فەرموودەی لە بوخاری پیرۆزدا هەیە.

میقداد خۆلامێکی ڕۆمی هەبوو، دەستی پزیشکی هەبوو، میقدادیش ورگن بوو، ورگی زۆر گەورە بوو، خولامەکەی پێی گوت: ئەگەر حەز دەکەی

سکت هەڵ دەدڕم و ئەم بەزو چەورییەی لێ دەردەهێنم و سووکی دەکەم، جاوای کردو شوێنەکەی دوورییەوە، بەلام سکی هەوی کردو میقداد مرد، خۆلامەکەش هەلهات و ڕای کرد ئەنجامدانی کاری وا و هێنانەوەی تەرمی میقداد لەمیصرەوە بۆ مەدینە، لەسەردەمی جێنشینی عوسمانا بەبێ دەربڕینی ڕەخنە و پێشگیری لەم کارە ، لەلایەنی صەحابەو تابیعینەوە ، بەلگەیە لەسەر ئەوە کەکاری وا دروستە، کەواتە: دروستە تەرمی کوردە ئاوارەکانی خۆشمان لەم سەردەمەدا لە هەندەرانی دوورەوە بهێنرێنەوە بۆ کوردستانی خۆمان وەکاری وا بێ شەرعی نییە، گەرچی خالّیش نیە لەگێرەو کێشەو سەراسێ.

٣- ئەم فەرمووەدەیە باشترین بەلگەیە لەسەر دروستبوونی کرداری نەشتەرگەری لەکاتی پێویستا .

## سەرگوزەشتەی نەوەی نەضیر

١٥٣٧- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (حَارَبَتْ النَّضِيرُ وَقُرَيْظَةُ فَاجْلَى بَنِي النَّضِيرِ وَاقَرَّ قُرَيْظَةَ وَمَنَّ عَلَيْهِمْ حَتَّى حَارَبَتْ قُرَيْظَةُ فَقَتَلَ رِجَالَهُمْ وَقَسَمَ نِسَاءَهُمْ وَاوْلادَهُمْ وَامْوَالَهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ الا بَعْضَهُمْ لَحِقُوا بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَامَنَهُمْ وَاسْلَمُوا وَاجْلَى يَهُودَ الْمَدِينَةِ كُلَّهُمْ بَنِي قَيْنُقَاعَ وَهُمْ رَهْط عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلامٍ وَيَهُودَ بَنِي حَارِثَةَ وَكُلَّ يَهُودِ الْمَدِينَةِ). (الحديث: ٤٠٢٨)[٣٠٤].

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: هۆزی نەوەی نەزیرو هۆزی نەوەی قورەیزە لە دژی پێغەمبەر شەڕیان کرد، لەئەنجاما پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) مەدینەی بەنەوەی نەزیر چۆڵ کرد و نەوەی قورەیزەی لەشوێنیخۆیان لەوێ هێشتەوە و هیچی لێ نەسەندن و کردی بەپیاوەتی

(٣٠٤) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: اجلاء اليهود من الحجاز ، رقم: ١٧٦٦ .

بەسەريانەوە، بەلام دووبارە بەنى قورەيزە دەستيان كردەوە بەشەڕو پەيمانەكەيانيان شكان، بۆيە پێغەمبەريش (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر ئەوە پياوە جەنگاوەرەكانی كوشتن و ژن و منداڵ و ماڵيشيانی بەسەر موسوڵماناندا دابەش كرد، وەلێ هۆزەكەی عەبدوڵلایكوڕی سەلام هاتنە لای پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) ئەويش ئەمانی دان و ئەوانيش موسوڵمان بوون. دواتر پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) مەدينەی چۆڵ كرد بە هەموو جوولەكەيێ، وەك بەنی قەينو قاع و بەنی حاريسە و جوولەكەكانی تری مەدينە (تاج/ ٨ ل/٢٢٢ ف/٣ ز/٨٩ - غەزای بەنی نەزير و بەنی قورەيزە- ش) .

١٥٣٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ: حَرَّقَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَعَ وَهِيَ الْبُوَيْرَةُ فَنَزَلَتْ مَاقَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ اوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى اصُولِهَا فَبِاذْنِ اللّٰهِ (الحديث ٤٠٣١ -اطرافه في: ٣٠٢١، ٤٠٣٢، ٤٨٨٤)[٣٠٥] .

ئيبنوعومەر (رەزای خودايان لێ بێ) فەرمووی: كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) رەزەدارخورماكانی بەنی نەزيری سووتاند و فەرمانی دا بەبڕينيان، كە لە بووەيرە بوون، كە نزيكی دوومیل لە مەدينەوە دوورە، جوولەكەكان بەمە ئاگريان تابەربوو، گوتيان: ئەی موحەممەد! تۆ لەلايەكەوە دەڵێيت: من پێغەمبەرم، كەچی لەلايەكی ترەوە دەچی رەزو باخ دادەهێنی و داری بەريی و دەرختی بەردار وسێبەردار دەسووتێنی و دادەپاچی، ئەمە چی بەسەر چييەوەيە؟! جاخودا ئەم ئايەتانەی نارد: ﴿ما قطعتم من لينة او تركتموها قائمة على اصولها فباذن الله وليُخزيَ الفاسقين﴾ (حەشر- ٥/٥٩)، واتە: هەرچی ئێوە بڕيتان كە باخەكانی نەوەی نەزير بوو، يا هێشتا نەوە بە ڕاوەستاوی لەسەر رەگ و ڕيشەو قەدی خۆی، هەمووی بەفەرمانی خودا بوو، هەتا كافرانی پێ چاوشكێن ببن و ئەو بەدكارو فاسيق ولە پەيمان دەرچوانە ڕەنجە

(٣٠٥) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: جواز قطع اشجار الكفار ... رقم: ١٧٤٦ .

ڕۆوریسوا ببن، بەفەرمانی خودا)، (تاج/ ٧ ز/٤٢ ف/٢ ل/١٨٨- ب/ ت- تەفسیری سوورەتی حەشر) .

١٥٣٩- عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَقُولُ: (ارْسَلَ ازْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عُثمَانَ الَى ابِي بَكْرٍ يَسْالْنَهُ ثُمُنَهُنَّ مِمَّا افَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكُنْتُ انَا ارُدُّهُنَّ فَقُلْتُ لَهُنَّ الا تَتَّقِينَ اللَّهَ الَمْ تَعْلَمْنَ انَّ النَّبِيِ(صَلَّىاللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ لا نُورَث مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ يُرِيدُ بِذلِكَ نَفْسَهُ انَّمَا يَاكُلُ الُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ هَذا الْمَالِ فَانْتَهَى ازْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى مَا اخْبَرَتْهُنَّ) (الحديث:٤٠٣٤ ، طرفاه في: ٦٧٢٧، ٦٧٣٠)[٣٠٦] .

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەپاش مەرگی پێغەمبەر، عوسمانی کوڕیعەفانیان نارد بۆخزمەتی ئەبوبەکری صەدیق، کە ئەوکاتە ئەوجێنیشین (خەلیفە)بوو، کەعەرزی بکا، هەشتیەکی خۆیان پێ بدا، لەو مفتەماڵەی کە خودای گەورە ڕەخساندبووی بۆ پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) لەتالانی دێهاتی دەوربەری مەدینەی پیرۆز ، منیش پەشیمانم دەکردنەوە پێیانم دەگوت: ئەوە بۆ لەخودا ناترسن، ئەدی نازانن کە پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (میرات و کەلەپوور لەئێمە ناگیرێ، کە دەستەی پێغەمبەراینن، ژێوزار ومەسرەفی کەسوکاری موحەممەد(دروودی خودای لێ بێ) لەسەربەیتولماڵە).

ئیتر هاوسەرەکانی تری پێغەمبەریش هاتنە سەر قسەکەی وداوای بەشەمیراتیان نەکرد، لەبەجێماوەی پێغەمبەر)، (تاج/٣ ل/٢٤ ف/٢).

(٣٠٦) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: قول النبيّ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) (لانورث ماتركناه صدقة) رقم: ١٧٨٥ .

# كوشتنى كەعبى كوڕى ئەشرەف

١٥٤٠- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الاشْرَفِ فَانَّهُ قَدْ اذى اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: اتُحِبُّ انْ اقْتُلَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: فَاذنْ لِي انْ اقُولَ شَيْئًا قَالَ: قُلْ: فَاتَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ: انَّ هَذا الرَّجُلَ قَدْ سَالَنَا صَدَقَةً وَانَّهُ قَدْ عَنَّانَا وَانِّي قَدْ اتَيْتُكَ اسْتَسْلِفُكَ قَالَ: وَايْضا وَاللَّهِ لَتَمَلُّنَّهُ قَالَ انَّا قَدْ اتَّبَعْنَاهُ فَلا نُحِبُّ انْ نَدَعَهُ حَتَّى نَنْظرَ الَى ايِّ شَيْء يَصِيرُ شَانُهُ وَقَدْ ارَدْنَا انْ تُسْلِفَنَا وَسْقًا اوْ فَقَالَ: نَعَمِ ارْهَنُونِي قَالُوا: ايَ شَيْء تُرِيدُ؟ قَالَ: ارْهَنُونِي نِسَاءكُمْ قَالُوا: كَيْفَ نَرْهَنُكَ نِساءنَا وَانْتَ اجْمَلُ الْعَرَبِ قَالَ: فَارْهَنُونِي ابْنَاءكُمْ ، قَالُوا: كَيْفَ نَرْهَنُكَ ابْنَاءنَا فَيُسَبُّ احَدُهُمْ فَيُقَالُ: رُهِنَ بِوَسْقٍ اوْ وَسْقَيْنِ هَذا عَارٌ عَلَيْنَا وَلَكِنَّا نَرْهَنُكَ اللامَةَ قَالَ سُفْيَانُ: يَعْنِي السِّلاحَ فَوَاعَدَهُ انْ يَاتِيَهُ.

فَجَاءهُ لَيْلا وَمَعَهُ ابُو نَائِلَةَ وَهُوَ اخُو كَعْبٍ مِنْ الرَّضاعَةِ فَدَعَاهُمْ الَى الْحِصْنِ فَنَزَلَ الَيْهِمْ فَقَالَتْ لَهُ امْرَاتُهُ: ايْنَ تَخْرُجُ هَذهِ السَّاعَةَ فَقَالَ: انَّمَا هُوَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ وَاخِي ابُو نَائِلَةَ ،قَالَتْ: اسْمَعُ صَوْتًا كَانَّهُ يَقْطرُ مِنْهُ الدَّمُ . قَالَ: انَّمَا هُوَ اخِي مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ وَرَضيعِي ابُو نَائِلَةَ انَّ الْكَرِيمَ لَوْ دُعِيَ الَى طعْنَةٍ بِلَيْلٍ لاجَابَ قَالَ: وَيُدْخِلُ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ مَعَهُ رَجُلَيْنِ.

وفي رواية: ابُو عَبْسِ بْنُ جَبْرٍ وَالْحَارِث بْنُ اوْسٍ وَعَبادُ بْنُ بِشْرٍ ،فَقَالَ: اذا مَا جَاء فَانِّي قَائِلٌ بِشَعَرِهِ فَاشَمُّهُ فَاذا رَايْتُمُونِي اسْتَمْكَنْتُ مِنْ رَاسِهِ فَدُونَكُمْ فَاضرِبُوهُ وَقَالَ مَرَّةً: ثمَّ اشِمُّكُمْ فَنزَلَ الَيْهِمْ مُتَوَشِّحًا وَهُوَ يَنْفَحُ مِنْهُ رِيحُ الطيبِ فَقَالَ: مَا رَايْتُ كَالْيَوْمِ رِيحًا ايْ اطيَبَ ، قَالَ: عِنْدِي اعْطرُ نِسَاء الْعَرَبِ وَاكْمَلُ الْعَرَبِ ،فَقَالَ: اتَاذنُ لِي انْ اشَمَّ رَاسَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ فَشَمَّهُ ثمَّ اشَمَّ اصْحَابَهُ ثمَّ قَالَ: اتَاذنُ لِي؟ قَالَ:نَعَمْ فَلَمَّا اسْتَمْكَنَ مِنْهُ قَالَ: دُونَكُمْ فَقَتَلُوهُ ثمَّ اتَوْا النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَـاخْبَرُوهُ)، (الحـديث: ٤٠٣٧، اطرافـه في: ٢٥١٠، ٣٠٣١، ٣٠٣٢، ٤٠٣٢)[٣٠٧] .

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (کێ دەتوانێ چارەی کەعبی کوڕی ئەشرەف بکاو لەناوی ببات، چونکە بەڕاستی ئازاری خواو پێغەمبەری خودا ئەدا؟). موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا! حەزدەکەی کە بیکوژم، فەرمووی: (بەڵێ) فەرمووی: بەڵام ڕێگەم پێ بدە کەشتێ لەبارەی تۆوە بڵێم، کەببێ بەهۆی ئەوە کە بەو فێڵە بیخەڵەتێنم؟ فەرموو: (بیڵێ) جا موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش چوو بۆلای و پێی گوت: ئەم پیاوە هەر ڕۆژەی داوای شتێکمان لێ دەکا، ڕۆژێ داوای زەکاتمان لێ دەکا، بەڕاستی ڕەنجاندووینی و بێزاری کردووین وە منیش هاتووم بۆلات یەك دوو وەسقمان بەقەرز بدەیتێ .

کەعبیش دەڵێ: بەخوا دیسانیش لێی بێزارتریش دەبن، ئەویش گوتی: تازە ئێمە شوێنی کەوتووین و تووشبووین، حەزیش ناکەین هەروا بە بێمەهانە وازی لێ بێنین، جارێ هەروا دەمێنین هەتا بزانین کاروباری ئەم پیاوە دەگات بەچی، وە دەشمانەوێ وەسقێ دوو وەسق خۆراکمان بەقەرز پێ بدەیت؟ کەعب گوتی: بەڵی باشە، بەڵام دەبێ بارمتەم پێ بدەن، وتیان: چیت دەوێ کە لەبارمتەدا دای بنێین؟ گوتی: ژنەکانتانم بەبارمتە لەلا دانێن، گوتیان: تۆ جوانترین عەرەبی، چۆن ژنت بەبارمتە لەلا دابنێین؟ تووشی سەرشۆڕی دەبین. گوتی: دەی کوڕی خۆتانم بدەنێ بەبارمتە . گوتیان: ئەویش هەر زەحمەتە، سبەی جنێویان پێدەدەن و پێیان دەڵێن: ئەی بارمتەی تەغارێ خۆراك! شتی وا ریسواییە بۆ ئێمە، بەڵام زریە واتە: چەكو شتی وات لەلا بەبارمتە دادەنێین.

---

(٣٠٧) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: قتل كعب بن الاشرف طاغوت اليهود ، رقم: ١٨٠١ .

ئـەویش بـەڵێنی پـێ دا کەبـچی بـۆلای، ئـەویش شـەوا چـوو بـۆلای، ئەبونائیلەیشی لەگەڵ خۆیدا برد، کەبرای شیری کەعب بوو، جا ئەویش بانگی کردن بۆ ناوقەلاکەو هاتە خوارەوە بۆ لایان، ژنەکەی پێی دەڵێ: بەم ناوەختـە بـۆ کـوێ دەچـیت؟ گـوتی: خۆمـانن: تـەنیا موحەممـەدی کـوڕی مەسلەمەو ئەبو نائیلەی برامە، ژنەکەی گوتی: دەی من دەنگێ دێتـە گوێم خوێنی لێ دەتکێ، کەعب گوتی: خۆمـانن، هەرموحەممـەی کوڕی مەسـلەمەی برام و ئەبو نائیلەی هاوشیرمە، پیاوی مـەردیش بەشـەو ئەگـەر خۆلك بکرێ بۆپەتی سێدارەش دەچێ بەپیریـەوە! دەڵێ: موحەممـەدی کوڕی مەسـلەمەش لەگـەلا خۆیـدا دوو پیـاویتریش دەباتـە ژوورەوە، لەگێڕانەوەیـەکا: ئـەم سـێ کەسەی لەگـەڵ خـۆی بـردە نـاو قەلاکـە: ئەبوعـەبس کوڕی جـەبرو حاریسی کوڕی ئەوس و عەببادی کوڕی بیشر.

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە تەگبیر بۆ هاوڕێکانی دەکاو دەڵێ: کاتێ هات من قژەکەی دەگرم و بۆنی دەکەم، جا کە ئێوە من تـان دی کەدەسـتم لـە قژەکەی گیربووەو سەریم توند گرتووە، ئـیتر خۆکـەون و دایگـرن بـە شمشێر جارێکیان گوتی: بە ئێوەش دەڵێم ئادەی بۆنی بکەن.

جـا کـەعب خـۆی لەبـەرکردو خـۆی پڕچـەك کـردو هاتـەخوارەوە بۆلایان،بۆن و بەرامەی پڕشوێنەکەی کرد، موحەممـەدی کوڕی مەسـلەمەیش بـۆ فێـڵ گـوتی: قـەت بـۆنی وا خۆشـم نـەدیوە . کـەعب بەشـانازییەوە گـوتی: بۆنخۆشترین و جوانترین ژنی عـەرەبانم لەلایـە، لەگـەڵیان کـەیف دەکـەم، ئـەم بۆنـەهی ئەوەیـە ، موحەممـەدیش دەڵـێ: ڕێگـەم نـادەی کـەبۆنی ئـەم بۆنـە خۆشـەی سـەرت بکـەم؟ کـەعب گـوتی: بفـەرموو، ئـەویش خـۆی بـۆنیکردو، ئەوجا هاوڕێکانیشی بۆنیان کرد، دیسان گوتیـەوە: ڕێگـەم دەدەیتـەوە کـەبۆنی سـەرت بکەمـەوە؟ گوتی: بـەڵێ:جا کەچنگی لەسـەری گیربـوو، گـوتی: ئـادەی دایگـرن، ئـەوانیش کوشـتیان، لـە پاشـا گەڕانـەوە بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەرو هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند).

## کوشتنی ئەبو رافیعی کوڕی ئەبول حەقیق

## قتل ابی رافع عبدالله بن ابی الحقيق، ويقال: سلام بن ابي الحقيق

١٥٤١- عَنْ الْبَراء بْنِ عَازِبٍ (رضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: بَعَث رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى ابِي رَافِعٍ الْيَهُودِيِّ رِجَالا مِنْ الانصار فَامَّرَ عَلَيْهِمْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَتِيكٍ وَكَانَ ابُو رَافِعٍ يُؤْذِي رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَيُعِينُ عَلَيْهِ وَكَانَ فِي حِصْنٍ لَهُ بارْض الْحِجَازِ فَلَمَّا دَنَوْا مِنْهُ وَقَدْ غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَرَاحَ النَّاسُ بِسَرْحِهِمْ فَقَالَ عَبْدُ اللّٰهِ لاصْحَابِهِ اجْلِسُوا مَكَانَكُمْ فَانِّي مُنْطلِقٌ وَمُتَلَطفٌ لِلْبَوَّابِ لَعَلِّي انْ ادْخُلَ فَاقْبَلَ حَتَّى دَنَا مِنْ الْبابِ ثمَّ تَقَنَّعَ بِثوْبِهِ كَانَّهُ يَقْضِي حَاجَةً وَقَدْ دَخَلَ النَّاسُ فَهَتَفَ بِهِ الْبَوَّابُ: يَا عَبْدَ اللّٰهِ انْ كُنتَ تُرِيدُ انْ تَدْخُلَ فَادْخُلْ فَانِّي ارِيدُ انْ اغْلِقَ الْبابَ فَدَخَلْتُ فَكَمَنْتُ فَلَمَّا دَخَلَ النَّاسُ اغْلَقَ الْبابَ ثمَّ عَلَّقَ الاغَالِيقَ عَلَى وَتَدٍ .

قَالَ: فَقُمْتُ الَى الاقَالِيدِ فَاخَذتُهَا فَفَتَحْتُ الْبابَ وَكَانَ ابُو رَافِعٍ يُسْمَرُ عِنْدَهُ وَكَانَ فِي عَلالِيَ لَهُ فَلَمَّا ذهَبَ عَنْهُ اهْلُ سَمَرِهِ صَعِدْتُ الَيْهِ فَجَعَلْتُ كُلَّمَا فَتَحْتُ بَابا اغْلَقْتُ عَلَيَ مِنْ دَاخِلٍ قُلْتُ:انْ الْقَوْمُ نَذرُوا بِي لَمْ يَخْلُصُوا الَيَ حَتَّى اقْتُلَهُ فَانْتَهيْتُ الَيْهِ فَاذا هُوَ فِي بَيْتٍ مُظلِمٍ وَسْط عِيَالِهِ لا ادْرِي ايْنَ هُوَ مِنْ الْبَيْتِ فَقُلْتُ: يَا ابا رَافِعٍ قَالَ: مَنْ هَذا؟ فَاهْوَيْتُ نَحْوَ الصَّوْتِ فَاضرِبُهُ ضرْبَةً بالسَّيْفِ وَانَا دَهِشٌ فَمَا اغْنَيْتُ شَيْئًا وَصَاحَ فَخَرَجْتُ مِنْ الْبَيْتِ فَامْكُث غَيْرَ بَعِيدٍ ثمَّ دَخَلْتُ الَيْهِ فَقُلْتُ: مَا هَذا الصَّوْتُ يَا ابا رَافِعٍ؟ فَقَالَ: لامِّكَ الْوَيْلُ انَّ رَجُلا فِي الْبَيْتِ ضرَبَنِي قَبْلُ بالسَّيْفِ قَالَ: فَاضرِبُهُ ضرْبَةً اثخَنَتْهُ وَلَمْ اقْتُلْهُ ثمَّ وَضعْتُ ظبَةَ السَّيْفِ فِي بَطنِهِ حَتَّىاخَذ فِي ظهْرِهِ فَعَرَفْتُ انِّي قَتَلْتُهُ فَجَعَلْتُ افْتَحُ الابْوَابَ بابا بابا حَتَّى انْتَهيْتُ الَى دَرَجَةٍ لَهُ فَوَضعْتُ رِجْلِي وَانَا ارَى انِّي قَدْ انْتَهيْتُ الَى الارْض فَوَقَعْتُ فِي لَيْلَةٍ مُقْمِرَةٍ فَانْكَسَرَتْ سَاقِي فَعَصَبْتُهَا بِعِمَامَةٍ ثمَّ انْطلَقْتُ حَتَّى جَلَسْتُ عَلَى الْبابِ فَقُلْتُ: لا اخْرُجُ اللَّيْلَةَ حَتَّى اعْلَمَ اقَتَلْتُهُ؟ فَلَمَّا صَاحَ الدِّيكُ قَامَ النَّاعِي عَلَى السُّورِ فَقَالَ: انْعَى ابا رَافِعٍ تَاجِرَ اهْلِ الْحِجَازِ فَانْطلَقْتُ الَى اصْحَابِي فَقُلْتُ النَّجَاء فَقَدْ

قَتَلَ اللّٰهُ ابا رَافِعٍ فَانْتَهَيْتُ اِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَدَّثْتُهُ فَقَالَ: ابْسُط رِجْلَكَ فَبَسَطتُ رِجْلِي فَمَسَحَهَا فَكَأنَّها لَمْ اشْتَكِهَا قَط. (الحديث: ٤٠٣٩، اطرافه في: ٣٠٢٢، ٣٠٢٣، ٤٠٣٨، ٤٠٤٠)[٣٠٨].

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) چەند پیاوێکی ئەنصاری نارد بۆ کوشتنی ئەبورافیعی جوولەکە، وەعەبدوڵلای کوڕی عەتیکی کرد بەسەرکردەیان، ئەم ئەبورافیعە ئازاری زۆری پێغەمبەری دەداو گەلەکۆمەکێی لێ دەکرد، پارەو پوولی زۆری دەدا بەهۆزە عەرەبە بتپەرستەکان کە دوژمنایەتی پێغەمبەریان دەکرد، وەك هۆزی غەتەفان، وە لە ناو قەلایەکی خۆیا بوو، لەخاکی حیجاز، لەنزیك خەیبەر.

جا کاتێ لەقەلاکە نزیك دەبنەوە، خەریك بوو خۆر ئاوا دەبوو، خەڵکەکە مالات و ئاژەڵیان بەرەو ماڵ بۆ ناو قەلاکە دەبردەوە عەبدوڵلایش بەهاوڕێکانیخۆی دەڵێ: ئێوە لە شوێنیخۆتان دابنیشن، من خۆم ئەچم وخۆم لە دەرکەوانەکە شیرین دەکەم، بەشکم بچمە ژوورەوە، ئەوجا دەچێتە پێشەوە تا لە دەرگاکە نزیك دەبێتەوە، ئەوجا خۆی دەپێچێ لە جلەکانیەوە لەسەر شێوەی کەسێ دەس بە ئاوبگەیەنێ وە مەردومیش ئەوانەی کە لەدەرەوەی قەلاکەبوون، هەموو چووبوونە ژوورەوە، کەسی وا لەدەرەوەی قەلاکە نەمابوو، دەرکەوانەکەش قاوی لێ کردم: ئەی بەندەی خودا! دەتەوێت بچیتە ژوورەوە، زووکەوەرە بچۆرە ژوورەوە، چونکە من دەمەوێ دەرگای قەلاکە دابخەم.

ئیتر منیش چوومە ژوورەوە، وەخۆم لەپەنایە کاحەشاردا، پاش ئەوەی خەڵکەکە هەموو چوونە ژوورەوە دەرگاکەی داخست و کلیلەکانی هەڵواسی بەمێخێکا، گوتی: منیش بەدزیەوە چووم بۆ کلیلەکان و بردمن و دەرگاکەم کردەوە.

---

(٣٠٨) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث البرآء في قتل ابي رافع اليهودي (فتح/٨خاتمة كتاب المغازي ص١٥٤) - المترجم .

ئـەبورافيع دەسـتووری وابـوو، دیوەخـانی هـەبوو، بەشـەو لـەلای کـۆ دەبوونەوەو دەمەتەقێ یان دەکرد، هەتا کاتی خەو! وەلە نـاو قەلاکەدا لـەناو کۆشکێکی چەند نهۆم دابوو، کەهی خۆی بـوو، جا کە دەوریـان چۆڵ کـردو دەمە تەقێ تەواو بوو، من هەر خۆم بەدزکە دزکە سەرکەوتم بۆلای، هـەموو جارێ کە دەرگایـەکم دەکـردەوە، لـەناوەوە لەسـەر خـۆمم دادەخـست، لـەدڵی خۆم دا گـوتم: ئابـەم جۆرە ئەگـەر هۆزەکـەی پێشیان زانـیم و کەشـف بـووم، لەبەر ئەوەی دەرگاکان داخراوە هەتا ئەم هەموو دەرگایە دەکەنـەوەو دەگەنـە لای من، من دەیکوژم و ئەرکی خۆم ئەنجام دەدەم.

جا کاتێ گەیشتمە لای، هەستم کرد کەوا لە هۆدەیەکی تاریکا، وا لەناو خێزانەکەیـدا، نـەم دەزانـی لـە کـوێی ژوورەکەدایـە، جا هـەتا کەشـفی بکـەم، بانگم کرد: ئەی ئەبو رافیع! بەسـەر سامییەکەوە گوتی: ئەوەکێیـە؟؟ منـیش بــە شــەڵەژاوی، ڕووەو دەنگەکــە دامپاچــی و بەشمــشێر کوێرانــە دامگــرت وشمشێرم یـەك لـە دوایـەك داوەشـاند بـەڵام هیـچم بـە هـیچ نـەکرد، ئـەویش دەستی کـرد بـەهاوارو بۆڕەبـوڕ، منـیش بـەفیڵ لـە ژوورەکـە چوومە دەرەوەو پاش کەمێ وەك کەسێ هاتبێ بەهاواریەوە گوتم: ئەی ئەبو رافیع! ئەو دەنگـە چی بـوو؟ گـوتی: کۆسـتی دایکـت کـەوێ، خـۆ ئێـستا پیـاوێ ویـستی بەشمـشێر بمکوژێ گوتی: ئـەمجارە بەدەنگەکـەیا بەتـەواوی جێگەکـەیم دیـاری کـردو بـە شمـشێر هەڵمـەتم بـۆی بـردو دامەبـەر شمشێرو کۆڵـەوارم کـرد، بـەڵام هێـشتا بەتەواوی نەم کوشت، دوایی نووکی شمشێرەکەم کردبە ناوەڕاستی ورگیدا، لـە گازەرەی پشتیەوە هاتە دەرەوە ئیتر زانیم کە کوشتوومە.

ئەوجا بـەرەو دوا گەڕامـەوەو یەکـە یەکـەدەرگاکانم کـردەوە هـەتا خـۆم دەربــاز بکــەم، هــەتا گەیــشتمە پەیــژەیا پیــا هاتمــەخوارەوە، لــەمن وایــە گەیشتوومەتە سەرزەوی، بەڵام مـابووی، دنیـا مانگـە شـەو بـوو، تـرپ کەوتمـە خوارەوە، لاقم شکا، بەمێزەرەکەم پێچام، ئـەوجا خـۆم بـەکێش کـردو چوومـە دەرەوەی قەلاکەو لەلای دەرگاکەدا دانیـشتم گـوتم: لـە قەلاکـە دەرناچـم هـەتا

ئەم شەو بۆم دەرنەكەویٚ كە كوشتوومە یانا؟ جاكاتیٚ كەڵەباب خویٚندی، جارچی جاڕی دا لە سەر دیواری شووراى قەلاكەوە (مەرگی ئەبورافیعی بازرگانی گەورەی حیجازتان پیٚ ڕادەگەیەنم).

ئەوساخۆم گەیاندە هاوریٚكانم وگوتم: خیٚراكەن فریام كەون خۆشتان دەرباز بكەن، خودا ئەبو رافیعی كوشت، جاكاتیٚ چوومەوە خزمەتی پیٚغەمبەر(دروودی خودای لیٚ بیٚ) هەواڵەكەم پیٚی ڕاگەیاند، فەرمووی: (قاچت راكیٚشە) منیش قاچم ڕاكیٚشا، پیٚغەمبەر (دروودی خودای لیٚ بیٚ) دەستیٚكی پیاهیٚنا، ئیتر هەر وەك نەئیٚشابیٚ وابوو.

## غەزای ئوحود (غزوة احد)

١٥٤٢- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ احُدٍ: ارَايْتَ انْ قُتِلْتُ فَايْنَ انَا؟ قَالَ: فِي الْجَنَّةِ فَالْقَى تَمَرَاتٍ فِي يَدِهِ ثُمَّ قَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ). (الحديث: ٤٠٤٦)(٣٠٩)

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای ئوحود، پیاویٚ عەرزی حەزرەتی كرد: ئەی پیٚغەمبەری خودا! پیٚم بفەرموو، ئەگەر من بكوژریٚم لەغەزادا جیٚگەم كویٚیە؟ فەرمووی:(جیٚگەت ناوبەهەشتە) پیاوەكە چەند دەنكیٚ خورما لەناو دەستیا بوو، خەریكی خواردنیان بوو، وەك بلیٚی ئەو خورمایانە ڕیٚگربن لە چوونە ناو بەهەشتی، فڕەی دان وشیٚرانە جەنگی كرد هەتا كوژرا).

١٥٤٣- عَنْ سَعْدِ بْنِ ابِي وَقَّاصٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: رَايْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ احُدٍ وَمَعَهُ رَجُلانِ يُقَاتِلانِ عَنْهُ عَلَيْهِمَا ثِيَابٌ بِيض كَاشَدِّ الْقِتَالِ مَا رَايْتُهُمَا قَبْلُ وَلا بَعْدُ. (الحديث: ٤٠٥٤)(٣١٠).

---

(٣٠٩) اخرجه مسلم في الامارة ، باب: ثبوت الجنة للشهيد ، رقم:١٨٩٩ .

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای ئوحود دووپیاوی بەرگ سپیم دی، لە ڕاست و چەپی پێغەمبەرەوە بوون، شەڕێکی زۆر گەرمیان بەدەوری حەزرەتدا دەکرد و ئاگادارییان دەکرد، نەلە وەپێش ئەوانەم دیبوو، نەلەوە پاشیش دیمنەوە، ئەو دوو پیاوە حەزرەتی جوبرائیل و میکائیل بوون) (تاج/٨ ل/٢١٤ ف/٥ - ش- باسی غەزای ئوحود).

١٥٤٤- وعنْهُ قال: نَثلَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كِنَانَتَهُ يَوْمَ احُدٍ فَقَالَ ارْمِ فِدَاكَ ابِي وَامِّي. (الحديث: ٤٠٥٥، اطرافه في: ٣٧٢٥ف= ١٤٦٦ تجريد) + (تاج/٨ ل/٢١٤)[٣١١]

وەرگەڕاوەکەی لە پێشەوە لە ژمارە: (١٤٦٦) تەجریدەکەدا رابورد.

١٥٤٥- عَنْ انَسٍ (رضيَ اللهُ عنهُ) شُجَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ احُدٍ فَقَالَ: كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ شَجُّوا نَبِيَّهُمْ فَنَزَلَتْ ﴿لَيْسَ لَكَ مِنْ الامر شَيْءٌ﴾[٣١٢] (ليس لهذا الحديث رقم في الطبعة المرقمة لفتح الباري . واقع بين الحديث رقم: ٤٠٦٨ و الحديث رقم: ٤٠٦٩).

ئیمامی ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی هەرای ئوحودا، دندانی پێشینی پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) شکا، لەڕیزی لای ڕاستی لەخوارەوە دانی چوارین (ڕەباعییە)ی شکا، وەناوچەوانی شکاو خوێن بەدەم و چاویا هاتەخوارەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: هۆزا کە ناهەقی ئاوا لەپێغەمبەری خۆیان بکەن، چۆن سەردەکەون، ئەوەیش لەکاتێکا کە ئەو پێغەمبەرەیان دڵسۆزانە خەریك بێ بانگیان بکا بۆلای خوداو ڕێگەی ڕاستیان

---

(٣١٠) اخرجه مسلم في الفضائل، باب:في قتال جبريل وميكائيل عن النبيّ (صلى الله عليه وسلم)، رقم: ٢٣٠٦ .

(٣١١) راجع طرفه: رقم: ١٤٦٦ تجريد - المترجم .

(٣١٢) اخرجه مسلم في الجهاد و السير، باب: غزوة احد، رقم: ١٧٩١ .

پێ نیشان بدا. جا خودای گەورە بەم بۆنەیوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿لیس لك من الامر شیئ﴾. (تاج/ ٦ ل/٨٤ ف/١٤- ٤- سورەتی ئالی عیمران).

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

لەتاجول ئوصولا لەم شوێنەدا، لە بەرگی شەشەم، لاپەڕە/٨٤دا نەخشەیەکی جوانم بۆ سیی و ددانە نووسیبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی چاپەمەنی کوردی لەو ڕۆژگارەدا ئەوەندە پێشکەوتووو نەبوو، والەم شوێنەدا، بە شێوەیەکی ڕوونتر و جوانتر دووبارەی دەکەینەوە، خوا یاربێ ئەمجارە نەخشەکە سەرکەو توو دەبێ و لەناو پەڕاوەکەدا پەخشەوە دەبێ:

| | | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | ضواحك: مقدّم الفم | | | | | | | | | | | |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ | ١٦ |
| ٨ | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ |
| سن العقل | ضرس | ضرس | ضرس | ضواحك | ناب | رباعية | ثنية | ثنية | رباعية | ناب | ضواحك | ضرس | ضرس | ضرس | سن العقل |
| ارْحَاء = اضراسْ | | | | | | | | | | | | ارْحَاء = اضراسْ | | | |

ئەمە وێنەو شکڵی شەویلەی سەرەوەیە، کەکۆی ددانەکانی دەکەنە (١٦) ددان. شەویلەی خوارەوەش هەروا بەبێ کەم و زیاد، کەواتە (١٦+١٦=٣٢) ددان. واتە: سەنایا (ددانە: دوانینە) چوارن، دوو لەسەرەوەو دوو لەخوارەوە، هەروا ڕەباعییە (ددانە: چوارینە) چوارن، دوولە سەرەوە و دوو لە خوارەوە، هەروا ناب (واتە: کەڵب) هەروا ضواحِك (زەردەدان) ڕەحاش واتە: (ضرس= کاکیلە = خرێ) یا چوارن یاپێنجن، لەهەردوولای شەویلە، واتە: لە شەویلەی سەرەوە: یا هەشتن، یادە، هەروا لە شەویلەی خوارەوەش یا هەشتن یا دە، ددانی ئەقلیش چوارن، دوو لەخوارەوەو دوو لەسەروە کەواتە: کۆیان دەکاتە (٣٢) سیی‌و دوو ددان. زانینی ئەم نەخشەیە ئاسانکارییە بۆ زۆر لەبڕیارە

فیقهییەکان، بەتایبەت لەبابەت قصاص وخوێنی ددانەکان و زۆر شتی ترەوە
.

١٥٤٦- عَنْ ابن عمر (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (اذا رَفَعَ رَاسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ مِنَ الرَّكْعَةِ الاخِرَةِ مِنَ الْفَجْرِ يَقُولُ اللّٰهُمَّ الْعَنْ فُلانًا وَفُلانًا وَفُلانًا بَعْدَ مَا يَقُولُ سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ فَانْزَلَ اللّٰهُ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنْ الامر شَيْءٌ - الَى قَوْلِهِ- فَانَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾. (الحديث: ٤٠٦٩، اطرافه في: ٤٠٧٠، ٤٥٥٩، ٧٣٤٦)[٣١٣].

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) سەری لەروکوعی رکاتی دوایی نوێژی بەیانی هەڵ دەبڕی و ڕاست دەبوویەوە دەیفەرموو (سمع الله لمن حمده ربّنا ولك الحمد) ئەو جا دەیفەرموو: (خودایە! نەفرەت لەصەفوانی کوڕی ئو مەییە و سوهەیلی کوڕی عەمرو حاریسی کوڕی هیشام بکە) جاخودا ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿لیس لك من الامرشيئ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿فانهم ظالمون﴾ جا لەپاشتر خودا تەوبەی ئەم سێ کەسەی قەبوڵکردو هەموویان موسوڵمان بوون و سەرو موسوڵمانی جوانیان لێ دەرچوو). (تاج/٦ ل/٨٣ ف/٢٢ ز/٤- سوورەتی ئالی عیمران).

١٥٤٧- عنْ عُبَيْدُ اللّٰهِ بن عديّ بن خيسار رحمه الله تعالى انه قَالَ لوحشيّ (رضي الله عنهُ): الا تُخْبِرُنَا بِقَتْلِ حَمْزَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ انَّ حَمْزَةَ قَتَلَ طعَيْمَةَ بْنَ عَدِيٍّ بْنِ الْخِيَارِ بِبَدْرٍ فَقَالَ لِي مَوْلايَ جُبَيْرُ بْنُ مُطعِمٍ انْ قَتَلْتَ حَمْزَةَ بِعَمِّي فَانْتَ حُرٌّ قَالَ فَلَمَّا انْ خَرَجَ النَّاسُ عَامَ عَيْنَيْنِ وَعَيْنَيْنِ جَبَلٌ بِحِيَالِ احُدٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ وَادٍ خَرَجْتُ مَعَ النَّاسِ الَى الْقِتَالِ فَلَمَّا انْ اصْطفُّوا لِلْقِتَالِ خَرَجَ سِبَاعٌ فَقَالَ هَلْ مِنْ مُبَارِزٍ قَالَ فَخَرَجَ الَيْهِ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطلِبِ فَقَالَ: يَا سِبَاعُ يَا ابْنَ امِّ انْمَارٍ مُقَطعَةِ الْبُظورِ

---

(٣١٣) راجع صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٢ ص –١٤٩ - المترجم .

اتُحَادُّ اللّٰهَ وَرَسُولَهُ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: ثمَّ شَدَّ عَلَيْهِ فَكَانَ كَامْسِ الـذاهِبِ قَال: وَكَمَنْتُ لِحَمْزَةَ تَحْتَ صَخْرَةٍ فَلَمَّا دَنَا مِنِّي رَمَيْتُـهُ بِحَرْبَتِي فَاضـعُهَا فِـي ثُنَّتِـهِ حَتَّى خَرَجَتْ مِنْ بَيْنِ وَرِكَيْهِ قَالَ: فَكَانَ ذاكَ الْعَهْدَ بِـهِ فَلَمَّـا رَجَـعَ النَّاسُ رَجَعْـتُ مَعَهُمْ فَاقَمْتُ بِمَكَّةَ حَتَّى فَشَا فِيهَا الاسلام.

ثمَّ خَرَجْتُ الَى الطائِفِ فَارْسَلُوا الَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَـلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) رَسُولا فَقِيلَ لِي: انَّهُ لا يَهِيجُ الرُّسُلَ قَالَ: فَخَرَجْتُ مَعَهُمْ حَتَّى قَدِمْتُ عَلَـى رَسُـولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا رَانِي قَالَ: انْتَ وَحْشِيٌّ؟ قُلْـتُ: نَعَـمْ قَـالَ: انْـتَ قَتَلْتَ حَمْزَةَ؟ قُلْتُ: قَدْ كَانَ مِنْ الامر مَا بَلَغَكَ قَالَ: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ انْ تُغَيِّبَ وَجْهَكَ عَنِّي قَالَ: فَخَرَجْتُ فَلَمَّا قُبِض رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَخَـرَجَ مُـسَيْلِمَةُ الْكَذابُ قُلْتُ: لاخْرُجَنَّ الَى مُسَيْلِمَةَ لَعَلِّي اقْتُلُهُ فَاكَافِئَ بِهِ حَمْزَةَ قَالَ: فَخَرَجْتُ مَعَ النَّاسِ فَكَانَ مِنْ امْرِهِ مَا كَانَ قَالَ: فَاذا رَجُلٌ قَائِمٌ فِي ثلْمَةِ جِدَارٍ كَانَّهُ جَمَـلٌ اوْرَقُ ثائِرُ الرَّاسِ قَالَ: فَرَمَيْتُهُ بِحَرْبَتِي فَاضعُهَا بَيْنَ ثدْيَيْهِ حَتَّى خَرَجَتْ مِنْ بَيْنِ كَتِفَيْهِ قَالَ: وَوَثبَ الَيْهِ رَجُلٌ مِنْ الانْصار فَضرَبَهُ بالسَّيْفِ عَلَى هَامَتِهِ .(الحديث: ٤٠٧٢)[٣١٤]

عوبەیدوڵلای کوڕی عـەدی کوڕی خیـار (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بـە وەحـشی بکوژی حەمزەی فەرموو: (هەواڵی کوشتنی حەمزەمان بۆ باس بکە) وەحـشی (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: (بـەڵێ باشـە، لـەڕۆژی غـەزای بـەدرا، حـەمزە توعەیمەی کوڕی عەدی کوڕی خیار دەکوژا، لەکاتی قەومانی غەزای ئوحـودda من بەندەی جوبەیری کوڕی موتعم بووم، جوبەیری ئاغام پێی گوتم: ئەگـەر تۆڵەی مامەم لە حەمزە بۆبـسینی و لـەجیاتی توعەیمـەی مامـەم بیکـوژی تـۆ ئـازادی. جـا کـاتێ سـاڵەکەی عەینـەین جەماوەرەکـە دەرچـوون بـۆ غـەزای ئوحـود، منـیش لەگـەڵ ئـەو خەڵکـە کەوتمـە ڕێ، عەینـەین کێوێکـە بەرابـەر ئوحود، شێوا لە نێوانیانایە، کـاتێ جـەنگاوەرەکان ڕیزیـان بەسـت بۆجـەنگین،

(٣١٤) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث وحشيّ في قتل حمزة (خاتمة كتاب المغازي ج/٨ ص ١٥٤) - المترجم .

سیباع که پاڵەوانێکی ناوداربوو هاتە مەیدان و گوتی: کێ ئازایە و لەخۆی ڕائەبوێرێ بابێتە مەیدان بۆم. جا حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب بۆی چووە مەیدان و فەرمووی: ئەی سیباع! ئەی کوڕەکەی ئوم ئەنباری قیتکە بڕ! ئەوە بەربەرەکانا و دژایەتی لەگەڵ خوداو پێغەمبەر دەکەی؟ ئەوجا حەمزە پەلاماری داو هەڵمەتی بردەسەرو بەچاونووقانێ کردی بە پۆڕی خوراو! منیش منەی حەمزەم دەکرد، لەژێر تاوێرێکا خۆم مەلاس دابوو، چاوەڕوانی زەفەرهێنان لە حەمزەم دەکرد جابەرە بەرە حەمزەم لێ نزیك بۆوە، خۆم مەلاس دا هەتا بواری دا بۆم نێزەکەمم تێ گرت و دای لەبەر مووسڵدانی لەبەینی هەردوو سمتیەوە دەرچوو، ئیتر یەکسە مردو پەتای نەبرد، کاتێ جەنگاوەرەکان گەڕانەوە بۆ مەککە، منیش لەگەڵیانا گەڕامەوە، لەمەککە جێنشین بووم، هەتا ئازاد کراو بووبە ولاتی ئیسلام .

ئەوجا ڕۆیشتم بۆ تائیف، ئەوانیش نوێنەریان نارد بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) وە بەمنیشیان گوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەست بۆ موسوڵمان نابات ، جا منیش لەخزمەتیانا چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) وەشایەتمانم هێنا کاتێ منی بینی فەرمووی: (تۆ وەحشیت؟ گوتم: بەڵێ ئەوم فەرمووی: (تۆحەمزەت کوشت؟) گوتم: (وەك بیستووتە وایە، من ئەوزاتەم کوشت) فەرمووی: (لەمەو دوا مەیەرە بەرچاوم، بڕۆ خۆت ونکە) وەحشی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی منیش ڕۆیشتم جاله پاش وەفات و مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کاتێ موسەیلەمەی کەززاب هەڵساو ئاژاوەی بەرپاکرد و لەگەڵ موسوڵماناندا کردیبە هەراو کێشەو بەرە، لەدڵی خۆما گوتم: واباشە ئەم هەلە بقوزمەوەو بچم بۆ ئەم شەڕە بۆ گیانی موسەیلەمە، بەشکم موسەیلەمە بکوژم و تاوانی کوشتنی حەمزەی پێ بشۆرمەوە. گوتی: جا لەگەڵ لەشکری موسوڵمانان بەرەو ولاتی موسویلەمەی درۆزن دەرچووین، تاکاتێ بوو بەشەڕوهەراو کوشوتارە گەورەو زۆرەی کە هەمووومان دەیزانی.ن وەحشی فەرمووی: شەڕ گەرم بوو بوو سوپای موسویلە زۆریان بۆ هاتبوو،

حاڵی موسویلەمە خۆی شڕبوو، جا تەماشام کرد وازەلامیٚ، دەڵێی وشتری دێزە، لەنێوانی کەلینی دیوارێکا وەستاوە، قژسەری گیف بووە، تەواو قژی ئاڵۆسکاوە تومەز ئەوە موسەیلەمەیە، منیش نێزەیەکم تیٚ سرەواند، دام لەکۆڵەی سینگی، لەنێوانی هەردوومەمکی، لەگازەرەی پشتیەوە لەبەینی هەر دوو شانیەوە دەرچوو. جا پیاوێکی ئەنصاریش پەلاماری داو شێرێکی کێشا بەکەللەی سەری دا).

**ڕوونکردنەوە:**

وەحشی کوڕی حەربی حەبەشی (رەزای خودای لێ بێ) صەحابەی پێغەمبەر بووە،لەپاش غەزای تائیف ئیسلام بوو. ئامادەی غەزای یەمامە بوو، نێزەیەکی هەبوو، خۆی دەیگوت: بەم نێزەیەم باشترین کەسم پیٚ کوشتووە، کە حەمزەی مامەی پغەمبەر بوو، هەروا خراپترین کەسیشم پیٚ کوشتووە کە موسەیلەمەی کەززاب بوو.

وەحشی لە بوخاریدا یەك فەرموودەی هەیە، هەتا سەردەمی جێنشینی عوسمان ژیاوە، لەحمص دادەنیشت، وەهەر لەوێش مردووە، کوڕێکی هەبوو ناوی حەرب بوو، ئەوو عەبدوڵلای کوڕی عەدی کوڕی خیارو جەعفەری کوڕی عومەرو کەسانی تریش فەرمودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، بەشێکی زۆر لە داستانی ژیانی والەم فەرموودەیە دا، لەناو صەحابەکانی پێغەمبردا کەسێکی ترنییە بەم ناوە. لەفەتحولباریدا لەشرحی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرمویٚ: (کاتیٚ وەحشی دیٚ بۆلای پێغەمبەر، عەرزی دەکەن، قوربان ئەمە وەحشیە، بکوژی حەمزەی مامەتە؟ دەفەرموا: (وازی لیٚ بێنن بابیٚ موسوڵمان ببیٚ، لەڕاستیدا من ئیسلامبوونی یەك کەسم گەلیٚ پیٚ باشترە لەکوشتنی هەزار کافری بیٚ بڕوا).

١٥٤٨- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اشْتَدَّ غَضبُ اللّٰهِ عَلَى قَوْمٍ فَعَلُوا بِنَبِيِّهِ يُشِيرُ الَى رَبَاعِيَتِهِ اشْتَدَّ غَضبُ اللّٰهِ عَلَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسُولُ اللّٰهِ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ(الحديث: ٤٠٧٣)[٣١٥].

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (ڕق و تووڕەیی خودا تەواو تاوی سەندووە دژی ئەو کۆمەڵەی ئاوایان لە پێغەمبەری خودا کردووە) ئاماژەی کرد بۆ ددانە چوارینەکەی خۆی کە لەغەزای ئوحوددا هاوبەش پەیدا کەرەکان شکاند بوویان. هەروا فەرموشی: (ڕق و تووڕەیی خودا تەواو جۆشی سەندووە، دژی ئەو کەسە کە پێغەمبەری خودا بەدەستی خۆی بیکوژێ لەپێناوی سەرکەوتنی ئاینی خودا دا) .**

**ڕونکردنەوە:**

**لەغەزای ئوحوددا کۆمەڵێ پێکان لە پێغەمبەر**(دروودی خودای لێ بێ) **کرا، چەند زامێکی گەورە لەچەند جێگەیەکی لەشی کرا، دەموچاوی زامار بوو، ددانە چوارینەی لەلای خوارەوەی شکا، لێوی خوارەوەی زامار بوو، تەوێڵی زامداربوو، دوو ئەڵقەی کلاو زریەکەی هەڵ چەقینە کوڵمی، کلاو زریەکەی لەسەریا شکا، توێخیکلاوەی ئەژنۆی لێبۆوە، دەوری حەفتا شمشێر بەر ڕووی کەوت خودا لەهەموویان پاراستی. ئوبەییەی کوڕی خەلەف هەڵی کوتایە سەری و هێرشی بۆ بردو سوێندی خوارد، کە ناگەڕێتەوە هەتا موحەممەد نەکوژێ. پێغەمبەر**(دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: نەخەیر، ئەو ناتوانی من بکوژێ، بەڵکو من ئەو دەکوژم، پێغەمبەر**(دروودی خودای لێ بێ) **لەدرزی زریەکەیەوە تای سرەواند، وەك گا کەوتەسەر زەوی‌و دەستی کرد بەبۆڕە بۆڕ،**

---

**(٣١٥) اخرجه مسلم في الجهاد و السيّر، باب: اشتداد غضب الله على من قتله رسول الله (صلى الله عليهِ وَسلمَ) رقم: ١٧٩٣ .**

کۆمەڵەکەی هەڵیان گرت و بردیان، ڕۆژێکی نەبرد کە تۆپی و گیانی بەدۆزەخ شاد بوو.

لەفەتحولباریدا ئەم زانیاریانەی واتیا: عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاص ددانە چوارینەکەی پێغەمبەری شکاند، وەلێوی خوارووی زامار کرد، وە عەبدوڵلای کوڕی شەهاب تەوێڵی شکاند، وە عەبدوڵلای کوڕی قمئە (کە ناوداره بەئیبنو قەمئە) کوڵمی پێغەمبەری زامار کرد، وە مالیکی کوڕی سنان خوێنەکەی لەڕووی پێغەمبەر دەمژی و دەلێسایەوەو دوایی قووتی دەدا، چونکە بەبێ ئەدەبی دەزانی کە ئەو خوێنە پیرۆزه بتفێنێتەوە. وە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر ئەم دڵسۆزییە مژدەی پێ داو پێی فەرموو ئاگری دۆزەخ چەشکەت ناکات! وە فەرمووی : (ئەگەر کەسێ دەیەوێ تەماشای کەسێ بکا، کە خوێنی من و خوێنی ئەو تێکەڵی یەك بووبێ لەودا، باتەماشای مالیکی کوڕی سینان بکا). سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص(رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قەت ئەوەندە سوورو مجێز نەبووم لەسەر کوشتنی کەسێ، وەك ئەو ڕۆژە سوور و مجێز بووم لەسەر کوشتنی عوتبەی برام، لەسەر ئەوەی کە ئەو زیانە جەستەییەی لە پێغەمبەردا).

عەبدوڵلای کوڕی قەمیئە، لەڕۆژی ئوحودا کە ڕوخساری پێغەمبەری زامار کردو ددانە چوارینەی لەلای ڕاستەوە، لەشەویلەی خوراوەی شکاند، وتی: هاوەری بگرە ئەم گورزە لەدەستی ئیبنو قەمیئە! پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) خوێنەکەی لەڕوخساری سڕی و فەرمووی: (ئەوە چیتە، بۆ وات کرد: (اقماك الله) واتە: (اذلك الله) خوا داماو و کەساست کا). جا خودا سابرێنە کێوییەك زاڵ دەکا بەسەریا، بەقۆچ دەیکوژێ وەهەر شۆقی تاهەڵ دەدا هەتا پارچە پارچەی دەکا) .

١٥٤٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) لَمَّا اصَابَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا اصَابَ يَوْمَ احُدٍ وَانْصَرَفَ عَنْهُ الْمُشْرِكُونَ خَافَ انْ يَرْجِعُوا قَالَ:

مَنْ يَذهَبُ فِي اثرِهِمْ فَانْتَدَبَ مِنْهُمْ سَبْعُونَ رَجُلا قَالَ: كَانَ فِيهِمْ ابُو بَكْرٍ وَالزُّبَيْـرُ).
(الحديث: ٤٠٧٧، ٢١٤)[٣١٦] .

عائشه (رەزای خودای لێ بێ) بەعورووەی کوڕی زوبەیری گوت: ئەی خوشکە زام! کاتێ کە لەڕۆژی غەزای ئوحود دا، پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) تووشی ئەو دەردی سەرێیە بوو، کە گەلێ لەیارانی کوژران و زامار بوون، کە لەشکری بتپەرستەکان گەڕانەوە بۆ مەککەی پیرۆز، پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) مەترسی ئەوەی کرد، کە دیسان لەناکاو دوشمن بگەڕێتەوە بۆسەریان، جا لەبەر ئەوەو لەبەر ئەوەیش کە وورەی موسوڵمانان بەرزبێ و بە ئەو زیان و کوشت و کوشتارە چاوەترسێن نەبن و دڵیان نەترسێ. فەرمووی: (کێ دەڕوا بەشوێنیانا؟ جا حەفتا پیاوی لێ هەڵبژاردن و ناردنی، ئەبوبەکر و زوبەیر یشیان تیابوو) (تاج/ ٦ ل- ٩٢ ف -٣٢ ز- ٤).

## غەزای خەندەق کەپێشی دەگوترێ غەزای ئەحزاب
## غزوة الخندق - وهي الاحزاب

١٥٥٠- عن جَابِر (رَضيَ اللهُ عنهُ) فَقَالَ: (انَّا يَوْمَ الْخَنْدَقِ نَحْفِرُ فَعَرَضَتْ كُدْيَةٌ شَدِيدَةٌ فَجَاءوا النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: هَذِهِ كُدْيَةٌ عَرَضَتْ فِي الْخَنْدَقِ فَقَالَ: انَا نَازِلٌ ثمَّ قَامَ وَبَطْنُهُ مَعْصُوبٌ بِحَجَرٍ وَلَبِثْنَا ثلاثَةَ ايَامٍ لا نَذُوقُ ذوَاقًا فَاخَذ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمِعْوَلَ فَضرَبَ فَعَادَ كَثِيبا اهْيَلَ).
(الحديث: ٤١٠١، طرفه في: ١٢٥٠ تجريد = ٣٠٧٠ فتح = بەرطی/٣ ل/٣٧١)[٣١٧] .

---

(٣١٦) والحديث من افراده (العيني/١٧ص١٦١) - المترجم .

(٣١٧) راجع رقم: (١٢٥٠ تجريد = المجلد الثالث ص٣٧١) - المترجم .

جـابير (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژی غـەزای خەنـدەق کـاتێ خەندەقەکەمان هەڵ دەکەن، بەردە تەمتەمێ هاتەرای، چوونە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) گوتیـان: قوربـان! خەندەقەکـە تەمتـەمێکی هاتۆتـە بـەر، فەرمووی: (وا خۆم دەچمە خوارەوە بۆی) .

خۆشەویـست (دروودی خودای لێ بێ) کەهەڵـسا، سـەرنجمان دا واسـکی خـۆی بەبـەردێ جەڕانـدبوو! چونکە سێ ڕۆژ بـوو ئـەوەی پـای بگـوترێ نـان و ئـاو چەشکەمان نەکرد بوو، پێغەبمەر(دروودی خودای لێ بێ) دەستی دایە پاچـەکەو مـاڵی بەتاوێرەکـە دا، ئـیتر ئـەو گابەردەکـە لـەوەو پـێش پیـك و پـاچ کـاری لـێ نەدەکردو یاران هاواریان بوو لەدەستی، بەولێدانـەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لێ بێ) وردوخاش بوو، وە بوو بەخاك و خـۆڵ)، (تـاج/٨ ل/٢١٧ ف/٤ ز/٨٨- غـەزای خەندەق). بڕوانە: ژمارە:١٢٥٠ تەجریر- بەرگی/٣ ل/٢١٧ .

١٥٥١- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ(رضيَ اللّهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَوْمَ الاحْزَابِ: نَغْزُوهُمْ وَلا يَغْزُونَنَا). (الحـديث: ٤١٠٩، طرفـه في: ٤١١٠)(٣١٨) .

سولەیمانی کوڕی صورەد (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: ڕۆژی غـەزای ئوحـود، پاش ئەوەی سوپای ئـەحزاب کشانەوەو هیـچیان بۆنـەکرا، پێغەمبـەر (دروودی خودای لـێ بـێ) لەسـەر شـێوەی هـەواڵ لـە ئاینـدە، واتـە: لەسـەر شـێوەی مـوعجیزە، فەرمووی: (ئـیتر نـۆرەی ئێمەیـە کـە بچینـە سـەر ئـەوان و لـەناو جێگـەو ڕێگـەی خۆیان دا هەڵمـەت بەرینـە سـەریان و غـەزایان بکـەین، وەجارێ تـر ئـەوان ئێمـە غەزا ناکەنەوە). وە پێغەمبەر چۆنی فـەرموو، ڕێـك وابـوو، تالـە ئـەنجاما مەککـە ئازاد کـراو سـوپای هاوبـەش پەیداکـەران تـەفرو توونـابوون. نوخـشەبێ لەسـوپای زوڵم و زۆری ئەمڕۆیش لەهەموو لایێ، بۆ خوا چی تێ دەچێ).

---

(٣١٨) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث سليمان بن صرد (الان نغـزوهم)(خاتمـة كتـاب المغازي/ فتح الباري/ ٨ ص ١٥٤) - المترجم .

**ڕوونكردنەوە:**

سولەیمانی كوڕی صورە دی كوڕی ئەل- جەون، هاوەڵێكی ناوداری پێغەمبەربوو، لەبوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، یەكێكیان ئەم فەرموودەیە، ئەوی تریشیان لە(صفە ابلیس)دا رابورد، پیاوێكی پیاوانەی خێر خوازی بەئایینی خاوەن پەرستش و خوا پەرستی بوو، ئەو كاتەی كووفە دروست كرا لەوێ بۆ خۆی خانوویەكی دروست كردو لەوێ دانیشت بەماڵەوە، لەگەڵ سوپای عەلیدا ئامادەی صەفین بوو، لەساڵی شەست و پێنجی كۆچیدا، بوو بەسەرۆكی سوپایەكی چوار هەزار كەس، لەتەمەنی نەوەدو سێ ساڵیدا، لەشەڕێكی خوێنین دا، لەشوێنێ بەناوی (عین الوردة) لەموعەسكەری مەروان، سولەیمان و سوپاكەی هەموو كوژران، عوبەیدوڵلای كوڕی زیاد، سەری سولەیمانی بڕی و بەدیاری بردی بۆ مەڕوانی كوڕی حەكەمی ئاغای.(بڕوانە: ژمارە: ١٣٢٥ = بەرگی : ٣ لاپەڕە : ٤٥٢) .

١٥٥٢- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: (لا الَهَ الا اللّٰهُ وَحْدَهُ اعَزَّ جُنْدَهُ وَنَصرَ عَبْدَهُ وَغَلَبَ الاحْزَابَ وَحْدَهُ فَلا شَيْءَ بَعْدَهُ)، (الحديث: ٤١١٤)[٣١٩].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموویی: پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (لا اله الا الله وحده، اعز جنده، ونصر عبده، وغلب الاحزاب وحده، فلا شيء بعده). واتە: هەر خودا تەنیا خۆی خودایەو بەس، لەشكری خۆی لەڕۆژی ئەحزابا سەرخست، بەندەكەی خۆی كەمو حەمەدی پێغەمبەری خودایە سەرخست ، بەتەنها خۆی لەشكری ئەحزابی بەزاند وتێك و پێكی شكاند، خۆی نەبێ هەموو شتێ تر هیچ و پووچە، بێجگە لەخۆی هەموو شتێ بوونی نەبوونە).

(٣١٩) اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: التعوذ من شر ما عمل، رقم: ٢٧٢٤ .

١٥٥٣- عنْ ابَي سَعِيدِ الْخُدْرِيَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ: (نَزَلَ اهْـلُ قُرَيْظَـةَ عَلَى حُكْمِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذ فَارْسَلَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى سَعْدٍ فَـاتَى عَلَـى حِمَارٍ فَلَمَّا دَنَا مِنْ الْمَسْجِدِ قَالَ لِلانْصار: قُومُـوا الَـى سَـيِّدِكُمْ اوْ خَيْـرِكُمْ فَقَـالَ: هَؤُلاء نَزَلُوا عَلَى حُكْمِكَ فَقَالَ تَقْتُلُ مُقَاتِلَتَهُمْ وَتَسْبِي ذرَارِيَهُمْ قَالَ: قَضَيْتَ بِحُكْـمِ اللّهِ وَرُبَّمَا قَالَ: بِحُكْمِ الْمَلِكِ). (الحديث: ٤١٢١، طرفـه في: ٣٠٤٣، ٣٨٠٤، ٦٢٦٢)[٣٢٠] .

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هۆزی بـەنی قـورەیزە، کـاتێ لەشـکری ئیـسلام دەورەیـان دان و، بیـست و پێـنج زۆر گـەمارۆی قەلاکانیان دان چاریان نـەما ڕازی بـوون بـەوە کەسـەعدی کوڕی موعاز هـەر بڕیار و حوکمێ دەربارەی ئەوان دەرکا، ئەوان پـای قایـل بـن، جا لەسـەنگەرو قـەلاکانیان هاتنــە دەرەوە، بـەڵام لەودەمــەدا سـەعد لـەوێ نـەبوو، چـونکە لەغـەزای خەنــدەقا زامــار بــوو بــوو، پێغەمبــەر(دروودی خـودای لـێ بـێ) نــاردی بەشوێنیدا، سەعد بەسواریی گوێدرێژێ هات، جا کە گەیشتە نزیکی مزگـەوت (واتــە: نوێژگاکــە) پێغەمبــەر(دروودی خـودای لـێ بـێ) بەئەنـصاری فـەرموو: (بـچن بەپیری ئاغاتانەوە) یا پای فەرموون: (بچن بەپیری پیاوە باشەکەتانەوە).

ئـەوجا فـەرمووی: (ئـەی سـەعد! ئەمانـە تۆیـان کـردووە بـە حەکـەم و فەرمانڕەواو بەبڕیاری تـۆ ڕازی بـوون). سـەعدیش فـەرمووی: (دەوا مـن ئـەم بڕیارەیـان بـۆ دەدەم: کـە جـەنگاوەرەکانیان بکـوژرێن و خـاوو خێزانیـشیان بـەتالانی بگیرێـن!) پێغەمبـەر(دروودی خودای لێ بێ) فـەرمووی: (بـە پـای فـەرمانی خودا فەرمانت دا) یا فەرمووی: (بەپای فـەرمانی پادشای گـەورە کـە خودایـە فـەرمانت دەرکـرد(تـاج/٥ ل/١٧٥ ف/٤ ز/٤٥- باسـی گـەورەیی سـەعدی کـوڕی موغاز+تاج/٨- ل/٢٢٢- ٤ ز/٨٩- غەزای بەنـی نـەزیر ...).

---

(٣٢٠) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: جواز قتال من نقض العهد ، رقم: ١٧٦٨ .

# غەزای زاتوریقاع: غەزا پەڕۆینە
# غزوة ذات الرقاع

١٥٥٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) انَّ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلّى باصْحَابِهِ فِي الْخَوْفِ فِي غَزْوَةِ السَّابِعَةِ غَزْوَةِ ذاتِ الرِّقَاعِ. (الحديث ٤١٢٥- اطرافه في: ٤١٢٦، ٤١٢٧ ، ٤١٣٠، ٤١٣٧)(٣٢١) .

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەغەزای حەوتەم دا، کەغەزای زاتوریقاع بوو، نوێژی ترسی بۆ هاوڕێکانی کرد) بۆچۆنێتی و دەستوورەکانی نوێژی ترس بڕوانە: (تاج/١ ل/٤٤٢ ز/١٥٢ + ز/١٥٣ + ز/١٥٤ + تەجرید بەرگی یەکەم ل/٤٧٣ ف . ژ: ٤٩٦ ت = فتح/٩٤٢ هەتا لاپەڕە: ٤٧٥). ل= لاپەڕە ، ز = زنجیرە ، ژ = ژمارە فتح = فتح الباری شەرحی صەحیحی بوخاری ، ف = فەرموودە .

١٥٥٥- عَنْ ابِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةٍ وَنَحْنُ سِتَّةُ نَفَرٍ بَيْنَنا بَعِيرٌ نَعْتَقِبُهُ فَنَقِبَتْ اقْدامُنَا وَنَقِبَتْ قَدَمَايَ وَسَقَطتْ اظفَارِي وَكُنَّا نَلُفُّ عَلَى ارْجُلِنَا الْخِرَقَ فَسُمِّيَتْ غَزْوَةَ ذاتِ الرِّقَاعِ لِمَا كُنَّا نَعْصِبُ مِنْ الْخِرَقِ عَلَى ارْجُلِنَا. (الحديث: ٤١٢٨)(٣٢٢) .

ئەبو موسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەت دا(دروودی خودای لێ بێ) چووین بۆ غەزایا، تاقمەکەی من شەش کەس بووین، تاقە وشترێکمان بەرکەوتبوو، هەرشەشمان بەسەرە بەرودوا سواری دەبووین، گوتی: ئەوەندە بەپێ ڕێگەمان بڕی بەپای پەتی، پێمان کوتراو توێجی بەردا، منیش قاچەکانم توێکیان بەرداو نینۆکەکانم کەوتن، لەتاواندا لەبەر بێ پێڵاوی و لەبەر گەرما پەڕۆمان بەقاچمانەوە دەپێچا، بۆیە ئەو غەزایە ناونرا غەزای

(٣٢١) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: صلاة الخوف ، رقم: ٨٤٣ .

(٣٢٢) اخرجه مسلم في الجهاد و السيَر ، باب: غزوة ذات الرّقاع، رقم: ١٨١٦ .

زاتوريقاع (واته: غەزا پەڕۆینه) چونكه لەبەر پێ خاوسی پەڕۆو پاڵمان دەئالان لەقاچمانەوە. (تاج/٨ ل/٢٢٥- ٩١ ف/١- غەزای زاتوريقاع- ش) + (بڕ : رياض/٢ ل/٩٧ ژ:٥٢٥) .

١٥٥٦- عنْ سهل بن ابي حثمة (رَضيَ اللهُ عنهُ) ، وكان شَهِدَ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ ذاتِ الرِّقَاعِ صَلّى صَلاةَ الْخَوْفِ انَّ طائِفَةً صَفَّتْ مَعَهُ وَطائِفَةٌ وِجَاهَ الْعَدُوِّ فَصلَّى بالَّتِي مَعَهُ رَكْعَةً ثُمَّ ثبتَ قَائِمًا وَاتَمُّوا لانْفُسِهِمْ ثُمَّ انْصَرَفُوا فَصَفُّوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ وَجَاءتْ الطائِفَةُ الاخْرَى فَصَلَّى بِهِمْ الرَّكْعَةَ الَّتِي بَقِيَتْ مِنْ صَلاتِهِ ثُمَّ ثَبَتَ جَالِسًا وَاتَمُّوا لانْفُسِهِمْ ثمَّ سَلَّمَ بِهِمْ (الحديث: ٤١٢٩ )[٣٢٣] .

سەهلی كوڕی ئەبی حەسمە(رەزای خودای لێ بێ) كه له غەزای زاتو ريقاعا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووه، لەوكاتەدا كەنوێژی ترس بۆ هاوڕێكانی كردووه، فەرمووی: موسڵمانەكان بوون بەدوو دەستەوە، دەستەيەكيان لەپشت پێغەمبەرەوە ڕيز بوون و دەستەكەی تريش بەرابەر دوژمن ڕاوەستان، جا پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) ڕكاتێكی تەواو كرد بەو تاقمەيەی كه لەگەڵيابوون، ئەو ساخۆی به پێومڕێك ڕاوەستا، هەتا ئەوان ڕكاتێكی تريان كردو نوێژی خۆيان بۆ خۆيان تەواو كردو، ڕۆيشتن ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستان، ئەو جا ئەو دەستەكەی ترهاتن، كه هەتا ئێستا ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستابوون، ئەو جا پێغەمبەر خۆی لەدوو ڕكاتەكەی خۆی ڕكاتێكی مابوو، ئەو ڕكاتەيشی كرد لەگەڵ ئەوانا، واته: لەڕكاتی دووەميا پێشنوێژی بۆ دەستەی دووەم كرد، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لەسەر شێوەی تەحيات ڕێك دانيشت، هەتا تاقمەی دووەم هەستان سەرو ڕكاتيتريان كرد بۆ خۆيان، ئەوجا تەحياتيان خوێند و پێغەمبەر سلاوی پێيان دايەوە).

---

(٣٢٣) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: صلاة الخوف ، رقم: ٨٤٢ ، (بڕوانه فيقهى ئاسان /١ل –٢٥٢+ ل- ١٢٣) .

١٥٥٧- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) انَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قِبَلَ نَجْدٍ فَلَمَّا قَفَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَفَلَ مَعَهُ فَادْرَكَتْهُمْ الْقَائِلَةُ فِي وَادٍ كَثيرِ الْعِضاهِ فَنَزَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَفَرَّقَ النَّاسُ في العضاه يَسْتَظِلّونَ بالشَّجَرِ فَنَزَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَحْتَ سَمُرَةٍ وَعَلَّقَ بِهَا سَيْفَهُ قال جابر: وَنِمْنَا نَوْمَةً فاذا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْعُونَا فجئناهُ فَاذا عِنْدَهُ اعْرَابِيٌّ جالسٌ فَقَالَ: (انَّ هَذا اخْتَرَط عَلَيَ سَيْفِي وَانَا نَائِمٌ فَاسْتَيْقَظتُ وَهُوَ فِي يَدِهِ صَلْتًا فَقَالَ لي: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ فَقُلْتُ: اللّٰهُ ، فها هوَ جالسٌ ، ثمَّ لَمْ يُعَاقِبْهُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث: ٤١٣٥، اطرافه في: ٢٩١٣، ٤١٣٤، ٤١٣٦)[٣٢٤].

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزایەك دا، لەخزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) بەرەو نەجد ڕۆیشتین بۆ غەزا، لەقرچەی نیوەڕۆدا لەشوێنێكی دڕكە زیاوی دا بۆ سەرخەو شكاندن لامان دا، خەڵكەكە بەناو شیوەكەدا بلاو بوونەوەو چوونە سێبەری دارەكانەوە، پێغەمبەریش(درودی خودای لێ بێ) لەبن دارێكا دابەزی و شمشێرەكەی پیادا هەڵواسی و خەوت، كاتێ خەبەری دەبێتەوە دەڕوانێ وا پیاوێ لەلایەتی، كە هاتووە حەزرەت هەستی پێ نەكردووە، جا ئێمەی بان كرد و فەرمووی: (ئەم پیاوە شمشێرەكەی منی هەڵكێشابوو، بەڕووتی گرتبووی بەدەستیەوە دەیگوت پێم: كێ ڕزگارت دەكات لەدەستم؟ منیش گوتم خودا. جا شمشێرەكەی نایەوە ناو كێلانەكەی، وا ئەوە تانێ بۆ خۆی دانیشتووە! ئیتر پێغەمبەریش=(درودی خودای لێ بێ) تۆڵەی لەپیاوەكە نەسەندو هیچی لێی نەكرد). (تاج/٨ ل/١١٠ ف=١ ز=٣٩- شمشێر).

(٣٢٤) اخرجه مسلم في فضائل النبيّ (العيني/١٤ص ١٨٩) انظر صحيح مسلم بشرح النووي . ج/١٥ص٤٤ + ص٤٥ – المترجم .

# غەزای بەنی موصتەلیق، کە غەزای مەریسیعە
# غزوة بني المصطلق ، وهي غزوة المَريسيع

١٥٥٨- عنْ ابي سَعِيدِ الخدري (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةِ بَنِي الْمُصْطَلِقِ فَاصَبْنَا سَبْيًا مِنْ سَبْيِ الْعَرَبِ فَاشْتَهَيْنَا النِّسَاء فَاشْتَدَّتْ عَلَيْنَا الْعُزْبَةُ وَاحْبَبْنَا الْعَزْلَ فاردنا ان نعزِلَ ، وقلنا: نعزِلُ ورسول الله (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بين اظهرنا ، قبلَ ان نساله، فسالناهُ فَقَالَ: مَا عَلَيْكُمْ انْ لا تَفْعَلُوا مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ الَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ الا وَهِيَ كَائِنَةٌ (الحديث: ٤١٣٨، اطرافه في: ٢٥٤٢، ٥٢١٠، ٦٦٠٣، ٧٤٠٩)(٣٢٥) .

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لێ بێ) چووین بۆغەزای بەنی موستەلیق، ژنانی نازدارانی عەرەبمان بەتالانی گرت، وەبێ ژنی و دوور لە هاوسەری زۆری بۆهێنا بووین، وەحەزیشمان لە فرۆشتنی ئەو ژنە تالانی یانە هەبوو، جاویستمان لەگەڵیانا ڕاببوێرین و بچینە لایان، بەڵام خۆمان بکێشینەوە، هەتا ئاوەکە نەگاتەجێی خۆی و نەبێ بە منداڵ، ئەگینا ژنەکان دەبن بە دایکی منداڵمان و ئەوکاتە بۆمان نافرۆشرێن، واتە: هەم حەزمان لە ماڵ بوو، هەم حەزمان لە کەیف و ڕابواردن بوو، ویستمان چارەسەرێ بدۆزینەوە، کە هەردوو لامان بۆ دابین بکا، بەبیری خۆمان عەزل واتە: خۆکێشانەوە ئەو دوو مەبەستەمان بۆ دابین دەکا، دوایی گوتمان: ئێمە ئێستا لەخزمەتی پێغەمبەرداین چۆن دەبێ بەبێ پرسی ئەو (دروودی خودای لێ بێ) شتی وا بکەین، جاکاتێ لێمان پرسی، فەرمووی: (قەیناکەن ئەگەر وانەکەن! چونکە چارەنووسی خودایی ڕەتبوونەوەی نییە، وەهەرکەسێ هەتا ڕۆژی قیامەت، خودای گەورە چی لەچارەی نووسیبێ دەبێ بێتە دی، ئەگەر لە چارەی

(٣٢٥) اخرجه مسلم في النكاح ، باب: حكم العزلِ ، رقم: ١٤٣٨ .

کەسێکی نووسیێی کەدەبی دروست ببێ ئەوە دروست دەبێ و لەدایك دەبێ و بەعەزل و شتی وا بەری چارەنووسی خودایی ناگیرێ). (تاج/٣ ل/١٠٠ ف/٨ ز/٤٣- دەستووری سەرجێیی).

## غەزای ئەنمار (غزوة انمار)

١٥٥٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ الانْصَارِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: رَايْتُ النَّبِيَ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةِ انْمَارٍ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ مُتَوَجِّهًا قِبَلَ الْمَشْرِقِ مُتَطَوِّعًا. (الحديث: ٤١٤٠، اطرافه في: ٢٥٣ تجريد = ٤٠٠ فتح = بەرطی یەکەم ل/٢٦٤)[٣٢٦] .

لێرەدا جابیر دەفەرموێ: بەچاوی خۆم خۆشەویستم دی، لە غەزای ئەنماردا، بەسواری ولاخ، ڕووی لەخۆر هەلات بوو، نوێژی سوننەتی دەکرد).

## غەزوەی حودەیبیە (غزوة الحُدَيبِيَة)

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لقد رضی الله عن المؤمنين اذ يُبايعونك تحت الشجرة﴾ الفتح:١٨ .

١٥٦٠- عَنْ الْبَرَاء (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ تَعُدُّونَ انْتُمْ الْفَتْحَ فَتْحَ مَكَّةَ وَقَدْ كَانَ فَتْحُ مَكَّةَ فَتْحًا وَنَحْنُ نَعُدُّ الْفَتْحَ بَيْعَةَ الرِّضْوَانِ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ارْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً وَالْحُدَيْبِيَةُ بِئْرٌ فَنَزَحْنَاهَا فَلَمْ نَتْرُكْ فِيهَا قَطْرَةً فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاتَاهَا فَجَلَسَ عَلَى شَفِيرِهَا ثُمَّ دَعَا بِانَاءٍ مِنْ مَاءٍ فَتَوَضَا ثُمَّ مَضْمَضَ وَدَعَا ثُمَّ صَبَّهُ فِيهَا فَتَرَكْنَاهَا غَيْرَ بَعِيدٍ ثُمَّ انَّهَا

---

(٣٢٦) راجع رقم: ٢٥٣ تجرييد = ٤٠٠ فتح = بەرگی /١ل -٢٦٤ - المترجم .

اصْدَرَتْنَا مَا شِئْنَا نَحْنُ وَرِكَابَنَا (الحديث: ٤١٥٠، طرفاه في: ٣٥٧٧، ٤١٥١)[٣٢٧] .

بەراء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێوە فەتحی مەککە بەفەتح دائەنێن، ڕاستە کەفەتحی مەککە فەتحێکی گەورە بوو، بەڵام لەباری دڵی ئێمەدا، بەیعەتولریزوان، کە لە ڕۆژی حودەیبییەدا ڕووی دا فەتحی هەرە گەورە ئەوە چونکە ئەو ڕێگەی خۆش کرد بۆ فەتحی مەککە و بوو بەهۆی ڕەزامەندیی خودای گەورە، ئەو سەردەمە ئێمە هەزارو چوار سەد کەس بووین، کە لەخزمەت پێغەمبەردا بووین فەتحی حودەیبییەمان ئەنجام دا، حودەیبییە خۆی بیرێ بوو، کەچووینە سەری یەکسەر ئاوەکەی ناویمان هەلگۆزی، یەك دڵۆپ ئاوی تیادا نەما.

دەنگوباسی ئەم وەزعە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) تەشریفی هاتە سەری، لەسەر لێوارەکەی دانیشت، ئەوجا لەحاجەتێك دا ، داوای هەنێ ئاوی کردو لەو ئاوە دەسنوێژی گرت، ئاوی لەدەمی ڕاداو نزای خوێندو ئاوەکەی ناو دەمی تفانەوە ناوبیرەکە، جا تۆزێ، دەوری تاوێ لە بیرەکە دوور کەوتینەوە، ئیتر بە ئارەزووی خۆمان، بەزیادەوە ئاوی بیرەکە بەشی ئێمەو بەشی ولاخەکانمانی کردو هەتالەوێ بووین بەباشی پاراوی دەکردین) .

١٥٦١- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ: انْتُمْ خَيْرُ اهْلِ الارْض.وَكُنَّا الْفًا وَارْبَعَ مِائَةٍ وَلَوْ كُنْتُ ابْصِرُ الْيَوْمَ لارَيْتُكُمْ مَكَانَ الشَّجَرَةِ(الحديث: ٤١٥٤، اطرافه في: ٣٥٧٦، ٣١٥٢، ٤١٥٣، ٤٨٤٠، ٥٦٣٩)[٣٢٨] .

---

(٣٢٧) راجع (خاتمة المناقب النبوية، بعد الحديث رقم: ١٤٤٨ تجريد، تسلسل: ١٨ حيث قال العسقلاني لم يوافقه مسلم على تخريج حديث البراء: (كنا بالحديبية اربع عشرة مائة...)) - المترجم.

(٣٢٨) اخرجه مسلم في الامارة، باب: استحباب مبايعة الامام الجيش ، رقم: ١٨٥٦ .

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی حودەیبییەدا، خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) بە ئێمەی فەرموو، کە ئامادەی ئەو غەزایە بووین لەخزمەتیدا: (ئێوە باشترینی دانیشتوانی سەر ڕووی زەوین) وە ئەو کاتە ئێمە هەزارو چوار سەد کەس بووین، جابیر (رەزای خودای لێ بێ) لەکۆتایی تەمەنی دا کوێربوو بوو، بۆیە دەیفەرموو (ئەگەر ئێستا چاوم بمایە شوێنی ئەو دەرەختەم پێ نیشان دەدان کە یارانی پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) لەژێریدا بەیعەت و پەیمانیان دا، بەپێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە یارانی و پەیڕەوانی).

١٥٦٢- عَنْ سُوَيْدِ بْنِ النُّعْمَانِ (رَضيَ اللهُ عنهُ) وَكَانَ مِنْ اصْحَابِ الشَّجَرَةِ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاصْحَابُهُ اتُوا بِسَوِيقٍ فَلاكُوهُ (الحديث: ٤١٧٥، طرفه في: ١٥٣ ت= ٢٠٩ ف = بەرطى يەكەم ل/١٧٠)(٣٢٩).

١٥٦٣- عنْ عُمَرَ بْنُ الْخَطابِ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَسِيرُ فِي بَعْض اسْفَارِهِ وَعُمَرُ بْنُ الْخَطابِ يَسِيرُ مَعَهُ لَيْلا فَسَالَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ عَنْ شَيْء فَلَمْ يُجِبْهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ سَالَهُ فَلَمْ يُجِبْهُ ثمَّ سَالَهُ فَلَمْ يُجِبْهُ وَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ: ثَكِلَتْكَ امُّكَ يَا عُمَرُ نَزَرْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثلاث مَرَّاتٍ كُلُّ ذلِكَ لا يُجِيبُكَ قَالَ عُمَرُ فَحَرَّكْتُ بَعِيري ثُمَّ تَقَدَّمْتُ امَامَ الْمُسْلِمِينَ وَخَشِيتُ انْ يَنْزِلَ فِيَ قُرْانٌ فَمَا نَشِبْتُ انْ سَمِعْتُ صَارِخًا يَصْرُخُ بِي قَالَ: فَقُلْتُ: لَقَدْ خَشِيتُ انْ يَكُونَ نَزَلَ فِيَ قُرْانٌ وَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ: (لَقَدْ انْزِلَتْ عَلَيَّ اللَّيْلَةَ سُورَةٌ لَهِيَ احَبُّ الَيَّ مِمَّا طلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ) ثمَّ قَرَا ﴿انَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا﴾. (الحديث:٤١٧٧ ، طرفاه في: ٤٨٣٣، ٥٠١٢)(٣٣٠).

---

(٣٢٩) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث سويد بن النعمان في المضمضة من السويق ، فتح الباري /١ ص (٣٥٨) خاتمة كتاب الوضوء —المترجم .

(٣٣٠) لم يستثنه العسقلاني من الاحاديث المتفق عليها — المترجم .

عومەری كوڕی خەتاب (رەزای خودای لێ بێ) فەرموویː لەسەفەرێكا، بەشەو لەخزمەتی پێغەمبەردا، بەسواری دەڕۆیشتین، پرسیارێكم لە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) كرد، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) وەلامی نەدامەوە، دیسان هەمان پرسیارم لێ كردەوە هەمدیس وەلامی نەدامەوە، هەمدیسان هەمان وەلامم لێ پرسی، هەمیدسانەوە وەلامی نەدامەوە.

منیش لەبەر خۆمەوە گوتمː ئەی عومەر! بەكۆستی دایكت بكەویت، ئەوەسێ جار لەسەریەك پێغەمبەرت قەلس و بێزار كرد، كەچی وەلامیشی نەدایتەوە، جا وشترەكەمم تێز كردو لێم خوڕی هەتا چوومە پێش پێشەوە، وەمەترسی ئەوەم هەبوو، كەبێ وێلێم كردبێ و لەبارەی ئەم هەلویستەی منەوە ئایەتی قورئان بێتە خوارەوەو سەر زەنشتم بكا لەسەر ئەوە، جا ئەوەندەم نەخایاند كە گوێم لێ بوو بانگكەرێ بانگم دەكا، لەدلی خۆما گوتمː تۆ بلێی بۆیە بانگم دەكەن، چونكە سەبارەت بەسەرزەنشتی من ئایەتی قورئان هاتبێ.

جا چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) وەسلاوم لێ كرد، جا پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) هۆی وەلام نەدانەوەكەی بۆم ڕوونكردەوەو ئەم مژدەیەی پێم داو فەرمووی: (ئەوە ئەم شەو سوورەتێكم بۆ هاتۆ تەخوارەوە، لەهەموو دنیام پێخۆشترە) ئینجا بۆ ئەوەی كە بۆم ڕوون بكاتەوە كە ئەو سوورەتە كامەیە ﴿انا فتحنا لك فتحا مُبينا﴾ خوێند.

١٥٦٤- عَنْ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ يَزِيدُ احَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ قَالا خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي بِضْعَ عَشْرَةَ مِائَةً مِنْ اصْحَابِهِ فَلَمَّا اتَى ذا الْحُلَيْفَةِ قَلَّدَ الْهَدْيَ وَاشْعَرَهُ وَاحْرَمَ مِنْهَا بِعُمْرَةٍ وَبَعَثَ عَيْنًا لَهُ مِنْ خُزَاعَةَ وَسَارَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى كَانَ بِغَدِيرِ الاشْطاط اتَاهُ عَيْنُهُ قَالَ انَّ قُرَيْشًا جَمَعُوا لَكَ جُمُوعًا وَقَدْ جَمَعُوا لَكَ الاحَابِيشَ وَهُمْ مُقَاتِلُوكَ وَصَادُّوكَ عَنْ الْبَيْتِ وَمَانِعُوكَ فَقَالَ اشِيرُوا ايُّهَا النَّاسُ عَلَيَّ اتَرَوْنَ انْ امِيلَ الَى

عِيَالِهِمْ وَذَرَارِيِّ هَؤُلاءِ الَّذِينَ يُرِيدُونَ انْ يَصُدُّونَا عَنْ الْبَيْتِ فَانْ يَاتُونَا كَانَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ قَطعَ عَيْنًا مِنْ الْمُشْرِكِينَ وَالا تَرَكْنَاهُمْ مَحْرُوبِينَ قَالَ ابُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ خَرَجْتَ عَامِدًا لِهَذا الْبَيْتِ لا تُرِيدُ قَتْلَ احَدٍ وَلا حَرْبَ احَدٍ فَتَوَجَّهْ لَهُ فَمَنْ صَدَّنَا عَنْهُ قَاتَلْنَاهُ قَالَ امْضوا عَلَى اسْمِ اللَّهِ. (الحديثين: ٤١٧٨، ٤١٧٩، طرفاهما في: ٧٩٩ ت= ١٦٩٤ ف، ١٦٩٥ ف = بەرگی دووەم لاپەڕە: ٢١٥ لەم پەڕاوە پیرۆزەی کە واین لەخزمەتی دا)[٣٣١].

میسورەی کوڕی مەخرەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی غەزای حودەیبییەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خۆی و نزیکەی هەزارو چوار سەد کەس لەیارانی، لە مەدینەوە ڕۆیشتن بۆ مەککە، جارڕۆیشتن هەتا گەیشتنە زولحولەیفە، لەوێ پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) وشترە دیارییەکانی بەیتی دیاریکردو یەکی جووتێ سۆلی کردە ملیان و تێغیدا لەدوو گیان هەتا نیشانە بن کە ئەم ئاژەلانە دیاری مالّی خودان، باکەس دەستیان بۆ نەبا، هەتا دەگەنە جێگەی سەربڕینیان، وە پێغەمبەرو هاوڕێیانی لە میقاتی خەلّکی مەدینەوە کە زولحولەیفەیە ئیحرامی عەمرەیان بەست.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خەفێیەکی نارد، لەهۆزی خوزاعە، کەسووسەی دەنگوباسی دوژمنی بۆبکات، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کەوتەرێ، خۆی و هاوەلانی، هەتا گەیشتنە ئەستێلّەکەی ئەشتات، لەوێ خەفێکەی هاتەوە، کەناوی بوسری کوڕی سوفیان بوو (رەزای خودای لێ بێ) وە ئەوسالّە موسولّمان بوو،کەسالّی شەشی کۆچی بوو، وە ئامادەی غەزای حودەیبییە بوو، هاتە وە گوتی: قورەیش گەلەکۆمەیان لێ کردووی، لە هەمووتیرەو هۆزێ، هەرچی هەرچیو پەرچییە کۆیان کردۆتەوە لە دژی تۆ، دەیانەوێ شەڕت لەگەلّ بکەن و ناهێلّن بچیتە ناو مەکەوەو ناهێلّن دینی و سەردانی بەیت بکەیت! ئیتر پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی

---

(٣٣١) لم يوافقه مسلم على تخريجه (انظر رقم: ٧٩٩ تجريد -بەرگی یەکەم ل- ٢١٥) - المترجم .

مەردوم! ڕاوێژم بۆ بکەن، چیبکەین، چی نەکەین، دەڵێن چیبدەین بەسەر ماڵ وخاووخێزانیان دا، چونکە مەوداممان نادەن کە دێنی خانەی پیرۆزی خودای گەورە بکەین، حاڵ لەم دووخاڵە بەدەر نییە، یادێن و پەلاماری یەکتری دەدەین، ئەوە وەك ئەوە وایە ئەو خەفێیەی کە لە بتپەرستان ناردمان بۆ هێنانی هەواڵیان، نەگەڕاوەتەوەو خواڵە ناوی بردووەو هەروەك لەبنەڕەتەوە خەفێمان نەناردبێ وایەو، بەبێ وادە لووتمان تەقی بێ بەلووتی یەکتریدا، وەکی تریش ئەگەر نەیەن و ئێمە بچین گورزێ لەماڵ ومناڵیان بوەشێنین و بگەڕێینەوەو بەجەنگ زەدەیی بەجێیان بهێڵین).

ئەبو بەکریش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ بۆ ئەمە نەهاتووی، تۆ هاتوویت بۆ دێنی وسەردانی ئەم خانەی خودایە، بۆ کوشتنی کەس نەهاتووی و هەروا بۆ شەڕیش لەگەڵ کەسێ نەهاتووی، کەواتە: بەرەو مەبەستی سەرەکی خۆت کەسەردانی خانەی خودایە، بڕۆ، هەرکەسا ڕێمان پێ بگرێ و ڕێگەا ئەوەمان نەدا دەچین بەگژیدا پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (بە پیرۆزی ناوی خوا بکەونەڕێ).

١٥٦٥- عَنْ نَافِعٍ رحمه الله تعالى قَالَ: انَّ النَّاسَ يَتَحَدَّثونَ انَّ ابْنَ عُمَرَ اسْلَمَ قَبْلَ عُمَرَ وَلَيْسَ كَذلِكَ وَلَكِنْ عُمَرُ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ ارْسَلَ عَبْدَ اللّٰهِ الَى فَرَسٍ لَهُ عِنْدَ رَجُلٍ مِنْ الانْصار يَاتِي بِهِ لِيُقَاتِلَ عَلَيْهِ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُبايِعُ عِنْدَ الشَّجَرَةِ وَعُمَرُ لا يَدْرِي بِذلِكَ فَبايَعَهُ عَبْدُ اللّٰهِ ثمَّ ذهَبَ الَى الْفَرَسِ فَجَاء بِهِ الَى عُمَرَ وَعُمَرُ يَسْتَلْئِمُ لِلْقِتَالِ فَاخْبَرَهُ انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُبايِعُ تَحْتَ الشَّجَرَةِ قَالَ فَانْطَلَقَ فَذهَبَ مَعَهُ حَتَّى بايَعَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَهِيَ الَّتِي يَتَحَدَّث النَّاسُ انَّ ابْنَ عُمَرَ اسْلَمَ قَبْلَ عُمَرَ. (الحديث: ٤١٨٦، طرفاه في: ٣٩١٦، ٤١٨٧)[٣٣٢].

---

(٣٣٢) راجع خاتمة كتاب المبعث المذكور في هذا المجلد بعد الحديث رقم: ١٥٢٢ ، تجريد ، رقم: ٣٩١٦/١٥ فتح - المترجم .

نافيع (رەزای خودای لیٚ بیٚ) کەفەقێی ئیبنو عومەر بووە، فەرمووی: ئەوخەڵکە گوایە دەڵێن: ئیبنوعومەر لە پێش عومەری باوکی دا موسوڵمان بووە، بەڵام ئەمە وانییە، ئەم گومانە هەڵەیە لەمەوە بووە، ڕۆژی غەزای حودەیبییە، عومەر ئەسپێکی لەلای پیاوێکی ئەنصاری دەبیٚ، ئیبنو عومەری کوڕی کەناوی عەبدوڵلابوو، دەنێریٚ بۆ ئەو ئەسپە، تا بۆی بهێنیٚ غەزا لە سەرپشتی بکا، کە ئیبنو عومەر دەچیٚ بەم کارەوە، دەڕوانیٚ وا پێغەمبەر (دروودی خودای لیٚ بیٚ) لەبن درەختی بەیعەتولریزوانا لە حودەیبییە، پەیمان وەردەگریٚ لە یارانی، ئیمامی عومەر ئاگای لەمەنەبوو، جا عەبدوڵلای کوڕی لە پێش باوکی دا پەیمان دەدا بە پێغەمبەر، ئەوجا دەچیٚ بۆ ئەسپەکەو دەیبا بۆعومەری باوکی، دەڕوانیٚ وا باوکی زریە لەبەردەکا بۆ شەڕکردن.

جا عەبدوڵلا هەواڵی پیٚ دەدا، کەپێغەمبەر(دروودی خودای لیٚ بیٚ) لەبن درەختەکەدا خەریکە پەیمان لە موسوڵمانان وەر دەگریٚ. فەرمووی: ئەوجا عومەرو عەبدوڵلایکوڕی دەچن بۆ خزمەت پێغەمبەرو عومەر پەیمان دەدا بە پێغەمبەرو دیسان عەبدوڵلایش پەیمانی دەداتیٚ جا ئالەم هەڵوێستەوە خەڵکەکە بەهەڵە دەڵێن: عەبدوڵلای کوڕی عومەر، لەپێش باوکیدا موسوڵمان بووە).

١٥٦٦- عنْ عَبْد اللّهِ بْنَ ابِي اوْفَى (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ اعْتَمَرَ فَطافَ فَطفْنَا مَعَهُ وَصَلَّى وَصَلَّيْنَا مَعَهُ وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَكُنَّا نَسْتُرُهُ مِنْ اهْلِ مَكَّةَ لا يُصِيبُهُ احَدٌ بِشَيْءٍ. (الحديث:٤١٨٨، طرفه في: ٧٦٨ تجريد = ١٦٠٠ فتح = بەرطى/٢ ل - ١٩٤)[٣٣٣]

لێرەدا دەفەرمویٚ: خۆشم لەگەڵ پێغەمبەردا بووم لەتەواف کردن ولە نوێژ کرنەکەدا، وەهەروەها دەفەرمویٚ: خۆشم بەشداریم دەکرد لە ئاگاداریی پێغەمبەردا، نەوەکا زیانێکی پیٚ بگەیەنن.

---

(٣٣٣) راجع رقم: ٧٦٨ت = ١٦٠٠ف = بەرطى /٢ل –١٩٤ . - المترجم .

# غەزای زاتول قەرەد ( غزوة ذات القرد)

١٥٦٧- عنْ سَلَمَةَ بْنَ الاكوَع (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ خَرَجْتُ قَبْلَ انْ يُؤَذنَ بالاولَى وَكَانَتْ لِقَاحُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) تَرْعَى بِذي قَرَدَ قَالَ فَلَقِيَنِي غُلامٌ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ فَقَالَ اخِذتْ لِقَاحُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قُلْتُ: مَنْ اخَذهَا؟ قَالَ غَطفَانُ قَالَ فَصَرَخْتُ ثلاث صَرَخَاتٍ يَا صَبَاحَاهْ قَالَ فَاسْمَعْتُ مَا بَيْنَ لابَتَيْ الْمَدِينَةِ ثمَّ انْدَفَعْتُ عَلَى وَجْهِي حَتّى ادْرَكْتُهُمْ وَقَدْ اخَذوا يَسْتَقُونَ مِنْ الْمَاء فَجَعَلْتُ ارْمِيهِمْ بِنَبْلِي وَكُنْتُ رَامِيًا وَاقُولُ:

انَا ابْنُ الاكوَع      وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضعْ

وَارْتَجِزُ حَتّى اسْتَنْقَذتُ اللّقَاحَ مِنْهُمْ وَاسْتَلَبْتُ مِنْهُمْ ثلاثينَ بُرْدَةً قَالَ وَجَاء النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَالنَّاسُ فَقُلْتُ يَا نَبِيَ اللّهِ قَدْ حَمَيْتُ الْقَوْمَ الْمَاء وَهُمْ عِطاشٌ فَابْعَث الَيْهِمْ السَّاعَةَ فَقَالَ يَا ابْنَ الاكوَع مَلَكْتَ فَاسْجِحْ قَالَ ثمَّ رَجَعْنَا وَيُرْدِفُنِي رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عَلَى نَاقَتِهِ حَتّى دَخَلْنَا الْمَدِينَةَ. (الحديث: ٤١٩٤، طرفه في: ١٢٤٠ تجريد = ٣٠٤١ فتح = بەرطى/٣ل – ٣٦٤)[٣٣٤].

ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە ڕابورد، لێرە ئەم بەهرانەی تری واتیادا:

١- لە پێش مەلا بانگدانا سەلەمە لەماڵ دەرچوو.

٢- ئەم ڕووداوە پێی دەگوترێ: غەزای زی قورەد، لەساڵی شەشی کۆچیدا بووە.

٣- لەم گێڕانەوەدا سەلەمە دەفەرمووێ: سیی عابایشم بەتالانی لێ گرتن.

٤- لێرەدا دەفەرموێ: کاتێ گەراینەوە بۆ مەدینە، من پیادەبووم، پێغەمبەر خۆی بۆ زێدە ڕێز، لەپاشکۆی خۆیەوە تا مەدینە سواری کردم، پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) وشترێکی مێنگەی لە ژێردا بوو.

(٣٣٤) راجع رقم: ١٢٤٠ت= ٣٠٤١ف =بەرطی /٣ل –٣٦٤ . - المترجم .

# غەزای خەیبەر (غزوة خيبر)

١٥٦٨- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الاكوَع (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) الَى خَيْبَرَ فَسِرْنَا لَيْلا فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ لِعَامِرٍ يَا عَامِرُ (رَضيَ اللهُ عنهُ) الا تُسْمِعُنَا مِنْ هُنَيْهَاتِكَ وَكَانَ عَامِرٌ رَجُلا شَاعِرًا حدّاء فَنَزَلَ يَحْدُو بالقَوْمِ يَقُولُ:

اللّهُمَّ لَوْلا انتَ مَا اهْتَدَيْنَا وَلا تَصَدَّقْنَا وَلا صَلَّيْنَا
فَاغْفِرْ فِداء لَكَ مَا ابْقَيْنَا وَثَبِّتْ الاقْدَامَ انْ لاقَيْنَا
وَالْقِيَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا انَّا اذا صِيحَ بِنَا ابَيْنَا
وَبالصِّيَاحِ عَوَّلُوا عَلَيْنَا

فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): مَنْ هَذا؟ السَّائِقُ قَالُوا: عَامِرُ بْنُ الاكوَع قَالَ يَرْحَمُهُ اللّهُ قَالَ رَجُلٌ مِنْ الْقَوْمِ وَجَبَتْ يَا نَبِيَ اللّهِ لَوْلا امْتَعْتَنَا بِهِ؟ فَاتَيْنَا خَيْبَرَ فَحَاصَرْنَاهُمْ حَتَّى اصَابَتْنَا مَخْمَصَةٌ شَدِيدَةٌ ثمَّ انَّ اللّهَ تَعَالَى فَتَحهَا عَلَيْهِمْ فَلَمَّا امْسَى النَّاسُ مَسَاء الْيَوْمِ الَّذي فُتِحَتْ عَلَيْهِمْ اوْقَدُوا نِيرَانًا كَثِيرَةً فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): مَا هَذهِ النِّيرَانُ عَلَى ايِّ شَيْء تُوقِدُونَ قَالُوا: عَلَى لَحْمٍ قَالَ: عَلَى ايِّ لَحْمٍ قَالُوا: لَحْمِ حُمُرِ الانْسِيَةِ قَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): اهْرِيقُوهَا وَاكْسِرُوهَا فَقَالَ:رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللّهِ اوْ نُهَرِيقُهَا وَنَغْسِلُهَا قَالَ اوْ ذاكَ فَلَمَّا تَصَافَّ الْقَوْمُ كَانَ سَيْفُ عَامِرٍ قَصِيرًا فَتَنَاوَلَ بِهِ سَاقَ يَهُودِيٍّ لِيَضرِبَهُ وَيَرْجِعُ ذبابُ سَيْفِهِ فَاصَابَ عَيْنَ رُكْبَةِ عَامِرٍ فَمَاتَ مِنْهُ قَالَ فَلَمَّا قفلُوا قَالَ سَلَمَةُ رَانِي رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَهُوَ اخِذ بِيَدِي قَالَ مَا لَكَ قُلْتُ لَهُ: فَدَاكَ ابِي وَامِّي زَعَمُوا انَّ عَامِرًا حَبِط عَمَلُهُ قَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): كَذبَ مَنْ قَالَهُ انَّ لَهُ لاجْرَيْنِ وَجَمَعَ بَيْنَ اصْبَعَيْهِ انَّهُ لَجَاهِدٌ مُجَاهِدٌ قَلَّ عَرَبِيٌّ مَشَى بِهَا مِثلَهُ حَدَّثنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثنَا حَاتِمٌ قَالَ:نَشَا بِهَا). (الحديث: ٤١٩٦، اطرافه في: ٢٤٧٧، ٥٤٩٧، ٦١٤٨، ٦٣٣١، ٦٨٩١)[٣٣٥].

(٣٣٥) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: غزوة خيبر ، رقم: ١٨٠٢ .

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا، دەرچووین بۆ غەزای خەیبەر، شەو بوو دەڕۆیشتین، پیاوێ لە لەشکرەکە بە عامیری مامەی گوت: ئەی عامیر! نەختێ وورەوورمان بۆ ناکەیت، ئادەی کەمێ هۆرەو سۆزمان بە دەنگە خۆشەکەت بۆبکە.

فەرمووی: عامیر پیاوێکی شاعیر بوو، هۆرەو سۆزی خۆشی دەکرد، جا ئەویش دابەزی وە دەستی کرد بە سۆز کردن و گوتی:

اللهم لولا انت ما اهتدينا

ولا تصدقنا ولا صلينا

فاغفر فداء لك مَا القينا

وثبت الاقدام ان لاقينا

والقين سكينة علينا

انا اذا صيح بنا ابينا

وبالصياح عولوا علينا

(بڕوانە: بەرگی سێ، لاپەڕە: ٣٠٠ - ١١٦٨ تەجرید).

جا خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەم دەنگخۆشەکێ یەکە بەدەنگی خۆشی وشترەکان لێ دەخوڕێ؟) گوتیان: عامری کوڕی ئەکوعە، فەرمووی: (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) پیاوێ لەیاران کە ئیمامی عومەر بوو، عەرزی پێغەمبەری کرد: شەهید بوونی مسۆگەر بوو، خۆزگەپێمانت دەهێشت، بۆیە عومەر وایفەرموو، چونکە بە ئەزموون بۆیان دەرکەوتبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) بەهەرکەسێ وابڵێو ئەم نزای (رحمه الله)ی بۆ بکا، شەهید دەبێ و بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێ.

جا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە خەیبەرو گەمارۆمان داو دەورەمان گرت، تووشی برسێتییەکی سەخت بووین، لە پاش ماوەیێ خودای گەروە بۆی فەتح کردین و قەلاکەمان ئازاد کرد، جالە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا کە قەلاکەیان

ئازاد کرد، مەردو مەکە ئاگرێکی زۆریان کردەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەم ئاگرانە چین؟ وەلە ژێری چیدا دەگرێن؟) گوتیان: گۆشتیان وابەسەرەوە، فەرمووی: (گۆشتی چی؟) گوتیان: گۆشتی کەری ماڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (گۆشتەکە برێژن و مەنجەڵەکان بشکێنن) پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی بۆ گۆشتەکە نەرێژین و مەنجەڵەکان بشۆین؟ فەرمووی: (یاوابکەن ئەومیش دەبێ).

جا کاتێ جەنگاوەرەکان لە هەردوو بەرەی شەڕ، ریزبوون و بەرابەر وەستان، مەرحەبی شای خەیبەر خۆی چووە مەیدان و دەستی کرد بە هەڕەشە کردن و تەحەددا کردن، عامیریش بۆیچووە مەیدان، شمشێرەکەی عامیر کورت بوو، دەستی کرد بەلێدانی قاچی کابرایەکی جوولەکە، کەمەرحەب بوو، بەڵام نووکی شمشێرەکەی گەڕایەوە بۆ خۆی و دای لە کەشکە ئەژنۆی خۆی و بەوە شەهید بوو.

سەلەمە فەرمووی: کاتێ شەڕ تەواو بوو، گەڕاینەوە بۆ مەدینە، لەرێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بینیمی، دەستی گرتم و فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆ وابڕسکاوی؟) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا باوك ودایکم بەقوربانت بێ، پەستی ئەوەم کە دەڵێن: عامیری مامەم کردەوەی بەفیڕۆ چووە، گوایە خۆی خۆی کوشتووە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوەی وادەڵێ درۆ دەکا، بەڵکوو بە پێچەوانەوە عامیر لەسەر ئەم شەهید بوونەی دوو پاداشتی گەورەی بۆهەیە) پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دوو پەنجەی خۆی نووسان بەیەکەوە، ئەوجا فەرمووی: (ئەو دوو پاداشە هی ئەم دووشتەیە: یەکەم عامیر لە عیبادەتا خۆی دەڕەنجان و پەرستکارێکی چاك بوو، دووەم عامیر تێکۆشەر و غەزاکارێکی کەم مانەندبوو، بەدەگمەن وا بووە هەتا ئێستا لەناو عەرەبانا، کەلەم ڕۆژگارەدا زۆرینەی موسوڵمان عەرەبن، پیاوی وەك عامیر هەبێ کە ئەم دوو رەفتارە شیرینەی تیادابێ!).

١٥٦٩- عَنْ انسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (اتَى خَيْبَرَ لَيْلا وَكَانَ اذا اتَى قَوْمًا بِلَيْلٍ لَمْ يُغِرْ بِهِمْ حَتَّى يُصْبِحَ فَلَمَّا اصْبَحَ خَرَجَتْ الْيَهُودُ بِمَسَاحِيهِمْ وَمَكَاتِلِهِمْ فَلَمَّا رَاوْهُ قَالُوا: مُحَمَّدٌ وَاللّهِ مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): خَرِبَتْ خَيْبَرُ انَّا اذا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاء صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ. (الحديث: ٤١٢٧، طرفه سبق في: ٢٣٥ ت= ٣٧١ فتح = بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٢٤٨) وفي روايَةٍ: فقتلَ النبيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) الْمقاتِلَةَ وسبى الذرِّيَةَ). (الحديث: ٤٢٠٠، طرفه سبق في: ٣٧١ فتح)[٣٣٦].

واتاو ڕاڤەی ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لە ژمارە: ٢٣٥دا رابورد. بڕوانە: تاج/ ٨ ل/٢٢٤ ز/٩٠ ف/٢ +٣ - باسی غەزای خەیبەر.

١٥٧٠- عَنْ ابِي مُوسَى الاشعري (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (لَمَّا غَزَا رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) خَيْبَرَ اوْ قَالَ لَمَّا تَوَجَّهَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) اشْرَفَ النَّاسُ عَلَى وَادٍ فَرَفَعُوا اصْوَاتَهُمْ بالتَّكْبِيرِ اللّهُ اكْبَرُ اللّهُ اكْبَرُ لا الَـهَ الا اللّهُ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ارْبَعُوا عَلَى انْفُسِكُمْ انَّكُمْ لا تَدْعُونَ اصَمَّ وَلا غَائِبا انَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعًا قَرِيبا وَهُوَ مَعَكُمْ وَانَا خَلْفَ دَابَّةِ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَسَمِعَنِي وَانَا اقُولُ لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ الا باللّهِ فَقَالَ لِي يَا عَبْدَ اللّهِ بْنَ قَيْسٍ قُلْتُ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللّهِ قَالَ الا ادُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ قُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللّهِ فَدَاكَ ابِي وَامِّي قَالَ لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ الا باللّهِ. (الحديث: ٤٢٠٢)[٣٣٧].

عەبدوڵڵای کوڕی قەیس (رەزای خودای لێ بێ) کەناسراوە بە ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) قەڵای خەیبەری ئازاد کرد، لەشکرەکە لە شیوێکەوە بەرەو خوار بوونەوە، بەو

(٣٣٦) اخرجه مسلم في الحج، باب: فضل المدينة وفي الجهاد والسير باب: غزوة خيبر، رقم: ١٣٦٥.

(٣٣٧) اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: استحباب خفض الصوت ... رقم: ٢٧٠٤ .

بۆنەیەوە دەستیان کرد بەئەڵلاهوئەکبەرو دەیانگوت: (الله اكبر الله اكبر لااله الاالله) پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هێواش بن و دەنگەدەنگ مەکەن، خۆ ئێوە بانگی کەڕولاڵ ناکەن، هەتا وادەنگ هەڵبڕن، یابانگی کەسێ ناکەن کە غائیب و نادیاربێ و پێویستی بەدەنگ هەڵبڕینی ئێوەبێ تاگوێی لە دەنگتان بێ، ئەوکەسەی کەئێوە هاواری لێ دەکەن و بانگی دەکەن، هەم بیسەرو ژنەوایە، هەم نزیکەو لەگەڵتانایەو بەکەم و بەزۆر ئاگای لەحاڵتانە).

من لەم کاتەدا لە پشت ولاخەکەی پێغەمبەرەوە بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) گوێی لەمن بوو گوتم: (لاحول ولا قوه الا بالله) فەرمووی: (ئەی عەبدوڵلای کوڕی قەیس!) عەرزیم کرد: بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! وام لەخزمەتدا، فەرووی: (با وشەیەکت پێ نیشان بدەم، کە گەنجێکە لەگەنجینەکانی بەهەشت) گوتم: بفەرموو، یارسول الله، باوك و دایکم بەقوربانت بن، فەرمووی: (ئەو وشەیە وشەی لاحول ولا قوة الا بالله)یە.

١٥٧١– عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْتَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ فَاقْتَتَلُوا فَلَمَّا مَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى عَسْكَرِهِ وَمَالَ الاخَرُونَ الَى عَسْكَرِهِمْ وَفِي اصْحَابِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ لا يَدَعُ لَهُمْ شَاذَةً وَلا فَاذَةً الا اتَّبَعَهَا يَضرِبُهَا بِسَيْفِهِ فَقِيلَ: مَا اجْزَا مِنَّا الْيَوْمَ احَدٌ كَمَا اجْزَا فُلانٌ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) امَا انَّهُ مِنْ اهْلِ النَّارِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: انَا صَاحِبُهُ. قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ كُلَّمَا وَقَفَ وَقَفَ مَعَهُ وَاذا اسْرَعَ اسْرَعَ مَعَهُ قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحًا شَدِيدًا فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بالارْض وَذبابَهُ بَيْنَ ثدْيَيْهِ ثمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَخَرَجَ الرَّجُلُ الَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: اشْهَدُ انَّكَ رَسُولُ اللّٰهِ قَالَ: وَمَا ذاكَ: قَالَ الرَّجُلُ الَّذي ذكَرْتَ انِفًا: انَّهُ مِنْ اهْلِ النَّارِ فَاعْظَمَ النَّاسُ ذلِكَ فَقُلْتُ: انَا لَكُمْ بِهِ فَخَرَجْتُ فِي طَلَبِهِ ثمَّ جُرِحَ جُرْحًا شَدِيدًا فَاسْتَعْجَلَ

الْمَوْتَ فَوَضعَ نَصْلَ سَيْفِهِ فِي الارْض وَذبابَهُ بَيْنَ ثدْيَيْهِ ثمَّ تَحَامَلَ عَلَيْهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): عِنْدَ ذلِكَ انَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ اهْلِ الْجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَهُوَ مِنْ اهْلِ النَّارِ وَانَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ اهْلِ النَّارِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَهُوَ مِنْ اهْلِ الْجَنَّةِ. (الحديث: ٤٢٠٣، اطرافه في: ٤٢٠٢، ٤٢٠٧، ٦٤٩٣، ٦٦٠٢)[٣٣٨].

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل ساعیدی (ڕەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لیّ بیّ) لەگەڵ دوژمنی هاوبەشکارانا ئاوقەدییەك بون و بوو بەجەنگ لە نێوانیان دا، جا کاتێ هەردوولا بەرەو بەرەی خۆیان کشانەوە، پیاوێ هەبوو لەناو یارانی پێغەمبەردا لەکاتی شەڕەکەدا بەرەنگاری هەریەکێ لە لەشکری دوژمن ببوایە، بوارەی نەدەدا، بەشمشێر دایدەگرت، یارانی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەر و ڕەزای خوا لەوان) فەرموویان: بەڕاستی ئەمڕۆ فیسارە کەس فریامان کەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لیّ بیّ) فەرمووی: (دەی ئەو زەلامە لە ئەهلی دۆزەخە) پیاوێ لەهاوڕێیان فەرمووی: دەبێ ئەم نهێنییە بدۆزمەوە. فەرمووی: جا شوێنی دەکەوێ لەکاتی شەڕکردن و هەڵمەت بردن دا، پیاوە ئازاکە لە کۆێ دەویستێ ئەویش لەگەڵی دەوێستێ، لەکۆێ خێرادەڕوا ئەویش خێرا دەڕوا، جالەکاتی جەنگین دا پیاوە ئازاکە زامار دەکرێ، زامێکی سەختی لێ دەکرێ جا پەلە لەمەرگیخۆی دەکا، مشتووی شمشێرەکەی لەسەرزەوییەکە دادەنێ و نووکەکەی لە نێوانی هەردوو مەمکی خۆیا دادەنێ و ئەوجا بە هەموو هێزی خۆی بە حوججەت خۆی دەدا بەسەر شمشێرەکەی دا و خۆی دەکوژی! جا پیاوەکەی کە شوێنی کەوتبوو هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لیّ بیّ) وە عەرزی کرد: شایەتی بەحەق دەدەم کە تۆ پێغەمبەری ڕەوانە کراوی خودای بۆ سەر

---

(٣٣٨) اخرجه مسلم في الايمان، باب: غلظ تحريم قتل الانسان نفسه، وفي القدر ، باب: كيفية خلق الادمي، رقم: ١١٢

بەرەی ئادەمیزاد، فەرمووی (دروودی خودای لێ بێ) (چۆن؟) گوتی: چونکە ئەوەی فەرمووت لەبارەی ئەو پیاوەوە هاتەدی، ئەوە بوو کەتۆ فەرمووت ئەو پیاوە لەخەڵکی دۆزەخە، مەر دومەکە ئەوەیان بەلاوە زەحمەت بوو، ئەو ئەوەندە ئازاو سوودمەندبێ بۆ سوپای ئیسلام کەچی دۆزەخیش بێ!! منیش پێیانم گوت: لێی گەڕێن بۆ من و من ئەم نهێنییەتان بۆ دەردەخەم، ئیتر شوێنی کەوتم، جا پیاوە کە چۆن زامار بوو، وەچۆن خۆی کوشت ئاوا لەنووکەوە گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) . جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پاش بیستنی ئەم داستانە فەرمووی: (پیاوی واهەیە کردارو ڕەفتاریوەك کردارو ڕەفتاری بەهەشتی وا، لەخەڵك وایە بەهەشتیە، بە لام خۆی دۆزەخییە، پیاویوایش هەیە بەپێچەوانەوە، لەخەڵك وایە کە دۆزەخییە، بەڵام خۆی بەهەشتییە). خوایە! بمانپارێزی لەشتیوا. (بڕوانە: تاج/١ ل/٤٠ ز/٦ ف/٤ - باسی باوەڕ بەچارەنووس).

١٥٧١م– وفي رواية عن ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ فَقَالَ رسول الله صلى الله عليه وسلّم قُمْ يَا فُلانُ فَاذنْ انَّهُ لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ الا مُؤْمِنٌ انَّ اللَّهَ لَيُؤَيِّدُ الدِّينَ بالرَّجُلِ الْفَاجِرِ (الحديث: ٤٢٠٤، اطرافه في: ٣٠٦٢، ٤٢٠٣، ٦٦٠٦)[٣٣٩].

لەگێڕانەوەیەکا، لەئەبوهورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (جا خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی:(ئەی فیسارەکەس! ئادەی هەڵسە، بەفەرمانی خواو پێغەمبەریخوا، جاڕبدەبە ناو خەڵکەکەدا و بانگەواز هەڵ دەکە: بێجگە لەموسوڵمان کەسی تر ناچێتە بەهەشت، بەهەشت لەسەر کافری بێباوەڕ حەرامە، زۆر جاریش وا دەبێ کە خودای گەورە بەهۆی پیاوی بەدکارەوە یاریدەی ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە دەدات). (بڕوانە: ژ:١٣٨٠ تجرید).

---

(٣٣٩) راجع الرقم السابق . - المترجم .

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

ئەم جۆرە فەرموودەیە لە زۆر ڕووەوە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە:

١- وەك: پیاو نموونەیە نەوەك مەرج و قەید، ژنیش هەروایە لە کاتی وادا، واتە: کەسەکە ژن بێ یان پیاو جیاوازی نییە.دووەم: مەبەست لەم جۆرە تەعبیرانە (ئەوە دۆزەخییە) یا (ئەوە لەئاگردایە) ئاگری هەتاهەتایی نییە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە: کە بەهۆی هەندێ کاری گوناهەوە، شایانی ئەوەیە کە بچێتە ناو دۆزەخەوە، وە بەپێی تاوان و گوناهەکەی لەدۆزەخا بمێنێتەوە، دوایی لە دۆزەخ دەرچێ و بچێتە ناو بەهەشت، مەگەر لەهەندێ حالا کە کابرا کافر، یامونافق، یامولحید بێ. هەتا ئەمڕۆکەش زۆر جار خودا بەهۆی پیاوی بەدکارەوە، ئیسلام سەردەخا. دەڵێن: ئەم پیاوە ناوی قزمان بووە، ڕاڤەنووسان وایان لەقەڵەم داوە، کە قەزمان بەکافری مردبێ، یابە فاسقی.

٢- زانایان دەفەرموون: خۆ کوژ بەدکارو فاسقە، بەڵام بە خۆکوژین کافر نابێ، کەواتە: ئەبەدی نابێ لەدۆەخا.

٣- ناونیشانی باش ئاشکرا بکرێ باشە، وەك: ئەوە بگوترێ: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە زانایەکی گەورەیە، کاکە احمد شێخ وەلی خوابووە، خەواریقی شەرعی لێ بینراوە بۆ ئەم بڕگەیە ئیمامی عەسقەلانی لە فەتحولباریدا بەدەق دەفەرموێ: (وفي الحديث جواز اعلام الرجل الصالح بفضيلة تكون فيه).

٤- بەبێ ڕاجیایی، بەپێی دەقی ئایەتی قورئان، هەموو گوناهێ بێجگە لە هاوڕێ بڕیاردان بۆ خودای گەورە، ئەگەری لێخۆشبوونی هەیە وە زۆربەی ئەم هەوالانەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەم بارەیەوە ڕایگەیاندوون لەم جۆرەن، لەبەر ئەوە بۆ ئێمە واباشە لەم کاتا نەداعیبرەت و پەندو دەرس و وانە لەفەرموودەکە و ناوەڕۆکەکەی وەربگرین، نەوەك گومانی بە دوقسەی خراپ بەم جۆرەکەسانەی لەم

جۆره فەرموودانـە دا نـاوبراون بکـەین، چـونکه زۆرینـەیان لـەوە دوا ئیسلام بوون مرۆی باشیان لیٚ دەرچووە.

١٥٧٢- عن يَزِيد بْنُ اَبِي عُبَيْدٍ رحمه الله تعالى قَالَ: رَايْتُ اثر ضَرْبَةٍ فِي سَاقِ سَلَمَةَ بن الاكوع (رضيَ اللهُ عنهُ) فَقُلْتُ: يَا ابا مُسْلِمٍ مَا هَذِهِ الضرْبَةُ؟ فَقَالَ هَذِهِ ضرْبَةٌ اصَابَتْنِي يَوْمَ خَيْبَرَ فَقَالَ النَّاسُ اصِيبَ سَلَمَةُ فَاتَيْتُ النَّبِيَ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنَفَثَ فِيهِ ثلاث نَفَثاتٍ فَمَا اشْتَكَيْتُهَا حَتَّى السَّاعَةِ(الحديث: ٤٢٠٦)[٣٤٠].

یەزیـدی کـوری ئەبوعوبەیـد (رەحمـەتی خـودای گـەورەی لـیٚ بـیٚ) فەرمووی: شوێنی برینی گورزێکی کۆنم بەلاقی سەلەمەی کورِی ئەکوەعەوە بینـی، پـێم گـوت: ئەبوموسـلیم! ئـەم جێگـه برینـه کۆنـه چـیـیه؟ فـەرمووی: لەرِۆژی غەزای خەیبەردا ئەم برینـەم لـا کـرا، خەڵکەکـه هاواریان لیٚ هەڵسا: ئای سەلە پێکرا! منیش لەسـەر ئـەو حاڵـه چوومه خزمـەتی پێغەمـەر (دروودی خودای لیٚ بیٚ) پێغەمبـەر بەتـەرِی دەمـی پیرۆزی سیٚ جار پفـی لـه شوێنی زامـه سەختەکه کرد، ئیتر واچاك بۆوە لەوساکاوە هەتا ئێستاسکالام نەماله دەستی.

**رِوونکردنەوە:**

بـرِوانــه: تــاج/٨ ل/٢٢٥ ف/٤ ز/٩٠ غــەزای خەیبــەر.ئــەم فەرموودەیــه چـواردەهەم فەرموودەیــه لــه فەرموودەسـیانی (ثلاثـی)یـەکانی صـەحیحی بوخـاری، بـرِوانــه: فــەرموودەی ژمـاره: ١٢٤٠ تەجریـد = ٣٠٤١ فـەتح = بـەرگی سێیەم لاپەرِه: ٣٦٤. بـرِوانـه: ژمارە: ١٥٤١ تەجرید.

١٥٧٣- عنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ اقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ خَيْبَرَ وَالْمَدِينَةِ ثلاث لَيَالٍ يُبْنَى عَلَيْهِ بِصَفِيَةَ فَدَعَوْتُ الْمُسْلِمِينَ الَى وَلِيمَتِهِ وَمَا كَانَ فِيهَا مِنْ خُبْزٍ وَلا لَحْمٍ وَمَا كَانَ فِيهَا الا انْ امَرَ بِلالا بالانْطاعِ فَبُسِطتْ فَالْقَى

(٣٤٠) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث سلمة في الضرب يوم خيبر -المترجم .

عَلَيْهَا التَّمْرَ وَالاقِط وَالسَّمْنَ فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: احْدَى امَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ اوْ مَا مَلَكَتْ يَمِينُهُ؟ قَالُوا: انْ حَجَبَهَا فَهِيَ احْدَى امَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ وَانْ لَمْ يَحْجُبْهَا فَهِيَ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ فَلَمَّا ارْتَحَلَ وَطا لَهَا خَلْفَهُ وَمَدَّ الْحِجَابَ. (الحديث: ٤٢١٣، طرفه سبق في: ٣٧١ تجريد= ٦١٠ فتح = بةرطى/٣ ل –٢٤٨)[٣٤١].

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **لەپاش تەواو بوونی غەزای خەیبەر، لەجێگەیێ، لەنێوانی خەیبەرو مەدینەدا، سێ شەو مایەوە، صەفییەی کچی حویەییان بۆ گواستەوە، من خۆم خوڵکی موسوڵمانانم دەکرد بۆسەرنانی شایی، نانی شاییەکە نان و گۆشتی تیا نەبوو، تەنیا برێتی بوو لەوە کەحەزرەت** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمانی کرد سفرەکانیان ڕاخست و هەنێ خورما و کەشك و ڕۆنیان هەڵرشتە سەریان و دەستیان کرد بە خواردنی! ئیتر ئەوە نانی شایی یەکەی پێغەمبەر بوو، کە کردی بۆ صەفییە، موسوڵمانانیش لەناو خۆیانا کەوتنە مقۆمقۆ: ئایاصەفییە یەکێك دەبێ لە دایکانی موسوڵمانان، یاکەنیزەکا دەبێ لەکەنیزەکەکانی پێغەمبەر؟ ئەنجا گوتیان: ئەگەر پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **پەردەی گرتەوە بۆی ئەوە ژنیەتیو دەبێ بەدایکی موسوڵمانان، ئەگینا ئەوە کەنیزەکیەتیو نابێ بەدایکی موسوڵمانان، جاکاتێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **کەوتەڕێ لە پاشکۆی خۆیەوە جێگەی بۆ خۆش کردو خستیە پاشکۆی خۆیو چارشێوی بۆ گرتەوە تا خەڵك نەیبینن). (تاج/٣ ل/٩٣ ز/٤٠ ف/٣- نانی شایی).**

١٥٧٤- عَنْ عَلِيٍّ بْنِ ابِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ)انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاء يَوْمَ خَيْبَرَ وَعَنْ اكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الانْسِيَةِ (الحديث: ٤٢١٦، اطرافه في: ٥١١٥، ٥٥٢٣، ٦٩٦١)[٣٤٢].

---

(٣٤١) راجع رقم:٢٣٥ تجريد - المترجم .

(٣٤٢) اخرجه مسلم في التكاح، باب: نكاح المتعة وبيان انه ابيح ثمَّ نسخ ، وفي الصيد و الذبائح، باب: تحريم لحم الحمر ... رقم: ١٤٠٧ .

**ئیمامی عەلی** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەکاتی غەزای خەیبەردا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەکاتی غەزای خەیبەردا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **ژن سیغەکردنی قەدەغە کرد، هەروا خواردنی گۆشتی کەری ماڵیشی قەدەغە کرد. ( بڕوانە: تاج/٣ ل/١٤٧ ز/٦٠- باسی سیغەکردن حەرامە ف/١+ ٢+ ٣+ ٤ ).**

١٥٧٥- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ قَسَمَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَوْمَ خَيْبَرَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ وَلِلرَّاجِلِ سَهْمًا. (الحديث: ٤٢٢٨، طرفه في: ١١٨٢ تجريد = ٢٨٦٣ فتح = بەرطى/٣ ل - ٣١٠).

١٥٧٦- عَنْ ابي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ بَلَغَنَا مَخْرَجُ النَّبِيِّ(صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَنَحْنُ بالْيَمَنِ فَخَرَجْنَا مُهَاجِرِينَ الَيْهِ انَا وَاخَوَانِ لِي انَا اصْغَرُهُمْ احَدُهُمَا ابُو بُرْدَةَ وَالاخر ابُو رُهْمٍ امَّا قَالَ: في بِضعٍ وَامَّا قَالَ: فِي ثلاثةٍ وَخَمْسِينَ اوْ اثنَيْنِ وَخَمْسِينَ رَجُلا مِنْ قَوْمِي فَرَكِبْنَا سَفِينَةً فَالْقَتْنَا سَفِينَتُنَا الَى النَّجَاشِيِّ بالْحَبَشَةِ فَوَافَقْنَا جَعْفَرَ بْنَ ابِي طَالِبٍ فَاقَمْنَا مَعَهُ حَتَّى قَدِمْنَا جَمِيعًا فَوَافَقْنَا النَّبِيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ.

وَكَانَ انَاسٌ مِنْ النَّاسِ يَقُولُونَ لَنَا: يَعْنِي لاهْلِ السَّفِينَةِ سَبَقْنَاكُمْ بالْهِجْرَةِ وَدَخَلَتْ اسْمَاء بِنْتُ عُمَيْسٍ وَهِيَ مِمَّنْ قَدِمَ مَعَنَا عَلَى حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) زَائِرَةً وَقَدْ كَانَتْ هَاجَرَتْ الَى النَّجَاشِيِّ فِيمَنْ هَاجَرَ فَدَخَلَ عُمَرُ عَلَى حَفْصَةَ وَاسْمَاء عِنْدَهَا فَقَالَ عُمَرُ: حِينَ رَاى اسْمَاء مَنْ هَذِهِ قَالَتْ اسْمَاء بِنْتُ عُمَيْسٍ: قَالَ عُمَرُ: الْحَبَشِيَةُ هَذهِ الْبَحْرِيَةُ هَذهِ؟ قَالَتْ اسْمَاء: نَعَمْ قَالَ: سَبَقْنَاكُمْ بالْهِجْرَةِ فَنَحْنُ احَقُّ بِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مِنْكُمْ فَغَضِبَتْ وَقَالَتْ: كَلا وَاللّٰهِ كُنْتُمْ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يُطعِمُ جَائِعَكُمْ وَيَعِظ جَاهِلَكُمْ وَكُنَّا فِي دَارِ اوْ فِي ارْض الْبُعَدَاء الْبُغَضاء بالْحَبَشَةِ وَذلِكَ فِي اللّٰهِ وَفِي رَسُولِهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَايْمُ اللّٰهِ لا اطعَمُ طعَامًا وَلا اشْرَبُ شَرَابا حَتَّى اذكُرَ مَا قُلْتَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَنَحْنُ كُنَّا نُؤْذى وَنُخَافُ

وَسَاذكُرُ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَاسْالُهُ وَاللّهِ لا اكْذبُ وَلا ازِيغُ وَلا ازِيدُ عَلَيْهِ.

فَلَمَّا جَاء النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَتْ: يَا نَبِيَ اللّهِ انَّ عُمَرَ قَالَ كَذا وَكَذا؟ قَالَ: فَمَا قُلْتِ لَهُ: قَالَتْ: قُلْتُ لَهُ: كَذا وَكَذا قَالَ: لَيْسَ باحَقَّ بِي مِنْكُمْ وَلَهُ وَلاصْحَابِهِ هِجْرَةٌ وَاحِدَةٌ وَلَكُمْ انْتُمْ اهْلَ السَّفِينَةِ هِجْرَتَان (الحديث: ٤٢٣٠، اطرافه في: ٣١٣٦، ٣٨٧٦، ٤٢٣٣) (ر: ١٥٧٨ تجريد)[٣٤٣].

ئەبومووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەیەمەن بووین خەبەرمان زنەوت کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کۆچی کردووە بۆ مەدینە، جا خۆم و دووبرام و پەنجاوسێ کەسی تر لەخزمەکانم کۆچمان کرد بۆلای، من بچووکی هەردوو براکانم بووم، کە یەکێکیان ئەبو بوردەو ئەوی تریاتن ئەبورەهم بوو، سواری پاپۆڕێ بووین لە حەبەش لەلای نەجاشی هەڵی ڕشتین، وەلەوێ تووشی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و هاوڕێکانی بووین، کە ئەوانیش لەتاو زوڵم و زۆری ناموسوڵمانەکانی مەککە و بێ دەرەتانی ڕەویان کردبوو بۆ حەبەشە، جەعفەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئێمەی ناردووە بۆ ئێرە وە فەرمانی پا کردووین کە لێرە بمێنینەوە، ئێوەش لەگەڵ ئێمە بمێننەوە، ئیتر ئێمەیش ماینەوە لەگەڵیانا، هەتا کاتێ گشتمان پێکەوە هاتینەوە.

وا ڕێکەوت کەچووینە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەوکاتە بوو کە قەلای خەیبەری فەتح کردبوو، جا بەشە پشکی لەتالانی خەیبەر بۆ ئێمەیش دانا یافەرمووی: بەشی ئێمەشی دا لێی، ئەوەی کە لەکاتی گرتنی قەلای خەیبەردا لەوێ نەبووبێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەشی بۆی دانەناوە، بێجگە لە ئێمە، کەتاقمەی پاپۆڕەکە بووین، جگە لە جەعفەرو هاوڕێکانی، بەشی ئەوانیشی دانا لەگەڵ ئەوانا، جاهی واهەبووپێمان دەگوت:

---

(٣٤٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل جعفر .. رقم:٢٥٠٢ ، ٢٥٠٣ .

ئێمه له کۆچ کردندا واین له پێش ئێوەوه، ڕۆژێ ئەسمای کچی عومەیس که یەکێك بوو له دەستەی گەمێکه، دەچێ بۆ دیدەنی حەفصه، عومەریش دەچێ بۆ لایان، ئەسماء لەوێ دەبینا، به حەفصەی کچی دەڵێ: ئەم ژنه ئەو ئەسمائەیه که لەحەبەشه بوو، لەو له دەریاوە هاتۆتەوه؟ ئەسماء دەڵێ: بەڵێ ئەوم، عومەر دەڵێ: بۆکۆچ کردن ئێمه واین له پێش ئێوەوه، کەواته: ئێمه له ئێوه له پێشترین به پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەسمائیش تووڕەدەبێ و دەڵێ: درۆت کرد ئەی عومەر! نەخێر نه بەخودا وانییه، چونکه ئێوه لەخزمەتی پێغەمبەردا بوون وخۆی خەمی خواردوون و سەرەوکاری کاروباری ئێوەی کردووەو برسیتانی نان و ئاوداوەو، نادانتانی تەمێ و ئامۆژگاری کردووه...

وەلی ئێمه لەحەبەشه بووین و لەدووره ولات بووین و لەناو بێگانان و ناحەزان دا ژیاوین، گەلێ داماو وبێ نازبووین ئەمەش که بووه و قەبووڵمان کردووه هەمووی له پێناوی ڕەزای خوداو، له پێناوی ئایینی پێغەمبەری ئەو دا بووه، جا سوێندبێ به خودا نەنان دەخۆم و نەئاو دەخۆمه هەتا ئەم قسەی تۆیه ئەی عومەر! نەگێڕمەوه بۆ پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) ئێمه ئازار و ئەشکەنجه دەدراین و تالاومان دەنۆشی و دەترسێنراین، وه ئەمانه هەمووی باس دەکەم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) وه بەباشی لێی دەپرسم، دەسا بەو خودایه ڕێك و ڕاست عەرزی دەکەم، نەدرۆی تیادەکەم و نه راوەڕێویی، وەنه لێی پتردەکەم.

جا که پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هات، گوتم پێی: ئەی پێغەمبەری خودا! عومەر واوا دەڵێ: فەرمووی (درودی لەسەر) ئەی تۆچیت پێی گوت). گوتم: واوام پێ گوت: فەرمووی: (عومەر له ئێوه له پێشتر نییه بەمن، وه بۆ ئەو وبۆ هاوڕێکانی یەك کۆچ هەیه، بەڵام بۆ ئێوه کەدەستەی گەمێکەن دوو کۆچتان بۆهەیه! ئەسماء فەرمووی: ئیتر ئەبو مووسا و

دانیشتوانی ناو پاپۆڕەکە، کە لەحەبەشەوە لەگەڵ من دا کۆچیان کردبوو بۆ مەدینـــە، دەستەدەســـتە دەهـــاتن بـــۆلای مـــن و ئـــەم فەرموودەیـــەیان لێ دەپرسیمەوە، شت نییە لەم جیهانەدا کـە وەك ئـەم مـژدەی پێغەمبـەرە (دروودی خودای لێ بێ) ئاوا شادمانیان بکاو، ئاوا لە دڵیانا گەورەو دڵ خۆشکەرەبێ ئـەسماء فـەرمووی: گـەلی جـار ئـەبو مووسـا، کـەخۆی یـەکێك بـوو لـە سەرنـشینەکانی پاپۆڕەکە، لە خۆشیانا ئەم فەرموودەیەی دووبارەو سێ بـارە پـا دەگێڕامـەوە!) (تاج/٤ ل –٣٢٧ ز - ١٠٢ف- ١- باسی: کۆچی دەستەی گەمێکە).

١٥٧٧– عَنْ ابِي مُوسَى قالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انِّي لاعْرِفُ اصْوَاتَ رُفْقَةِ الاشْعَرِيِّينَ بالْقُرْانِ حِينَ يَدْخُلُونَ باللَّيْلِ وَاعْرِفُ مَنَازِلَهُمْ مِنْ اصْـوَاتِهِمْ بالْقُرْانِ باللَّيْلِ وَانْ كُنْتُ لَمْ ارَ مَنَازِلَهُمْ حِينَ نَزَلُوا بالنَّهَـارِ وَمِـنْهُمْ حَكِـيمٌ اذا لَقِـيَ الْخَيْلَ اوْ قَالَ الْعَـدُوَّ قَـالَ لَهُـمْ انَّ اصْـحَابِي يَـامُرُونَكُمْ انْ تَنْظـرُوهُمْ. (الحـديث: ٤٢٣٢)[٣٤٤].

ئـەبو مووسـا (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: (دەنگـی کـاروانی هاوڕێیـانی ئەشـعەری دەناسمـەوە، لەشـەودا کـە دەڕۆنـەوە بۆماڵـەوە، بـەهۆی خوێنـدنی قورئانـەوە دەیـان ناسمـەوە، گەرچـی بـەڕۆژیش ماڵـە کانیـانم نـەدیوەو نـازانم لـەکوێ دادەنیـشن، حـەکیم یەکێکـە لـەوان پیـاوی دانـای وایـان تیادایـە کـاتێ دەگـا بەلەشـکری دوژمـن، بـەبێ پەروایێیان دەڵێ: هاوڕێکانم فەرمانتان پێ دەکەن کەچاوەڕوانیان بکەن واتـە: دەڵێ بە هاوڕێیانی خۆی: ئەی دەستەسوار! باپێکەوە بـڕۆین بۆسـەر دوژمـن، یادەڵێ بە لەشکری دوشمن: ئەی سوپای دوژمن! ئەگەر ئێوە ئازان و مـەردن و ترسنۆك و کوونی نین، مەڕۆن و ڕامەکەن هەتاکۆمەڵەی منیش دێن، ئەوسا بۆتـان دەردەکـەوێ کـە کـێ ئازایـە). (تـاج/٥ل- ٢٢٧ز- ٦٣ف- ٣- مـەزناهی ئـەبو مووسا).

(٣٤٤) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: في فضائل الاشعريين ﷺ ، رقم: ٢٤٩٩ .

١٥٧٨- و عَنهُ قال ابو مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ انْ افْتَتَحَ خَيْبَرَ فَقَسَمَ لَنَا وَلَمْ يَقْسِمْ لاحَدٍ لَمْ يَشْهَدْ الْفَتْحَ غَيْرَنَا (الحديث: ٤٢٣٣، اطرافه في: ٣١٣٦، ٣٨٧٦، ٤٢٣٠).

واتای ئەم فەرمودەیە لە تەرمەفی/٤٢٣٠ی دا رابورد = ١٥٧٦ تجريد.

١٥٧٩- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ تَزَوَّجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ وَبَنَى بِهَا وَهُوَ حَلالٌ وَمَاتَتْ بِسَرِفَ. (الحديث: ٤٢٥٩، طرفه في: ١٨٤٥ تجريد = ١٨٤٠ فتح).

ئیبنو عەباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کاتێ مەیموونەی هاوسەری مارەکرد لەئیحرامدا بوو، لەئیحرامی عەمرە تول قەزادا بوو، کاتێ گواستیەوە بێ ئیحرام بوو، مەیموونە (رەزای خودای لێ بێ) لەسەرف ئەمری خودای کرد، کە جێگەیەکە شەش میل لەمەککەوە دوورە).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودانە دوورو نزیك پەیوەندیيان بە خەیبەرەوە هەیە فەرموودەی ژمارە: ١٥٧٩ نەبێ، کە پەیوەندی بەعەمرە تول قەزاوە هەیە، کە ئەویش لەڕیزی غەزاکانە.

مەیموونە ناوی (بڕە) بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ناوی نا مەیموونە، حەوت فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ناوی مەیموونەی گۆڕی چونکە پێی ناخۆش بوو کە بگوترێ: پێغەمبەر لەلای بەڕەوە دەرچووو، بڕوانە: ژمارە: ١٥٤ تەجرید + تاج/ ١٠ ل/١٦٣ ف/٤+ ٣ ز/٦٥- گۆڕینی ناوی ناشیرین) مەیموونە (رەزای خودای لێ بێ) دواهەمین ژنی گوازراوەی پێغەمبەر بوو کە مردووە دروودی خوا لە پێغەمبەرو رەزای خوا لە هەموو هاوسەرەکانی بێ.

# غەزای مۆتە لەولاتی شام
# (غزوة موتة من ارض الشام)

١٥٨٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ امَّرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فِي غَزْوَةِ مُؤْتَةَ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انْ قُتِلَ زَيْدٌ فَجَعْفَرٌ وَانْ قُتِلَ جَعْفَرٌ فَعَبْدُ اللّٰهِ بْنُ رَوَاحَةَ قَالَ عَبْدُ اللّٰهِ: كُنْتُ فِيهِمْ فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ فَالْتَمَسْنَا جَعْفَرَ بْنَ ابِي طَالِبٍ فَوَجَدْنَاهُ فِي الْقَتْلَى وَوَجَدْنَا مَا فِي جَسَدِهِ بِضعًا وَتِسْعِينَ مِنْ طَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ). (الحديث: ٤٢٦١، طرفه في: ٤٢٦٠) (انظر رقم: ١٤٧٨ تجريد)[٣٤٥].

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای مۆتەدا، حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) کاتێ سوپاکەی بەرێکردو زەیدی کوڕی حاریسەی کرد بەسەرکردەی سوپاکە، فەرمووی: (ئەگەر زەید کوژرا ئەوا جەعفەر لە شوێنی ئەو سەرکردەیە، ئەگەر جەعفەریش کوژرا عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە سەرکردەیە). ئیبنوعومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆم لەو غەزایەدا ئامادە بووم، کاتێ گەڕاین بۆ تەرمەکەی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب، کە دۆزیمانەوە لەناو کوژراوەکان دا، زیاتر لەنەوەد زامی سەرە ڕم و دەمەشیرو تیری پێوە بوو). (تاج/٨ ل/٢٤٤ ز/١٠٠ ف/١- سەرباسی غەزای مۆتە لە و لاتی شام) + (تاج/٥ ل/١٤٣ و ٣٢- ف/١ + بەرگی یەکەم تاج/١ ل/٥٣٠ ف/٣ ز/١٩٧ - گریان بەبێ دەنگی).

١٥٨١- عنْ اسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُما) يَقُولُ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى الْحُرَقَةِ فَصَبَّحْنَا الْقَوْمَ فَهَزَمْنَاهُمْ وَلَحِقْتُ انَا وَرَجُلٌ مِنْ الانْصار رَجُلا مِنْهُمْ فَلَمَّا غَشيِنَاهُ قَالَ: لا الَهَ الا اللّٰهُ فَكَفَّ الانْصَارِيُّ عنهُ فَطَعَنْتُهُ بِرُمْحِي حَتَّى قَتَلْتُهُ فَلَمَّا قَدِمْنَا بَلَغَ النَّبِيَ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا اسَامَةُ

---

(٣٤٥) لم يوافقه مسلم على تخريجه ، راجع رقم: ١٤٧٨ تجريد - المترجم .

اقَتَلْتَهُ بَعْدَ مَا قَالَ: لا الَهَ الا اللّٰهُ قُلْتُ: كَانَ مُتَعَوِّذا فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى تَمَنَّيْتُ انّي لَمْ اكُنْ اسْلَمْتُ قَبْلَ ذٰلِكَ الْيَوْمِ (الحديث: ٤٢٦٩، طرفه في: ٦٨٧٢)(٣٤٦).

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودا لەخۆی و باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەشکرێ بووین، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ناردینی بۆ سەرهۆزی حورەقە، لەگەڵ بەیانا دامان بەسەریانا، وەخۆیان بۆ ڕانەگیراو شکان، وەمن و پیاوێکی ئەنصاری نیشتینە سەر پیاوێ لەوان، دەورەمان داو گرتمانە ناو، لەم دەمەدا دەستی کرد بەگوتنی: (لا الە الا اللە) ئیتر ئەنصارییە کەوازی لێهێنا، بەڵام من دامەبەرم، هەتا کوشتم.

کەهاتینەوە ئەم هەواڵە گەیشتەوە بەپێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی ئوسامە! شتی وات کردووە، ئەو کە گوتی: لا الە الا اللە، ئیتر چۆن دەستت تێی چوو؟)عەرزیم کرد: قوربان! بەڕاستی نەبوو، ئەی ویست بەو بیانووە خۆی ڕزگار بکا لەدەستم بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەم وەلامەی منی بەدڵ نەبوو، بۆیە بۆ سەرزەنشتی من هەردەیفەرموو: (پاش ئەوەکە ئەووشە پیرۆزەی گوت چۆن کوشتت؟) ئیتر ئەوەندەی دووبارە کردەوە، لەدڵەوە خۆزگەم خواست کە ئەم کەتنەم بەسەر نەهاتایە، تەنانەت ئەگەر بەو ئەگەرەیش بوایە کە هەتا ئەو ڕۆژە موسوڵمان نەبوومایە و پاش ئەم داستانە ئیسلام ببومایە، هەتا لەسەردەمی ئیسلاما تووشی تاوانی گەورەی وانە بوومایە).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم غەزایە ناوداره بە غەزای غالیبی لەیسی کەلبی لەم غەزایە دا غالیب خۆی سەرکردەبوو، لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی حەوتی کۆچی دابوو، خێڵی بەنی عەون و بەنی عەبدی شەعلەبە، لە مەیفەعەی بوون، لە پشت بەتن

(٣٤٦) اخرجه مسلم في الايمان ، باب: تحرير قتل الكافر بعد ان قال : لااله الا الله ، رقم: ٩٦ .

نەخلەوە، لەناوچەی نەجد، لەمەدینەوە هەشت بەرید دوورە، لەشکرەکە سەدوسیی پیاوبوون دەڵێن: ئەم ئایەتە ﴿وَلا تَقُولُوا لِمَنْ الْقَى الَيْكُمْ السَّلامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ سەبارەت بەم غەزایە دابەزیوە. بڕوانە: ژمارە: ١٥٣٥ت = ٤٠١٩+ (تاج/ ٨ ل/١١٤ ف/٣ ز/٤٣ - خەبات و غەزا دەبێ لەپێناوی ئایین دابێ).

١٥٨٢- عنْ سَلَمَةَ بْنَ الاكوَع قالَ: غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَبْعَ غَزَوَاتٍ وَخَرَجْتُ فِيمَا يَبْعَث مِنْ الْبَعْث تِسْعَ غَزَوَاتٍ عَلَيْنَا مَرَّةً ابُو بَكْرٍ وَمَرَّةً اسَامَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما). (الحديث: ٤٢٧٠، اطرافه في: ٤٢٧١، ٤٢٧٢، ٤٢٧٣)[٣٤٧].

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەوت غەزام لەگەڵ پێغەمبەر رخۆی کردووە، وەلە گەڵ نێردەی سەربازیش دا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەینارد بەلایەکا، بۆ نۆ غەزای ترچووم، جارێ لەم نۆجارە ئەبوبەکری صەدیق سەرکردەمان بوو، جارێکیش ئوسامە بوو (رەزای خودایان لێ بێ).

## غەزای فەتحی مەککە لە ڕەمەزانا
## (غزوة الفتح في رمضان)

١٥٨٣- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ فِي رَمَضانَ مِنْ الْمَدِينَةِ وَمَعَهُ عَشَرَةُ الافٍ وَذلِكَ عَلَى رَاسِ ثَمان سِنِينَ وَنِصْفٍ مِنْ مَقْدَمِهِ الْمَدِينَةَ فَسَارَ هُوَ وَمَنْ مَعَهُ مِنْ الْمُسْلِمِينَ الَى مَكَّةَ يَصُومُ وَيَصُومُونَ حَتَّى بَلَغَ الْكَدِيدَ وَهُوَ مَاء بَيْنَ عُسْفَانَ وَقُدَيْدٍ افْطرَ وَافْطَرُوا. (الحديث: ٤٢٧٦، طرفه في: ٨٩٦ تجريد = ١٩٤٤ فتح = بقرطى/٢ ل - ٢٨١)[٣٤٨].

واتاکەی رۆیشت لەپێشەوە.

---

(٣٤٧) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: عدد غزوات النبيّ (صلى الله عليه وسلم) رقم: ١٨١٥ .

(٣٤٨) اخرجه مسلم في الصيام ، باب: جواز الصوم و الفطر للمسافر .. رقم: ١١١٣ .

١٥٨٤- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رَمَضانَ الَى حُنَيْنٍ وَالنَّاسُ مُخْتَلِفُونَ فَصَائِمٌ وَمُفْطِرٌ فَلَمَّا اسْتَوَى عَلَى رَاحِلَتِهِ دَعَا بِانَاء مِنْ لَبَنٍ اوْ مَاء فَوَضَعَهُ عَلَى رَاحَتِهِ اوْ عَلَى رَاحِلَتِهِ ثُمَّ نَظَرَ الَى النَّاسِ فَقَالَ الْمُفْطِرُونَ لِلصُّوَّامِ افْطِرُوا. (الحديث: ٤٢٧٧، طرفه في: ٩٨٩٦ ت= ١٩٤٤ ف = بةرطى/٢ ل/٢٨١)[٣٤٩].

دیسان ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) لەپاش فەتحی مەککە، کە لەمانگی رەمەزانا ئەنجامی دا چوو بۆ فەتحی حونەین، لەرێگە موسوڵمانان بوون، بەدوو دەستەوە: هەبوو بەرۆژوو بوو، هەشیان بوو بەرۆژوو نەبوو، جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) سواری ولاخەکەی بوو، ومرێك جێگەی خۆی گرت لەسەر پشتی، ویستی نیشانی لەشکرەکەی خۆی بداکە خۆی لەم سەفەرەدا بەرۆژوو نابێ، بۆیە وائێستا رۆژووەکەی دەشکێنێ، جابۆ ئەم مەبەستە داوای جامی شیر، یائاوی کرد، وەلەسەر لەپی خۆی داینا، یافەرمووی: لەبەردەمی خۆیا لەسەر پشتی ولاخەکە داینا، هەتا لەشکرەکە سەیری بکەن و ببینن کەوا پێغەمبەر رۆژووەکەی دەشکێنێ، تا ئەوانیش چاوێ لێ بکەن و رۆژووەکەیان بشکێنن. تەنانەت ئەوانەی کە بە رۆژوو نەبوون دەیانگوت بەرۆژووەوانەکان: رۆژووکانتان بشکێنن).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە جۆرەکێشەیەکی واتیادا:

١- پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەمانگی شەوالدا، واتە: لە شەشەلان دا، غەزای حونەینی ئەنجام دا، نەوەك لەڕەمەزانا.

---

(٣٤٩) قال العيني: (و الحديث انفرد به البخاريُ) العيني/١٧ص٢٧٧ - المترجم .

٢- ڕەنگ بێ ئەم ڕۆژووە ڕۆژووی سوننەتی شەشەلان بووبێ (بڕوانە: تاج/٨ ل/٢٢٨ ز/٩٥- غەزای فەتحی مەککە + بەرگی/ ٨ ل/٢٣٧ ز/٩٦- غەزای حونەین).

١٥٨٥- عنْ عروة بن الزبير (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَمَّا سَارَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْفَتْحِ فَبَلَغَ ذلِكَ قُرَيْشًا خَرَجَ ابُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ وَحَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ وَبُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاء يَلْتَمِسُونَ الْخَبَرَ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاقْبَلُوا يَسِيرُونَ حَتَّى اتَوْا مَرَّ الظهْرَانِ فَاذا هُمْ بِنِيرَانٍ كَانَّهَا نِيرَانُ عَرَفَةَ فَقَالَ ابُو سُفْيَانَ: مَا هَذهِ لَكَانَّهَا نِيرَانُ عَرَفَةَ؟ فَقَالَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاء: نِيرَانُ بَنِي عَمْرٍو فَقَالَ ابُو سُفْيَانَ: عَمْرٌو اقَلُّ مِنْ ذلِكَ فَرَاهُمْ نَاسٌ مِنْ حَرَسِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَادْرَكُوهُمْ فَاخَذوهُمْ فَاتَوْا بِهِمْ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسْلَمَ ابُو سُفْيَانَ.

فَلَمَّا سَارَ قَالَ لِلْعَباسِ: احْبِسْ ابا سُفْيَانَ عِنْدَ حَطمِ الْخَيْلِ حَتَّى يَنْظرَ الَى الْمُسْلِمِينَ فَحبَسَهُ الْعَباسُ فَجعَلَتْ الْقَبائِلُ تَمرُّ مَعَ النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَمُرُّ كَتِيبَةً كَتِيبَةً عَلَى ابِي سُفْيَانَ فَمرَّتْ كَتِيبَةٌ قَالَ يَا عَباسُ: مَنْ هَذهِ؟ قَالَ: هَـذهِ غِفَارُ قَالَ: مَا لِي وَلِغِفَارَ ثمَّ مَرَّتْ جُهَيْنَةُ قَالَ: مِثلَ ذلِكَ ثمَّ مَرَّتْ سَعْدُ بْنُ هُذيْمٍ فَقَالَ مِثلَ ذلِكَ وَمَرَّتْ سُلَيْمُ فَقَالَ مِثلَ ذلِكَ حَتَّى اقْبَلَتْ كَتِيبَةٌ لَمْ يَرَ مِثلَهَا قَالَ: مَنْ هَذهِ؟ قَالَ: هَؤُلاء الانْصار عَلَيْهِمْ سَعْدُ بْنُ عُبادَةَ مَعَهُ الرَّايَةُ فَقَالَ سَعْدُ بْنُ عُبادَةَ: يَاابا سُفْيَانَ الْيَوْمَ يَوْمُ الْمَلْحَمَةِ الْيَوْمَ تُسْتَحَلُّ الْكَعْبَةُ فَقَالَ ابُو سُفْيَانَ: يَاعَباسُ حَبَّذا يَوْمُ الذمَارِ.

ثمَّ جَاءتْ كَتِيبَةٌ وَهِيَ اقَلُّ الْكَتَائِبِ فِيهِمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاصْحَابُهُ وَرَايَةُ النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ فَلَمَّا مَرَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بابِي سُفْيَانَ قَالَ: الَمْ تَعْلَمْ مَا قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبادَةَ؟ قَالَ: مَا قَالَ؟ قَالَ: كَذا وَكَذا فَقَالَ: كَذبَ سَعْدٌ وَلَكِنْ هَذا يَوْمٌ يُعظمُ اللّٰهُ فِيهِ الْكَعْبَةَ وَيَوْمٌ تُكْسَى فِيهِ الْكَعْبَةُ قَالَ: وَامَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْ تُرْكَزَ

رَايَتُهُ بالْحَجُونِ قَالَ عُرْوَةُ وَاخبَرَنِي نَافِعُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطعِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ الْعَبَاسَ يَقُولُ لِلزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ: يَا ابا عَبْدِ اللّٰهِ هَا هُنَا امَرَكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْ تَرْكُزَ الرَّايَةَ قَالَ: وَامَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَئِذ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ انْ يَدْخُلَ مِنْ اعْلَى مَكَّةَ مِنْ كَدَاء وَدَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ كُدَا فَقُتِلَ مِنْ خَيْلِ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) يَوْمَئِذ رَجُلانِ حُبَيْشُ بْنُ الاشْعَرِ وَكُرْزُ بْنُ جابرٍ الْفِهْرِيُّ). (الحديث: ٤٢٨٠، طرفه في: ١٢١٨ تجريد = بةرطي/ ٣ل –٣٤٣)[٣٥٠].

**عوروەی کوڕی زوبەیر** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ ساڵی ئازاد کردنی مەککە، پێغەمبەر** (درودی خودای لێ بێ) **کەوتەڕێ بەرەو مەککە، کاتێ بێ بڕواکانی قوڕەیش بەمەدەزانن ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب و حەکیمی کوڕی حیزام و بودەیلی کوڕی وەرقا لەمەککە دەردەچن و دێن بەرەو ئەوان هەتا سووسەی هەواڵی حەزرەت بکەن، ملی ڕێ دەگرن تا دەگەنە مەڕو زەهران لەوێ دەڕوانن وا ڕیزە ئاگرێکی زۆر زۆر، وەك ئاگری شەوی عەرەفە ئاوا زۆر دەگرێ و دیارە و دەڵێی چراخانە، ئەبوسوفیان دەڵێ: ئەم هەمگە ئاگرە چییە؟ دەڵێی چراخانی شەوی عەرەفەیە، بو دەیل دەڵێ: ئاگری بەنی عەمرە، ئەبوسوفیان دەڵێ: لەکوێ بەنی عەمر ئەوەندە دەبن؟! چەند کەسێ لە پاسەوانانی پێغەمبەر** (درودی خودای لێ بێ) **ئەم زەلامانە دەبینن و دەچن بۆیان و دەیانگرن و دەیانبەن بۆلای پێغەمبەر**(درودی خودای لێ بێ) **لەوێ ئەبو سوفیان موسوڵمان دەبێ.**

**پێغەمبەر** (درودی خودای لێ بێ) **کە دەکەوێتە ڕێ بەعەبباس دەفەرموێ: لەکوێدا ڕێگەکە تەنگەبەر دەبێتە وەو سوارەکان کەڵەکە دەبەستن ئالەوێدا ئەبو سوفیان ڕابگرە هەتا بەچاوی خۆی بەباشی سوپای ئیسلام ببینێ**

---

(٣٥٠) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عروة بن الزبير في قصة الفتح (فتح/٨ص١٥٤ – خاتمة كتاب المغزي ، راجع رقم: ١٢١٨ تجريد)- المترجم .

وبزانێ کە لەوزەی ئەودا نییەو ئیتر خەیاڵی بەرابەر وەستانی لەشکری ئیسلام لەکەللەی خۆی دەرکا، عەبباس لەوێدا ڕایدەگرێ، هۆزەکان پۆل پۆل لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لێ بێ) ریز بوون و دەستیان کرد بە ڕۆیشتن و پۆل لەدوا پۆل بەسەر ئەبوسوفیاندا تێ دەپەڕن، دەستەسوارا لەلایەوە ڕەت دەبن، گوتی: عەبباس! ئەمانە کێن؟ فەرمووی: لەشکری هۆزی غیفارن، گوتی: من لەمانەچی کەی ئەمانە ناحەزی من بوون (وائێستا هاتوون بۆسەرم)؟

ئەمجا هۆزی جوهەینە ڕابووردن، هەروا هۆزی سەعدی کوڕی هوزەیم و هۆزی سولەیم، یەکە یەکە ئەبوسوفیان دەیپرسی و عەبباس وەلامی دەدایەوەو ئەویش وایدەگوتەوە، هەتا دەستە سوارێ دێن، وێنەی ئەوانی نەدیبوو،گوتی: عەباس! ئەمانە کێن! فەرمووی: لەشکری یاریدەدەرانن، سەعدی عوبادە سەرکردەیانە، ئالاکە بەو بوو، سەعد گوتی: ئەی ئەبوسوفیان! ئەمرۆ ڕۆژی کوشت و کوشتارە، ئەمڕۆ کوشت و کوشتار لە ناو بەست و حەرەم و کابەدا حەلاڵ دەبێ و قڕدەخرێتە ناو ناموسوڵمانەکانی مەککە، بەتایبەتی گەورە پیاوەکانیان، وەك ئەبو سوفیان، ئەبو سوفیان گوتی: ئەی عەبباس! خۆزگەم بەمردن، ئای بۆ کەڵە مێردێکی مەرد پەنای بداینایە!

لەپاشا دەستە سوارێکی تر هاتن بەژمارە لەهەموو دەستە سوارەکانی تر کەمتربوون ئەوانە پۆلی پێغەمبەر و یارانی بوون، ئالاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەزوبەیری کوڕی عەووام دەبێ، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەلای ئەبوسوفیانەوە ڕادەبوورێ عەرزی دەکا: قوربان دەزانیت کەسەعدی کوڕی عوبادە چی دەڵێ؟ فەرمووی: دەڵێ چی؟) گوتی: وا وا دەڵێ: ئەمرۆ کوشت و کوشتار لە ناو کەعبەدا ڕەوا دەبینرێ! فەرمووی: (سەعد درۆ دەکات، لەخۆیەوە قسەی وا دەکات، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە خودا قەدرو ڕێزی کەعبەی تیادا دەگرێ و، ئەمڕۆ ئەو ڕۆژمیە کە کەعبە

پۆشتەوپەرداخ دەكرێتەوە! گوتی: حەرزەت (دروودی خودای لێ بێ) فەرمانی دا كە ئالاكەی خۆی لەحەجوون هەڵبكرێ، ئەو ڕۆژەیش فەرمانی كردبە خالیدی كوڕی وەلید كە لەلای سەرووی مەككەوە لەكەدائەوە بچێتە ناو شاری مەككەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خۆی لەكوداوە لە دامێنی شارەوە ڕۆیشتە ناو شارەوە ئەو ڕۆژە لەسوارەی خالید دوو كەس كوژران : حوبەیشی كوڕی ئەشعەر و،كورزی كوڕی جابیری فیهری بوون). (تاج/٨ ل/٢٢٨ ز/٩٥ ف/٢- غەزای فەتح- ئازاد كردن- ی مەككە).

**ڕوونكردنەوە:**

ئەم فەرمودەیە مورسەلی تابیعییە، چونكە عوروەی كوڕی زوبەیر تابیعییە، مەبەستی پێشەوا بوخاری لەم فەرموودەیە، كۆتایەكەیەتی، كەعوروە لەنافیعی كوڕی جوبەیرەوە لە عەباسی كوڕی موتەلیبەوە دەیگێڕێتەوە، چونكە ئەم ئەندازەیەی مەو صوولە.

١٥٨٦- عنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ: (رَأيتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ فَتحِ مَكَّةَ عَلَى نَاقَتِهِ وَهُوَ يَقْرَا سُورَةَ الْفَتْحِ يُرَجِّعُ وَقَالَ: لَوْلا انْ يَجْتَمِعَ النَّاسُ حَوْلِي لَرَجَّعْتُ كَمَا رَجَّعَ). (الحديث: ٤٢٨١، اطرافه في: ٤٨٣٥، ٥٠٣٤، ٧٥٤٠)[٣٥١].

عەبدوڵلای كوڕی موغەففەل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی ئازادكردنی مەككە، خۆشەویستم دی (دروودی خودای لێ بێ) بەڕێوە، بەسواری وشترە مێنگەكەی خۆی سوورەتی فەتحی دەخوێند، لەكاتی خوێندنەكەدا دەنگی خۆیی بەسۆزو بەئاوازەوە دەلەرانەوەو، بەتێرو تەسەلی گۆی بەپیتەكان دەكرد، موعاوییەی كوڕی قوڕە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دەترسم خەڵك

---

(٣٥١) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: ذكر قراءة النبي (صَلى اللهُ عليهِ وَسَلم) سورة الفتح ، رقم: ٧٩٤ .

کەڵەکەم لێ بکەن، ئەگینا ئێستا بەجوانی لاسایی شێوەی قورئان خوێندنەکەی عەبدوڵلای کوڕی موغەففەلم بۆ دەکردنەوە، وەك چۆن ئەو لاسایی شێوەی تەرجیعەکەی پێغەمبەری دەکردەوە). (تاج/٥ ل/٢٨٦ ف/٤ — ز/٧٨).

١٥٨٧ – عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ وَحَوْلَ الْبَيْتِ سِتُّونَ وَثلاث مِائَةِ نُصُبٍ فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ فِي يَدِهِ وَيَقُولُ جَاء الْحَقُّ وَزَهَقَ الْباطلُ جَاء الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْباطلُ وَمَا يُعِيدُ. (الحديث: ٤٢٨٧، طرفاه في: ٤٢٨٧، ٤٧٢٠)[٣٥٢].

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی ئازاد کردنی شاری مەککەدا، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هاتە ناوشاری مەککەوە، لەوکاتەدا بەگرد(دەور)ی ماڵی بەیتا، سێسەدو شەست بتێ لێبوو!! پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) داردەستێکی بەدەستەوە بوو، دەیژەند بەچاوی پەیکەری بتەکانداو بتەکان فنگەوتلوور دەکەوتن و پێغەمبەر دەیفەرموو: ﴿جاء الحَقُّ وَزهقَ الباطلُ انَّ الباطلَ كان زهوقا﴾– ١٨/١٧. واتە: هەق و ڕاستی واهات، ئایینی پیرۆزی ئیسلام سەرکەوت، جێگەی بەشتی هیچ و پووچ و ئایینی پڕۆ پووچی بتپەرستی لەق کرد، لەڕاستی دا سەردەمی پڕۆ پووچی بەسەر چوو، شتی وا باوی نەما، ڕۆژ ڕۆژی ئیسلامە کەڕێکی هۆشی ساخە، ڕۆژی کوفرو بتپەرستی و شتی وا تەواو.

وەهەروەها حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) دوابەدوای ئەمە ئەم ئایەتەیتریشی دەخوێندەوە: ﴿جاء الحقُّ ومايبدئُ الباطلُ مايُعيد﴾– ٣٤/٤٩.

واتە: بفەرموو: واڕۆژی حەق هەڵهات و نووری ئیسلام بلاو بۆوە بەجیهاندا، ئیتر ئایینی بتپەرستی وشتی وا هیچ و پووچ باوی نەماو، کاتی

---

(٣٥٢) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: ازالة الاصنام من حول الكعبة، رقم: ١٧٨١ .

بەسەر چووەو بنەبڕ بووە، وەبڕای بڕای جارێکی تر ڕێز پەیداناکاتەوەو سەر هەڵ ناداتەوە!). (تاج/٦ ل/٢٧٥ ف/١٨ ز/١٨ - سوورەتی ئیسراء).

١٥٨٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: كُنَّا بِمَاء مَمَرَّ النَّاسِ وَكَانَ يَمُرُّ بِنَا الرُّكْبَانُ فَنَسْأَلُهُمْ مَا لِلنَّاسِ مَا لِلنَّاسِ؟ مَا هَذا الرَّجُلُ؟ فَيَقُولُونَ: يَزْعُمُ انَّ اللَّهَ ارْسَلَهُ،اوْحَى الَيْهِ،اوْ اوْحَى اللَّهُ بِكَذا. فَكُنْتُ احْفَظ ذلِكَ الْكَلامَ وَكَأنَّمَا يُقَرُّ فِي صَدْرِي وَكَانَتْ الْعَرَبُ تَلَوَّمُ باسْلامِهِمْ الْفَتْحَ فَيَقُولُونَ اتْرُكُوهُ وَقَوْمَهُ فَانَّهُ انْ ظَهَرَ عَلَيْهِمْ فَهُوَ نَبِيٌّ صَادِقٌ فَلَمَّا كَانَتْ وَقْعَةُ اهْلِ الْفَتْحِ بادَرَ كُلُّ قَوْمٍ باسْلامِهِمْ وَبَدَرَ ابِي قَوْمِي باسْلامِهِمْ فَلَمَّا قَدِمَ قَالَ: جِئْتُكُمْ وَاللَّهِ مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَقًّا فَقَالَ: صَلُّوا صَلاةَ كَذا فِي حِينِ كَذا وَصَلُّوا صَلاةَ كَذا فِي حِينِ كَذا فَاذا حَضرَتْ الصَّلاةُ فَلْيُؤَذِنْ احَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ اكْثرُكُمْ قُرْآنًا فَنَظرُوا فَلَمْ يَكُنْ احَدٌ اكْثرَ قُرْآنًا مِنِّي لِمَا كُنْتُ اتَلَقَّى مِنْ الرُّكْبانِ فَقَدَّمُونِي بَيْنَ ايْدِيهِمْ وَانَا ابْنُ سِتّ اوْ سَبْعِ سِنِينَ وَكَانَتْ عَلَيَّ بُرْدَةٌ كُنْتُ اذا سَجَدْتُ تَقَلَّصَتْ عَنِّي فَقَالَتْ امْرَاةٌ مِنْ الْحَيِّ الا تُغَطوا عَنَّا اسْتَ قَارِئِكُمْ؟ فَاشْتَرَوْا فَقَطعُوا لِي قَمِيصًا فَمَا فَرِحْتُ بِشَيْءٍ فَرَحِي بِذلِكَ الْقَمِيصِ. (الحديث: ٤٣٠٢)(٣٥٣).

عەمری کوڕی سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە لە هەوارگەیێ بووین، ناوی ماو بوو، سەرە ڕێگەی خێلا و کۆچەرییەکان بوو، لەوێ هەواریان دەگرت، ناوبەناو کاروانا دەهاتن وهاموشۆیان دەکرد،ئێمەیش پرسیارمان لێدەکردن: ئەوە ئەو خەڵکە چییە هەرباسی ئەم پیاوە دەکەن؟ ئەوانیش دەیانگوت: ئەم پیاوەکە ناوی موحەممەدە بەقسەیخۆی دەڵێ: فرستادەی خودایە، خودا سوروشی بۆ دەکا، فریشتەنیگای خوایی بۆ دەهێنێ، دەڵێ: ئەم ئایەتانەم بە سرووش بۆ هاتووە، منیش ڕێك ئەو قورئانەم لە بەر دەکرد، کەئەوا دەیانگوت: موحەممەد دەڵێ: ئەمەم بەوەحی بۆ هاتووە،

---

(٣٥٣) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عمرو بن سلمة في الصلاة (فتح -٨- خاتمة كتاب المغازي/ص١٥٤=فتح/٨ص٥٠٤)- المترجم

وەکـوو لـەخوداوە لـەدڵما کۆبکرێتـەوەو بێتەبـەرم وا بـوو، زۆرینـەی هـۆزە گەورەکانی عەرەب چاوەڕوانی ئەوە بوون، ئەگەر موحەممەد (درودی خودای لێ بێ) بتـوانێ مەککـە ئـازاد بکـا، ئـەوانیش ئیـسلامبوونی خۆیـان ئاشـکرا بکـەن، دەیانگوت: واز لەموحەممەد بهێنن، هەتا بزانین لەگـەڵ هۆزەکـەیخۆی داچی بەچی دەکا، ئەگـەر سـەرکەوت بەسـەریانا ئـەوا ڕاسـتە کـە هـەق پێغەمبـەری خودایە.

جـا کاتـا ڕووداوی ئـازادکردنی مەککـە ڕووی داو، خـەڵکی مەککـە هـەموو ئیـسلامبوون،هۆزەکانی تـری دەوروبـەری مەککـەیش، هەریەکـەیان لـەلای خۆیانەوە زوو بەزوو ئیسلام بوون، وە با وکیـشم بـەزوویی وەفـدی هۆزەکـەی برد بۆخزمەتی پێغەمبەرو خۆی و هۆزەکەی ئیسلام بوون، جاکاتێ هاتنـەوە، باوکم فەرمووی: سوێندم بەخودا، لەخزمەتی پێغەمبەری خوداوە گەڕاومەوە بۆلاتان، ئەو پیاوە بەڕاستی نێراوی خودایە، فەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی پێمان: (کاتی ئەو نوێژە فیسارەکاتە، وەکاتی ئـەو نوێـژەی تـر ئەوکاتەیە وەهەروا، کاتێکیش نوێـژ بـوو یـەکێکتان بـانگ بـدەن، وەکامیـشتان زیاتر قورئانی لەبەر بوو با ئەوە پێش نوێژیتان بۆبکات) کە تەماشـایان کـرد کە سیان بەقەد من قورئانی لەبەر نـەبوو، بـەهۆی ئـەو قورئانـەوە کـە لـەوەو پێش لەکاروانەکانم وەردەگرت و لەبەرم دەکرد.

ئیترمنیـان کـرد بەپێـشنوێژی خۆیـان و پـێش خۆیانیـان خـستم ومنـیش بەرنوێژیم بۆ دەکردن، وە ئەو کاتە شەش سـالان یـان حـەوت سـالان بـووم، وە بالاپۆشـێکم لەبـەردا بـوو، کەدەچـوومە کوڕنـووش و سـوژدەم دەبرد،کـوڵ دەبووەو دەهاتەوە یەك، ژنـێ لەخێڵەکـەمان گـوتی: ئەمـە چـۆن حاڵێکـە، ئـەم منالـە کـە بەرنوێـژیمان بۆدەکـا، لەسـەجدەدا شـەرمگای دەردەکـەوێ کەواتـە چارێکی ئـەم حالـە بکەن‌و بەپارچـەیا پۆشـاك گـەلۆگونی داپۆشـن، ئـەوانیش پارچـەێی قوماشـیان کـڕی‌و کراسـێکی ئاودامانیـان بـۆ دروسـت کـردم، وەك

ديشداشه، وهشەرمگامى شاردەوه ڤەت وەك بەو كراسه شادمان بووم بە هيچى تر ئاوا كەيف خۆش نەبووم).

**ڕوونكردنەوە:**

عەمرى كورى سەلەمەى كورى قەيسى الجرمى خۆى و باوكى لەهاوەلانى پێغەمبەرن، لەسەر راى بەهێز بەمندالى بەخزمەت پێغەمبەر گەيشتووە، وەك لەم فەرموودەيەدا دەردەكەوێ خۆى مەلاى هۆزەكەيان بووە، بە منالى بەرنوێژى بۆيان كردووە، باوكيشى لەپاش ئازاد كردنى مەككە، بەزوويى لەگەڵ شاندێ لەهۆزەكەى دەچن بۆلاى پێغەمبەر و هەموو موسوڵمان دەبن، عەمر لە بوخاريدا هەر ئەم فەرموودەيەى ئێرەى هەيە، هەروا باوكيشى، عەمر لە بەصرە نيشتەجێ بوو.

ئەم زاتانە شاگردى بوون، فەرموودەكانى ئەو يان گێراوەتەوە: ئەبو قلابەو عاصمى ئەحوەل و ئەيوبى سەختيانى و كەسانى تريش. ناوى باوكى عەمر بەڕێك و پێكى سەليمەيە، بە ژێرى لام، نەوەك سەلەمە بەسەرى لام، سەلە ميسرييە عەمرى كورى فەرموودەى ئەوى گێراوەتەوە بڕوانە فەرموودەى ژمارە: ٣٦٢ ت = ٦٢٨ ف + حديث/٦٣٠ف= بەرگى يەكەم ل/٣٥٨-٣٥٩ ڕەزاو ڕەحمەتى خودا لەعەمرو لە سەليمەى باوكى.

١٥٨٩ - عن عبدالله بن ابي اوفى انّه كان بيدهِ ضربةٌ، قال: ضربتها مع النبيّ صلى الله عليه وسلّم يوم حنين (الحديث: ٤٣١٤)[٣٥٤].

عەبدوڵلاى كورى ئەبو ئەوفا دەفەرموێ: (ئەم جێگە پێكانە كەوا بەباسكمەوە، هى كاتى غەزاى حونەينە، لەو غەزايەدا من لەخزمەتى پێغەمبەردا بووم) بڕوانە: فەرموودەى ژمارە: ٧٢٠ ت = ١٤٩٧ف = بەرگى دووەم لاپەڕە:١٤١.

---

(٣٥٤) الحديث من افراده (عينى ١٧ص٢٩٥) - المترجم .

# غەزای ئەوطاس (غزوة اوطاس)

١٥٩٠- عَنْ ابِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ لَمَّا فَرَغَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ حُنَيْنٍ بَعَثَ ابا عَامِرٍ عَلَى جَيْشٍ الَى اوْطاسٍ فَلَقِيَ دُرَيْدَ بْنَ الصِّمَّةِ فَقُتِلَ دُرَيْدٌ وَهَزَمَ اللَّهُ اصْحَابَهُ قَالَ ابُو مُوسَى: وَبَعَثَنِي مَعَ ابِي عَامِرٍ فَرُمِيَ ابُو عَامِرٍ فِي رُكْبَتِهِ رَمَاهُ جُشَمِيٌّ بِسَهْمٍ فَاثْبَتَهُ فِي رُكْبَتِهِ فَانْتَهَيْتُ الَيْهِ فَقُلْتُ: يَا عَمِّ مَنْ رَمَاكَ؟ فَاشَارَ الَى ابِي مُوسَى فَقَالَ: ذاكَ قَاتِلِي الَّذي رَمَانِي فَقَصَدْتُ لَهُ فَلَحِقْتُهُ فَلَمَّا رَانِي وَلَّى فَاتَّبَعْتُهُ وَجَعَلْتُ اقُولُ لَهُ: الا تَسْتَحْيِي الا تَثْبُتُ فَكَفَّ فَاخْتَلَفْنَا ضَرْبَتَيْنِ بالسَّيْفِ فَقَتَلْتُهُ ثمَّ قُلْتُ لابِي عَامِرٍ: قَتَلَ اللَّهُ صَاحِبَكَ قَالَ: فَانْزِعْ هَذا السَّهْمَ فَنَزَعْتُهُ فَنَزَا مِنْهُ الْمَاء قَالَ: يَا ابْنَ اخِي اقْرِئْ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) السَّلامَ وَقُلْ لَهُ: اسْتَغْفِرْ لِي وَاسْتَخْلَفَنِي ابُو عَامِرٍ عَلَى النَّاسِ فَمَكُثَ يَسِيرًا ثمَّ مَاتَ.

فَرَجَعْتُ فَدَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِهِ عَلَى سَرِيرٍ مُرْمَلٍ وَعَلَيْهِ فِرَاشٌ قَدْ اثرَ رِمَالُ السَّرِيرِ بِظَهْرِهِ وَجَنْبَيْهِ فَاخْبَرْتُهُ بِخَبَرِنَا وَخَبَرِ ابِي عَامِرٍ وَقَالَ قُلْ لَهُ اسْتَغْفِرْ لِي فَدَعَا بِمَاء فَتَوَضا ثمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَقَالَ: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ ابِي عَامِرٍ وَرَايْتُ بَيَاض ابْطيْهِ) ثمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ مِنْ النَّاسِ) فَقُلْتُ: وَلِي فَاسْتَغْفِرْ فَقَالَ: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ ذنْبَهُ وَادْخِلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُدْخَلا كَرِيمًا). (الحديث: ٤٣٢٣، اطرافه في: ٢٨٨٤، ٦٣٨٣)[٣٥٥].

**ئەبو مووسا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **لەغەزای حونەین لێبۆوە، ئەبو عامری مامەمی کردبە سەرکردەی لەشکرێك و ناردی بۆ دۆڵی ئەوتاس، لەوێ بەرەنگاری دورەیدی کوڕی صیممە دەبن، وە دورەید خۆی کوژراو هاوڕێکانی، لەسایەی خوداوە لەشەڕەکەدا دەشکێن و هەڵدێن، ئەبومووسا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: منیش بە فەرمانی پێغەمبەر**

---

**(٣٥٥) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل ابي موسي و .....رقم:٢٤٩٨ .**

(دروودی خودای لێ بێ) لەگەڵ ئەبو عامیردا چووم بۆ ئەم غەزایە، لەشەڕەکەدا کابرایەکی بەنی جەشەمی تیرێکی لە ئەژنۆی ئەبوعامیردا، منیش خۆم گەیاندە لای مامەم و پێم گوت: مامەکێ ئەم تیرەی پێوەنای؟ ئەویش ئاماژەی بۆم کرد: هۆ ئائەو پیاوە بکوژی منە، منیش نیشتمە سەری و گرتمەوە، کە هەستی پێکردم و منی بینی ڕایکرد، منیش شوێنی کەوتم و خۆش خۆش تانەم لێدەداو پێیم دەگوت: ئەوە شەرم ناکەی وا ڕادەکەی، ئەگەر مەردی بوەستە بۆم، ئەویش شەرم گرتی و وەستا، ئیتر بەشیر بەربووینە یەکتر، من ئەوم کوشت، ئەوجا گەڕامەوە بۆ لای ئەبوعامیر وپێم گوت: مامە! یارۆی تۆی واڵ کرد خودا لە کۆڵی کردەوە و کوشتم فەرمووی: ئادەی ئەمجا ئەم تیرە لەئەژنۆم دەرکێشە، کاتا تیرەکەم دەرکێشا لە ژەنۆی لەجێی تیرەکەوە ئاوی لینجی لێ هات.

جا ئەبو عامیر فەرمووی: سلاوم ڕابگەیەنە بەپێغەمبەری خودا، وەعەرزی بکە: ئەبوعامیر عەرزی دەکردی کەداوای لێخۆشبوونی لە خودا بۆبکەی. ئەبوعامیری منی لە جێی خۆی کرد بەسەرلەشکر و پاش کەمێ عەمری حەقی بەجێ هێناو مرد (ڕەزای خودای لێ بێ)، کە گەڕامەوە چومە خزمەتی حەزرەت(دروودی خودای لێ بێ) لەماڵی خۆی بوو، لەسەرتەختا بوو، ڕایەڵی تەختەکە بە پووشی پەلکە خورما چنرابوو، ئەوەی کە پێی بڵێی رایەخ و بەڕەوشتی وا بەسەریەوە نەبوو، پەلکە خورماکانی ڕایەڵی چارپایەکە چەقیبوونە پشت و هەردوو لاتەنشتی پێغەمبەر و شوێن شریتی تەختەکە وەك نەخش نەخشابوو جا دەنگ و باسی خۆمان و باسو خواسی ئەبوعامیرم بۆیگێرایەوە، ئەوەشم بۆی گێڕایەوە کە ئەبوعامیر داوای کردبوو لێی کە بۆی بپاڕێتەوە، جاحەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) داوای ئاوی کردو دەسنوێژی پێ گرت و هەردوو دەسی خۆی ئەوەنە هەڵبڕی هەتا سپیدەی هەردوو بنباخەڵی دەرکەوتن، ئەوجا دەستی کرد بەنزاکردن و فەرمووی:

خودایە! خۆش ببەلە بەندە بچکۆلەکەی خۆت لە ئەبوعامیر ئەی خودایە! لە ڕۆژی قیامەتا لەسەرووی زۆر لە دروستکراوانی خۆتەوە دایبنێ).

منیش عەریزم کرد: قوربان دەبفەرموو بۆ منیش داوای لێ بووردن و لێخۆشبون بکە فەرمووی: (خودایە! لەگوناهی عەبدوڵلای کوڕی قەیس خۆش ببە و لە ڕۆژی قیامەتا، لەپایەیەکی بەڕێزدا دایبنێ (تاج/٥ ل/٢٢٥ ف/٢ ز/٦٣- ش ).

## غەزای تاییف لەمانگی شەشەلانا بوو، ساڵی هەشتی کۆچی (غزوة الطائف في شوال سنة ثمان)

١٥٩١- عنْ امِّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قالَت: دَخَلَ عَلَيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدِي مُخَنَّث فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ ابِي امَيَةَ يَا عَبْدَ اللَّهِ ارَايْتَ انْ فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ الطائِفَ غَدًا فَعَلَيْكَ بابْنَةِ غَيْلانَ فَانَّهَا تُقْبِلُ بارْبَعٍ وَتُدْبِرُ بِثمَانٍ وَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لا يَدْخُلَنَّ هَؤُلاء عَلَيْكُنَّ). (الحديث: ٤٣٢٤، طرفاه في: ٥٢٣٥، ٥٨٨٧)[٣٥٦]

ئوم سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) تەشریفی هێنا بۆلام، لەو کاتەدا پیاوێکی سەرژنانی لەوێ بوو، جا پیاوەکە بە عەبدوڵلای کوڕی ئومەییەی گوت، کە عەبدوڵلا برای من بوو، پێی گوت: ئەگەر سبەینێ بەپشتی خودا تائیفتان ئازاد کرد، خۆم کچەکەی غەیلانت پێ نیشان دەدەم، لەدەستی نەدەی، نێچیرێکی قەڵەوە، چۆن شۆخ و شەنگ و گەرم و نەرمێکە!! لە پێشەوە نەرم و نۆڵەو چوار لۆیە، لەپاشەوە خڕو پڕە و هەشت لۆیە! پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) بەئێمەی فەرموو: (مەهێڵن ئەم جۆرە کەسە هاموشۆتان بکا).

---

(٣٥٦) اخرجه مسلم في السلام، باب: منع المخنث من الدّخول على النساء الاجانب ، رقم: ٢١٨٠ .

لەگێرانەوەیەکا کەواله تاج دا، دەفەرموێ: (کە دادەنیشێ خڕوخەپانە و هەر لۆیە و دەنیشێتە سەر لۆ، کەقسە دەکا دەڵێی شەکر دەشکێنێ، یا بولبولەو دەخوێنا بەینی هەردوو ڕانی وەك خەپلەی هەلاتەوایە! جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) گوێی لەم قسانەی بوو، فەرمووی: (مەهێڵن ئەمەبا بۆ لاتان) (تاج/٣ ل/١٤٠ ف/٦ ز/٥٦- باسی بەتەنیا کۆبوونەوە...).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- ئەم پیاوە سەرژنانییە ناوی (هیت)بوو، وەدا دەنرێ بەصەحابی!

٢- ئەم عەبدوڵلایە لەگەڵ ئەبوسوفیانا ئیسلام بوون لە ئازادکردنی مەککەدا، لەغەزای تائیف دا بە تیرێ شەهید بوو.

٣- پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر ئەم جۆرە قسانە هیتی لەمەدینە وەردەرنا، ناردی بۆ (الحمی) نەفیکردن و رەهەنەکردن جۆرێکە لەسزا.

٤- عەرزی پێغەمبەریان نکرد: بافیسارە پیاوی سەرژنانی بکوژین؟ فەرمووی: (خودا ڕێگەی ئەوەی نەداوم کە نوێژکاران بکوژم).

لە ڕاستیدا ئەم فەرموودەیە چارەسەری کێشەیەکی گەورەی ئەم سەردەمەمان بۆ دەکا. زۆرینەی لاوان و هونەرمەندان و گۆرانی بێژان لەم بابەتەن، جا کورت و پۆخت: هاوڕێتیو دۆستایەتی ئەم جۆرە مرۆڤە سەر ژنانییانە کارێکی ناباشە، بەلاّم جنێو پێدان و غەیبەت و ئازاردانیان بە لاش و بەخۆڕایی نادروستە و ئەمانەیش هەر بە موسوڵمان دادەنرێن، ئەوەی کەلەسەر ئێمەیە هەوڵی چاکبوونیان بدەین، بەلاّم تۆڵەو هەڕەشەو ئازاردانیان ئەوە لە ئەستۆی دەوڵەتە، بۆ ئێمە نەهاتووە لەوەدا تدخل بکەین بەلاّم ئەوەندە هەیە ( لە کاتی پێویستدا، وە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووی ڕاستی، وە بۆ بەرژەوەندی دین و دنیا، وە بۆ بەرژەوەندی خاوەن پەیوەندی، وە لە کاتی پرسیارو هەواڵپرسی لە ڕفتاری کەسی، بۆ ئەم مەبەستا نەو لەم

كاتانەدا: (لاغیبه فی فاسقٍ) بە مەرجێ باسی فیسقەکەی بۆ مەبەستێکی ڕەوا بێت).

١٥٩٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ: لَمَّا حَاصَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الطائِفَ فَلَمْ يَنَلْ مِنهُمْ شَيْئًا قَالَ: (انَّا قَافِلُونَ انْ شَاء اللّٰـهُ) فَثقُلَ عَلَيْهِمْ وَقَالُوا: نَذهَبُ وَلا نَفتَحُهُ وَقَالَ مَرَّةً: (نَقْفُلُ) فَقَالَ: (اغْدُوا عَلَى الْقِتَالِ فَغَدَوْا فَاصَابَهُمْ جِرَاحٌ) فَقَالَ: (انَّا قَافِلُونَ غَدًا انْ شَاء اللّٰـهُ) فَاعْجَبَهُمْ فَضحِكَ النَّبِيُّ(صَلّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ). (الحـديث: ٤٣٢٥، طرفـاه في: ٦٠٨٦، ٧٤٨٠)[٣٥٧].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپاش غەزای حونەین و ئەوتاس پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دەورەی خەڵکی قەلای تاییفی دا،بەلام زەبەری پێ نەبردن، فەرمووی: (خودا حەزکا دەگەڕێینەوە) یارانیش (رەزای خودایان لێ بێ) لەبەریان گران بوو، فەرموویان: (چۆن بگەڕێینەوە، خۆ ئێمە هێشتا قەلاکەمان ئازاد نەکردووە!؟). فەرمووی (درودی خودای لێ بێ) (دەسبەینێ سەر لەیانی بڕۆن بۆ شەڕو هەڵکوتنە سەریان) جا بۆ سبەینێ کەچوون، بۆ شەڕو هەرا، لەسەر لێواری شوورەی قەلاکەوە بە دوورەتیر هەندا لە موسوڵمانان زامار بوون وەهیچیشیان پێ نەکردن، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دیسان پێی فەرموونەوە: (خوا حەزکا سبەێنێ دەگەڕێینەوە!) فەرمووی: کەچی ئەمجارە یاران گەڕانەوەیان بەدڵ بوو، ڕەخنەیان نەبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) کەبینی وا ڕایان گۆڕی و ئەوانیش لەپاش ئەزموون و تاقیکردنەوە هاتنە سەرقسەکەی ئەو، لەم حاڵەیان پێکەنی). (تاج/٨ ل/٢٤٢ ز/٩٨ - غەزای تائیف).

١٥٩٣- عنْ سَعْد وَابَي بَكْرَةَ -رضي الله عنهما- فَقَالا سَمِعْنَا النَّبِيَ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ مَنْ ادَّعَى الَى غَيْرِ ابِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ فَالْجَنَّةُ عَلَيْـهِ حَرَامٌ و في

(٣٥٧) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: غزوة الطائف و رقم: ١٧٧٨ .

روايةٍ امَّا احَدُهُمَا فَاوَّلُ مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ وَامَّا الاخَر فَـنَزَلَ الَـى النَّبِـيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثالِث ثلاثـةٍ وَعِـشْرِينَ مِـنْ الطائِفِ. (الحديث: ٤٣٢٦، طرفه في: ٦٧٦٦ الحديث ٤٣٢٧- طرفه في: ٦٧٦٧).

سەعدو ئەبو بەكرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموويان: ژنەوتمان لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (بڕوانە: ژمارە ١٣٩٥، لەپێشەوە رەت بوو...).

لەگێڕانەوەیەكا: یەكێكیان كەسەعدە، یەكەم كەس بوو، كەیەكم تیری هاویشت لە ڕێگەی خوادا، ئەوی تریشیان كە ئەبوبەكرەیە، سێیەم كەس بوو، لەوبیست و سێ كەسەی كە هەڵزنی بوون بەشووراكەی قەلای تائیف دا وەخۆیان ڕزگار كردبوو، وەهاتبوون ئیسلام بوو بوون).

١٥٩٤- عَنْ ابِي مُوسَى (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ نَازِلٌ بالْجِعْرَانَةِ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ وَمَعَهُ بِلالٌ فَاتَى النَّبِيَ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اعْرَابِيٌّ فَقَالَ الا تُنْجِزُ لِي مَا وَعَدْتَنِي؟ فَقَالَ لَهُ: ابْشِرْ فَقَالَ قَدْ اكْثَرْتَ عَلَيَّ مِنْ ابْشِرْ فَاقْبَلَ عَلَى ابِي مُوسَى وَبِلالٍ كَهَيْئَةِ الْغَضبانِ فَقَالَ رَدَّ الْبُشْرَى فَاقْبَلا انْتُمَا قَالا قَبِلْنَا ثُمَّ دَعَا بِقَدَحٍ فِيهِ مَاء فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ فِيهِ وَمَجَّ فِيهِ ثُمَّ قَالَ اشْرَبا مِنْهُ وَافْرِغَا عَلَى وُجُوهِكُمَا وَنُحُورِكُمَا وَابْشِرَا فَاخَذا الْقَدَحَ فَفَعَلا فَنَادَتْ امُّ سَلَمَةَ مِنْ وَرَاء السِّتْرِ انْ افْضلا لامِّكُمَا فَافْضلا لَهَا مِنْهُ طائِفَةً. (الحديث:٤٣٢٨، طرفاه في:١٨٨، ١٩٦)[٣٥٨].

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، لە پاش غەزای حونەین، لە جیعرانەدا بەبەزیبوو، كەجیعرانە وا لەنێوانی مەككەی پیرۆزو مەدینەی نازداردا، بیلالیشی لەخزمەتا بوو، عارەبێكی دەشتەكی هاتە خزمەتی، گوتی: ئەی موحەممەد! گفتت پێم داوە كەلەم تالانییە بەشم بدەی، كوا گفتەكەت؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی:

(٣٥٨) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل اصحاب الشجرة ، رقم: ٢٤٩٧ .

(مـوژدەبێ لـەتۆ) ئـەویش گـوتی: زۆرت پـێ گوتـووم مـوژدەبێ لـە تـۆ! مـن دەمەوێ بەڵێنەکەتم بۆ جا بەجێ بکەی.

پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) وەك کەسـێ دلگیربـێ لەقسەکەی کابرا، ڕووی کـردە مـن و بـیلال و فـەرمووی: (خۆدیتـان ئەمـە مـوژدەی نـاوێ و دایـە وەبەسـەرما، چـونکە نرخـی نـازانێ، دەی ئێـوە ئـەو موژدەیـە وەربگـرن بۆخۆتان) ئەوانیش گوتیان: قوربـان! ئێمـە قوبووڵمانـە، جـا پێغەمبـەر (درووودی خودای لێ بێ) داوای جامێ ئـاوی کـردو هـەردوو دەست و دەم و چـاوی خـۆی تیـا شـۆرد و قـومێ ئـاوی هـەلگرت و لـەدەمیخۆی وەرداو تفانیـەوە ناوجامەکـە، ئەوجا بەئێمەی فەرموو: (لێی بخۆنەوەو لێی بپەرژێنن لەدەم و چاوو سـینگ و بەرۆکی خۆتان، وەموژدەبێ لێتان).

ئـەوانیش جامەکـەیان لێ وەرگـرت و فەرمانەکـەی پێغەمبـەریان بـە جێهێنا، ئوم سەلەمەیش (رەزای خودای لـێ بێ) کـە هاوسـەری پێغەمبـەرە، لەپـشتی پـەردەوە، بـانگی لێ کـردن: لـە ئـاوی جامەکـەتان بەشـی ئـەم دایکـی خۆتانـە بهێڵنەوە، ئەوانیش چۆڕێکیان تیادا هێشتەوە بۆی) (تـاج/ ٥ ل/٢٢٤ ز/٦٣ ف/١ - ش/ ت باسی مەزناهی ئەبو مووسا).

١٥٩٥- عَنْ انَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ جَمَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) نَاسًا مِنْ الانْصار رضيَ الله عنهَمْ فَقَـالَ: انَّ قُرَيْـشًا حَـدِيث عَهْـدٍ بِجَاهِلِيَـةٍ وَمُصِيبَةٍ وَانِّي ارَدْتُ انْ اجْبُـرَهُمْ وَاتَـالَّفَهُمْ امَـا تَرْضَـوْنَ انْ يَرْجِـعَ النَّـاسُ بالـدُّنْيَا وَتَرْجِعُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى بُيُـوتِكُمْ؟ قَـالُوا: بَلَـى قَـالَ: لَـوْ سَلَكَ النَّـاسُ وَادِيًـا وَسَـلَكَتْ الانْـصار شِـعْبًا لَـسَلَكْتُ وَادِيَ الانْـصار اوْ شِـعْبَ الانْـصَارِ (الحـديث: ٤٣٣٤، طرفـه في: ١٢٧٠ت = ٣١٤٦ ف = بـةرطى٣/ تةجريدى صةريح =موختةصةرى صةحيحى بوخارى، لاثـةرِة: ٣٩٤) + (ذمـارة: ١٢٧١ تجريد)[٣٥٩].

---

(٣٥٩) اخرجه مسلم في الزكاة، باب: اعطاء المؤلفة قلوبهم على الاسلام، رقم: ١٠٥٩ .

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای حونەین، کە خودا ماڵێکی بێ ئارەقی مفتی ڕەخساند بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لەو ماڵەی کە لەهۆزی هەوازین بەتالانی گیرا، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دەستی کرد بە بەخشین لێی، وەچەند پیاوێ لە قوڕەیش، یەکی سەرو سەد و شتری دا پێیان، جاچەند کەسێ لەیاریدەدەران (لەئەنصار) گوتیان: خودا لە پێغەمبەر خۆش بێ، دەچێ بەشی قوڕەیشییەکان دەدات کەهەتا دوێنێ بێ باوەڕ بوون و بەرهەڵستی ئیسلامیان دەکرد، کەچی بەشی ئێمە مانان نادات، کە هێشتا خوێنی شەڕی کاتی بێباوەڕی ئەوان لە شمشێرەکانمان دەتکێ و ئەوان لە چاو ئێمەدا دوێنێ موسوڵمان بوون، ئیتر بۆ بەشی ئەوان دەدا وبەشی ئێمە نادات!؟

پێغەمبەریش (درودی خودای لێ بێ) قسەکەیانی بەرگوێ کەوتەوەو ناردی بەشیۆن یاریدەدەران داو، لە خێوەتێکی چەرمین دا کۆیکردنەوەو کە کۆ بوونەوە خۆشی تەشریفی چوو بۆ ناویان و فەرمووی: (کەسێکی واتان تیادایە کە لە خۆتان نەبێ؟). گوتیان: نەخەیر، مەگەر خۆشکەزای خۆمانمان لەناو دابێ، فەرمووی: (خۆشکەزای عەشرەت یەکێکە لەخۆیان).

ئەوجا فەرمووی (هەموو دەزانین کەهۆزی قوڕەیش هەم نۆ موسوڵمانن و هەم تازە کۆست کەووتوون، جابۆیە منیش دەمەوێ تۆڵەیان بۆ بکەمەوە و دڵنەوایی‌یان بکەم، باشە ئەدیی ئێوە بەوە ڕازی نابن کە خەڵکیتر دینارو درەم و مەڕو مالات لەگەڵ خۆیان ببەنەوە بۆ ماڵەوەیان، کەئەمانە مایەی خۆشی ئەم جیهانە بێبەقایەن، بەڵام ئێوە لەباتی ئەو پڕو پیتی دنیایە کە ئەوان دەیبەنەوە، پێغەمبەری خودا لەگەڵ خۆتان ببەنەوە بۆماڵەوەتان و ئەو لەخۆتان ڕازی بکەن، کە ڕەزای ئەو مایەی بەختەوەری هەردوو ژیانە! بزانن ئەگەر خەڵکیتر هەموویان لە شاڕێگەکانە بڕۆن، بەڵام ئێوەی ئەنصار لە بارێکە ڕێگەیەکەوە بڕۆن، من لەگەڵ ئەو خەڵکە ناڕۆم بەڵام لەگەڵ ئێوە دەڕۆم، خەیاڵ نەکەن و دڵ لەدڵ مەدەن، ژینم ژینی ئێوەیە، مردنم مردنی

ئێومیـه، هـاوژینی ئێـوه بهکهسـی ترنـادهم) (تـاج/ ٨ ل/١٥٦ ف/٢+ ١ ز/٦٥-باسی: خهلاتکردنی نۆ موسوڵمان).

١٥٩٦- عنْ عبدالله بن عمر (رَضيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ: بَعَث النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ الَى بَنِي حارثة فَدَعَاهُمْ الَى الاسـلام فَلَمْ يُحْسِنُوا انْ يَقُولُوا اسْلَمْنَا فَجَعَلُوا يَقُولُونَ صَبَانَا صَبَانَا فَجَعَلَ خَالِدٌ يَقْتُلُ مِنهُمْ وَيَاسِرُ وَدَفَعَ الَى كُلِّ رَجُلٍ مِنَّا اسِيرَهُ حَتَّى اذا كَانَ يَوْمٌ امَرَ خَالِدٌ انْ يَقْتُلَ كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا اسِيرَهُ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لا اقْتُلُ اسِيرِي وَلا يَقْتُلُ رَجُلٌ مِنْ اصْحَابِي اسِيرَهُ حَتَّى قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذكَرْنَاهُ فَرَفَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ فَقَالَ اللَّهُمَّ انِّي ابْرَا الَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدٌ مَرَّتَيْنِ (الحديث: ٤٣٣٩، طرفه في: ٧١٨٩).

عهبـدوڵلای کـوڕی عومـهر (رهزای خودایـان لـێ بـێ) فـهرمووی: پێغهمبـهر (دروودی خودای لێ بێ) خالیـدی کـوڕی وهلیـدی کـرد بهسـهرکردهی لهشکرێ و نـاردنی بـۆ سهرهۆزی بهنی حاریسه، خالیـد بانگیـان دهکـا بۆسـهر ئیـسلام بـوون و دهڵێ: وهرن موسوڵمان بن، ئهم غهزایه له پاش فهتحی مهککه دهبێ.

ئهوانیش لهبهر ئهوهی نازانن چۆن چۆنی ئیسلامبوونی خۆیان بهجوانی ڕابگهیـهنن و بڵـێن: باشـه وا ئیـسلام بـووین، لـهباتی ئـهوه دهڵـێن: باشـه وا وهرگهڕاین واته: له بتپهرستیيهوه بۆ سهر ئیسلامهتی و بووین بـه صابیئی، چونکه لهسهرهتای بلاوبوونهوهی ئیسلامهوه، کهسێ که ئیسلام دهبوو، پێیـان دهگوت: صابیئی، واته: له ئایینی بـاو بـاپیری خـۆی وهرگـهڕاوهو چـووته سـهر دینێکی تازه، وه ئهمهیان بۆ تانهوتهشهر دهگوت.

خالیـدیش وا دهزانـێ کـه ئهمانـه نایانـهوێ ئیـسلام بـبن و هـهر بـه واتـا کۆنهکهی قوڕهیش، وشهی (صابیئی)دهڵێن، لهبهرئهوه دهست دهکا بهکوشـتارو بهدیل کردن لێیان، لهدوایيدا که شهڕ تهواو بوو، ههر پیـاوێ لهئێمه، خالیـد دیلی خۆی دایه دهستی، ههتا ڕۆژێ خالید فهرمانیداو فهرمووی: ههرکهسهی دیلـی خـۆی بکـوژێ، منـیش گـوتم: بـه خـودا نـهخۆم دیلـی خـۆم دهکـوژم و

نەدەشهێڵم کە کەسێ لەهاوڕێیانی من دێلی خۆی بکوژێ، ئیتر هەندێ لە لەشکرەکە دیلیخۆی کوشت و هەندێکیان نەیانکوشتن، کاتێ چووینەوە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) ئەم باسەمان بۆیگێڕایەوە، ئەویش بێزاری لەکارەکەی خالید دەربڕی و هەردوو دەستی خۆی وەك کاتی پاڕانەوە بەرز کردەوەو دووجار فەرمووی: خودایە! من بەریم لەمە کەخالید کردوویەتی و من لە شتی وا بەدوورم بەشایەتی تۆ ئەی خودایە! (تاج/٨ ل/٢٥٧ – ز/١٠٣).

١٥٩٧– عنْ عَلِيّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَرِيَةً فَاسْتَعْمَلَ رَجُلا مِنَ الانْصار وَامَرَهُمْ انْ يُطيعُوهُ فَغضبَ فَقَالَ: الَيْسَ امَرَكُمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْ تُطيعُوني؟ قَالُوا: بَلَى قَالَ: فَاجْمَعُوا لِي حَطبا فَجمَعُوا فَقَالَ: اوْقِدُوا نَارًا فَاوْقَدُوهَا فَقَالَ: ادْخُلُوهَا فَهَمُّوا وَجَعَلَ بَعْضهُمْ يُمْسِكُ بَعْضا وَيَقُولُونَ فَرَرْنَا الَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ النَّارِ فَمَا زَالُوا حَتَّى خَمَدَتْ النَّارُ فَسَكَنَ غَضبُهُ فَبَلَغَ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا الَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ الطاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ). (الحديث: ٤٣٤٠، طرفاه في: ٧١٤٥، ٧٢٥٧)[٣٦٠].

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لقێکی نارد و پیاوێکی لەیاریدەدەران (ئەنصار) کرد بە بەسەرکردەیان، وە فەرمانی پێیان کرد، کە فەرمانبەریی ئەو فەرماندەیە بکەن و لەفەرمانی دەرنەچن، جا ڕۆژێ فەرماندەکە تووڕە دەبێ، لەسەر ئەوە فەرمانێکیان پێ دەکا، ئەوانیش بەگوێی ناکەن، جادەڵێ: ئەی باشە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی نەکردووە بە ئێوە کە لەفەرمانی من دەرنەچن و بەگوێم بکەن! گوتیان: بەڵێ. دەڵێ: کەواتە ئادەی بارێ دارم بۆ کۆبکەنەوەئەوانیش

(٣٦٠) و الحديث .. اخرجه مسلم في المغازي (عيني/١٧ص٣١٤)- المترجم .

دارەکەی بۆ کۆدەکەنەوە،دەڵێ: ئادەی ئاگریتێ بەردەن، ئەوانیش ئاگری تێ بەردەدەن، ئەوجا دەڵێ: دەچنە ناوی!

جا ئەوانیش لە سەرەتاوە خەریك دەبن بچنە ناوی، بەڵام بەرەبەرە رایان دەگۆڕا و ئەوانەی کە دەیانەوێ بچنە ناو ئاگرەکە، کەسانی تر لەهاوڕێکانیان دەیانگرن و ناهێڵن بچنە ناوی و بەیەکتری دەڵێن: ئێمە لەدەستی چوونە ناو ئاگر هەنامان بردووە بۆ پەنای ئایینی موحەممەد، ئیتر چۆن ئێستا بچینە ناوی؟ ئیتر ئەمە حاڵیان بوو، لەم بارەیەوە هەر مقۆمقۆیان بوو، وە نەچوونە ناوی هەتا ئاگرەکە دامردەوە، لەولاشەوە فەرماندەکەیان ڕقەکەی نیشتەوە.

ئەم باس و خواسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ روون کردنەوەی کارەکە فەرمووی: (ئەوانە ئەگەر بەقسەی ئەو فەرماندەیەی خۆیان بکردایە، بەبێ لێکۆڵینەوەی شایان لێی، بچوونایەتە ناو ئەو ئاگرە، ئەوە تاوانێکی گەورەی وا دەبوو، کە لە تۆڵەو سزای ئەوەدا هەتا ڕۆژی قیامەت لەو ئاگرەدا دەمانەوەو لە ژیانی بەرزەخ دا لەناو ئەو ئاگرەدا دەبوون، باشیان کردووە کە لەمەدا بەگوێی فەرماندارەکەی خۆیانیان نەکردووە، چونکە فەرمانەکەی ناهەق بووە، ئەوەی کە لەسەر فەرمانبەرە، فەرمانی فەرمانڕەواکەی جێ بە جێ بکا، بەڵام بەمەرجێ فەرمانەکەی هەق و دروست بێ نەوەك ناحەق و نادروست، وەك ئەم حاڵەتەی ئەمان).

١٥٩٨- عنْ ابي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) انّ النبي بعث ابا موسى وَمُعَاذ بْنَ جَبَلٍ الَى الْيَمَنِ قَالَ وَبَعَث كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى مِخْلافٍ قَالَ وَالْيَمَنُ مِخْلافَانِ ثُمَّ قَالَ يَسِّرَا وَلا تُعَسِّرَا وَبَشِّرَا وَلا تُنَفِّرَا فَانْطلَقَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا الى عَمَلِهِ وَكَانَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا اذا سَارَ فِي ارْضِهِ كَانَ قَرِيبا مِنْ صَاحِبِهِ احْدَث بِهِ عَهْدًا فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَسَارَ مُعَاذ فِي ارْضِهِ قَرِيبا مِنْ صَاحِبِهِ ابي مُوسَى فَجَاء يَسِيرُ عَلَى بَغْلَتِهِ حَتَّى انْتَهَى الَيْهِ وَاذا هُوَ جَالِسٌ وَقَدْ اجْتَمَعَ الَيْهِ النَّاسُ وَاذا رَجُلٌ عِنْدَهُ قَدْ جُمِعَتْ يَدَاهُ الَى

عُنُقِهِ فَقَالَ لَهُ مُعَاذ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ ايُّمَ هَذا؟ قَالَ: هَذا رَجُلٌ كَفَرَ بَعْدَ اسْلامِهِ قَالَ: لا انْزِلُ حَتَّى يُقْتَلَ قَالَ: انَّمَا جِيء بِهِ لِذلِكَ فَانْزِلْ قَالَ: مَا انْزِلُ حَتَّى يُقْتَلَ فَامَرَ بِهِ فَقُتِلَ ثمَّ نَزَلَ فَقَالَ يَا عَبْدَ اللَّهِ كَيْفَ تَقْرَا الْقُرْانَ؟ قَالَ: اتَفَوَّقُهُ تَفَوُّقًا قَالَ: فَكَيْفَ تَقْرَا انْتَ يَا مُعَاذ؟ قَالَ: انَامُ اوَّلَ اللَّيْلِ فَاقُومُ وَقَدْ قَضيْتُ جُزْئِي مِنْ النَّوْمِ فَاقْرَا مَا كَتَبَ اللَّهُ لِي فَاحْتَسِبُ نَوْمَتِي كَمَا احْتَسِبُ قَوْمَتِي). (الحديث: ٤٣٤٢، طرفه في: ٤٣٤٥)، (انظر: ٢٢٦١ فتح الباري)[٣٦١].

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە پێش حەجی مالاوایی دا، ئەبو مووسای باوکم و مەعازی کوڕی جەبەل دەنێرێ بۆ ولاتی یەمەن، هەر یەکێك لەم دووکەسە دەکا بەسەرۆکی ناوچەیێ لەدوو ناوچەکەی سەرو و خوارووی یەمەن، موعاز دەکا بە سەرۆکی هەرێمی سەروو، ئەبو مووسایش دەکا بە سەرۆکی هەرێمی خواروو، ولاتی یەمەن ئەوکاتە دوو هەرێم دەبێ (هەرێم =مخلاف= اقلیم - فەتح الباری).

پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) پێیان دەفەرموێ: (هەتا دەتوانن کاربۆخەڵك ئاسان بکەن و باریان گران مەکەن، هەمیشە دەمتان خێربێنێ و موژدەی خۆش بەمەردوم بدەن و، بەهەڕەشەو گوڕەشەی زۆر خەڵك لەخۆتان و لەدین تەرامەکەن!).

ئەنجا هەردوکیان ڕۆیشتن بەلای کاری خۆیانەوە، دەستووریشیان وا دەبێ ئەگەر یەکێکیان سەری لەقەڵەمڕەوەکەی خۆی بدایە و، لە هەمان کاتا لە هەرێمی هاوڕێکەیەوە نزیك ببوایە تەوە دەچوو بۆلای و سلاوی لێ دەکردو هەواڵی دەپرسی.

(٣٦١) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب:في الامر بالتيسير و ترك التنفير في الاشربة... كل مسكر خمر، رقم: ١٧٣٣ .

جا جارێ موعاز بەقەڵەمڕەوی خۆیدا دەسووڕێتەوە کەلە ئەبو مووسای هاوڕێی نزیك دەبێتەوە، بەسواری قاترێ دەچێ بۆ لای، دەڕوانی وا ئەبو مووسا دانیشتووە و خەڵك دەوریان لێ داوەو، پیاوێکیش والەلایدا، هەردوو دەستیبە کۆت و زنجیر شەتەك دراوەو کراوەتەملی. موعاز دەفەرموێ: (ئەی عەبدوڵلای کوڕی قەیس! ئەم پیاوە چییە، بۆ واکۆت و زنجیر کراوە؟ فەرمووی: ئەوە لە دینی ئیسلام هەلگەڕاوەتەوەو، لە پێشا جوولەکە بووەو موسوڵمان بووەو کافر بۆتەوە، موعاز دەفەرموێ: دانابەزم هەتا نەکوژرێ، ئەبومووسا دەفەرموێ: دەتۆ دابەزە خۆشمان بۆ ئەوەمان هێناوە کە بیکوژین. دەفەرموێ: خەیر، دانابەزم تانەکوژرێ، جا ئەبو مووسا فەرمان دەداو پیاوەکە دەکوژرێ، ئەوجا موعاز دادەبەزێ و دەفەرموێ ئەی عەبدوڵلا! لەسەر چی شێوەیێ دەوری قورئان دەکەویتەوەو چۆن چۆنی قورئان دەخوێنی؟ فەرمووی: وەك و شترێ ژەم لە دواژەم بیدۆشیت، ئاوا بەرودوا هەرجارەی بەپێی توانا چەندەم بۆ لوا ئەوەندە دەور دەکەمەوە گوتی: ئەی تۆ چۆنی دەور دەکەیتەوە؟ موعاز فەرمووی (من لەسەرەتای شەوەوە بەشی خۆم دەخەوم ئەوجا هەڵ دەستم، چەندەی خودا بۆی نووسیبم ئەوەندە دەور دەکەمەوە، ئیتر بەتەمای ئەوەم کە خودا ئەو خەوتنەیشم وەك شەونوێژو قورئانخوێندنەکە، کە لە خەو هەڵ دەستم بۆی، ئەوەیشم ئاوابەتاعەت وبەندەیی بۆم حەلێب بکا (تاج/٨ ل/٢٥٨ ز/١٠٤ ف/١).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودە پیرۆزەیە، گەورەترین بەلگەیە لەسەر سیستەمی دەوڵەتی ویلایات لە ئیسلام دا، کەبەزمانی سەردەم پێی دەگوترێ: دەوڵەتی فیدڕاڵی لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا، چەند ئەمارەتێکی ئیسلامی نیمچە سەربەخۆ، هەبوو، وەك بەحرەین عەلای حەزرەمی کرد بەفەرمانڕەوایان (بڕوانە:

ژمارە: ١٥٢٢ تەجرید، لەم بەرگەدا، ژیانی عەلاء)+ (بەرگی/٣ ل/٤٠٢ ژ :١٢٧٧) هەتا تەنانەت دروستە هەرێمێ لەو هەرێمانە دانیشتووەکانی موسوڵمان نەبن و سەرۆکەکەیان لەخۆیان بێ و ناموسوڵمان بێ، وەك ئەوە مەسیحی بێ (بڕوانە: ژمارە: ٧١٣ = بەرگی/٢ ل/١٣٥ = ژمارە: ١٤٨١و تەرمەفەکانی لە فەتحولباریدا + ٣١٦٢ فەتح).

مامۆستای مەزنی عەینی لە عومدەتولقاریٔ دا، بەرگی/٩لاپەڕە/٦٦ دەفەرموێ: (لەتەلویح دا دەفەرموێ: ئەم شای ئەیلەیە ناوی یوحەنناى كوڕی روبە بووە) وەهەروەها لەهەمان شوێن دا دەفەرموێ: (...كان النبي (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اقطع هذا الملك من بلاده قطائع، وفوض اليه حكومتها..) واتە: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لێ بێ) چەند شوێنێکی لە ولاتی ئەم شای ئەیلەیە هەڵبژاردو بەخەلاتی دای بەخۆیو حوکمڕانی ولاتەکەیشی سپارد بەخۆی !).

وەهەروەها دەفەرموێ: (وفيه قبول هدية الكفار، وفيه جواز الا هداء لملك الكفار وجاز اقطاع ارض لهم) واتە: لەم فەرموودەی داستانی شای ئەیلەدا ئەم بەهرانەی واتیادا: دروستە دیاری لەناو موسوڵمان وەر بگیرێ، وەهەروا دیاری بدرێ بە شای ناموسوڵمانان، وەخەلات و بەخشیش و زەوی و زار بەخەلاتی بدرێ بە ناموسوڵمان..) (عینی/٩ ص/٧٠) بڕوانە: ژمارە: ١٦١٠/٤٣٨٠ لەم بەرگەدا.

١٥٩٩- عَنْ ابِي مُوسَى الاشْعَرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَهُ الَى الْيَمَنِ فَسَالَهُ عَنْ اشْرِبَةٍ تُصْنَعُ بِهَا فَقَالَ وَمَا هِيَ قَالَ الْبِتْعُ وَالْمِزْرُ فَقُلْتُ لابِي بُرْدَةَ مَا الْبِتْعُ قَالَ نَبِيذ الْعَسَلِ وَالْمِزْرُ نَبِيذ الشَّعِيرِ فَقَالَ كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ رَوَاهُ جَرِيرٌ وَعَبْدُ الْوَاحِدِ عَنْ الشَّيْبَانِيِّ عَنْ ابِي بُرْدَةَ (الحديث:٤٣٤٣، طرفه في: ١٠٠٢ تجريد = ٢٢٦١ فتح = بەرطى/٣ ل - ٧٥)[٣٦٢].

(٣٦٢) راجع رقم: ١٠٠٢ ت = ٢٢٦١ ف = بەرگی/٣ل- ٧٥ - المترجم .

**ئەبو مووسای ئەشعەری** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **منی نارد بۆیەمەن (وکردمی بەسەرۆکی هەرێمی خواروو بڕوانە: ژمارە: ١٥٩٨) وەمنیش لەبابەتی چەند جۆرە خواردنەوەیەکەوە کەلەو ولاتە دروست دەکرێن پرسیارم لێ کرد.**

**فەرمووی: (ئەوانە چین) عەرزیم کرد: خۆشاوی هەنگوین و خۆشاوی جۆن، کەبەزمانی خەڵکی ئەوێ بەیەکەمیان دەگوترێ: بتع و بەدوومیان دەڵێن: میزر فەرمووی (هەمووسەرخۆشیکەرێ نادروستە) قسەگێڕەوە (راوی) دەفەرمووێ: بەتع: خۆشاوی هەنگوینە، میزریش ئاوی جۆی خووساوە). (تاج/٤ ل/٨٧ ف/٧).**

**١٦٠٠- عنْ الْبَرَاء (رَضيَ اللهُ عنهُ) قالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ الَى الْيَمَنِ قَالَ ثُمَّ بَعَث عَلِيًّا بَعْدَ ذلِكَ مَكَانَهُ فَقَالَ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مُرْ اصْحَابَ خَالِدٍ مَنْ شَاء مِنْهُمْ انْ يُعَقِّبَ مَعَكَ فَلْيُعَقِّبْ وَمَنْ شَاء فَلْيُقْبِلْ فَكُنْتُ فِيمَنْ عَقَّبَ مَعَهُ قَالَ فَغَنِمْتُ اوَاقٍ ذوَاتِ عَدَدٍ (الحديث: ٤٣٤٩)[٣٦٣].**

**بەراء** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا، ناردینی بۆ یەمەن، بۆ غەزا کردن، لە پاش گەڕانەوەمان لە تائیف، لەپاش ماوەیێ عەلی نارد لە شوێن خالید، وە بە عەلی دەفەرمووێ: (بەهاورێکانی خالید بڵێ: ئەوەی کە حەز دەکا لەگەڵ خالیددا بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، ئەوەکەیفی خۆیەتی، ئەوەیشی کە حەزدەکا لەگەڵ تۆدا بمێنێتەوەو لە پاشدا لەگەڵ تۆدا بگەڕێتەوە بۆیەمەن، ئەویش هەرئارەزووی خۆیەتی، من خۆم یەکێك بووم لەوانەی کە لەگەڵ عەلیدا گەڕاینەوە بۆیەمەن و، لەگەڵیا ماینەوە لەوێ، جا ئەندازەیەکی باش پارەو**

---

**(٣٦٣) قال العيني- رحمه الله تعالى- : (والحديث من افراده- عيني ١٨ص٦) - المترجم .**




پوولم لـه تـالان وه دهسـت كـهوت!) (تـاج/٨ ل/٢٦٠ ف/١ ز/١٠٥- باسـی نـاردنی عهلی و خالید بۆ ولاتی یهمهن).

١٦٠١- عَنْ بُرَيْدَةَ عَنْ ابِيهِ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَـالَ: (بَعَـث النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِيًّا الَى خَالِدٍ لِيَقْبِض الْخُمُسَ وَكُنْتُ ابْغِض عَلِيًّا وَقَدْ اغْتَسَلَ فَقُلْـتُ لِخَالِدٍ: الا تَرَى الَى هَذا فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) ذَكَـرْتُ ذلِكَ لَهُ فَقَالَ يَا بُرَيْدَةُ اتُبْغِض عَلِيًّا فَقُلْتُ نَعَمْ قَالَ: لا تُبْغِضهُ فَـانَّ لَـهُ فِـي الْخُمُـسِ اكْثرَ مِنْ ذلِكَ) (الحديث: ٤٣٥٠)(٣٦٤).

بورهید (رهزای خودای لـێ بـێ) فـهرمووی: پێغهمبـهری خـودا (دروودی خـودای لهسهر بـێ) عـهلی نـارد بـۆلای خالیـدی كـوڕی وهلیـد، لهیهمـهن هـهتا پێـنج یـهكی ئـهو تالانییه وهربگرێ، كه لهشكرهكهی خالید دهستیان كهوتبوو، وهمن لهبهرشـتێ رقم له عهلی گـرت، چـونكه دیـم لهتالانییهكه، كـه نیزێكی جوانی ههڵبـژارد بۆخۆی لهباتی بهش و بهدهسـتی گـرت و لهپاشـا خـۆی شـۆردو غوسـڵی خـۆی دهركرد، وهمن ئهمهم دانا بهگزی له تالانییهكه. جا بهخالیـدم گـوت: سـهیری ئهمه ناكهی، چی كارێكی ناشیرینی كرد!!

جا كاتێ هاتینهوه بۆ خزمهتی پێغهمبـهر لهمهدینـهی نـازدار، ئهمـهم بـۆ باس كردو عهرزیم كرد كه من لهبهر ئهوه رقم لهعهلییـه، فـهرمووی: (ئـهی بورهیده! ئایا رقت لهعهلییه؟) گوتم: بهڵێ، فـهرمووی: (رقـت لهعـهلی نـهبێ، چونكه عهلی لهو پێنج یهكه، لهوهیش زیـاتر بهشهپـشكی دهكـهوێ). (بڕوانـه: ژماره: ١٦٠٠).

١٦٠٢- عـنْ ابَـي سَـعِيدِ الْخُـدْرِيَ (رَضِـيَ اللهُ عنـهُ) يَقُـولُ: (بَعَـث عَلِـيُّ بْنُ ابي طَالِبٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) الَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) مِـنْ الْـيَمَنِ

(٣٦٤) قال في الفتح: (لم يوافقه مسلم على تخريج حديث البراء في قصة على مع الجارية ، وحديث بريدة فيه –خاتمة كتاب المغازي ج/٨ص١٥٤)- المترجم .

بِذهَيْبَةٍ فِي اَدِيمٍ مَقْرُوظ لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا قَالَ: فَقَسَمَهَا بَيْنَ ارْبَعَةِ نَفَرٍ بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ وَاقْرَعَ بْنِ حابِسٍ وَزَيْدِ الْخَيْلِ وَالرَّابِعُ امَّا عَلْقَمَةُ وَامَّا عَامِرُ بْنُ الطفَيْلِ.

فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ اصْحَابِهِ: كُنَّا نَحْنُ احَقَّ بِهَذا مِنْ هَؤُلاء قَالَ: فَبَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فَقَالَ الا تَامَنُونِي وَانَا امِينُ مَنْ فِي السَّمَاء يَاتِينِي خَبَرُ السَّمَاء صَبَاحًا وَمَسَاء قَالَ فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ نَاشِزُ الْجَبْهَةِ كَثُ اللّحْيَةِ مَحْلُوقُ الرَّاسِ مُشَمَّرُ الازَارِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ اتَّقِ اللّٰهَ قَالَ وَيْلَكَ اوَلَسْتُ احَقَّ اهْلِ الارْض انْ يَتَّقِيَ اللّٰهَ قَالَ: ثمَّ وَلّى الرَّجُلُ قَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ الا اضرِبُ عُنُقَهُ؟ قَالَ: لا لَعَلّهُ انْ يَكُونَ يُصَلّي فَقَالَ خَالِدٌ: وَكَمْ مِنْ مُصَلّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّم): انّي لَمْ اومَرْ انْ انْقُبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاسِ وَلا اشُقَّ بُطونَهُمْ قَالَ: ثمَّ نَظرَ الَيْهِ وَهُوَ مُقَفّ فَقَالَ: انَّهُ يَخرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللّٰهِ رَطبا لا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنْ الدّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَةِ وَاظنُّهُ قَالَ: لَئِنْ ادْرَكْتُهُمْ لاقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثمودَ) (الحديث: ٤٣٥١، اطرافه في: ٣٣٤٤، ٣٦١٠، ٤٦٦٧، ٥٠٥٨، ٦١٦٣، ٦٩٣١، ٦٩٣٣، ٧٤٣٣، ٧٥٦٢)[٣٦٥].

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەلی لەیەمەنەوە پارچۆڵەیا زێڕی پوختە نەکرانی لەماڵی تالانی، نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) زێڕەکە لە پارچە قایشێکا بوو بە گەلا سەلەم (قورظ) خۆشە کرا بوو، هێشتا خاك وخۆڵی ناو کانەکەی پێوەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دابەشی کرد بە سەر ئەم چوارکەسەدا: بەسەر عویەینەی کوڕی بەدرونەقرەعی کوڕی جابیس وزەیدی خەیل و، چوارەمیشیان یا عەلقەمەی کوڕی عولاسە بوو، یاعامیری کوڕی توفەیل بوو.

(٣٦٥) قال العيني- رحمه الله تعالى- : (واخرجه مسلم في الزكاة- ج/ ١٥ ص٢٢٩ - المترجم .

پیاوێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە شایستەتر بووین بەم مالا وسامانی تالانییە، کە پێغەمبەر دابەشی کرد بەسەر ئەمانەدا! ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (من کە ئەمینداری خودای ئەرزو ئاسمانم و ئێوارەو بەیانی لە ئاسمانەوە وەحی و سرووشم بۆ دێ، کەچی هێشتا ئێوە متمانەم پێ ناکەن و، ئەوەتانێ هەندێکتان بەقای پێم نییەو ڕەخنەم لێ دەگرێ! فەرمووی: جا کابرایەکی چاو بە قوولاچووی، سەرکوڵم دەرپەڕیوی، گۆنا زەقیا، ناوچاوان قۆقزی، ڕیش پڕی، سەرتاشراوی، چاك بەلادا کردوو، پیاوێکی لەم حاڵە و لەم ڕەنگە، هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخودا بترسەو شەرم و شکۆیی لە خودا بکە!!

حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: بەدبەخت خۆت! ئەی ماڵ وێران! بۆ کەس هەیە لەسەر ڕووی زەوی کە ئاوا وەك من لەخودای گەورە بترسێ و، ئەوەندەی من شەرم و شکۆلە خودا بکا! گوتی: ئەوجا کابراکە ڕۆیشت، خالیدی کوڕی وەلیدیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی نەدەم لەگەردنی؟ فەرمووی: (نا، شتیوا مەکە، بەشکم نوێژکەر بێ) خالید فەرمووی: زۆر نوێژکەری وا هەیە زمان و دڵی یەك نین و، سەری زمانی شیرینە وبنی زمانی ژەهرینە پێغەمبەریش(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (من خودا نەیفەرمووە پێم کەناو دڵی خەڵك بپشکنم، یا ناو سکیان هەڵ بدڕم). گوتی: کە کاتێ پیاوەکە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەنەوەی ئەمە هۆزێ دەکەونەوە، بەزمانی پاراو، نامەیخودا: قورئانی پیرۆز، دەور دەکەنەوە، بەلام لەگەروویان ڕەت نابێ و ناچێتە ناو دڵیانەوە، ئەوانە وا لەئایین بەلەسە دەبن وا لە ئایینی ئیسلام بە پەلە دەردەچن وەك چۆن تیرێ، کەبدا لە نێچیرێ، خێرا گورج دەیسمێ و لێی دەردەپەڕێ ئەوانیش ئاوا).

فەرمووده گێڕەوه واتە: راوی دەفەرموێ: وادەزانم حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی (ئەگەر خۆم فریای ئەو هۆزەو وەچەیە بکەوم و، لەچەرخی من دا، کەسێ لەوانە پەیدا ببێ وەك چۆن خودا یافتی هۆزی سەموودی بڕییەوە، منیش ئاوایافتی ئەوان دەبڕمەوەو، هەموویان دەکوژم!) (تاج/٨ ل/٢٦١ ف/٢ ز/١٠٥) ف = فەرمووده.

## غەزای زول خەلەصە (غزوة ذي الخلصة)

١٦٠٣- عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الا تُرِيحُنِي مِنْ ذي الْخَلَصَةِ فَقُلْتُ: بَلَى فَانْطَلَقْتُ فِي خَمْسِينَ وَمِائَةِ فَارِسٍ مِنْ احْمَسَ وَكَانُوا اصْحَابَ خَيْلٍ وَكُنْتُ لَا اثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ فَذَكَرْتُ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَضرَبَ يَدَهُ عَلَى صَدْرِي حَتَّى رَايْتُ اثرَ يَدِهِ فِي صَدْرِي وَقَالَ: اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا قَالَ: فَمَا وَقَعْتُ عَنْ فَرَسٍ بَعْدُ قَالَ: وَكَانَ ذو الْخَلَصَةِ بَيْتًا بالْيَمَنِ لِخَثعَمَ وَبَجِيلَةَ فِيهِ نُصُبٌ تُعْبَدُ يُقَالُ لَهُ: الْكَعْبَةُ قَالَ: فَاتَاهَا فَحَرَّقَهَا بالنَّارِ وَكَسَرَهَا قَالَ: وَلَمَّا قَدِمَ جَرِيرٌ الْيَمَنَ كَانَ بِهَا رَجُلٌ يَسْتَقْسِمُ بالْازْلَامِ فَقِيلَ لَهُ: انَّ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَا هُنَا فَانْ قَدَرَ عَلَيْكَ ضَرَبَ عُنُقَكَ قَالَ: فَبَيْنَمَا هُوَ يَضرِبُ بِهَا اذ وَقَفَ عَلَيْهِ جَرِيرٌ فَقَالَ: لَتَكْسِرَنَّهَا وَلَتَشْهَدَنَّ انْ لا الَهَ الا اللَّهُ اوْ لَاضرِبَنَّ عُنُقَكَ قَالَ: فَكَسَرَهَا وَشَهِدَ ثمَّ بَعَث جَرِيرٌ رَجُلًا مِنْ احْمَسَ يُكْنَى ابا ارْطَاةَ الَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُبَشِّرُهُ بِذلِكَ فَلَمَّا اتَى النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالَّذي بَعَثكَ بالْحَقِّ مَا جِئْتُ حَتَّى تَرَكْتُهَا كَانَّهَا جَمَلٌ اجْرَبُ قَالَ: فَبَرَّكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى خَيْلِ احْمَسَ وَرِجَالِهَا خَمْسَ مَرَّاتٍ) (الحديث:٤٣٥٧، طرفه في: ١٢٣٧ تجريد = ٣٠٢٠ فتح= بەرطی/٣ل – ٣٥٨)[٣٦٦].

(٣٦٦) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل جرير بن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عنهُ) ، رقم: ٢٤٧٦ .

واتـای ئـەم فەرموودەیـە لـە پێـشەوە بـە تـەواوی ڕۆیـشت، تـەنیا ئـەم زیادەیـەی نـەبێ (لـەناو ئـەم خانـەیـەدا کۆمـەڵێ پەیکـەری بوتیـان تیـادا بـوو دەیانپەرستن... لـەو دەمـەدا کەجـەریر دەگاتـە پێـشەوە دەڕوانـێ وا پیـاوێ لەناو خانووەکەدا بە ئەزلام دانە ئەگرێتەوە، پێی دەڵێ: سوێندم بـە خـودا یـا ئـەم ئەزلامانـە دەشـکێنی و شـایەتمان دێنـی کـە: اشـهد ان لا الـه الله، یـاخود لەگەردنت ئەدەم و بەشیر دەتکوژم؟ فـەرمووی: ئـیتر کـابرا دانـەکانی شکان و شایەتمانی هێنا...).

١٦٠٤- عَنْ جَرِيرٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ كُنْتُ بالْيَمَنِ فَلَقِيتُ رَجُلَيْنِ مِنْ اهْلِ الْيَمَنِ ذا كَلاعٍ وَذا عَمْرٍو فَجَعَلْتُ احَدِّثُهُمْ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَي: ذو عَمْرٍو لَئِنْ كَانَ الَّذي تَذكُرُ مِنْ امْرِ صَاحِبِكَ لَقَدْ مَرَّ عَلَـى اجَلِـهِ مُنْـذ ثلاث وَاقْبَلا مَعِي حَتَّى اذا كُنَّا فِي بَعْض الطريقِ رُفِعَ لَنَـا رَكْـبٌ مِـنْ قِبَـلِ الْمَدِينَـةِ فَسَالْنَاهُمْ فَقَالُوا: قُبِض رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) وَاسْـتُخْلِفَ ابُـو بَكْـرٍ وَالنَّاسُ صَالِحُونَ فَقَالا اخْبِرْ صَاحِبَكَ انَّا قَدْ جِئْنَا وَلَعَلَّنَا سَنَعُودُ انْ شَاء اللّٰهُ وَرَجَعَـا الَى الْيَمَنِ فَاخْبَرْتُ ابا بَكْرٍ بِحَدِيثِهِمْ قَالَ افَلا جِئْتَ بِهِمْ فَلَمَّا كَانَ بَعْدُ قَالَ لِـي ذو عَمْرٍو يَا جَرِيرُ انَّ بِكَ عَلَيَّ كَرَامَةً وَانِّي مُخْبِرُكَ خَيْرًا انَّكُمْ مَعْشَرَ الْعَرَبِ لَنْ تَزَالُـوا بِخَيْرٍ مَا كُنْتُمْ اذا هَلَكَ امِيرٌ تَامَّرْتُمْ فِي اخَـرَ فَـاذا كَانَـتْ بالـسَّيْفِ كَـانُوا مُلُوكًـا يَغْضبُونَ غَضبَ الْمُلُوكِ وَيَرْضَوْنَ رِضا الْمُلُوكِ (الحديث: ٤٣٥٩)[٣٦٧].

دیـسان جـەریر (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەیـەمن بـووم، دوو پیـاوی شاپیاوی خەڵکی یەمەنم بینی، کە زوکەلاع و زوعەمر بـوون، کـەزو کـەلاعیان ڕۆحانییەکی گەورەی کاتی سەردەمی نەزانی (جاهلیە)بوو، لافی خوایـەتی لێ دەدا، وە زوعەمریـشیان لـە پادشـایانی یەمـەن بـوو، منـیش لـەبارەی پێغەمبەرایـەتی پێغەمبـەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) قـسەم بـۆ کـردن، کەچـی

(٣٦٧) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث جرير في بعثه الى اليمن (فتح/٨ص١٥٤ خاتمة كتاب المغازي - المترجم .

زوعەمریان پێی گوتم: ئەگەر تۆ ئەم دەنگوباسەی هاورێکەی خۆتمان بۆ دەگێڕیتەوە، دەسا ئەوەیش بزانە بامنیش چی لەبارەی هاورێکەتەوە دەزانم پێت بڵێم: ئەوە سێ ڕۆژە مردووە! جامنیش بۆ سۆراخی ئەم هەواڵە بەرەو مەدینە لەگەڵ لەشکرێکا کەوتمە ڕێگە، هەتا گەیشتینە هەوارێ گەیشتین بەبرکەیەك سوار لەلای مەدینەوە هاتبوون، کە بۆ ئەم هەواڵە لێمان پرسین، گوتیان: ڕاستە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کردووەو ئەبو بەکریش کراوە بەجێنشین، وە موسوڵمانانیش زۆرباش وتەبان و هیچ کێشەیەکیان نییە، بە بۆنەی وەفاتی پێغەمبەرەوە.

جا زوکەلاع و زوعەمر، خۆیان گەڕانەوە بۆ یەمەن و بەمنیان گوت: بە برادەرەکەت بڵێ، واتە: بە ئەبوبەکر، ئێمە نیازمان بووکە بێین بۆ مەدینە، بەڵام مادام موحەممەد وەفاتی کردووە دەگەڕێینەوە بۆ یەمەن، سابەشکوو لە دەرفەتێکا خوا حەزکابێینەوە بۆ مەدینە، جا ئەوان گەڕانەوە بۆ یەمەن و من چوومەوە بۆ مەدینەو بەخزمەت ئەبو بەکر گەیشتم و باسوخواسی ئەوانم بۆی گێڕایەوە، کە هەتا ئەوێش لەگەڵمان هاتن و دوایی کەبیستیان پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) مردووە گەڕانەوە، ئەبو بەکر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی بۆ نەتهێنان. لەوەدوا زوکەلاع پێی گوتم: ئەی جەریر! تۆ پیاوێکی خاوەن ڕێزو قەدری لەلای من، لەبەر ئەوە با ئەم قسەیەت بۆ بکەم: ئێوەی کۆمەڵەی عەرەب مادام هەتا وەك ئێستاتان، ئاوا لەناو خۆتانا یەك دڵ و یەك بن، هەر کاتێ فەرمانڕەوایەکتان بمرێ وەك ئێستا بەڕاوێژو ڕاوێژکاری و بە ئاشتی و هێمنی فەرمانڕەوایەکیتر لە خۆتان دابنێن، ئەی جەریر! هەتا ئێوە وابن هەر خێر دێتە ڕێتان و سەرکەوتوو دەبن، بەڵام کێشەو بەرەی گەورەکاتێ دروست دەبێ کەفەرمانڕەوایی بەزەبری شیرو تیر بەبسەپێ بەسەر مەردوم دا، ئەو کاتە فەرمانڕەواکانتان دەبن بەپادشای زۆردار، وەك ئەوان تووڕە دەبن و وەك ئەوان لە مەردوم رازی دەبن).

**ڕوونکردنەوە:**

زوکـەلاع و زوعـەمر دوو پادشا بـوون لـە پادشـایانی یەمـەن، دەڵـێن: زوکـەلاعیان داوای خوایـەتیکردووە، بـەڵام گـرنگ ئەومیـە کـە هـەردوکیان ئیـسلام بـون و لـەزەمانی حـەزرەتی عومـەردا کۆچـیان کـردووە بـۆ مەیدنـە زوکەلاع کەهات بـۆ مەینـە، دوازدە هـەزار مـاڵ کۆیلـەی هـەبوو، عومـەر پێـی گوت: کە ئەمانە بفرۆشە بەمن، هـەتا لـەم جـەنگی نامـسوڵمانەنەدا بـەکاریان بهێنم؟ زولکەلاع گوتی: ئەمانە ئازادن، لەیـەك سـاعەتا هـەموویانی ئـازادکرد، زوکـەلاع پیـاوێکی جـوان خـاس بـوو، کـاتێ دەڕۆیـشتە نـاو مەککـەوە میـزەری دەبەستەوە، ئەو سەرو میزەرە هەر لەخۆی جوان بـوو، لـە شـەڕی صـەفین دا نوێنەری موعاوییە بوو، لە پێش تەواو بونی شەڕەکە دا کـوژرا، وە موعاوییـە بەمردنەکەی خۆشحاڵ بوو، ساڵی سیی و حەوت کوژرا (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودا لەوو لە زوعەمر).

## غەزای قەراخی دەریا (سیف البحر)

کەخۆیان مات دابوو بۆ پەلاماردانی کاروانێکی قوڕەیش، ئەم لەشکری ئیسلامە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح (ڕەزای خودای لێ بێ) سەرلەشکریان بوو.

(غزوة سیف البحر، وهم یتلقون عیرا لقریش وامیرُهم ابـو عبیدة بـن الجراح (رَضيَ اللهُ عنهُ)).

١٦٠٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّهُ قَالَ: (لَمَّا بَعَـث رَسُـولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْثا قِبَلَ السَّاحِلِ وَامَّرَ عَلَيْهِمْ اباعُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ وَهُمْ ثلاث مِائَةٍ فَخَرَجْنَا وَكُنَّا بِبَعْض الطريقِ فَنِيَ الزَّادُ فَامَرَ ابـو عُبَيْـدَةَ بـازْوَادِ الْجَـيْشِ فَجُمِعَ فَكَانَ مِزْوَدَيْ تَمْرٍ فَكَانَ يَقُوتُنا كُلَّ يَوْمٍ قَلِيلا قَلِيلا حَتَّى فَنِيَ فَلَمْ يَكُنْ يُصِيبُنَا الا تَمْرَةٌ تَمْرَةٌ فَقُلْتُ: مَا تُغْنِي عَنْكُمْ تَمْرَةٌ فَقَالَ: لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَنِيَتْ ثـمَّ انْتَهَيْنَا الَى الْبَحْرِ فَاذا حُوتٌ مِثْلُ الظربِ فَاكَلَ مِنْهَا الْقَوْمُ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ لَيْلَةً ثـمَّ امَـرَ

ابُو عُبَيْدَةَ بِضلَعَيْنِ مِنْ اضلاعِهِ فَنُصِبا ثمَّ امَرَ بِراحِلَةٍ فَرُحِلَتْ ثمَّ مَرَّتْ تَحْتَهُمَا فَلَمْ تُصِبْهُمَا). (الحديث: ٤٣٦٠، اطرافه في: ٢٤٨٣، ٢٩٨٣، ٤٣٦١، ٤٣٦٢، ٥٤٩٣، ٥٤٩٤)[٣٦٨].

١٦٠٥م– وعنهُ (رَضيَ اللهُ عنهُ) في روايةٍ انّه قالَ: فَالْقَى لَنَا الْبَحْرُ دَابَّةً يُقَالُ لَهَا الْعَنْبَرُ فَاكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ وَادَّهَنَّا مِنْ وَدَكِهِ حَتَّى ثابَتْ الَيْنَا اجْسَامُنَا (الحديث: ٤٣٦١،طرفه في: ٤٣٦٠).

١٦٠٥م م– وعنهُ في روايةٍ اخرى: قَالَ ابُو عُبَيْدَةَ: (كُلُوا فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ ذكَرْنا ذلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ كُلُوا رِزْقًا اخْرَجَهُ اللَّهُ اطعِمُونَا انْ كَانَ مَعَكُمْ فَاتَاهُ بَعْضهُمْ بعُضوٍ فاكَلَهُ). (الحديث: ٤٣٦٢، طرفه في: ٤٣٦٠).

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشکرێکی سێ سەد کەسی نارد بۆ قەراخی دەریا، وە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەرراحی کرد بەسەر لەشکریان، من خۆم لەو لەشکرا دابووم، سێ سەد سوار بووین، دەرچووین هەتا گەیشتینە جێگەیێ توێشوومان پێ نەما، خۆراکمان تەواو هاتە کزی، تووشی برسێتییەکی سەخت بووین، لەتاوانا بەگەلاکوتك گەلا دارمان دەوەراندو دەمانخوارد! جا ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد، هەموو توێشووەکانی لەشکرەکەیان کۆکردەوە، هەمووی پڕ دوو تۆیشە بەرە خورما بوو، ئیتر هەموو ڕۆژێ، بەکەمە کەمە دەیژی یاندین، هەتا ئەوەیش نەما، و تەنیا ڕۆژانەیەکی سەرو دەنك خورمامان پێ دەبرا وەهبی کوڕی کیسان فەرمووی بە جابیرم گوت: جا تاقەدەنکێ خورما بەکەڵکی چیتان دەهات؟ فەرمووی: وەك چۆن منالی ساوا مەمکی دایکی دەمژێ، ئاوا ئەودەنکە خورمایەمان دەمژی، وەئاومان دەکرد بەسەریدا، ئیتر بەشی ئەو

---

(٣٦٨) اخرجه مسلم في الصيد و الذبائح ، باب: اباحة ميتات البحر، رقم: ١٩٣٥ .

ڕۆژە تائێوارێی دەکردین، کاتێ ئەوەیش نەما ئەوسا هەستمان کرد بەسوودی بوونەکەی و نرخیمان زانی.

لە پاشا گەیشتینە سەردەریا، روانیمان وا نەهەنگێك وەك یالێ وەهایە، لەکەنار دەریاکە بەمردوویی کەوتووە، ئیتر برادەران هەژدەشەو لێیان خواردو خۆمان بەپیوەکەی چەوردەکرد، هەتا لەشمان بووزایەوە، ئەوجا ئەبوعوبەیدە فەرمانی کرد دوو پەرا سووی ئەو نەهەنگەیان ڕاست کردەوە و لەبنەوەکەمێ بلاویان کردنەوەو لەسەرەوە نووکەکانیان نووساندن بەیەکەوە، لەچەشنی دوولا شیپانەی دەروازە، ئەوجا فەرمانی کرد وشترێکی زەبەلاحیان کۆپان کردو پیاوێکی فیلەتەنمان تیادا بوو لەسەر ئەو کۆپانەوە سواری ئەو وشترەی کردو بە ژێر ئەو دوو پەراسووەدا ڕۆیشت سەری نەیدا لەپەراسووەکان.

دەفەرموێ: ئەبو عوبەیدە فەرمووی: (دەی لێی بخۆن) جاکاتێ هاتینەوە بۆ مەدینە، باسەکەمان عەرزی حەزرەت کرد، فەرمووی: (بخۆن لەو رزق و ڕۆژیە پاکە کە خودا رەخساندوویەتی، دەرخواردی ئێمەیش بدەن لێی، ئەگەر لاتان ماوە) جاهەندێ لەبرادەران لەگۆشتی ئەو نەهەنگەی لەلا مابوو، بۆیهێنا، پێغەمبەریش لێی خوارد) (بڕوانە: تاج/٤ ل/٩ ز/٢ ف/١ - گیانلەبەری ئاوی ومردارەوە بوویشی دەخورێ).

## شاندەکەی بەنی تەمیم

١٦٠٦- عنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) (انَّهُ قَدِمَ رَكْبٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ ابُو بَكْرٍ امِّرْ الْقَعْقَاعَ بْنَ مَعْبَدِ بْنِ زُرَارَةَ قَالَ عُمَرُ بَلْ امِّرْ الاقرَعَ بْنَ حَابِسٍ قَالَ ابُو بَكْرٍ مَا ارَدْتَ الا خِلافِي قَالَ عُمَرُ مَا ارَدْتُ خِلافَكَ فَتَمَارَيَا حَتَّى ارْتَفَعَتْ اصْوَاتُهُمَا فَنَزَلَ فِي ذَلِكَ يَا ايُّهَا الَّذِينَ

امَنُوا لا تُقَدِّمُوا حَتَّى انْقَضتْ). (الحديث: ٤٣٦٧، اطرافه في: ٤٨٤٥، ٤٨٤٧، ٧٣٠٢)[٣٦٩]

عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستەیێ سواری بەنی تەمیمی هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە ئەبو بەکر عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا!! قەعقاعی کوری مەعبەدی کوڕی زورارە بکە بەگەورەو و فەرمانڕەوایان، ئیمامی عومەریش فەرمووی: ئەقرەعی کوڕی حابیس بکە بەگەورەیان، ئەبوبەکر لەقسەکەی عومەر دلگران بوو، پێی گوت: تۆهەر مەبەستت دژایەتی و بەربەرەکانی من بوو، لەم قسەیەدا!! عومەریش فەرمووی: مەبەستم شتی وانییە، ئیتر بووبەمشت و مڕیان و دەنگیان بەرزەوەبوو. ئیتر ئەم ئایەتە بەم بۆنەیەوە هات بۆ پێغەمبەر: ﴿یاایها الذین امنو الاتقدموا بین یدی الله ورسوله واتقوا الله ان الله سمیع علیم﴾ سوورەتی حوجورات/٤٩/ ١-، واتە: ئەی موسوڵمانییە! هیچ کارێ خود سەر، لە خۆتانەوە بەبێ فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا مەکەن، لەخودابترسن چونکە خودا ئاگای لە هەموو شتێکەو هەمووشتێ دەزانێ). (تاج/٧ ل/١٤٨ ز/٣٢- سوورەتی حوجورات).

## شاندەکەی بەنی حەنیفەو سەرگوروشتەی ئیسلامبوونی سومامەی کوڕی ئوسال
## (وفد بني تميم وحديث ثمامة بن اثالٍ)

١٦٠٧- عنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْلا قِبَلَ نَجْدٍ فَجَاءتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ يُقَالُ لَهُ: ثُمَامَةُ بْنُ اثالٍ فَرَبَطُوهُ

---

(٣٦٩) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عبدالله بن الزبير في وفد بني تميم (خاتمة كتاب المغازي ج- / ٨ ص١٥٤ =ج /ص ٥٠٤ . ط . ج)- المترجم.

بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ فَخَرَجَ الَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ؟ فَقَالَ: عِنْدِي خَيْرٌ يَا مُحَمَّدُ انْ تَقْتُلْنِي تَقْتُلْ ذا دَمٍ وَانْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ وَانْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ فَسَلْ مِنْهُ مَا شِئْتَ فَتُرِكَ حَتَّى كَانَ الْغَدُ ثُمَّ قَالَ لَهُ: مَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ قَالَ: مَا قُلْتُ لَكَ: انْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ فَتَرَكَهُ حَتَّى كَانَ بَعْدَ الْغَدِ فَقَالَ: مَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ فَقَالَ: عِنْدِي مَا قُلْتُ لَكَ فَقَالَ: اطْلِقُوا ثُمَامَةَ.

فَانْطَلَقَ الَى نَخلٍ قَرِيبٍ مِنْ الْمَسْجِدِ فَاغْتَسَلَ ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَقَالَ: اشْهَدُ انْ لا الَهَ الا اللَّهُ وَاشْهَدُ انَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ يَا مُحَمَّدُ وَاللَّهِ مَا كَانَ عَلَى الارْضِ وَجْهٌ ابْغَض الَيَ مِنْ وَجْهِكَ فَقَدْ اصْبَحَ وَجْهُكَ احَبَّ الْوُجُوهِ الَيَ وَاللَّهِ مَا كَانَ مِنْ دِينٍ ابْغَض الَيَ مِنْ دِينِكَ فَاصْبَحَ دِينُكَ احَبَّ الدِّينِ الَيَ وَاللَّهِ مَا كَانَ مِنْ بَلَدٍ ابْغَض الَيَ مِنْ بَلَدِكَ فَاصْبَحَ بَلَدُكَ احَبَّ الْبِلادِ الَيَ وَانَّ خَيْلَكَ اخَذَتْنِي وَانَا ارِيدُ الْعُمْرَةَ فَمَاذا تَرَى فَبَشَّرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَامَرَهُ انْ يَعْتَمِرَ فَلَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ قَالَ لَهُ قَائِلٌ صَبَوْتَ قَالَ لا وَلَكِنْ اسْلَمْتُ مَعَ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلا وَاللَّهِ لا يَاتِيكُمْ مِنْ الْيَمَامَةِ حَبَّةُ حِنْطَةٍ حَتَّى يَاذنَ فِيهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث: ٤٣٧٢، اطرافه في: ٤٦٢٠، ٤٦٩، ٢٤٢٢، ٢٤٢٣)[٣٧٠].

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت (درووودو سلاوی خوای گەورەی لەسەر بێ و سەرو مالا و منالاو هەست و نەست بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی) بڕکەیێ سواری بەرەو نەجد نارد، کەهاتنەوە پیاوێکی بەنی حەنیفەیی یان دیل کردبوو، لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، ناوی سومامەی کوڕی ئوسال بوو، سەرگەورەی خەلکی یەمامە بوو،جا لەبەر ئەوەی کەلەسەردەمی حەزرەتدا بەندیخانەیان نەبوو، چونکە حوکمیان تابلێی سادەو پڕدادو عەدالەت بوو، پێویستیان بە پۆلیس و کەلەبچە و زیندان**

(٣٧٠) اخرجه مسلم في الجهاد و السير ، باب: ربط الاسير و حبسه ... رقم: ١٧٦٤ .

نـەبوو، لەبـەر ئـەوە پیاوەکـەیان بـە کۆڵەکـەیێی لەکۆڵەکـەکانی مزگەوتـەوە بەستەوە...

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای و فەرمووی پـای: ئـەی پومامـە! پێت وایە چیت لێ دەکەین؟) ئەویش گوتی: ئەی موحەممەد! ئومێدی خێـرت لێ دەکەم: چونکە تۆ پیاوێکی حەقۆانیت، لەبەر ئـەوە، ئـەوەی کـەتۆ بیکوژی شایانی کوشتنەنە وە ئـەوەی کـە تـۆ پیاوەتی لەگـەڵ بکەی مایـەی سوپاس و شانازییە بۆی، خۆ ئەگەر پارەو ماڵیشت دەوێ، چـەندە حـەز دەکـەی داوابکـە دەتـدەمێ،جا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وازی لێ هێنـاو بـۆ دووسـبەی، فەرموویە وەپێی (ئەی سومامە! لات وایە کەچیت لێ دەکەم؟) ئەویش گوتی: هەرئەوەیە کە پێم گوتیت! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئـەو ڕۆژەیش وازی لێ هێنایـەوە و بۆسـبەینێ فەرموویـەوە: (ئـەی سـومامە! لات وایـە چـیت لێ دەکـەم؟ گـوتی : هـەر ئەوەیـە کـە ئـەو ڕۆژە پـێم گوتـووی، ئومێـدی خێـرت لێدەکـەم: چـونکە ئـەوەی تـۆ دەیکـوژی شـایانی کوشـتنە، وە ئـەوەی کـەتۆ پیاوەتی لەگەڵ بکەی مایەی سوپاسکردنە، کەواتە بۆ منـیش چ بمکوژیـت و چ پیاوەتیم لەگەڵ بکەی جێگەی خۆیەتی، خۆ ئەگەر دەتەوێ بە پـارەو مـاڵیش بەرم بدەیت چەنەدەت دەوێ داوا بکە دەیدەم پێت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سومامە بەردەن).

سومامە ڕۆیـشت لـەناو باخـە خورمایـەکا، کـە لـەنزیکی مزگەوتـەوە بـوو لەوێ خۆی شۆردو هاتەوە بۆ مزگەوت و گـوتی: (اشهد ان لا الـه الاالله واشـهد ان محمـدا عبـده ورسـوله) ئـەی موحەممـەد! بـەزاتی خـودا لەمـەوپێش کـەس نەبوو لەسـەر ڕووی زەوی، کـە بەقـەد تـۆرقم لێـی بـێ، بـەڵام ئێـستاکە کـەس نییە کـە بەقـەد تۆخۆشـم بـوێ هـەروەها ئایینەکـەت و ولاتەکەیشت، بـەزاتێ کەزاتی خودایە، دین نەبووە کە بەقەد دینەکەی تۆ رقم لێی بێ بەڵام ئێـستا دینەکـەی تـۆم لەهـەموو دینێکـی تـر خۆشـتر دەوێ، بـەزاتێ کـەزاتی خودایـە،

ولات نەبووە کە بەقەد ولاتەکەی تۆرقم لێی بێ، بەڵام ئێستا ولاتەکەی تۆ خۆشەویست ترین ولاتە بەلامەوە، من لەو کاتەدا کە سوارەکانی تۆ گرتمیان دەمویست عەمرە بکەم، بۆ ئەمە چی دەفەرمووی؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) مزگێنی پێ داو فەرمانی کرد، کەبچێ عەمرەکەی بکا. جاکە دەچێ بۆ مەککە، یەکێ پێی دەڵێ: ئەوە لەئایینی خۆت وەرگەڕاویت و بوویت بەصابیئی (واتە: بەموسوڵمان) سومامە پێی گوت: نەخێر نەبووم بەصابیئی، بەڵام موسوڵمان بووم و دینی پێغەمبەری ڕاست و دروستی خودام وەر گرتووە، کە موحەممەدە، دەسا بەزاتی خودا، تا ئێوە لەسەر ئەم بارودۆخە ناحەزانەبن لەگەڵ ئیسلام دا، یەك دەنگ گەنم چییە، لەولاتی یەمامەوە بۆتان نایێ، مەگەر ڕەزامەندی پێغەمبەری لەسەربێ!. (تاج/٨ ل/١٧١ ز/٧٠ - باسی دییل).

ئەو بەهرانەی لەم فەرموودە پیرۆزەیە وەردەگیرێن:

١- دروستە گومانبار حەپس بکرێ، یابە شێوەیێ کە لەباربێ بۆحاڵ ببەسترێتەوە.

٢- بوونی بێباوەڕ لەناو مزگەوتا لەبەر پێویستی ڕەوا دروستە.

٣- لەکاتی ئیسلامبوونا غوسڵ کردن مەشرووع و ڕەوایە.

٤- سومامە یەکێکە لە گەورە پیاوانی هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پێش ئازاد کردنی مەککەدا ئیسلام بووە. فەرموودەکانی لە بوخاریدا لەڕێگەی سەعیدی مەقبورییەوە، لەئەبو هورەیرەوە گێرد راونەتەوە، کاتێ خەڵکی یەمامە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو دوای موسەیلەمەی کەزاب کەوتن، سومامە و ئەو موسوڵمانانەی بە گوێیان کرد کۆچیان کرد بۆلای عەلائی حەزەمی بۆ بەحرەین، وە لەگەڵ ئەوانا چوون بەگژ هەڵگەڕاوەکانی موسویلەمەدا.

١٦٠٨- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَدِمَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذابُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّهِ(صَلّىاللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)فَجَعَلَ يَقُولُ انْ جَعَلَ لِي مُحَمَّدٌ الامر مِنْ بَعْدِهِ تَبِعْتُهُ وَقَدِمَهَا فِي بَشَرٍ كَثيرٍ مِنْ قَوْمِهِ فَاقْبَلَ الَيْهِ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ ثابِتُ بْنُ قَيسِ بْنِ شَمَّاسٍ وَفِي يَدِ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قِطعَةُ جَرِيدٍ حَتَّى وَقَفَ عَلَى مُسَيْلِمَةَ فِي اصْحَابِهِ فَقَالَ لَوْ سَالْتَنِي هَذِهِ الْقِطعَةَ مَا اعْطَيْتُكَهَا وَلَنْ تَعْدُوَ امْرَ اللّهِ فِيكَ وَلَئِنْ ادْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللّهُ وَانّي لارَاكَ الّذي ارِيتُ فِيهِ مَا رَايْتُ وَهَذا ثابِتٌ يُجِيبُكَ عَنّي ثمَّ انْصَرَفَ عَنْهُ. (الحديث: ٤٣٧٣، اطرافه في: ٣٦٢٠، ٤٣٧٨، ٧٠٣٣، ٧٤٦١).

قَالَ ابْنُ عَباسٍ: فَسَالْتُ عَنْ قَوْلِ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (انَّكَ ارَى الّذي ارِيتُ فِيهِ مَا ارَيْتُ فَاخْبَرَنِي ابُو هُرَيْرَةَ انَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ بَيْنَا انَا نَائِمٌ رَايْتُ فِي يَدَيَ سِوَارَيْنِ مِنْ ذهَبٍ فَاهَمَّنِي شَانُهُمَا فَاوحِيَ الَيَ فِي الْمَنَامِ انْ انْفُخهُمَا فَنَفَخْتُهُمَا فَطارَا فَاوَّلْتُهُمَا كَذابَيْنِ يَخرُجَانِ بَعْدِي احَدُهُمَا الْعَنْسِيُّ وَالاخَر مُسَيْلِمَةُ. (الحديث: ٤٣٧٤، اطرافه في: ٣٦٢١، ٤٣٧٥، ٤٣٧٩،

٧٠٣٤، ٧٠٣٧)[٣٧١].

**ئینبوعەباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر خۆی موسەیلەمەی درۆزن کەناسراوەبە موسەیلەمەی کەزاب هات بۆمەدینە، عەشاماتێکی زۆری لەهۆزەکەیخۆی لەگەڵ دابوو، دەیگوت: ئەگەر موحەممەد لەدوای مردنی خۆی، کاروبارو جێنشینی خۆی بسپێری بەمن وبمکات بەجێنشینی خۆی دیمە سەر دینەکەی و پەیڕەوی ئەو دەکەم، پێغەمبەریش** (دروودی خودای لێ بێ) **سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسی لەگەڵ خۆی برد.**

---

**(٣٧١) اخرجه مسلم في الرؤيا، باب: رؤيا النبي** (صلى الله عليه وسلم) **رقم: ٢٢٧٣، ٢٢٧٤**

ئەم پابیتە خەتیبی پێغەمبەر بوو، وە چوو بۆلای موسەیلەمە، هەتا لەبەرچاوی هەموان اقامەحوججەی لەسەر بکات، وەلەم کاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پارچە چیلکەیەکی پەلکەی خورمای بەدەستەوە بوو، کەگەیشتە لای موسەیلەمە، لەناو هۆزەکەیا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەدیاری ڕاوەستا، لەپاش گوفتوگۆیەك، کەبرێتی بوو لەوە موسەیلەمە داوای جینێشنی پێغەمبەری کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پێی فەرموو: (ئەگەر داوای ئەم پارچە چیلکە یەشم لێ بکەی نایدەم پێت! چ جای ئەوەی کەبتکەم بە جێنشینی خۆم لەدوای خۆم، تۆ ناتوانی فەرمانی خودا سەبارەت بەخۆت بشکێنی و، ئەو فەرمانەی خوا لەبارەی تۆوە بڕیاری داوە بەتۆڕەت نابێتەوە، خۆ ئەگەرتۆ لەمن هەڵبگەڕێیتەوە، خودا لەگلوگۆت دەخات، وات دەبینم کە تۆ ئەوکابرایەیت کە بەخەو حاڵی بەدی ئەوم پێ نیشان دراوە، ئەوا من دەڕۆم، ئەمە سابیتە چی قسەیەکت هەیە ئەو لەباتی من وەلامت دەداتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەجێی هێشت و ڕۆیشت.

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی ئەم خەونەی پێغەمبەرەوە، کە فەرمووی: (تۆ ناتوانی فەرمانی خودا سەبارەت بەخۆت...) لەبارەی ئەم خەونەیەوە لە ئەبوهورەیرەم پرسی، فەرمووی: (پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: نووستبووم لەخەوما دیم کە لە هەردوو دەستمدا دوو بازنی زێڕم دی، ئەوە خەمگینی کردم، لە خەوەکەما سرووشم بۆکرا: ئادەی فوویان لێ بکە منیش فووم لێ کردن جا هەردووکیان بابردنیو فڕین ئەو بازنانەم بە دوو درۆزن لێك دایەوە، کە لەدوای من شۆڕەتیان بلاودەبێتەوەو ناویان دەزڕێ، ئەو دوو فرە درۆزنە یەکێکیان: ئەسوەدی عەنسی بوو، یەکێکیان: موسەیلەمەی کەزاب بوو. لەگێڕانەوەیەکا: بەم دوو درۆزنەم لێك دانەوە کەخۆم وام لە نێوانیان دا: بەکابرای صەنعاو بە کابرای یەمامە کە مەدینە دەکەوێتە بەینی ئەم دوانەوە). (تاج/١٠ ل/٢٤٥ ف/١ ز/٩٥).

١٦٠٩- عنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): (بَيْنَا انَا نَائِمٌ اتِيتُ بِخَزَائِنِ الارْض فَوُضعَ فِي كَفّي سِوَارَانِ مِنْ ذهَبٍ فَكَبُرَا عَلَيّ فَاوْحَى اللّهُ اليّ انْ انْفُخْهُمَا فَنَفَخْتُهُمَا فَذهَبا فَاوّلْتُهُمَا الْكَذابَيْنِ اللّذيْنِ انَا بَيْنَهُمَا صَاحِبَ صَنْعَاء وَصَاحِبَ الْيَمَامَةِ) (الحديث: ٤٣٧٥، طرفه في: ٤٣٧٤)[٣٧٢].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخەوما بینیم کەوا دووبازنی زێڕم وا لەدەست دا، وە زۆرم پێ ناخۆش بوو، لە خەوەکەدا سرووش (وەحی)یم بۆهات: کە فوویان لێ کە، جاکەفووم لێ کردن بابردنی! جالێکم دانەوە بەم دوو پێغەمبەرە درۆزنە کەلەپاش من دەردەکەون، کە یەکێکیان ئەسوەدی عەنەسیە، کەلەصەنعایە، ئەوی تریشیان موسەیلەمەی درۆزنە کە لەیەمامەیە (تاج/٨ ل/١٦ ز/٥ - ئەو خەونانەی کە پێغەمبەر خۆی(دروودی خودای لێ بێ) دیویانی).

## داستانی خەڵکی نەجران (قصّة اهل النجران)

١٦١٠- عَنْ حُذيْفَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (جَاء الْعَاقِبُ وَالسَّيِّدُ صَاحِبا نَجْرَانَ الَى رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يُرِيدَانِ انْ يُلاعِنَاهُ قَالَ فَقَالَ احَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ لا تَفْعَلْ فَوَاللّهِ لَئِنْ كَانَ نَبِيًّا فَلاعَنَّا لا نُفْلِحُ نَحْنُ وَلا عَقِبُنَا مِنْ بَعْدِنَا قَالا: انَّا نُعْطِيكَ مَا سَالْتَنَا وَابْعَث مَعَنَا رَجُلا امِينًا وَلا تَبْعَث مَعَنَا الا امِينًا فَقَالَ: لابْعَثَنَّ مَعَكُمْ رَجُلا امِينًا حَقَّ امِينٍ فَاسْتَشْرَفَ لَهُ اصْحَابُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ قُمْ يَا ابا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ فَلَمَّا قَامَ قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): (هَذا امِينُ هَذهِ الامَّةِ). (الحديث: ٤٣٨٠، اطرافه في: ٣٧٤٥، ٤٣٨١، ٧٢٥٤)

(٣٧٢) اخرجه مسلم في الرؤيا، باب: رؤيا النبي (صلى الله عليه وسلم) رقم: ٢٢٧٤ .

وفي رواية عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: (لِكُلِّ امَّةٍ امِينٌ وَامِينُ هَذهِ الامّة ابُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ). (الحديث: ٤٣٨١، اطرافه في: ٣٧٤٤، ٤٣٨٢، ٧٢٥٥)[٣٧٣].

حوزەیفـە (رەزای خودای لـێ بـێ) فـەرمووی: عاقیـب و سـەیید کـە هەریـەکی لـە ڕوویەکـەوە دەمڕاستی و لاتـی نـەجران بـوون، عاقیـب نـاوی عبدالمسیح بـوو، سەییدیش ناوی ئەیهەم بـوو، هـاتن بـۆ خزمـەتی حـەزرەتی پێغەمبـەر (دروودی خودای لـێ بـێ) چـوونە نـاو مزگەوتـەوە، ڕووەو خۆرهـەلات نوێـژی خۆیـان کـرد، لەپاشاڕۆیشتنە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لـێ بێ) سلاویان لێ کرد، وەلامی سلاوەکەی دانـەوە، بانگەشـەی لێ کـردن بـۆ ئیسلام بـوون، ڕازی نـەبوون کـە ئیسلام ببن، دوایی بـوو بـەگوفتو گـۆو دەمـەقرێ، وە پێغەمبـەری خـوا چـەند ئایـەتێکی قورئـانی بـۆ خوێندنـەوە، دوایـی داوای لێ کـردن کـە موباهەلـەیان لەگـەڵ دابکـا، موباهەلـە ئەوەیـە کـە هـەردوولا لـەخودا داوابکـەن و بلـێن: هەرکەسـێ بەهـەق ڕازی نـابێ و لـەم لایەنـەوە درۆدەکـا نـەفرەت و لەعنـەتی خودا لەو زالمانەبێ..).

ئـەوانیش بەمـە ڕازی بـوون و ویـستیان موباهەلـەو مولاعەنـە لەگـەڵ پێغەمبەر بکەن، بـەلام دوایـی یـەکێکیان بـەوی تریـانی گـوت: نەکـەی شـتیوا بکـەیت، شـتی وامەکـە، سـابەو خودایـە ئەگـەر ڕاسـت بـێ پێغەمبـەر بـێ و موباهەلەی لەگەڵ بکەین، نەخۆمان و نەنەوەو وەچەمان لەپاش خۆمان قەت خێرنایەتـە ڕێمـان و سـەرکەوتوو نـابین، دوایـی عـەرزی حـەزرەتیان کـرد: پێویست بەشەڕە نەفرەت ناکا، دەمانەوێ بەئاشتی لەگەڵتا ڕێك کەوین، ئێمـە ئیـسلام نـابین بـەلام سـەرانەت دەدەینـێ وەچیمان لێداوادەکـەیت دەیـدەین پێت، وە بۆ جابەجاکردنی ئەم سوڵحنامەیە پیاوێکی دەستپاکی ئەمینـدارمان

---

(٣٧٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل ابي عبيـدة بـن الجـرّاح (رَضيَ اللهُ عنهُ) ، رقم:٢٤٢٠ .

لەگەڵدا بنێرە، توخوا نائەمینمان بۆ مەنێرە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (لەگەڵتانا بۆ ئەم مەبەستە پیاوێکی زۆر ئەمنیدارو نیازپاکتان بۆ دەنێرم) جا زۆر لەهاوڕێکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەرکەسەیان لە لای خۆیەوە، خۆی بۆ ئەم پایە مەزنە قوت کردەوەو حەزی لەوە بوو، کە ئەو ئەمینداره خۆی بێ.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح هەڵسە) کە ئەبو عوبەیدە هەڵسا، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەمە ئەمینداری ئەم میللەتەی ئێمەیە!) وە ئەوی نارد لەگەڵیانا لەگێڕانەوەیەکا (هەموو نەتەوەێی ئەمیندارێکی هەیە، ئەمینداری ئێمەیش کەنەتەوەی ئیسلامین، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحە) (تاج/٥ ل/٩١ ز/١٣ ف/١+٢+٣) بڕوانە: ژمارە: ١٥٩٨ات لەم بەرگەدا.

**ڕوونکردنەوە:**

نەجران ولاتێکی گەورە بوو، حەوت قۆناغ لەمەککەوە دوور بوو، کە بەرەو یەمەن بڕۆی، دەوری حەفتاو سێ دا سەر بەشاری نەجران بوون، خەڵکەکەی مەسیحی بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەپێی ڕێکەوتن نامەێی، بەرابەر بەرانەیەی دیاری کراو، هێشتنیەوە لەسەر ولاتی خۆیان و لەسەر دینیخۆیان، پاش کەمێ سەییدو عاقیب هاتنەوە بۆ مەدینە هەردوکیان ئیسلام بوون لە سەر دەستی پێغەمبەردا (دروودی خودای لێ بێ) .

مامۆستای گەورەو مەزن ئیمامی عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (شەڕە نەفرەت لەگەڵ سەرپێچی کارا، لەپاش ڕاستکردنەەی بەڵگەی ڕاست و دروست، کارێکیڕەوایە، زۆر لە زانایان ئەمەیان کردووە، بە ئەزموون چەسپاوە ئەوانەی کە بەناهەق موباهەلە و شەڕە نەفرەت دەکەن ناگاتە ساڵا کە لەناو دەچن، مەن خۆم لەگەڵ کابرایەکا، کەلایەنگیری

زەندیقانی دەکرد، موباهەلەو شەڕە نەفرەتم کرد، دوومانگی نەبرد کە خوا لەناوی برد فەرمایشتی عەسقەلانی تەواو).

زۆر بەهرەی گرنگ لەم فەرموودەدا هەیە، وەك:

١- هاتنی ئەم شاندەی نەجران لە ساڵی نۆی کۆچیدا بووە.

٢- پێشەوای موسوڵمانان لە هەل و مەرجی وادا چی بە بەرژەوەندی موسوڵمانان دەزانێ ئەوە هەڵ دەبژێرێ، هەمیشە ئاشتی لەڕوانگەی ئیسلامەوە لە شەڕو شوڕ باشترە، پێکەوە ژیان لەناو چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلاما لەگەڵ کەمایەتی ئایینی تر وەك مەسیحی دروستە.

٣- خاوەن نامەکان دروستە بۆکاری ڕەوا هامۆشۆی مزگەوت بکەن، بگرە دروستە نوێژی تیا بکەن و لە ناو مزگەتی ئێمەدا ڕووبکەنە قیبلە و ڕووگەی خۆیان.

٤- ئەمانەت و دەستپاکی لە هەموو سەردەمێکا هەوێنی برایەتی و ئاشتی و خۆشبەختییە بەداخەوە لە ولاتی ئێمەدا، وەك تەیری عەنقای لێهاتووە، تانەپاکتربی لە پێشتری. قەت باوەڕم نەدەکرد کە ئەم کوردە بێ کەسە، ژێردەسە، زۆر چەوساوەو کەساسە، ئاوا بە دەنکە جۆیی بزەڕێ و ئاسمان بە چاتۆڵ بزانێ و خۆی لێ بێ بەمیکی ماوس!

## هاتنی ئەشعەرییەکان و خەڵکی یەمەن
## (قدومُ الاشعرين واهل اليمن)

١٦١١- عنْ ابي مُوسَى الاشعري (رَضيَ اللهُ عنهُ) قال: انَّا اتَيْنا النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَفَرٌ مِنْ الاشْعَرِيِّينَ فَاستَحْمَلْنَاهُ فَابَى انْ يَحْمِلَنَا فَاستَحْمَلْنَاهُ فَحَلَفَ انْ لا يَحْمِلَنَا ثمَّ لَمْ يَلْبَث النَّبِيُّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْ اتِيَ بِنَهْبِ ابِلٍ فَامَرَ لَنَا بخَمْسِ ذوْدٍ فَلَمَّا قَبَضنَاهَا قُلْنا تَغَفَّلْنَا النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمِينَهُ لا نُفلِحُ بَعْدَهَا ابَدًا فَاتَيْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ انَّكَ حَلَفْتَ انْ لا تَحْمِلَنا وَقَدْ حَمَلْتَنا؟ قَالَ:

اجَلْ وَلَكِنْ لا احْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَارَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا الا اتَيْتُ الَّذي هُوَ خَيْرٌ مِنْهَا وتحلَّلْتُهـا (الحـديث:٤٣٨٥، اطرافـه في: ٣١٣٣، ٤٤١٥، ٥٥١٧، ٥٥١٨، ٦٦٢٣، ٦٦٤٩، ٦٦٧٨، ٦٦٨٠، ٦٧١٨، ٦٧١٩، ٦٧٢١، ٧٥٥٥)[٣٧٤].

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ لە ئەشعەرییەکان بووین، چووینە خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) داوامان لێی کرد کە ولاخی سواریمان بداتێ، هەتا بەشداری بکەین لە غەزای تەبووکا لە خزمەتیدا، وارێکەوت لەو کاتەدا تووڕە بوو، بۆیە سوێندی خوارد کەولاخمان پێ نەدات، وە جارێتریش داوامان لێی کردەوەوە، وەهەروەها هەروا، بەلاّم زۆری نەخایاند وشتری تالانی زۆریان بۆیهێنا، جا پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمانی کرد پێنج وشتریان پێمان دا، کاتێ وشترەکانمان وەرگرت، گوتمان: کارێکی باشمان نەکرد، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) ئاگای لەوە نەما بوو کە سوێندی خواردووە وشتری سواریمان پێنەدات، وە ئێمەش ئەوەمان بەهەل زانی و یادمان نەخستەوە کەشتێکی واهەیە، چاو لە مەبخشێنین و پێغەمبەری لێ ئاگادار نەکەینەوە ئەوە بەگزی دادەنرا، شتی وایش بکەین هەتا هەتایە سەرکەوتوو نابین.

جا من خۆم چوومە خزمەتی وعەرزیم کرد: قوربان! خۆت دەزانی کە تۆ سوێندت خوارد کە ولاخی سواریمان پێ نەدەیت لەم غەزایەدا، کەچی ئەوەتا ولاخی سواریت داوە پێمان، ئەمە چۆنە؟ فەرمووی (بەڵێ چۆن دەڵێیت وایە، بەلاّم من هەرکاتێ سوێند لەسەرشتێ بخۆم کە نەیکەم، یا بیکەم، وەلە پاشا بۆم دەربکەوێ کە بەپێچەوانەی سوێندەکەی منەوە باشترە،

---

(٣٧٤) اخرجه مسلم في الايمان، باب: ندب من حلف يمينا ، فراى غيرها خيرا منها ، رقم:١٦٤٩ .

چى باش بێ ئەوە دەكەم و كەفارەتى سوێندەكەو توومكەم دەدەم) (تاج/٣ل-٣٤٣- هەتا ل/٣٤٥- باسى كەفارەتى سوێند).

١٦١٢ – عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) اتَاكُمْ اهْلُ الْيَمَنِ هُمْ ارَقُّ افْئِدَةً وَالْيَنُ قُلُوبا الايْمَانُ يَمَان وَالْحِكْمَـةُ يَمَانِيَـةٌ وَالْفَخْـرُ وَالْخُيَلاء فِي اصْحَابِ الابِلِ وَالسَّكِينَةُ وَالْوَقَارُ فِي اهْلِ الْغَنَمِ (الحديث:٤٣٨٧، طرفه في: ز ١٣٣٠ت = رقم: ٣٣١٠ ف = بەرطى ٣ل- ٤٥٦)[٣٧٥]

ئـەبو هـورەيرە (رەزاى خـوداى لـێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر(درוودى خـوداى لـێ بـێ) فـەرمووى:(خـوا خـەڵكى يەمـەن هـاتن بـۆ لاتـان، زۆربەويـژدان و دڵنـەرمن، يەمەن كانگەى باوەڕوئيمانە، هەروەك حيكمەت و داناييش سەر بەيەمـەنن و يەمەن سەرچاوەيەكى ڕۆشـنە بـۆ ئيسلامەتىو شـەريعەت.. بـاقى وەرگـەڕاوى ئەم فەرموودەيە، لە پێـشەوە لـەم شـوێنەدا ڕابـورد: ژ ١٣٣١ ت = رقـم: ٣٣٠٢ ف =بەرگى/٣ ل/٤٥٧).

## حەجى مالاوايى (حجة الوداع)

١٦١٣ – عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (اقْبَلَ النَّبِيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْفَتْحِ وَهُوَ مُرْدِفٌ اسَامَةَ عَلَى الْقَصْوَاء وَمَعَهُ بِلالٌ وَعُثمَـانُ بْـنُ طَلْحَـةَ حَتَّى انَاخَ عِنْدَ الْبَيْتِ ثمَّ قَالَ لِعُثمَانَ ائْتِنَا بالْمِفْتَاحِ فَجَاءهُ بالْمِفْتَاحِ فَفتَحَ لَـهُ الْبـابَ فَدَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاسَامَةُ وَبِلالٌ وَعُثمَانُ ثمَّ اغْلَقُوا عَلَيْهِمْ الْبابَ فَمَكَثَ نَهَارًا طوِيلا ثمَّ خَرَجَ وَابْتَدَرَ النَّاسُ الدُّخُولَ فَسَبَقْتُهُمْ فَوَجَدْتُ بِـلالا قَائِمًـا مِنْ وَرَاء الْبابِ فَقُلْتُ لَهُ: ايْنَ صَلَّى رَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَقَـالَ: صَلَّى بَيْنَ ذيْنِكَ الْعَمُودَيْنِ الْمُقَدَّمَيْنِ وَكَانَ الْبَيْتُ عَلَى سِتَّةِ اعْمِـدَةٍ سَـطرَيْنِ صَـلَّى بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ مِنْ السَّطرِ الْمُقَدَّمِ وَجَعَلَ بابَ الْبَيْتِ خَلْفَ ظهْـرِهِ وَاسْـتَقْبَلَ بِوَجْهِـهِ

(٣٧٥) راجع رقم:١٣٣٠ =المجلد الثالث ص٤٥٦ - المترجم

الَّذي يَسْتَقْبِلُكَ حِينَ تَلِجُ الْبَيْتَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِدَارِ قَالَ وَنَسِيتُ انْ اسْالَهُ كَمْ صَلَّى وَعِنْدَ الْمَكَانِ الَّذي صَلَّى فِيهِ مَرْمَرَةٌ حَمْرَاء)(الحديث: ٤٤٠٠، اطرافه في: ٣٩٧، ٤٦٨، ٥٠٤، ٥٠٥، ٥٠٦، ١١٦٧، ١٥٩٨، ١٥٩٩، ٢٩٨٨، ٤٢٨٦، ٤٤٠٠)(٣٧٦).

پوختەی واتای ئەم فەرموودە پیرۆزەیە لە پێشەوە لەم شوێنانەدا ڕابورد ژمارە: ٢٨٨ت =ژمارە: ٤٦٨ فەتح =بەرگی/١ ل/٢٩٦ + ژمارە: ٣٠١ تەجرید = ژ/٥٠٥ فەتح = بەرگی/١ ل/٣١٠ + ژمارە: ١٢٢٣ ت = ٢٩٨٨ فەتح = بەرگی/٣ ل/٣٤٧ لەگێڕانەوەی ئێرەدا ئەم پترییە هەیە:

ئەو ڕۆژگارە ماڵی بەیت لەسەر شەش کۆڵە کەبوو، کەبرێتی بوون لە دوو ریز، هەر ریزەی سێ کۆڵەکە بوو، لەنێوانی دوو کۆڵەکەدا لەرێزی یەکەم نوێژی کرد، پشتی کردە دەرگای بەیت و ڕووی کردە ئەوشوێنە کە کاتێ لە دەرگای بەیتەوە دەچیتە ناوی بەرابەرتەو دەکەوێتە نێوانی تۆو نێوانی دیوارەکەی ئەوبەری دەرگاکە) لەو شوێنەدا کە پێغەر نوێژی تیادا کرد، تەختە بەردێکی سووری مەڕمەڕی لێ بوو.

**ڕوونکردنەوە:**

مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: (ئەم شێوازی چۆنێتیی خانەی خودایە لەو سەردەمەدا وا بووە، بەڵام لەپاش چاخی پێغەمبەر، لەسەردەمی ئیبنو زوبەیردا شێوازی بەیت تەواو گۆڕاوە).

١٦١٤- عنْ زَيْدُ بْنُ ارْقَمَ انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَزَا تِسْعَ عَشْرَةَ غَزْوَةً وَانَّهُ حَجَّ بَعْدَ مَا هَاجَرَ حَجَّةً وَاحِدَةً لَمْ يَحُجَّ بَعْدَهَا حَجَّةَ الْوَدَاعِ (الحديث:

(٣٧٦) راجع رقم: ٢٨٨ = المجلد الاول ص٢٩٦ - المترجم .

٤٤٠٤، طرفه في رقم: ١٥٢٣= ٣٩٤٩ ف. سبق في بداية كتاب المغازي من هذا المجلد)[٣٧٧].

**لەگێڕانەوەی ئێرەدا لە دواكەیدا دەفەرمویٚ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **لەپاش كۆچكردن بۆمەدینەیەك حەجی كردووە كە حەجی مالاوایی بوو.**

١٦١٥- عَنْ ابي بَكْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)قَالَ: (الزَّمَانُ قَدْ اسْتَدَارَ كَهَيْئَةِ يَوْمَ خَلَقَ الله السَّمَوَاتِ وَالارض السَّنَةُ اثنا عَشَرَ شَهْرًا مِنْهَا اربَعَةٌ حُرُمٌ ثلاثةٌ مُتَوَالِيَاتٌ ذو الْقَعْدَةِ وَذو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ ايُّ شَهْرٍ هَذا قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ اعْلَمُ فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا انَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ قَالَ: الَيْسَ ذو الْحِجَّةِ؟ قُلْنَا: بَلَى قَالَ: فَايُّ بَلَدٍ هَذا قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ اعْلَمُ فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا انَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ قَالَ: الَيْسَ الْبَلْدَةَ؟ قُلْنَا: بَلَى قَالَ: فَايُّ يَوْمٍ هَذا قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ اعْلَمُ فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا انَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ قَالَ: الَيْس يَوْمَ النَّحْرِ؟ قُلْنَا: بَلَى قَالَ: فَانَّ دِمَاءكُمْ وَامْوَالَكُمْ قَالَ: مُحَمَّدٌ وَاحْسِبُهُ قَالَ: وَاعْرَاضكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذا فِي بَلَدِكُمْ هَذا فِي شَهْرِكُمْ هَذا وَسَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ فَيَسْالُكُمْ عَنْ اعْمَالِكُمْ الا فَلا تَرْجِعُوا بَعْدِي ضلالا يَضرِبُ بَعْضكُمْ رِقَابَ بَعْض الا لِيُبَلِّغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ فَلَعَلَّ بَعْض مَنْ يُبَلَّغُهُ انْ يَكُونَ اوْعَى لَهُ مِنْ بَعْض مَنْ سَمِعَهُ، الا هَلْ بَلَّغْتُ مَرَّتَيْنِ). (الحديث: ٤٤٠٦، طرفه في: ٦٠/٦٧ ف = بەرطی/١ل- ٨٥)[٣٧٨].

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (چەرخ چووتەوە دۆخی جارانی خۆی، وەزەمان هەڵسووڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەیەی خۆی كە خودای گەورە ئاسمانەكان و زەوی دروست كردو، شەوو ڕۆژو مانگ و ساڵی دانا، ئیمساڵ ساڵ بووەتەوە بەدوانزە مانگ و هەموو مانگێ لەدوانزە مانگەی خودا كەوتۆتەوە**

---

(٣٧٧) اخرجه مسلم في الحج ، باب: عدد عمر النبيّ (صلى اللهُ عليهِ وَسلمَ) وزمانهن ، وفي الجهاد و السيَر ، باب: عدد غزوات النبيّ (صلى اللهُ عليهِ وَسلمَ) ... رقم: ١٣٥٤ .

(٣٧٨) اخرجه مسلم في القسامة ، باب: تغليظ تحريم الدماء .. رقم:١٦٧٩ .

شوێنی ڕاستەقینەی خۆی و نەسیٔ نەما، وە وەك سەردەمی پێغەمبەرەکان ئەوەی ڕەوایە بووتەوە بەڕەواو ئەوەی ناڕەوایە بوومتەوە بەناڕەوا، وە ئەو گۆڕان و دەستکاریی شەریعەتەکە لەسەر دەمی نەزانی دا، کرابوون ڕاست کرانەوە، وە ئەم دوانزە مانگە چواریان مانگی حەرامن و خاوەن ڕێزو قەدرو نرخن و لەبەر ئەوە شەڕو شۆڕ و هەراو جەنگیان زۆر تیاحەرامە. وە ئەم چوار مانگە سیانیان بەرو دوان و بەشوێن یەکادێن: کە ناوجەژنان و نومینەو موحەررەمن، ئەوی تریشیان تەنیایە کە مانگی ڕەجەبە، کەناوداره بە ڕەجەبی هۆزی موزەر، لەبەر ئەوە کە هۆزی موزەر زۆر قەدری ئەم مانگە دەگرن، کەدەکەوێتە بەینی جومادای دووهەم و کۆڵە مانگەوە) تەواوکەری فەرمووەدەکە لە پێشەوە ڕابورد.(بڕوانە: تاج/ ٢ ل/٢٢١ ز/١١٢ ف/٣).

١٦١٦– عنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) حَلَقَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَاَنَاسٌ مِنْ اصْحَابِهِ وَقَصَّرَ بَعْضهُمْ. (الحديث: ٤٤١١، طرفه في رقم: ١٧٢٦ت =رقم: ١٧٢٦ ف = بەرطی دوەم لاثەرە : ٢٢٠).

لێرەدا ئەم پترییەی هەیە: کەسانی تریش لە حەجکاران وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش تەواو کردنی کردارەکانی حەج، بۆ ئیحرام شکاندن سەری خۆیان تاشی، وەهەندێکی تریان مووی سەری خۆیان کورت کردەوە).

## غەزوەی تەبووك، کە برێتییە لە غەزای عوسرە
## (غزوة تبوك، وهي العسرة)

١٦١٧– عَنْ ابِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (ارْسَلَنِي اصْحَابِي الَى رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْالُهُ الْحُمْلانَ لَهُمْ اذ هُمْ مَعَهُ فِي جَيْشِ الْعُسْرَةِ وَهِيَ غَزْوَةُ تَبُوكَ فَقُلْتُ: يَا نَبِيَ اللّهِ انَّ اصْحَابِي ارْسَلُونِي الَيْكَ لِتَحْمِلَهُمْ فَقَالَ: (وَاللّهِ لا احْمِلُكُمْ عَلَى شَيْءٍ) وَوَافَقْتُهُ وَهُوَ غَضبانُ وَلا اشْعُرُ وَرَجَعْتُ حَزِينًا مِنْ مَنْعِ النَّبِيِّ

ئەنــەس (رەزای خــودای لــێ بــێ) فــەرمووی: كــاتێ لەنەخۆشــینی ســەرەمەرگا نەخۆشــییكەی پێغەمبــەر (دروودی خودای لــێ بــێ) تــەواو گــران بــوو، بــەرە بــەرە پەرۆشــی و ســەخڵەتی پێغەمبــەری داگــرت و بەینــە بەینــە دەبووراپــەوە و هەناسەی تــەواو تونــدو ســوار دەبــوو فاتیمــەیش سلاوی خــوای لەسەربێ لــە پەرۆشــی بــۆ بــاوكی، بانگــەوازی هــەڵ داو لەســەرە خــۆ، بــەبێ هــات و هــاوار دەیوت: ئای بۆ ئەم مەینەتی و سەخڵەتی و ئیش و ئازارەی بــاوكمی واتیــادا ! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (لەپاش ئــەمڕۆ، باوكت ئــەوەی ناخۆشیو پەرۆشی بێ نایبینێ).

١٦٢٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) انَّ النَّبِيَ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثلاث وَسِتِّينَ (الحديث: ٤٤٦٦، طرفه في: ١٤١٠ تجريد= ٣٥٣٦ فتح= بەرطی/ ٤ ل - ).واتای فەرموودەكە لەوێ بەتەواوی رۆیشت.

## پایانی (خاتِمَة)

مامۆســتای شــێخی عەســقەلانی (رەحمــەتی خــودای لــێ بــێ) دەفــەرموێ: (نامــەی مەغازی پێنج سەدو شەست و سێ فــەرموودەی بــەرزەوە كــراو (مــەرفووع) ی لــەخۆگرتووە، هەنــدا لــەم فەرموودانــە، لــەحوكمی حەدیــسی مــەرفووع دان، مەرفووعی تەواونین. بێڕشته (مُعَلَّق)ە كانیــان حــەفتاو شــەش فــەرموودەن، ئــەوانی‌تریان پەیوەســـتن، واتـــە: موصـــولن- دووبارەكانیـــان چوارســـەدو دەفــەرموودەن، پوختەكــەیان: (٥٦٣- ٤١٠=١٥٣) دەكاتــە ســەدو پــەنجاو ســێ فــەرمووده، موسلیمیش وەك شــێخی بوخــاری (رەحمــەتی خــودای لێ بێ) هــەموویانی گێڕاوەتــەوە، واتــە: ١٥٣ فــەرمووده پوختەكــە، بێجگــە لــە شەســت و ســێ فەرموودەیان كەئەمانەن :

١- حەدیسی ئیبنو مەسعوود: (شهدت من المقداد بن الاسود مشهدا=١٥٢٤ت=٣٩٥٢ فەتح).

٢- فەرمووده ئیبنو عـەباس: (لا یـستوی القاعـدون مـن المـؤمنین) =٣٩٥٤ فـتـح) لەتەجریدەکەدا نییه.

٣- فەرموودەکـەی عـەلی: (انـا اول مـن یجثـو للخـصومة)=٣٩٦٥ فـەتحولباری لەتەجریدەکەدا لەم شوێنەدا نییه.

٤- فەرموودەی بەراء: (شهد علی بـدرا وبـارز وظـاهر)=٣٩٧٠ف لەتەجریدەکـه دانییه.

٥- ئیبنو عومەر: (في توجههِ الی سعید بن زیـدوکان بـدریًا=٣٩٩٠ف لەتەجریـده کەدا نییه.

٦- محمدی کوڕی ایاس کوڕی البکیر=٣٩٩١ف.له(ت= تەجرید)دانییه.

٧- فەرموودەی رفاعەی کوڕی رافع لەفەضـلی ئـەهلی بـەدردا =١٥٢٨ت =٣٩٩٢ف. لەم بەرگەدایه.

٨- ئیبنو عەباس: (هذا جبریل اخذ براس فرسه..)=١٥٢٩ت=٤٠٤١ف.

٩-

١١- کوشتنی عوبەیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص=١٥٣٠ت=٣٩٩٨ف.

١٢- حەدیسی روبەییع(في الضرب بالدف=١٥٣١ = ٤٠٠١ ف)

١٣- حەدیـــسی عـــەلی: (في تکـــبیرة علـــی ســـهل بـــن حنیـــف) =٤٠٠٤ف، له(ت)دا نییه.

١٤- حەدیسی عومەر: (تایمت حفصه=١٥٣٣ت=٤٠٠٥ فتح الباری.

١٥-

١٦- فەرموودەی کوشـتنی ئـەبو رافیـع=١٥٤١ ت =٤٠٣٩ ف. لەهـەموو شـوێنی لـەم جێگایانــەدا (ت)= (تەجریـد) وه ف(ف) =(فــتح البــاری شــرح صــحیح البخاری).

١٧- حەدیـسەی عەبـدورەحمانی کـوڕی عـەوف، سـەبارەت بەشـەهید بـوونی موصعەبی کوڕی عومەیر=٤٠٤٥فتح. له (ت)ێدا نییه.

١٨- حەدیسی زەیدی کوڕی سابت: (حین نسخ المصاحف=٤٠٤٩ فەتح. لەتەجریدەکەدا نییە.

١٩- حەدیسی وەحشی سەبارەت بەکوشتنی حەمزە=١٥٤٧ت=٤٠٧٢ فەتح.

٢٠- حەدیسی ژمارە(١٩) لە ئاخرەکەیەوە، لە فەتحا هەیە، لە تەجریدەکەدا نییە=حدیث ابن عمر في قتل مسیلمة.

٢١- حەدیسی ئەبو هورەیرە سەبارەت بەداستانی شەهید بوونی خوبەیبی کوڕی عدی=٤٠٨٦ ف لەتەجریدا لەم شوێنەدا نیە.

٢٢- فەرموودەی ژمارە: ١٥٥١ لەتەجریددا=فەرموودەی ژمارە:٤١٠٩ لە فەتحولباریدا=الان نغزوهم.

٢٣- حەدیسی ابن عباس: ((صلی الخوف بذي قرد=٤١٢٥ و ئەطرافەکانی) = ژمارە: ١٥٥٤ تەجرید= ٤١٢٥ فەتحول باری. گێڕانەوەکەی ئیبنوعەباس والە کۆتایی ئەم ژمارەیەوە لە فەتحولباریدا، بەڵام لەتەجریدەکەدا نییە.

٢٤- وحدیث ابي موسی فیة معلق.

٢٥- وحدیث جابر فیه معلق.

٢٦- ژمارە:١٥٥٩ تەجرید=٤١٤٠ فەتحول باری. ڕیوایەتی القاسم.

٢٧- حدیث الافك=٤١٤٤ فەرموودەکەی عائیشە: ( تقول: الولق الكذب) لە تەجریدەکەدا نییە.

٢٨- فەرموودەکەی بەراء سەبارەت بەبیری حودەیبیەیە=ژمارە:١٥٦٠ تەجرید=٤١٥٠ فەتحولباری.

٢٩- فەرموودەی میرداس: (یذهب الصالحون..=٤١٥٦ فەتحول باری. لەتەجریدەکەدا نییە.

٣٠- حەدیسی بنت خفاف مع عمر=٤١٦٠ف. لەتەجریددا نییە.

٣١- حەدیسی عومەر لەگەڵ بنتی خەفاف دا=٤١٦١ لەتەجریددا نیە.

٣٢- حەدیسی بەراو: (لا ندري ما احدثنا=٤١٧٠ فەتحول باری. لە تەجریدەکەدا نییە.

٣٣- حەدیسی زاهیر(في لحوم الحمر=٤١٧٣ فەتحولباری. لەتەجریدا نیە.

٣٤- حەدیسی اهبانی کوڕی ئەوس لەبارەی کوڕ نووشەوە (کان اذا اشتکی رکبته وکان اذا سجد جعل تحت رکبته وسادة)=٤١٧١ فەتحولباری لە تەجریدەکەدا نییە.

٣٥- حەدیسی عائیذي کوڕی عەمر: (هل ینقض الوضوء)=٤١٧٦ فەتحولباری لە تەجریدەکەدا نییە.

٣٦- حەدیسی قەتادە سەبارەت بەموثلە=٤١٩٢ فەتحوباری. لەتەجریدا نییە.

٣٧- ژمارە:١٥٦٧ تەجرید=٤١٩٤ فەتحول باری. سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (في الضرب یوم خیبر).

٣٨- ژمارە: ٤٢٠٨ فەرموودەی ئەنەس لەبارەی طەیلە سانەوە لە تەجریدەکەدا نییە.

٣٩- حەدیسی عائیشە: فی تمر خیبر=٤٢٤٢ فەتحولباری لە(ت)یدا نییە.

٤٠- حەدیسی ئیبنو عومەر، هەر لەبارەی خورمای خەیبەرەوە=(ما شبعنا حتی فتحنا خیبر)= ٤٢٤٣ فەتحولباری لەتەجریدا نییە

٤١- حەدیسی ئیبنو عومەر لەبارەی غەزای مۆتەوە=١٥٨٠ تەجرید= ٤٢٦١ فەتحولباری.

٤٢- فەرموودەکەی خالیدی کوڕی وەلید لەبارەی غەزای مۆتەوە: (لقد دق في یدي یوم مؤتة تسعة اسیاف)=٤٢٦٦ فەتح لەتەجریدەکەدا نییە.

٤٣- حەدیسی (عمرة بنت رواحة في البکاء)= ٤٢٦٧ فەتحولباری لە تەجریدەکەدا نییە.

٤٤- فەرموودەکەی عوروە سەبارەت بەداستانی ئازادکردنی مەککە =٤٢٨٠ فەتحولباری =١٥٨٥ تەجرید.

٤٥- فەرموودەکەی عەبدوڵلای کوڕی ثەعلەبە، لەبارەی: (وكان النبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قد مسح وجهه عام الفتح)=٤٣٠٠ فەتحولباری. لەتەجریدەکەدا نییە.

٤٦- حەدیسی (عمرو بن سلمة في الصلاة) =١٥٨٨ تەجرید=٤٣٠٢ فەتحول باری.

٤٧- وفيه حديثهٔ عن ابيه.

٤٨- فەرموودەی ژمارە: ١٥٨٩ تەجرید=٤٣١٤ فەتحول باری.

٤٩- فەمروودەی ژمارە: ١٥٩٦ تەجرید=٤٣٣٩ فەتح.

٥٠- داستانی کوشتنی جوولەکە هەڵگەڕاوەکە =ژمارە:١٥٩٨ تەجرید =٤٣٤٢ فەتحول باری.

٥١- داستانی عەلیو کەنیزەکە=ژمارە:١٦٠٠ تجريد=ژمارە:٤٣٥١فەتحول باری

٥٢- حديث بُريدَة فيه= ژمارە:١٦٠١ تەجرید=٤٣٥٠ فەتح.

٥٣- فەرموودەکەی جەریر کە چوو بۆ یەمەن= ژمارە: ١٦٠٤ تەجرید =٤٣٥٩ فەتحولباری.

٥٤- وفيه روايته عن ذي عمرو.

٥٥- وحديث عبدالله بن الزبير في وفد بني تميم=ژمارە: ١٦٠٦ تەجرید=٤٣٦٧ فەتحول باری.

٥٦- ژمارە: ٤٣٦٧- فەتحول باری =حديث ابي رجاء المطاردي في رجب. لەتەجریدەکەدا نییە.

٥٧- حديثه فرر نا الى النار، الى مسيلمة الكذاب=فەرموودەی ژمارە:٤٣٧٧ فەتحول باری. لەتەجریددا نییە.

٥٨- (حديث ابن مسعود مع خباب وفيه قراءة علقمة) = رقم:٤٣٩١ فتح البارى. لەتەجریدەکەدا نییە.

٥٩- فەرموودەی ژمارە: ٤٣٩٤ فتح الباری= حدیث عدي مع عمر. لە تەجریدەکەدا نییە.

٦٠- حدیث ابي بکرة: (لا يفلح قوم ولوا امرهم امراة)= رقم: ١٦٢٠ تجريد= رقم: ٤٤٢٥ فتح الباری.

٦١- وحدیث على مع ابن عباس في الوفاة النبوية = رقم: ١٦٢٥ تجريد= رقم: ٤٤٤٧ فتح الباری.

٦٢- حدیث انس مع فاطمة في الوفاة النبوية = رقم: ١٦٢٨ تجريد = رقم: ٤٤٦٢ فتح الباری.

٦٣- (حدیث بلال في ليلة القدر) = رقم: ٤٤٧٠ فتح الباری. لە تەجریدەکەدا نییە.

هەروەها ئیمامی عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) ەکۆتایی ئەم پایانە(خاتمە)دا دەفەرموێ (چل و دوو بیستراو (اثر)ی صەحابەو تابیعینیشی- واتیادا. جگە لەو چەند ئەسەرەی کە موسنەدبوون و لەحوکمی مەرفووعدا بوون، وە خودای پاك و پیرۆز خۆی باشتری لێ دەزانێ.

باسی غەزاو غەزەوات تەواو، نۆرەی کیتابی تەفسیرە، کەبە پشتیخودای گەورە، یەکسەربەشوێن ئەم باسەدا شەرەفی قودوم دەبەخشاو دێت لەکۆتایی ئەم باسەدا، کاتێ خۆی لەڕەشنووسەکەم نووسیوە:

(خودایە! بەمیهرەبانی خۆت، بەرتکای ئەم پێغەمبەرە نازدارەی خۆتمان بخەو، لەخۆمان و کەس و کارمان و دایك و باوکمان و مردو زیندوومان خۆش ببە، وە لەسەرەمەرگا فریامان بکەوە وببە بەفریاد ڕەس بۆمان. دەسا:

بڕێژە خوا ڕەحمەت بە دانیمی تا ئەبەد

سەر خۆشەویستت کە چاکترینی خەڵکە بەجەم

خودایە ! نائومێدی بەر ئاسانەی خۆتمان نەکەی.

ئەمە دەقی ئەو نزایەیە کە لە ساڵی (١٩٧٣) دا لە مستشفی کەرکوك العسکری لەم جێگەیەدا نووسیومە. وە ئێستاش کەشەوی ١٠/ڕەمەزانی/٢٠٠٤ زاینیيە، بەئومێدی قەبووڵ بوون دەڵێم: ئامین.

وەرگێڕ: نوری فارس حەمەخان

١٠/ڕەمەزانی/٢٠٠٤ ی ٢٤/١٠/٢٠٠٤/

مامۆستایان/ سلێمانی/ کوردستان



# ٦٨-نامەی تەفسیری قورئان
# (كتاب التفسير)

## (باسی گەورەیی سوورەتی فاتیحە )

١٦٣٠- عَنْ ابي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (كُنْتُ اصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ فَدَعَانِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ اجِبْهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ انِّي كُنْتُ اصَلِّي فَقَالَ: (الَمْ يَقُلْ اللَّهُ: ﴿ اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ اذا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ ثمَّ قَالَ لِي: (لاعَلِّمَنَّكَ سُورَةً هِيَ اعْظَمُ السُّوَرِ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ انْ تَخْرُجَ مِنْ الْمَسْجِدِ)، (ثمَّ اخَذ بِيَدِي فَلَمَّا ارَادَ انْ يَخْرُجَ قُلْتُ لَهُ: الَمْ تَقُلْ لاعَلِّمَنَّكَ سُورَةً هِيَ اعْظَمُ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ) قَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي اوتِيتُهُ ). (الحديث:٤٤٧٤، اطرافه في:٤٦٤٧، ٤٧٠٣، ٥٠٠٦)[٣٩٢].

(٣٩٢) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي سعيد بن المعلى في الفاتحة (فتح/٩ص٧٧٢)ط= ج /٨ ص٧٤٣ ط قديمة - خاتمة كتاب التفسير - المترجم .

ئەبوسەعیدی کوڕی موعەللا (رەزای خودای لێ بێ) (رەزای خودای لێ بێ)فەرمووی جارێك لەمزگەوت نوێژم دەکرد، لەناو نوێژەکەدا، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) بانگی کردم، وەلامم نەدایەوە، کە نوێژەکەم تەواوکرد چوومەخزمەتی، فەرمووی (بۆچیبانگم کردیو نەهاتی؟) عەرزیم بەزوویی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەوکاتەی کەتۆ بانگت کردم، من نوێژم دەکرد، بۆیە وەلامم نەدایتەوە. فەرمووی (بۆچی ئەی خودای گەورە نافەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ اذا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ ئەنفال =٢٤/٨-

واتە : ئەی کەسانێ کە باوەڕتان بەئایینی ئیسلام هێناوە؛ بە پەلە وەلامی خوداو پێغەمبەری خودا بدەنەوەو بەزوویی بچن بەدەنگیانەوە، هەر کاتێ پێغەمبەری من بانگی کردن بۆ سەر ئەو کارانەی کەدەبن بەمایەی سەربەرزی ژینیجیهانتان و، بەهۆی روو سووری وژیانی جاویدانی خۆشیبێئێش وئازاری ئەو جیهانتان، بەگورجی بچن بەدەنگیانەوە).

لەپاشا فەرمووی : (هۆشیاربە ! لە پێش ئەوەدا کە لەمزگەوت بچیتە دەرەوە، سوورەتێکت نیشان ئەدەم، کەگەورەترین سوورەتە لەقورئاندا. فەرموی: (ئەو سوورەتە ﴿الحمد لله ربّ العالمين﴾ە کە ئەو(سبعا من المثاني) و (القران العظيم)ەیە کەخوای گەورە بەخەلات بەخشیویەتی بەمن، کە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ﴾١٥/٨٧-.

واتە: بەڕاستی ئێمە کە پەروەردگاری ئێوەین، حەوت ئایەتی قورئانمان داوەبەتۆئەی موحەممەد؛کەلەهەموڕۆژوشەوێکدا، چەندجارێك لەنوێژدا دووبارە دەکرێنەوە، سەرەڕای ئەم حەوتەی دوبار پاتەیش، هەموو سوورەتەکانی تری قورئانیشم پێ خەلات کردووی، کە قورئان گشتی بەبێجیاوازی لە نێوان سورەتێك وسوورەتێکیتردا، هەموی گەورەیەو خاوەنی پایەو مایەیە). (تاج/٥ ز/٨١ ل/٢٩٣ ف/١ باسی گەورەیی سورەتی فاتیحە) فەرمایشتی خوای گەورە (البقرە- ٢/٢٢).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿فَلا تَجْعَلُوا لِلّٰهِ انداداً وَانْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ البقرة: ٢/٢٢.

١٦٣١- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ سَالْتُ النَّبِيَ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ايُّ الذنْبِ اعْظمُ عِنْدَ اللّٰهِ؟ قَالَ: انْ تَجْعَلَ لِلّٰهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ قُلْتُ: انَّ ذلِكَ لَعَظِيمٌ قُلْتُ: ثمَّ ايُّ؟ قَالَ وَانْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ انْ يَطعَمَ مَعَكَ قُلْتُ: ثُمَّ ايُّ؟ قَالَ: انْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ.). الحديث ٤٤٧٧، اطرافه في: ٤٧٦١، ٦٠٠١، ٦٨١١، ٦٨٦١، ٧٥٢٠، ٧٥٣٢(٣٩٣).

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پرسیارم کردلەپێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) ئەی پێغەمبەری خودا؛کام گوناهە لەلای خودا زۆر گەورەیەو بە تاوانێکی زۆرگەورە دەژمێردرێت؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە مانەند بۆخودا بڕیار بدەیت، ئەوخودایەی کە تۆی دروست کردووە تۆ بلێ: هاوەڵی هەیە) گوتم: لەراستیدا ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەیە، ئەی لەدوای ئەوە چیتاوانێکیتر فرە گەورەیە؟ فەرموی: (ئەوەیە کەلەترسی ئەوەی منالی خۆت نان و ئاوەکەت بخوات بیکوژیت ! )عەرزیم کرد : ئەمجارە چیتاوانێك زۆرگەورەترە؟ فەرمووی: ( ئەوەیە کە داوێن پیسی بکەیت لەگەڵ حەلاڵ وهاوسەری دراوسێکەت دا.

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمْ الْغَمَامَ وَانزَلْنَا عَلَيْكُمْ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى﴾ ٢/ ٥٧

١٦٣٢- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الْكَمْاةُ مِنْ الْمَنِّ وَمَاؤُهَا شِفَاء لِلْعَيْنِ) الحديث: ٤٤٧٨، طرفاه في: ٤٦٣٩، ٥٧٠٨(٣٩٤).

---

(٣٩٣) اخرجهُ مسلم في الايمان، باب: كون الشرك اقبح الذنوب وبيان اعظمها بعده، رقم:٨٦ .

(٣٩٤) اخرجهُ مسلم في الاشربة . باب: فضل الكماة ومداواة العين بها، ، رقم: ٢٠٤٩ .

**سەعیدی کوڕی زەید** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (دوومەلان لەچەشنی ئەو گەزۆیە کە دەباری بۆ نەوەی ئیسرائیل، کە ناسراون بە بەنیئیسرائیل، واتە: وەك ئەو لەخۆیەوە بەبێ ئەوەی کەسێ بیڕوێنێ خۆی دەڕوێ، وە ئاوەکەی دەرمانە بۆ چاو) ئیمامی تیرمیزی** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **ئەمەی پترە: (والعجوة من الجنّة وهي شفاء من السمّ) خورمای عەجوەیش هی بەهەشتەو دەرمانە بۆ ژەهر)(تاج/٤ ز/٦٥ ل/٢٠٤ ف/٢- باسی خورمای عەجوە).**

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

## ﴿وَاذ قُلْنَا ادْخُلُوا هَذِهِ الْقَرْيَةَ﴾ ٢/٥٨

**١٦٣٣- عنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): (قِيلَ لِبَنِي اسْرَائِيلَ: ﴿ادْخُلُوا الْبابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطةٌ﴾ فَدَخَلُوا يَزْحَفُونَ عَلَى اسْتَاهِهِمْ فَبَدَّلُوا وَقَالُوا: حَبَّةٌ فِي شَعَرَةٍ (الحديث:٤٤٧٩، طرفاه في: ٣٤٠٣، ٤٦٤١)[٣٩٥].**

**ئەبوهورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(درودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (گوترا بەبنی ئیسرائیل : ﴿ وَادْخُلُوا الْبابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطةٌ﴾. کەچی ئەوان بەپێچەوانەوە، لەباتی ئەوەی بەمل کەچی وکڕنووش بردنەوە بچنە ژوورەوە، بە قنگە خشکێ چونە ژوورەوە و لەجیاتی ئەوەی کە بڵێن: حیگگە، زمانیان گۆڕیو وتیان: خیگگە، حەببە ڤی شەعەرە، کەقسەیەکی بێمەعنایە لەسەر گوتەی عەللامەی عەینی -ڕەحمەتی خوای لێبێ- وەمەبەستیان لەم قسە بامەعنایە لێدەمەوەڕی وشکاندنی فەرمانی خودابووە)(تاج/ ٦ ز/٣ ل/٩ ف/٥ - باسی تەفسیری سورەتی بەقەرە).**

---

**(٣٩٥) اخرجهُ مسلم في اول كتاب التفسير، رقم: ٣٠١٥ .**

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ايَةٍ اوْ نُنسِهَا نَاتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا﴾ ٢/١٠٦

١٦٣٤- عَنْ ابْنِ عَباسٍ(رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ:قَالَ عُمَرُ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُ): اقْرَؤُنَا ابيٌّ، وَاقْضانا عَلِيٌّ، وَانَّا لَنَدَعُ مِنْ قَوْلِ ابيّ، وَذاكَ انَّ ابيًّا يَقُولُ: لا ادَعُ شَيْئًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَ قَدْ قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ايَةٍ اوْ نُنْسِهَا﴾. (الحديث: ٤٤٨١، طرفه في: ٥٠٠٥)[٣٩٦].

**ئیبنوعەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: عومەر**(رەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: باشترین قورئان خوێنمان ئوبەیەی کوڕی کەعبە، باشترین دادوەر- قازی- یشمان عەلی کوڕی ئەبو تالیبە، بەڵام لەگەڵ ئەم راستیەشدا، ئێمە زۆر جاران واز لە قیرائەتی ئوبەی دەهێنین، چونکە ئوبەی دەڵێ: هەرچیم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر بیستبێ، بەقسەی کەسێتر وازی لێناهێنم! دەی ئەم بۆچونەی ئوبەی بەرپەرچ دەدرێتەوەبەم فەرمودەیەی خودای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ايَةٍ اوْ نُنسِهَا﴾ چونکە ئەوەتا خودای گەورە لەم ئایەتەدا، بەدەق دەفەرموێ: هەندێ لە ئایەتی قورئان سڕاوەتەوە ولەبیری پێغەمبەر براوەتەوە، کەواتە: دوور نیە هەندێ لەوقیرائاتانەی ئوبەی دەیان خوێنێ سڕابونەتەوە، نەسخەوە بووبن کەچی ئەو هەربیان خوێنێ).**

**ڕاڤەو ڕوون کردنەوە:**

**لەڕشتەی ئەم فەرمودەیەدا ئەم ناسککارییەی واتێدا : سێ‌سەحابە بەریز یەکەم لەدووەمەوەو دووەم لەسێیەمەوە گێڕانەوە ئەنجام دەدەن : ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: عومەر دەفەرموێ: ئوبەی دەفەرموێ: (هەرچیم لەزاری پێغەمبەر بیستبێ بەقسەی کەسێتر وازی لێ نایەنم ).**

---

(٣٩٦) لم يوافقهُ مسلم على تخريج حديث ابن عمر : (ابيَ اقرؤنا) (فتح ٩ص٧٧٢، ط،ج=ج/٨ص٧٤٢ ط. قديمة، خاتمة كتاب التفسير —المترجم .

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿وَقَالُوا اتَّخَذ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ﴾ ٢/١١٦

١٦٣٥– عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ اللَّهُ: كَذبَنِي ابْنُ ادَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذلِكَ وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذلِكَ فَامَّا تَكْذيبُهُ ايَايَ فَزَعَمَ انِّي لا اقْدِرُ انْ اعِيدَهُ كَمَا كَانَ وَامَّا شَتْمُهُ ايَايَ فَقَوْلُهُ لِي وَلَدٌ فَسُبْحَانِي انْ اتَّخِذ صَاحِبَةً اوْ وَلَدًا ). (الحديث ٤٤٨٢)[397].

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: (خودای گەورە دەفەرموێ: ئادەمیزاد ڕادەی ئەوەی نیە کەمن بە درۆ بخاتەوە، یاجنێوم پێ بدات کەچی شتی وا دەکات، ئەوەیان کەمن بەدرۆ دەخاتەوەئەو قسەیەتی کەدەڵێ: گوایە من ناتوانم کە لەپاش مردن وەك جاران سەر لەنوێ دروستی بکەمەوە، جنێوەکەشی بەمن ئەو قسەیە کەدەڵێ: گوایە من مناڵم هەیە : شتی وا نەبووە و نابێ، من گەلێ پاك و پیرۆزو بەدوورم لەوە کە منالم هەبێ ). (تاج/٦ ز/٣ ل/١٤ ف/١٠) ف/١٠ = ژمارەی فەرموودە لەو لاپەڕەدا دەیە.**

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿وَاتَّخِذوا مِنْ مَقَامِ ابْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ ٢/١٢٥

١٦٣٦– عَنْ انَس (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ عُمَرُ: (وَافَقْتُ رَبِّي فِي ثلاث اوْ وَافَقَنِي رَبِّي فِي ثلاث، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ اتَّخَذتَ مَقَامَ ابْرَاهِيمَ مُصَلًّى؟ وَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ يَدْخُلُ عَلَيْكَ الْبَرُّ وَالْفَاجِرُ فَلَوْ امَرْتَ امَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ بِالْحِجَابِ، فَانْزَلَ اللَّهُ ايَةَ الْحِجَابِ قَالَ: وَبَلَغَنِي مُعَاتَبَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْض نِسَائِهِ فَدَخَلْتُ عَلَيْهِنَّ قُلْتُ: انْ انْتَهَيْتُنَّ اوْ لَيُبَدِّلَنَّ اللَّهُ رَسُولَهُ (صَلَّى

---

**(٣٩٧) لم يوافقهُ مسلم على تخريج حديث ابن عباس (كذبني ابن ادم) (خاتمة كتاب التفسير، فتح/٩ص٧٧٢= ج/٨ص٧٤٢) —المترجم .**

اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْرًا مِنْكُنَّ حَتَّى اتَيْتُ احْدَى نِسَائِهِ قَالَتْ يَا عُمَرُ امَا فِي رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا يَعِظ نِسَاءهُ حَتَّى تَعِظهُنَّ انْتَ؟ فَانْزَلَ اللّٰهُ: ﴿عَسَى رَبُّهُ انْ طَلَّقَكُنَّ انْ يُبَدِّلَهُ ازْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ﴾ الايَة .(الحديث ٤٤٨٣ — طرفه في= ٤٠٢، ٢٥٥، بةرطى/١ ل/٢٦٥).

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی : لەم سێ شتەدا پێشنیاری من لەگەڵ فەرمانی پەروەردگاری گەورەما یەکی گرت: یەکەم گوتم : ئەی پێغەمبەری خودا خۆزگە مەقامی ئیبراهیممان دەکرد بە نوێژگا، واتە : ئەو شوێنەی لە کاتی دروست کردنی کەعبەدا حەزرەتی ئیبراهیم تێدا وەستا دەمان کرد بەجێگە نوێژ...تاد (بڕوانە: ژمارە: ٢٥٥ تەجرید، واتە: ژمارە: ٤٠٢ فەتح واتە بەرگی یەکەم لاپەڕە/٢٦٥) + (تاج/١ ل/٢١١ ف/٥ ز/٥٣).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿قُولُوا امَنَّا باللّٰهِ وَمَا انزلَ الَيْنَا﴾ ١٣٦/٢

١٦٣٧– عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ كَانَ اهْلُ الْكِتَابِ يَقْرَءونَ التَّوْرَاةَ بالْعِبْرَانِيَةِ وَيُفَسِّرُونَهَا بالْعَرَبِيَةِ لاهْلِ الاسْلامِ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لا تُصَدِّقُوا اهْلَ الْكِتَابِ وَلا تُكَذِبُوهُمْ وَ﴿قُولُوا امَنَّا باللّٰهِ وَمَا انْزِلَ الَيْنَا﴾ الايَة. (الحديث:٤٤٨٥، طرفاه في: ٧٣٦٢، ٧٥٤٢)[٣٩٨].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: جاران خاوەن نامەکان تەوراتیان بەزمانی عیبری دەخوێندەوە بەعەرەبی شەرح وراڤەیان دەکرد بۆ موسڵمانان، پێغەمبەریش (درودی خودای لێ بێ) فەرموی : (نەباوەڕ بەم قسانەی خاوەن نامەکان بکەن وەنەبەدرۆشیان بخەنەوە، بەڵام بڵێن: ﴿امَنَّا باللّٰهِ وَمَا

(٣٩٨) لم يوافقهُ مسلم على حديث ابي هريرة : (لا تصدقوا اهل الكتاب) خاتمة كتاب التفسير ج٩/٧٧٢ فتح —المترجم .

انزلَ الَيْنـا......﴾ تـا كۆتـايى ئايـەت- بەقـەره ١٣٦/٢- واتـه بـاوەڕى تـەواومان هێناوه بـەخوا، هـەروا بـه قورئـان كـه بـەهۆى موحەممـەدەوه بۆمـان هـاتووه، باوەڕمـان هێنـاوه بـه كتێـب و شـەريعەتى ئيـبراهيم و ئيسماعيل وئيـسحاق و يـەعقوب ونەتەوەكانىيـەعقوب وەباوەڕمـان هەيـه بەتـەورات كـه هـاتووه بـۆ مووسـا و، بـه ئينجيـل كـه هـاتووه بـۆ عيـسا، وەبـەو كتێبانـەى كـه دراون بـه پێغەمبەران بەخەلاتىلەلايەنى خوداى خۆيانەوه...تـادوايى). ( تـاج/٦ ل/٢٦- ف/١٤).

**فەرمايشتى خواى گەورە:**

﴿وَكَذلِكَ جَعَلْنَاكُمْ امَّةً وَسَطا لِتَكُونوا شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ ١٤٣/٢

١٦٣٨- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (يُدْعَى نُوحٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يَـا رَبِّ) فَيَقُـولُ: هَـلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ فَيُقَالُ: لامَّتِهِ هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: (مَا اتَانَا مِنْ نَـذِيرٍ) فَيَقُـولُ: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ؟ فَيَقُولُ: (مُحَمَّدٌ وَامَّتُهُ فَتَشْهَدُونَ انَّهُ قَدْ بَلَّغَ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَـيْكُمْ شَهِيدًا فَذلِكَ قَوْلُهُ جَلَّ ذكْرُهُ ﴿وَكَذلِكَ جَعَلْنَاكُمْ امَّةً وَسَطا لِتَكُونُوا شُـهَدَاء عَلَـى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُـولُ عَلَـيْكُمْ شَـهِيدًا﴾. (الحـديث ٤٤٨٧، طرفـاه في: ٣٣٣٩، ٧٣٤٩).

ئەبو سەعيدى خدرى (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرموى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لێ بێ) فـەرموى: (ڕۆژى قيامـەت نـووح پێغەمبـەر(دروودى خوداى لێ بێ) بـانگ دەكرێ بـۆ حـوزورى خـودا، كـەدێ دەفـەرموێ: ئـەى پـەروەردگارى مـن بفـەرموو، تـۆ سـەروەرو مـن فەرمانبـەر، فـەرمانت وابەچـى مـن سـەرم وا لەڕێتـدا، خـوداى گـەورە دەفـەرموێ: ئايـا ئـەى نـوح تـۆ پـەيامى منـت ڕاگەيانـد بـه گەلەكـەى خۆت؟ نووح دەفەرموێ: بەڵێ پێم ڕاگەياندن، ئينجا دەگوترێت بەگەلى نووح:

ئایا وەك نوح خۆی دەڵێ پەیامی خودای بەئێوە ڕاگەیاندوە؟ دەڵێین : کەس نەهاتووە بۆ لای ئێمە کە بۆشتی وا هۆشیارو ئاگادارمان بکاتەوە.

ئەوجا خودا بەنووح دەفەرموێ: کێ شایەتیت بۆ دەدات؟ نوح دەفەرموێ: موحەممەد و گەلی موحەممەد شایەتیم بۆ دەدەن ئەوجەلە ئێوە ئەی ئوممەتی موحەممەد؛ شایەتی بۆ دەدەن، کە ئەو زاتە پەیامی خودای پێیان ڕاگەیاندووە، منیش کە پێغەمبەری ئێوەم دەبم بەشایەت لەسەر ڕاستی شایەتی یەکەی ئێوە، مەبەست لەم ئایەتە ئەم مەبەستەیە کە دەفەرموێ:﴿وَكَذلِكَ جَعَلْنَاكُمْ امَّةً وَسَطا﴾ - ١٤٢/٢ - (واتە : هەروەکو ڕووگەم بۆ گۆڕین، بەڕووگەیێ کە بەدڵی خۆتان بێ‌و، لەهەمان کات داڕێگەی ڕاستم پێ نیشان دان، ئاوەهایش ئێوەم کردووە بەگەلێکی میانەڕەوی سەردەستە، نەوەك گەلی موسا بەتەواوی ماددە پەرست و نەوەکوو گەلی عیسای پێش تەحریف، جیهان نەویست و زاهیدو پشت لەدونیا، هەتا لە پاشەڕۆژدا ببن بە شایەت لەسەر نەتەوەکانی پێغەمبەرەکانیتر، وە پێغەمبەری خۆشتان کە موحەممەدە، ببێ بە شایەت لەسەر ڕاستی ئێوە) (تاج/٦ ل/٢٧ ز/٣ ف/١٥).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

## ﴿فَمَنْ تَمَتَّعَ بالْعُمْرَةِ الَى الْحَجِّ﴾ ١٩٦/٢

١٦٣٩- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهما) قَالَ انْزِلَتْ ايَةُ الْمُتْعَةِ فِي كِتَابِ اللّٰهِ فَفَعَلْنَاهَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَمْ يُنْزَلْ قُرانٌ يُحَرِّمُهُ وَلَمْ يَنْهَ عَنْهَا حَتَّى مَاتَ قَالَ رَجُلٌ بِرَايِهِ مَا شَاءَ(الحديث ٤٥١٨)[٣٩٩].

لەم شوێنەدا مەبەست و واتاکەی بە تەواوی ڕۆیشت: ژمارە: ٧٥٧تەجرید ١٥٧١ فەتحولباری بەرگی یەکەم لاپەڕە١٨٤).

(٣٩٩) اخرجهُ مسلم في الحج، باب:جواز التمتع، رقم:١٢٢٦ .

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

**﴿ثمَّ افِيضوا مِنْ حَيْث افَاض النَّاسُ﴾ ٢/١٩٩**

١٦٤٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) كَانَتْ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بالْمُزْدَلِفَةِ وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَاتٍ فَلَمَّا جَاء الاسْلامُ امَرَ اللّٰهُ نَبِيَهُ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْ يَاتِيَ عَرَفَاتٍ ثمَّ يَقِفَ بِهَا ثمَّ يُفِيض مِنْهَا فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى ﴿ثمَّ افِيضوا مِنْ حَيْث افَاض النَّاسُ﴾(الحديث ٤٥٢٠، طرفه في:١٦٦٥)[٤٠٠].

**ئەم فەرمودەیە بەتەواوی لەم شوێنەدا واتاکەی ڕۆیشت، لەژمارە ٧٨٩ تەجرید بەرگی دووەم لاپەڕە: ٢٠٩ بەشی: (ڕاڤەو شیکردنەوە) گێڕانەوەکەی تاجول ئوسووڵە.**

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

**﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ رَبَّنَا اتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذابَ النَّارِ﴾ ٢/٢٠١**

١٦٤١- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللّٰهُمَّ ﴿رَبَّنَا اتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذابَ النَّارِ﴾. (الحديث٤٥٢٢، طرفه في : ٦٣٨٥).

**ئەنەس** (ڕەزای خودای لێ بێ)**فەرمووی : هەمیشەپێغەمبەر** (درودی خودای لێ بێ) **ئەم نزایەی دەکردو دەیفەرموو: ﴿اللّٰهُمَّ رَبَّنَا اتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذابَ النَّارِ﴾ ٢/٢٠١ - واتە: خودایە! ئەی پەروەردگاری ئێمە! هەم لە جیهاندا و هەم لە ڕۆژی پاشەڕۆژدا بەشی باشمان بدەرێ و، لە هەردوو جیهاندا چاکمان بۆبکە، وەبمان پارێزە لەسزای دۆزەخ). (تاج/٦ ل/٣٩).**

---

(٤٠٠) اخرجهُ مسلم في الحج. باب: جواز التمتع ، و في الوقوف، قوله تعالى: ﴿ ثمَ افيضوا من حيث﴾ رقم: ١٢١٩ .

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿لا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾ البقرة/٢٧٣

١٦٤٢- عنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذي تَرُدُّهُ التَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ وَلا اللُّقْمَةُ وَلا اللُّقْمَتَانِ انَّمَا الْمِسْكِينُ الَّذي يَتَعَفَّفُ وَاقْرَءوا انْ شِئْتُمْ يَعْنِي قَوْلَهُ: ﴿لا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾. (الحديث: ٤٥٣٩، طرفه في: ٧١٢ ت = ١٤٧٩، ١٤٧٦) بەتەواوی لەبەرطی دوو، ل/١٣٤ دا رابورد)[٤٠١].

## تەفسیری سورەتی ئالی عیمران (تفسير سورة ال عمران)

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿مِنْهُ ايَاتٌ مُحْكَمَاتٌ﴾ ٣/٧

١٦٤٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (تَلا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَذهِ الايَةَ: ﴿هُوَ الَّذي انْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ ايَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ امُّ الْكِتَابِ وَاخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَامَّا الَّذينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَاوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَاوِيلَهُ الا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ امَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذكَّرُ الا اولُو الالْبَابِ﴾ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (فَاذا رَايْتِ الَّذينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَاولَئِكِ الَّذينَ سَمَّى اللَّهُ فَاحْذَرُوهُمْ). (الحديث ٤٥٤٧)[٤٠٢].

**عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ئەم ئایەتەی خوێندەوە ولەپاشا فەرمووی: (کاتێ ئەو کەسانەت دی کەشوێنی ئەو ئایەتانەدەکەون، کەچەن واتایێهەڵدەگرن کە پێیان دەگوترێ: ئایەتە موتەشابیهەکان وڕواڵەتی ئەو ئایەتانە دەکەن بەبەهانەو بیانوو وچاو وڕاوی**

(٤٠١) اخرجهُ مسلم في الزكاة ، باب: المسكين الذي لايجد غنىً ولايفطس له ... رقم: ١٠٣٩.

(٤٠٢) اخرجهُ مسلم في العلم ، باب: النهي عن اتباع متشابه القران ... رقم: ٢٦٦٥ .

لەمەردووم پێدەکەن وخەڵکی پێلەخشتەدەبەن، ئەی گوێدار! بزانە کە ئەوانە ئەو کەسانەن، کەخوداناوی بردوون ودەربارەیان لە قورئانـدا فەرموویەتی : ﴿فَامَّا الَّذينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ﴾: (دڵ دەغەزدارەکان لەدووی ئایەتە چەن واتا هەڵگرەکان دەگەڕێن، بەنیازی ئەوەی کە ئاژاوە بەرپا بکەن. حەزرەت فەرمووی: جا کەواتە ئەی گەلی ئیسلام! خۆتانیان لێ بپارێزن ومەترسیتان لێیان هەبێ). (ش/د/ت- تاج/٦/ ز/٤ - سوورەتی ئالی عیمران ف- ١).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿انَّ الَّذينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللهِ وَايْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلا اوْلَئِكَ لاخَلاقَ لَهُمْ﴾٣/٧٧

١٦٤٤- عَنْ ابْنِ ابِي مُلَيْكَةَ (رحمه الله تعالى)انَّ امْرَاتَيْنِ كَانَتَا تَخْرِزَانِ فِي بَيْتٍ اوْ فِي الْحُجْرَةِ فَخَرَجَتْ احْدَاهُمَا وَقَدْ انْفِذ باشْفَى فِي كَفِّهَا فَادَّعَتْ عَلَى الاخْرَى فَرُفِعَ امرهما الَى ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) فَقَالَ ابْنُ عَباسٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لَوْ يُعْطى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لَذهَبَ دِمَاء قَوْمٍ وَامْوَالُهُمْ ذكِّرُوهَا باللَّهِ وَاقْرَءوا عَلَيْهَا: ﴿انَّ الَّذينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ﴾ فَذكِّرُوهَا فَاعْتَرَفَتْ فَقَالَ ابْنُ عَباسٍ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ). (الحديث:٤٥٥٢، طرفاه في:٢٥١٤، ٢٦٦٨) بەرطی/ ٣ل – ١٧٥ ذمارة: ١٠٨٢ تەجرید[٤٠٣].

ئیبنو ئەبی مولەیکە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو ژن لەناو ماڵێکا، یالەناوهۆدەیەکدا، درەوشەکاری دەکەن یەکێکیان بریندار دەبێ، درەوشەیێ چووبوو بەناو لەپیا، داوای ئەوە بووکە گوایە ژنەکەی‌تر وای لێکردووە، داوا کەیان برا بۆ لای ئیبنوعەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی

(٤٠٣) اخرجهُ مسلم في الاقضية ، باب: اليمين على المدّعى عليه، رقم:١٧١١ .

خودای لەسەر بێ)دەفەرموێ: (ئەگەر ئەو خەڵکە لەسەر داوای خۆیان، بەبێ پێ نیشاندانی بەڵگە و ڕاستکردنەوەی شایەت، هەرچی داوا بکەن بدرێ پێیان ئەوا دەبێ بەتێکە و لێکەو هەرکەسەو بۆخۆیو سەرئەنجام، گەلێ سەرو ماڵ و خوێن و سامانی زۆرکەس بەفیڕۆ دەڕوا).

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: تەمێو ئامۆژگاری ژنە گومان لێکراوە کە بکەن و ڕێزی خودای یاد بخەنەوە ترسی خودای بخەنەبەر، بە تایبەتی ئەم ئایەتەی بۆبخوێننەوە:﴿ انَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّٰهِ وَايْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلا﴾٧٧/٣. (واتە: کەسانێ کەبەڵێن وپەیمان بەخودا دەدەن وسوێند دەخۆن و، لەپاشا پەیمانەکە دەشکێنن وسوێندەکانیان نابەنە سەر و، بەبەهایەکی دونیایی دەیانگۆڕنەوە...). فەرمووی: کەوایان کرد، ژنەکە پێیدانا کە ئەو وای لێکردووە. ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەکاتی داوا و داواکاریدا، سوێند دەدرێ بەداوا لێکراو) (تاج/٦ ل/٧٨ ز/٤ ف/١٣).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿انَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ﴾ ٣/ ١٧٣:

١٦٤٥- عَنْ ابْنِ عَباسٍ: (حَسْبُنَا اللّٰهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ) قَالَهَا ابْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَام حِينَ الْقِيَ فِي النَّارِ وَقَالَهَا مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ قَالُوا: ﴿انَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ ايمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللّٰهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (الحديث ٤٥٦٣، طرفه في: ٤٥٦٤).

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەو کاتەی کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) فڕەدرایە ناو مەنجەنیقەکەوە، فەرمووی: (حسبنا الله و نعم الوكيل) وە موحەممەدیش (دروودی خودای لێ بێ) دیسان هەروایفەرموو واتە: ئەوکاتەی کەپێیان گوت: ﴿انَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ ايمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللّٰهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ ٣/١٧٣.

واتـه: ئەومەردانـە کـە یـاران وهاوڕێیـانی موحەممـەدن، مەردایەتییـەکی تریـشیان هەیـە، کـاتێ کەهەنـدێ کەسـی ناحـەز- بـۆ ئـەوەی کـە دڵیـان سارد بکەنـەوە و زەنـدەقیان بـەرن، هـەتا نەچـن بـۆ شـەڕو ڕووبـەڕویی دوژمـن، لـە پاش جەنگی ئوحود، ئـەو ناحەزانـە بـەم مەردانـەیان دەگوت: کـە سوپایەکی گـەورەی بـت پەرەسـتەکانی مەککـە، بەسـەرۆکایەتی ئەبوسـوفیان، گردبـوو نەتـەوەو گەلەکۆمەیـەکی گـەلێ گـەورەیان لـەئێوە کـردووەو، دەیانـەوێ بـدەن بەسـەرتانا و بەیـەکجاری ڕیـشەکەنتان بکـەن، کـەوابوو دەرمەچـن ومـەڕۆن بۆشەڕ لەگەڵیانداو هاوکاری لەگەڵ لەشکری ئیسلام مەکەن و شەڕی خـۆتڕین مەکەن و، خەمی خۆتان هەبێو ترسی ماڵ و منـداڵی خۆتـان هـەبێو، سـەری خۆتان بەلایەکدا دەرکەن، بەڵام ئـەوان مەردانـەو دلێرانـەو شـێرانە، ئەوقسە نابارەو ئەو هەڕەشـەو گوڕەشـە ژەهراویو ناهـەموارە، ئـەو پیلانـە ژەهـردارە، ئەوەنـدەیتر شـێرەی کـردن و ئیمـان و بـاوەڕی پـتر و چـاکترکردن و، دڵـی ئەستورتر کـردن وورەی بـەرزترکردن و، لـەکانی دڵیانـەوە، بـەزمانێکی پاراو، بە متمانەیەکی تەواوبەخواوبەخۆ، فەرموویان: ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ ئێمە خودامان بەسە، خودا کەسی ئێمەیە، هەر خودایە پشت وپەنامان، دیارە کـە باشـترین پـشت و پـەناش خـودای گـەورە و تەوانایـە). (تـاج/٦ ز/٤ ل/٩٢ ف/٣٣).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنْ الَّذِينَ اوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَمِنْ الَّـذِينَ اشْـرَكُوا اذى كَثِيرًا﴾ ٣/ ١٨٦

١٦٤٦- عَنْ اسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ عَلَى قَطِيفَةٍ فَدَكِيَّةٍ وَارْدَفَ اسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَرَاءهُ يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِي بَنِي الْحَارِث بْنِ الْخَزْرَجِ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ قَالَ: حَتَّى مَرَّ بِمَجْلِسٍ فِيهِ

عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ ابَيّ ابْنُ سَلُولَ وَذلِكَ قَبْلَ انْ يُسْلِمَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ ابَيّ فَاذا فِي الْمَجْلِسِ اخْلاط مِنْ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ عَبَدَةِ الاوْثانِ وَالْيَهُودِ وَالْمُسْلِمِينَ وَفِي الْمَجْلِسِ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ رَوَاحَةَ فَلَمَّا غَشِيَتْ الْمَجلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ خَمَّرَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ ابَيّ انْفَهُ بِرِدَائِهِ ثمَّ قَالَ: لا تُغَبِّرُوا عَلَيْنَا فَسَلَّمَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِمْ ثمَّ وَقَفَ فَنَزَلَ فَدَعَاهُمْ الَى اللّٰهِ وَقَرَا عَلَيْهِمْ الْقُرْانَ فَقَالَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ ابَيّ ابْنُ سَلُولَ: ايُّهَا الْمَرْء انَّهُ لا احْسَنَ مِمَّا تَقُولُ انْ كَانَ حَقًّا فَلا تُؤْذنَا بِهِ فِي مَجْلِسِنَا ارْجِعْ الَى رَحْلِكَ فَمَنْ جَاءكَ فَاقْصُصْ عَلَيْهِ فَقَالَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ رَوَاحَةَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَاغْشَنَا بِهِ فِي مَجَالِسِنَا فَانَّا نُحِبُّ ذلِكَ فَاسْتَبَّ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْيَهُودُ حَتَّى كَادُوا يَتَثاوَرُونَ فَلَمْ يَزَلْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخَفِّضُهُمْ حَتَّى سَكَنُوا.

ثمَّ رَكِبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَابَّتَهُ فَسَارَ حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبادَةَ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا سَعْدُ الَمْ تَسْمَعْ مَا قَالَ ابُو حُبَابٍ يُرِيدُ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ ابَيّ قَالَ: كَذا وَكَذا قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبادَةَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ اعْفُ عَنْهُ وَاصْفَحْ عَنْهُ فَوَالَّذي انْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ لَقَدْ جَاء اللّٰهُ بِالْحَقِّ الَّذي انْزَلَ عَلَيْكَ لَقَدْ اصْطَلَحَ اهْلُ هَذهِ الْبُحَيْرَةِ عَلَى انْ يُتَوِّجُوهُ فَيُعَصِّبُوهُ بِالْعِصَابَةِ فَلَمَّا اتى اللّٰهُ ذلِكَ بِالْحَقِّ الَّذي اعْطاكَ اللّٰهُ شَرِقَ بِذلِكَ فَذلِكَ فَعَلَ بِهِ مَا رَايْتَ فَعَفَا عَنْهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاصْحَابُهُ يَعْفُونَ عَنْ الْمُشْرِكِينَ وَاهْلِ الْكِتَابِ كَمَا امَرَهُمْ اللّٰهُ وَيَصْبِرُونَ عَلَى الاذى قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنْ الَّذينَ اوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَمِنْ الَّذينَ اشْرَكُوا اذى كَثِيرًا﴾ الايَةَ ﴿وَقَالَ اللّٰهُ وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ اهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ ايمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ انْفُسِهِمْ﴾ الَى اخِرِ الايَةِ.

وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَاوَّلُ الْعَفْوَ مَا امَرَهُ اللّٰهُ بِهِ حَتَّى اذنَ اللّٰهُ فِيهِمْ فَلَمَّا غَزَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَدْرًا فَقَتَلَ اللّٰهُ بِهِ صَنَادِيدَ كُفَّارِ قُرَيْشٍ قَالَ ابْنُ ابَيّ ابْنُ سَلُولَ وَمَنْ مَعَهُ مِنْ الْمُشْرِكِينَ وَعَبَدَةِ الاوْثانِ: هَذا امْرٌ قَدْ

تَوَجَّهَ فَبايَعُوا الرَّسُولَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الاسْلام فَاسْلَمُوا. (الحديث ٤٥٦٦)[٤٠٤].

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) بەسواری گوێدرێژێك، کەجلێکی قەیفەی فەدەکی لێ کرابوو، چوو بۆ سەدان و هەواڵپرسی سەعدی کوڕی عوبادە، لەخێڵی بەنی حاریسی کوڕی خەزرەج، سەعد نەخۆش بوو، ئوسامەی کوڕی زەیدی خستە پاشکۆی خۆی ئەمەیش لەپێش ڕوداوی بەدردابوو..

ڕۆیشت تا گەیشتە لای کۆڕی دانیشتنێ، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی، کەناسراوە بەناوی دایکییەوە بە ئیبنو سەلوول لەناو ئەو کۆڕەدا بوو، ئەمەیش لەپێش ئەوەدا بوو کە ئیبنوسەلوول بە ڕواڵەت و بەدرۆ موسڵمان ببێ، وە لەناو کۆڕەکەدا تێکەڵەیەکی لە موسوڵمانان ولە هاوبەش پەیداکەران و لە جوولەکە لەوێ بوو، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەی شاعیریش لەوێ بوو. جا کاتێ تەپ و تۆزی وڵاخەکە چوو بەسەر کۆڕەکەدا، عەبدوڵلای کوڕی سەلوول، بەپۆشاکەکەی لووتی خۆی گرت و، گوتی: هێی‌تۆزمان بەسەردا مەکەن! پێغەمبەر یش(دروودی خودای لێ بێ) سلاوی لێکردن و ئەوجا ڕاوەستا و دابەزی و بانگی کردن بۆ سەر ئاینی خوداو..

بەپێی حاڵ چەند ئایەتێکی قورئانی بەسەردا خوێندن، ئیبنو سەلوولیش گوتی: ئەی کابرا! ئەم قسانەی تۆدەیکەی لێی جوانتر نییە، ئەگەر حەق بێ، بەڵام هەر چۆنێ بێ، بەم قسانە کۆڕی دانیشتنەکەمان لێتێك مەدە، بچۆ لە شوێن و جێگەی خۆت ئەم قسانە بکە هەر کەسێك هات بۆلات ئەم هەقایەتانەی بۆ بخوێنە! عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: با، ئەی پێغەمبەری خودا بفەرمووله هەموو شوێنێك لەهەر

---

(٤٠٤) اخرجهٔ مسلم في الجهاد و السير ، باب:في دعاء النبي (صلى اللهُ عليهِ وَسَلم) وصبره على اذى المنافقين. رقم: ١٧٩٨ .

كوێ بووین، ئەم پەندو ئامۆژگاری وقسەجوانانەمان بۆ بفەرموو، بەڕاستی ئێمە حەزمان لێیانە ئیتر قسەیەك لەم و قسەیەك لەو، بوبەشەڕە جنێو، لەنێوانی موسڵمانەکان و بت پەرستەکان و جولەکەکاندا، تەنانەت خەریك بوو پەلاماری یەکتری بدەن، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەرەبەرەخاوی کردنەوە، هەتا ئارام بوونەوە.

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) سواری گوێدرێژەکە بوویەوە و ڕۆیشت هەتاچووە لای سەعدی کوڕی عوبادە لە ژوورەکەیدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی سەعد ! دەزانی کە هاتم بۆ لای تۆ، تووشی ئیبنوسەلوول وکۆمەڵەکەی بووم، ئەو نامەردە واوای گوت). پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) قسەکانی ئەبوحوباب (واتە ئیبنوسەلوولی) بۆ سەعد گێڕایەوە سەعدیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ! لێیببورەو چاوپۆشی لێ بکە، چونکە سوێندم بەو خودایەی کە ئەم قورئانەی ناردووە بۆ تۆ، بەر لەوەی کە تۆ تەشریف بهێنیت بۆ مەدینە، وەئەم پەیامە پیرۆزە بهێنا بۆ ئێرە، خەڵکی ئەم شارە لەسەر ئەوە ڕێك کەوتبوون کە ئەم کابرایە بکەنە پادشای خۆیان وتاجی پادشایەتی لەسەربکەن، جاکاتێ کەخودا بەهۆی ئەو پەیامە پیرۆزەی کە بەتۆداناردی بۆمان، فەشەلیبەو هێناو نەیهێشت ئەوەی بۆببێ، پیشی خواردەوەو تەقی کرد، جا لەبەر ئەمەیە کەدەیبینی ئاوادەکاو شەڕ بەتۆ دەفرۆشێ!

پێغەمبەریش چاوپۆشی لێکرد، ئەو کاتە دەستووری پێغەمبەر و هاوڕێکانی وابوو، کە چاوپۆشی لە هاوبەش پەیداکەران (موشریکیین) وخاوەن نامەکان بکەن، لەسەر ئەو شێوەیەی کەخودا فەرمانی پێکردوون، وە ئارامیان دەگرت لەسەر ئێش و ئازاریان، خودای بالآدەست وخاوەن شکۆ لەم لایەنەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنْ الَّذِينَ اوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَمِنْ الَّذِينَ اشْرَكُوا اذى كَثِيرًا﴾ وە هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ

مِنْ اهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ ايمَـانِكُمْ كُفَّـارًا حَسَدًا مِـنْ عِنْـدِ انفُـسِهِمْ﴾ تاكۆتایی ئایەتەکە. پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) عەفوکە لەکۆتایی ئایەتەکەدا بەم شێوەیە باسی لێوەکراوە : ﴿فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّى يَاتِيَ اللَّهُ بِامْرِهِ﴾ بەوشێوەیەواتای دەکرد، کەخودا فەرمانی پێیدەکردوە کە بەو شێوەیە تەئویلی بکات، کە فەرمانی پێکراوە بە ئارامگرتن و بەخۆگری لەبەرباری ئێشو ئازاریان دا، هەتا خودا فەرمانی دا بە پێغەمبەر کە جەنگیان لەگەڵ دابکات.

جاکاتێ کە پێغەمبەر ویارانی غەزای بەدریان بەسەرکەوتوویی ئەنجام دا، وە لوتی بێ باوەڕانیان شکاندو کۆمەڵێ لە گەورە پیاوانی بێ باوەڕانی قورەیشیان کوشت، ئەو کاتە لە ژێر کاریگەری ئەم غەزایەدا کوڕی سەلوول و کۆمەڵەکەی لەهاوبەش پەیداکەران و بتپەرستان گوتیان: ئێمە بمانەوێو نەمانەوێ ئەم ئاینی ئیسلامە خۆی سەپاندوو چەسپی، کەواتە تازووە باخۆمانی پیاکەین، وەلەسەر ئەم بنیادە ئیسلام بوون وبەڵێن و پەیمانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا کە ببن بەلایەنگیرانی ئیسلام ).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

بۆ تێگەیشتنی تەواوی ئەم فەرموودەیە بڕوانە: (ڕاڤەوشیکردنەوە)ی فەرموودەی ژمارە: ٦٠٩ ت =١٢٦٩ف= بەرگی/٢ ل/٣٠).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿لا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا اتَوا﴾٣/١٨٨

١٦٤٧- عَنْ ابِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) انَّ رِجَالا مِنْ الْمُنَافِقِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ اذا خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ وَفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلافَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاذا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اعْتَذَرُوا الَيْـهِ وَحَلَفُـوا وَاحَبُّـوا

انْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَنَزَلَتْ ﴿لا تَحْسِبَنَّ الَّذينَ يَفْرَحُونَ بِمَا اتَوْا وَيُحِبُّونَ انْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا﴾.. الايَة (الحديث ٤٥٦٧)(٤٠٥).

ئەبوسەعیدی خدری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لێ بێ) چەند پیاوێك هەبوون، ناپاك (منافق) بوون، كاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دەچوو بۆ غەزا، ئەوان بەفێڵ و فەرەج خۆیان دەدزیەوە ولەماڵەوە دەمانەوە، بە پێچەوانەی حەزرەتەوە(درودی خودای لێ بێ) وە بۆ دژایەتی ئەو بەم هەڵوێستە ناپاكانەیان كەیفخۆش دەبوون، كاتێكیش كە پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) دەهاتەوە لە غەزا دەچوونە خزمەتی و بەهانەو مەهانەی درۆیان دەهێنایەوەو، سوێندیان لەسەر دەخواردو كەیفیان بەوە دەهات، كە بە بەلاش لەسەر شتێ كە نەیانكردووە سوپاس و تاریف بكرێن! ئیتر بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی كەپەردە لەسەر ئەم هەڵوێستە ناجەوان مەردانەیان هەڵدەداتەوە، كە دەفەرموێ: ﴿لا تَحْسَبَنَّ الَّذينَ يَفْرَحُونَ بِمَا اتَوا وَيُحِبُّونَ انْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلا تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنَ الْعَذابِ وَلَهُمْ عَذابٌ الِيمٌ﴾٣/١٨٨، واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! وەتۆش ئەی موسڵمانی بەرێز! وا مەزانە ئەوانە كە وا دڵشادو شادومان دەبن بەكردەوەی ناشیرینی خۆیان و حەز دەكەن كە لەسەر شتێكی باش، كەبەدرۆ دەڵێن : ئەوشتە باشەمان كردووە بەڵام لەڕاستیدا ئەو ئیشەیان نەكردووە، حەزدەكەن لەسەرئەو شتە باشە، بەهۆی ئەو درۆیانەیانەوە، بە بەلاش سوپاس ووەسف بكرێن، قەت وامەزانە كە ئەوانەو وێنەی ئەوانە، بەم ساختەكاریەو فرت وفێڵە، لەدەست تۆڵە و سزاو قاری خودای گەورە قوتار دەبن و، لە پەنایەكا ئاسوودە و سەرفەراز دەبن و ئۆقرە و ستار دەگرن، قەت شتی وانییە بەڵكو بۆ ئەوانەو بۆ وێنەی ئەوانە، هەیە سزای بەسوێ و ئازاری

(٤٠٥) اخرجهُ مسلم في اوائل صفات المنافقين و احكامهم ، رقم: ٢٧٧٧ .

ئـێش بـەناو پـەڕەی دڵ گـەیێن! (تـاج/٦ ل/٩٥ - ش- شـەیخان = بوخـاری و موسلیم ).

١٦٤٨- ع نْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) وقد قيلَ لهُ: لَئِنْ كَانَ كُلُّ امْـرِئٍ فَرِحَ بِمَا اوتِيَ وَاحَبَّ انْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ مُعَذبا لَنُعَذبَنَّ اجْمَعُونَ فَقَالَ ابْنُ عَباسٍ وَمَا لَكُمْ وَلِهَذهِ انَّمَا دَعَا النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَهُـودَ فَـسَالَهُمْ عَـنْ شَـيْءٍ فَكَتَمُوهُ ايَاهُ وَاخبَرُوهُ بِغَيْرِهِ فَارَوْهُ انْ قَدْ اسْتَحْمَدُوا الَيْهِ بِمَا اخبَرُوهُ عَنْهُ فِيمَا سَالَهُمْ وَفَرِحُوا بِمَا اوتُوا مِنْ كِتمَانِهِمْ). (الحديث٤٥٦٨)[٤٠٦].

کاتێ کە مـەروانی کوڕی حەکـەم سـەرداری سـەر شاری مەدینـە بـوو، بـە دەرکەوانەکەی خۆی، کە ناوی ڕافیع بوو، گوت: ئەی ڕافیع ! ئادەی بڕۆ بـۆلای ئیبنوعەبباس پێـی بڵێ: خـۆ ئەگـەر هەموکـەس سـزا و ئـازار بـدرێت لەسـەر ئەوەی کە شادمان ببێ بەوەی کەدەستی دەکەوێ و حەز بکات کـە بـەخۆڕایی سوپاس بکرێـت لەسـەر شـتێ کەنـەی کردبێـت، خـۆ ئەگـەر ئەمـەوابێ، ئـەوا کـەسمان لـە قیامەتـدا ڕزگارمـان نـابێو، هـەمووومان سـەرجەم سـزاو ئـازار دەدرێین، چونکە کێ هەیە مەگەر بەدەگمەن، کە مـاڵ و منـاڵ و ئایـەو مایـەو پایەو، وەسپی ڕاست و درۆی پێ خۆش نەبێ؟

جـا کـاتێ کـە ڕافیـع ئـەم پەیامـەی مـەروانی ڕاگەیانـد بەئیبنوعـەبباس، ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) لەوەلامدا فەرمووی: ئێوە چیتانە بەسـەر ئـەم باسـەوە؟ ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارە وە لەشانی جوولەکەکانـدا، جارێـك کـە حـەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) بـانگی کـردن و پرسـیاری شـتێکی لێکـردن، ئـەوان شتەکەیان شاردەوە وحەشاری وەلامە ڕاستەکەیان داو، بە پێچەوانەی ئـەوەوە شـتێکی تریـان پێگـوت، ئینجـا وایـان نیـشانی حـەزرەت دەدا کـە وەلامـی پرسـیارەکەی ئـەویان بەڕاستیداوەتەوە، کـەوابێ دەبـێ حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سـوپاس وتاریفیـان بکـات، وە شـادومان ودڵـشادبوون بـەوەی

---

(٤٠٦) اخرجهُ مسلم في اوائل صفات المنافقين و احكامهم ، رقم: ٢٧٧٧ .

کەڕاستیەکەیان شاردبووەوە، کەتمی حەقیقەتەکەیان کردووە، ئەوجا ئیبنو عەبباس ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَاذ اخَذ اللّٰهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ اوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلا تَكْتُمُونَهُ﴾ ٣/١٨٧، (تاج/٦ ل/٩٦ ز/٤ ف/٣٨).

## تەفسیری سوورەتی نیساء (تفسیر سورة النساء)

**فەرمایشتی گەورەی سەروەر:**

﴿ وَانْ خِفْتُمْ الا تُقْسِطوا فِي الْيَتَامَى﴾ ٤/٣

١٦٤٩- عَنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ رحمه الله تعالى انَّهُ سَالَ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) عَنْ قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى: ﴿وَانْ خِفْتُمْ انْ لا تُقْسِطوا فِي الْيَتَامَى﴾ فَقَالَتْ: (يَا ابْنَ اخْتِي هَذِهِ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا تَشْرَكُهُ فِي مَالِهِ وَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا انْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ انْ يُقْسِط فِي صَدَاقِهَا فَيُعْطِيَهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ فَنُهُوا عَنْ انْ يَنْكِحُوهُنَّ الا انْ يُقْسِطوا لَهُنَّ وَيَبْلُغُوا لَهُنَّ اعْلَى سُنَّتِهِنَّ فِي الصَّدَاقِ فَامِرُوا انْ يَنْكِحُوا مَا طابَ لَهُمْ مِنْ النِّسَاء سِوَاهُنَّ) قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: (وَانَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ هَذِهِ الايَة فَانْزَلَ اللّٰهُ ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ﴾ قَالَتْ عَائِشَةُ: وَقَوْلُ اللّٰهِ تَعَالَى فِي ايَةٍ اخْرَى: ﴿وَتَرْغَبُونَ انْ تَنْكِحُوهُنَّ﴾ رَغْبَةُ احَدِكُمْ عَنْ يَتِيمَتِهِ حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ وَالْجَمَالِ قَالَتْ فَنُهُوا انْ يَنْكِحُوا عَنْ مَنْ رَغِبُوا فِي مَالِهِ وَجَمَالِهِ فِي يَتَامَى النِّسَاء الا بِالْقِسْط مِنْ اجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ اذا كُنَّ قَلِيلاتِ الْمَالِ وَالْجَمَالِ)(الحديث ٤٥٧٤، اطرافه في: ٢٤٩٤، ٢٧٦٣، ٤٥٧٣، ٤٥٧٤، ٤٦٠٠، ٥٠٦٤، ٥٠٩٢، ٥٠٩٨، ٥١٢٨، ٥١٣١، ٥١٤٠، ٦٩٦٥)(٤٠٧).

عوروەی کوڕی زوبەیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم لە عائیشە کرد : لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَانْ خِفْتُمْ الا تُقْسِطوا

(٤٠٧) اخرجهُ مسلم في اوائل كتاب التفسير ، رقم: ٣٠١٨ .

فِي الْيَتَامَى فَانكِحُوا مَا طابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاء مَثنَى وَثلاث وَرُباعَ﴾ (واتـه: ئەگەر ترسـتان لـەوە هـەبوو، کـە عەدالـەت ودادپـەروەری نەکـەن لەگـەڵ ئـەو کچە هەتیوانـەدا، کـەوان لـە ژێـر چـاودێری ئێـوەدا، ئەگـەر بێتـو مارەیـان بکـەن بۆخۆیـان، ئەگـەر ئـەم مەترسـیەتان هـەبوو، ئەوابـچن ژنێکـی ترمارەبکـەن بۆخۆتـان، کـە بـەدڵتان بـێ‌و واز لـەو هەتیوانـە بهێـنن، وە دەتـوانن ژنـێ، یـان دووژن، یان سێژن، یان چوارژن، بـەپێی یاسـای شـەرع بهێـنن، بەمـەرجێ کـە بەمەرجی سەرەکی‌دادەنرێت کە ئەوەیە کە بتـوانن عەدالـەت و دادپـەروەریی بە جێ‌بهێنن لە نێوانیاندا.

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی خوارزای خۆم! ئـەم ئایەتـە هاتـە خوارەوە لەشانی کچانی بێ باوکدا، کـە لـەلای حەقـداریان بـن وئـەو هەقـدارە بچێ لەبـەر سامان و مـاڵی کچەکە، یـا لەبـەر جوانی‌یەکـەی مارەی بکـات لـە خۆی، بەڵام ئەوەندەی کە بـاوبێ مـارەی بۆدانـەنێ، جـا خـودا نـەهی لێکـردن لـەکردنی شـتی‌وا، مەگـەر بەمـەرجێك کـە وەك ژنـانی تـر مـارەیی ومافیـان بۆدابنێن، ئەوە دەبێ، دەنا خودا فەرموویەتی پێیان برۆن لـە ژنـانی‌تر بـەدڵی خۆتان ژن بهێنن و وازبێنن لەوان.

عوروه فەرموی: عائیشه فەرمووی: خەڵکەکـە لـەپاش هـاتنی ئـەم ئایەتـە داوای فەتوایان لە پێغەمبـەرکرد، خـودا لـە وەلامـدا ئـەم ئایەتـەی تـری نـارد: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاء﴾ عائیشه فەرموی: ئەوفەرمودەیەی خودای گەورە کە لەئایەتێکی تردا دەفەرمێ: ﴿وتَرْغَبُونَ انْ تَنكِحُوهُنَّ﴾ مەبەست لێـی ئەمەیـە : کەکەسـتان حـەزتان لەوەنیـە کـە ئـەو کـچە هـەتیوە مـارە بکـات بـۆ خـۆی کەحەقداریـەتی، لەبەرئـەوەی کەسـامان وجوانیـان کەمـە.دیـسان عائیـشه فـەرمووی: نـەهیان لێکـرا کـە ئـەو کـچە هەتیوەکـەم مـاڵ و کـەم جوانیانـە نەهێنن مەگەر بەمەرجێك کەدادپەروەری ڕابگرن).(تاج/٦ ل/١٠٠ ز/٥ ف/١).

**فەرمایشتی خوای کەورە:**

**﴿يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي اوْلادِكُمْ﴾ ٤/ ١١**

١٦٥٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: عَادَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابُو بَكْرٍ فِي بَنِي سَلِمَةَ مَاشِيَيْنِ فَوَجَدَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لا اعْقِلُ شَيْئًا فَدَعَا بِمَاء فَتَوَضا مِنْهُ ثُمَّ رَشَّ عَلَيَّ فَافَقْتُ فَقُلْتُ مَا تَامُرُنِي انْ اصْنَعَ فِي مَالِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَنَزَلَتْ ﴿يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي اوْلادِكُمْ﴾ (الحديث ٤٥٧٧- طرفه في ت/١٩٤ف- ٢٨٠= بەرطى يەكەم لاثەرة : ١٦٤).

واتای فەرموودەکەو تەخریجەکەی لەوێ بە تەواوی ڕابورد لێرەئەم پترییەی هەیە : پێغەمبەر لەگەڵ ئەبوبەکردا بەپێدەچن بۆهەواڵ پرسی جابیر، کە لەناو هۆزی بەنی سەلیمە دابووە، کە هۆزی جابیر خۆی بوون.

**فەرمایشتی خوای کەورە:**

**﴿انَّ اللَّهَ لا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ ٤/ ٤٠**

١٦٥١- عَنْ ابِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) (انَّ انَاسًا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالُوا: (يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): نَعَمْ هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ بِالظَّهِيرَةِ ضَوْءٌ لَيْسَ فِيهَا سَحَابٌ؟ قَالُوا: لا،قَالَ: (وَهَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ ضَوْءٌ لَيْسَ فِيهَا سَحَابٌ؟ قَالُوا: لا قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الا كَمَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ احَدِهِمَا اذا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ اذَنَ مُؤَذِّنٌ تَتْبَعُ كُلُّ امَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ فَلا يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ غَيْرَ اللَّهِ مِنْ الاصْنَامِ وَالانْصَابِ الا يَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ حَتَّى اذا لَمْ يَبْقَ الا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ بَرٌّ اوْ فَاجِرٌ وَغُبَّرَاتُ اهْلِ الْكِتَابِ فَيُدْعَى الْيَهُودُ فَيُقَالُ لَهُمْ مَنْ كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللَّهِ فَيُقَالُ لَهُمْ: كَذَبْتُمْ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلا وَلَدٍ فَمَاذَا تَبْغُونَ فَقَالُوا: عَطِشْنَا رَبَّنَا فَاسْقِنَا فَيُشَارُ الا تَرِدُونَ فَيُحْشَرُونَ الَى النَّارِ كَانَّهَا سَرَابٌ

يَحطِمُ بَعْضهَا بَعْضا فَيَتَسَاقَطونَ فِي النَّارِ ثمَّ يُدْعَى النَّصَارَى فَيُقَالُ لَهُمْ: مَنْ كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟

قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللّٰهِ فَيُقَالُ لَهُمْ: كَذبْتُمْ مَا اتَّخَذ اللّٰهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلا وَلَدٍ فَيُقَالُ لَهُمْ: مَاذا تَبْغُونَ؟ فَكَذلِكَ مِثلَ الاوَّلِ حَتَّى اذا لَمْ يَبْقَ الا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللّٰهَ مِنْ بَرّ اوْ فَاجِرٍ اتَاهُمْ رَبُّ الْعَالَمِينَ فِي ادْنَى صُورَةٍ مِنْ الَّتِي رَاوْهُ فِيهَا فَيُقَالُ: مَاذا تَنْتَظِرُونَ تَتْبَعُ كُلُّ امَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ قَالُوا: فَارَقْنَا النَّاسَ فِي الدُّنْيَا عَلَى افْقَرِ مَا كُنَّا الَيْهِمْ وَلَمْ نُصَاحِبْهُمْ وَنَحْنُ نَنْتَظِرُ رَبَّنَا الَّذي كُنَّا نَعْبُدُ فَيَقُولُ: انَا رَبُّكُمْ فَيَقُولُونَ لا نُشْرِكُ باللّٰهِ شَيْئًا مَرَّتَيْنِ اوْ ثلاثا). (الحديث ٤٥٨١ – طرفه في: ٢١ تجريد = ٢٢ فتح = بەرطى يەكەم لاثەرِة: ٤١ )[٤٠٨].

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چەند کەسێ عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لەرۆژی دوارۆژدا لە قیامەت دا خودای خۆمان دەبینین؟ فەرمووی: بەڵێدەیبینن، لە پاشدا فەرمووی: ئایا بە ڕۆژی نیوەڕۆ ئاسمان سامالّ بێو یەك دنك هەوری پێوە نەبێ، لە دیتنی خۆردا هیچ ئەرکێ، زەحمەتێ، دەبینن، یاخود ئایا شەوی چواردەی مانگ کە ئاسمان سایەقەی ساف بێ هیچ هەوری نەبێ، بۆ چاوپێکەوتنی مانگ هیچ ئەرکێ دەکێشن؟ گوتیان نەخێر؟ ئەی پێغەمبەری خودا؟! فەرمووی: (دەی بەبێ ئەرك و کێشەو بەرە، وەك چۆن ئەم دووانە لەم دوو کاتەدا بە ئاسانی و باشی دەبینن ئاوەهاش لە ڕۆژی دوارۆژدا بە چاوی سەر، بەخۆشی و بەئاسانی، خودای خۆتان دەبینن کە خودایەکی پیرۆز و گەورەیە، کاتێك کە قیامەت بوو، بانگکەرێ بانگەواز دەکات ؛ هەموو میللەتێ لەجیهاندا چیپەرەستووە باشوێنی ئەوە بکەوێ، ئیتر ئەوانەی کەبت و ئەوجۆرە شتانەیان پەرەستووەو، غەیری خودایان پەرەستووەو، پەیکەری داریـن و

---

(٤٠٨) طرفه وتخريجه في رقم: ٢١ تجريد = ٢٢ فتح = ج/١ص/٤١ =بەرگی یەکەم لاپەڕە : ٤١.

بەردینیان کردووە بەخوداو، پەرەستوویانە، هەموو دەکەونە ناو دۆزەخەوە، هەتا دەمێنێتەوە ئەوانەی کە خودایان پەرەستووە : لەچاك ولەخراپ و، لە پاشماوەی خاوەن نامەکان.

ئەوجا بانگی جوولەکە دەکرێو پێیان دەگوترێت: ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن : عوزەیری کوڕی خودامان دەپەرست. پێیان دەڵێن: درۆدەکەن خودا نەهاوسەری بووەو نەمنداڵ، دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: خودایە! توونیمانە ئاومان بدەرێ، بیخۆینەوە، پێیان دەفەرموون بچن بۆ ئەوێوە ئاو بخۆنەوە، جا بەرەو ئاگر خڕیان دەکەنەوەودەیان تەپێننە ناوی، ئاگرەکە لە دوورەوە دەڵێی بەردە تراویلکەیە، لەبەر ئەوە لەوان وایە کە ئەوە ئاوە، بەلام ئاو نییە، ئاگری سوورە، بڵێسەو نێڵەنێڵ و کڵپەکڵپی لەگەڵ خۆیدا شەڕ دەکات، ئیتر هەمویان دەکەونە ناوی.

ئەمجا بانگی فەلەکان دەکەن وپێیان دەڵێن: ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: مەسیحی کوڕی خودامان دەپەرست، پێیان دەفەرموون: درۆدەکەن، خودا نەهاوسەری هەیەو، نەمنداڵ، وەك لەقورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ سورەتی جن٣/٧٢. دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! تینوومانە، ئاومان پێبدە هەتا بیخۆینەوە، پێیان دەڵێن : بڕۆن بۆئەوێوە، لەوێ ئاو بخۆنەوە، ئەوجامۆڵیان دەدەن، بەرەودۆزەخ، ئاگرەکە لەلای ئەوانەوە کە تەماشای دەکەن دەڵێی بەردەخوێیە، چۆن بەردەخوێ لەسارادا، لەدوورەوە لەقرچەی گەرمادا، لەدەریای ئاو دەکات، لەلای ئەوانەوە ئاگرەکە ئاوە، وەك شەپۆلە ئاوی زۆروا بوو، بڵێسەکەی لە گەڵکڵپەی خۆیدا کوڵەکەدەدا!!

جا ئەوانیش دیسان دەسەپێننە ناو ئاگر، هەتا تەنیا ئەوانە دەمێننەوە کە هەرخودای گەورەیان پەرەستووە، بەچاك وخراپیانەوە، ئەوجا پەروەردگاری هەردوو جیهان (کە پاك وپیرۆزە و، بێخەوش و، بێ گەردەو،

گەورەیە) لەسەر شێوەیێ دێ بۆلایان، کە نزیکترین شێوەیە، لەو شێوەی کە لە قورئانی پیرۆزولەسەرزمانیموحەممەد بۆیان باسکراوە، پێیان دەفەرمووێ: ئەوە چاوەڕوانی چی دەکەن؟ ئەوەتانێ هەموو میللەتێ لە جیهاندا چی پەرەستووە، ئێستا شوێنی ئەوە کەوتووە، جادەڵێن: ئەی خودایە؟ خۆت ئاگات لێیە کە ئێمە لەجیهاندا لەبەر خاتری ڕەزای تۆ دەستمان لە کەسوکاری خۆمان و، لەئازیزانی خۆمان و، لەخەڵکانیتریش هەڵگرتبوو، وە هاوڕێیەتیمان نەدەکردن لەو پێناوەدا، لە کاتێکدا کەزۆر کارمان پێیان هەبوو، کەوابووفریامان کەوە لەم سەخڵەتیە ڕزگارمان بکە، خوداش دەفەرموێ: من خودای ئێوەم، دەڵێن: پەنادەگرین بەخودا لەتۆ، ئێمەهیچ هاوبەش پەیداناکەین بۆخودای خۆمان). (دووجار یان سێ جار ئەم گفتوگۆیەدوبارەدەکەنەوە ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بوخاری و موسلیم و تەرمەزیو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە، زۆر بە دورو درێژی، بەدرێژی والە تاجول ئوسولْ دا لەم شوێنەدا : (بەرگی دەیەم، لاپەڕە: ٤١١ ز- ١٣١، باسی پێغەمبەران و باوەڕدارانیش – بەفەرمانی خودا- تکاو شەفاعەت دەکەن بۆ کەسانی تر).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿ فَكَيْفَ اذا جِئْنَا مِنْ كُلِّ امَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيدًا﴾ ٤١/٤

١٦٥٢– عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بن مسعود (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (اقْرَا عَلَيَّ قُلْتُ: اقْرَا عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ انْزِلَ قَالَ: فَانِّي احِبُّ انْ اسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي فَقَرَاتُ عَلَيْهِ سُورَةَ النِّسَاء حَتَّى بَلَغْتُ ﴿فَكَيْفَ اذا جِئْنَا مِنْ كُلِّ

امَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاءِ شَهِيدًا﴾ قَالَ: امْسِكْ فَاذا عَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ.
(الحديث ٤٥٨٢– اطرافه في : ٥٠٤٩– ٥٠٥٠– ٥٠٥٥– ٥٠٥٦ )[٤٠٩].

عەبدوڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی : پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی پێم: (هەندێ قورئانم بۆ بخوێنە ). گوتم : قوربان ؟! قورئان بۆ تۆ هاتووە و من بۆتی بخوێنم؟ فەرمووی: ( حەزدەکەم کەسێکی تر بیخوێنێ و من گوێی لێ بگرم، جا منیش سورەتی نیسائم بۆ خوێند، تا گەیشتمە سەر ئەم ئایەتە: ﴿ فَكَيْفَ اذا جِئْنَا مِنْ كُلِّ امَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاءِ شَهِيدًا﴾ ٤/٤١.

واتە : جا ئەوە دەبێ حاڵی ئەو کافرە بێبڕوایانە، لەڕۆژی قیامەتدا چۆن بێ، لەو کاتەدا کە لەهەموو مییللەتێك شایەتێ بهێنن، شایەتی بدات لەسەر بێبڕوایی‌و نامەردی ئەوان، وە تۆیش ئەی موحەممەد! دەهێنین بۆ شایەتیدان لەسەریان وبۆ شایەتی دان بۆیان). ئیتر کەگەیشتمە ئێرە فەرمووی: (ئیتربەسە) کە تەماشای حەزرەتم کردواموتەنەسیر بووبوو، ئەسر هۆن هۆن بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە (تاج/٥ ل/٢٩٠ ژ/٧٩ ف/١)+ (ریاض الصالحین/ بەرگی/دوو ژ/٥٤ ژ: ١- ٤٤٦).

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿انَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمْ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي انفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضعَفِينَ فِي الارْض قَالُوا الَمْ تَكُنْ ارْض اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا﴾ ٤/٩٧.

١٦٥٣– عن ابْنُ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهما) انَّ نَاسًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا مَعَ الْمُشْرِكِينَ يُكَثِرُونَ سَوَادَ الْمُشْرِكِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَاتِي السَّهْمُ فَيُرْمَى بِهِ فَيُصِيبُ احَدَهُمْ فَيَقْتُلُهُ اوْ يُضرَبُ فَيُقْتَلُ فَانْزَلَ اللَّهُ انَّ الَّذِينَ

---

(٤٠٩) اخرجهُ مسلم في الصلاة، (عيني /١٨ص١٧٤) –المترجم .

تَوَفَّاهُمْ الْمَلاَئِكَةُ ظَالِمِي انْفُسِهِمْ الايَـة. (الحـديث ٤٥٩٦- اطرافـه فـي: ٧٠٨٥ ).[410]

ئیبنوعـەبباس (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: هەنـدێ لەموسـڵمانان لـەناو بتپەرەسـتەکانی مەککـەدا بـوون، هێـشتا کۆچـیان نـەکرد بـوو بـۆ مەدینـە، ڕەشایی‌و قەڕەباڵغی ئەوانیان زۆر دەکردو، دەبوون بەهۆی ئـەوەی کـە لـەکاتی جەنگ و پێك هەڵپرژاندا تارمایی لەشکری کوفر، لەبەر چاوی سوپای ئیسلام زۆرتربنوێنێ، جاوا ڕێ دەکـەوت جاروبـار تـیرێ دەهـات دەیدالەیـەکێکیان، یا دەیکوشــت، یــان زامــداری دەکــرد، موســڵمانەکانیش : دەیــانگوت : ئەمانــە بـەزۆرهێنراون، لەبـەر ئـەوە بۆیـان دەپاڕانـەوە، بـەڵام خـودا ڕێگـەی ئـەوەی نەدان جا بۆیە خودای گەورە بـۆ ڕونکردنـەوەی ئـەم هەڵوێـستە، تـەواوی ئـەم ئایەتەی ناردە خـوارەوە : ﴿انَّ الَّذينَ تَوَفَّاهُمْ الْمَلاَئِكَةُ ظَالِمِي انفُسِهِمْ – ٩٧﴾، (تاج/٦ ل/١١٢ ف/٢١ ز/٥).

**ڕوونکردنەوە:**

کـورت و پوخـت کـاری ئـەم جـۆرە کەسانە بـە تـاوانێکی گـەورە دانـراوە، فریــشتەی گیــان کێــشان لــە کــاتی ســەرەمەرگدا مــوژدەی ســزای ســەخت و بە سوێیان پێ دەدەن.

**فەرمایشتی خوای گەورە:**

﴿انَّا اوْحَيْنَا الَيْكَ كَمَا اوْحَيْنَا الَى نُوحٍ﴾٤/١٦٣

١٦٥٤- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ مَنْ قَالَ انَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى فَقَدْ كَذَبَ (الحديث ٤٦٠٤- طرفاه فـي :

(٤١٠) لم يوافقهُ مسلم على تخريج حديث ابن عباس في نزول﴿ان الذين توفاهم الملائكة ظالمي انفسهم﴾ (فتح/٩ ص٧٧٢ –المترجم .

٣٤١٢- ٤٦٠٣- ٤٨٠٤-. راجـعْ : ٣٤٠٣- ٣٤١٥- ٣٤١٦ = ١٣٦٢ تەجريد. بەرطى ضوارەم- لاثەرِة/٤٩)(٤١١).

پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) دەفـەرموێ : هەرکەسـێ بڵێ: مـن (واتـە: پێغەمبـەر ) باشـترم لـە یونـسی کوڕی مـەتتا، بەڕاسـتی ئـەوە درۆ دەکـات). (تاج/٤ ل/٣٨٨ ف/٢ ز/١١٨).

**ڕوونکردنەوە:**

ئـەم فەرمودەیـە جۆرەکێـشەیەکی واتیـادا، چـونکە ئیجمـاع لەسـەرئەوە هەیـە کەپێغەمبـەر (درودی خـودای لـێ بـێ) (خَيـرُ خَلْـقِ اللهِ)یـەو، باشـترینی دروستکراوانی خودایە، لەبەر ئەوە ئەگەرکەسێ بڵێ: پێغەمبەر لەموسا، یا لە عیسا، یا لە یونس باشترە ئەوە ڕاست دەکات و درۆ ناکات. لەبەر ئەوە زاناکـان بەم دوو شێوەیە ئەم فەرموودەیـە تـەئویل دەکـەن : یەکـەم : هەرکەسـێ بڵـێ من، واتە خۆی، لە یونس باشترە ئەوە درۆ دەکا، چـونکە یـوونس لەبەرئـەوەی پێغەمبـەرە، لـەو باشـترە کەپێغەمبەرنییـە کەقـسەی وا زل دەکـا.دووەم: ئـەم فەرمایشتەی پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) لە پێش ئەوەدا بووە، کە بزانێ خـۆی (خیر البشر)ە و چاکترینی مەردومە.

## تەفسیری سوورەتی مائیدة (تفسير سورة المائدة)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ يَاأَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا انزِلَ الَيْكَ مِنْ رَبِّكَ﴾ ٦٧/٥

---

(٤١١) رواه مسلم في فضائل موسى= ج/١٥ ص١٣٣- ١٣٤ ، صحيح مسلم بشرح النووي رقم: ٢٣٧٦ — المترجم .

١٦٥٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (مَنْ حَدَّثَكَ انَّ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَتَمَ شَيْئًا مِمَّا انْزَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ فَقَدْ كَذبَ وَاللَّهُ يَقُولُ: ﴿يَا ايُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا انْزِلَ الَيْكَ مِنْ رَبِّكَ﴾الايَة. (الحديث ٤٦١٢ سبق طرفه في: ١٣٠٦ تةجريد= ٣٢٣٤= بةرطى/٣ل -٤٣٧)[412].

عائيشه (رمزاى خوداى لىَ بىَ) فەرمووى: هەر كەسىَ قسەى واى بۆكردى: كەگوايە موحەممەد(دروودى خوداى لىَ بىَ) شتێكى حەشارداوە لەو قورئان و سوننەتەى كە بەسرووش بۆى هاتووە، ئەوە بەڕاستى درۆ دەكات، چونكە خوداى گەورە لەم ئايەتە پيرۆزەدا، فەرمان دەكات بەپێغەمبەر، ئەوقورئان ووەحيەى بۆى هاتووە ڕايبگەيەنێ‌وهەرِشەى ئەوەى‌لىَ‌دەكا، ئەگەر بە ئەركى خۆى هەلَ نەستىَ لەم لايەنەوە بەرپرسيارە، كە دەفەرمووێ: ﴿يَاايُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا انزِلَ الَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَانْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ﴾ ٦٧/٥. (تاج/٦ ز/٧ ل/١٥٨ ژ/٨).

**فەرمايشتى خوداى گەورە:**

﴿ يَا ايُّهَا الَّذينَ امَنُوا لا تُحَرِّمُوا طيِّباتِ مَا احَلَّ اللَّهُ لَكُمْ﴾ ٨٧/٥

١٦٥٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (كُنَّا نَغْزُو مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَيْسَ مَعَنَا نِسَاء فَقُلْنَا:الا نَخْتَصِي فَنَهَانَا عَنْ ذلِكَ فَرَخَّصَ لَنا بَعْدَ ذلِكَ انْ نَتَزَوَّجَ الْمَرْاةَ بالثوْبِ ثمَّ قَرَا: ﴿يَا ايُّهَا الَّذينَ امَنُوا لا تُحَرِّمُوا طيِّباتِ مَا احَلَّ اللَّهُ لَكُمْ﴾. (الحديث ٤٦١٥- طرفاه في : ٥٠٧١- ٥٠٧٥)[413].

عەبدوولَلاى كوڕى مەسعود (رمزاى خودايان لىَ بىَ) فەرمووى: گەلىَ‌جاروادەبوو، لەخزمەتى پێغەمبەردا (دروودى خوداى لىَ بىَ) دەچووين بۆ غەزا ؛ ژنمان لەگەل

---

(٤١٢) اخرجهُ مسلم في الايمان، باب: معنى قوله تعالى ﴿ولقد راه نزلة اخرى﴾ رقم: ١٧٧.

(٤١٣) اخرجهُ مسلم في النكاح، باب: نكاح المتعة وبيان انها ابيح ثمَ نسخ .. رقم: ١٤٠٤ .

خۆمـان نـەدەبرد؛ جا بۆئـەوەی کـە لـەم ڕووەوە توشـی تـاوان نەبین؛ عـەرزی پێغەمبـەرمان کـرد ئـەی پیغەمبـەری خـودا! ریگـەمان پابـدە خۆمـان دەخەسێنین ئەویش ڕێگەی ئەوەی پانـەداین، بـەڵام لـەوەدوا، پێغەمبـەر(درووودی خودای لێ بێ) ڕێگەی پێدابن کـە بـۆ ناچاری ژن سیغە بکـەین؟، لەسـەرجل و بـەرگ و شـتیتریش. ئینجا ئیبنوومەسعود بۆپشتیوانی ڕای خـۆی، لـەبارەی دروست بـوونی ژن سـیغەکردنەوە، ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ﴾ واتە : ئەی موسڵمانینە! لەیاسای خودای گەورە دەرمەچن، ئەوشـتە پـاك وخۆشـانە، چ خـۆراك بـن، چ شتی تر، کەخودا ڕەوای دیوە بۆتان و خۆی بۆی حـەلاڵ کـردوون لەخۆتانـەوە لەسەر خۆتانی حـەرام مەکـەن ...). (تـاج/٦ ل/١٣٧ فـەرموودەی ژمارە:١٠، ١١، زنجیرە: ٦ تەفسیری سوورەتی مائیدە+ بەرگی/٣ ل/١٤٧ ز/٦٠ ژ/١، ٢، ٣، ٤- باسی سـیغەکردن حەرامـە + فیقهـی ئاسـان بـەرگی/٢ ز/٢٩٨ لاپـەڕە : ٧٣٩- باسـی سیغەکردن (نكاح المتعه) مـارەبڕینی کـاتی : ژنهێنـان بۆماوەیـەکی دیاریکراو، وەك بۆحەفتەییێ، یامانگێ، یاساڵێ، یا دەساڵ یا کەمتر یـان زیـاتر بەمـەرجێك ماوەکەی دیاری کرابێ).

**فەرمایشتی خوای گەورەیە :**

﴿ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ٥/٩٠

١٦٥٧- وقَالَ ابْنُ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ): (الأزْلامُ الْقِدَاحُ يَقْتَسِمُونَ بِهَا فِي الأمُورِ وَالنُّصُبُ أنْصَابٌ يَذْبَحُونَ عَلَيْهَا).

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفـەرموێ : ئـەزلام ئـەو تەختـە دارانەیـە، کـە دانـەو فاڵیـان پـێ دەگرنـەوە، کـێ سـێ تەختـەی وەك یـەك لـە یـەکێکیان نوسـراوە : بیکـە، لەیـەکێ تریـان نوسـراوە مەیکـە، لەسـێیەمیان هـیچ

نەنووسراوە، جا کەسێ بیەوێ کارێ بکا، لەسەر ئەم شێوەیە دانەیان پێدەگرێتەوە دەیان خاتە ناو کیسەیەکەوەو دەست دەبا یەکێکیان بەبێ تەعیین دەردەهێنا وکاری پێدەکا ئەگەر (بیکە)دەرچوو کارەکە دەکا، ئەگەر(مەیکە) دەرچوو نایکا، ئەگەر خاڵیەکە دەرچوو کە هیچی لێ نەنوسراوە دووبارەی دەکاتەوە. هەروا دەفەرموێ: نوسبیش ئەو پەیکەرە بەردینانەیە، کە ئاژەڵیان بۆسەردەبڕن ودەیان پەرستن.

١٦٥٧ م – عن انَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) مَا كَانَ لَنَا خَمْرٌ غَيْرُ فَضيخِكُمْ هَذا الَّذي تُسَمُّونَهُ الْفَضيخَ فَانِّي لَقَائِمٌ اسْقِي ابا طلْحَةَ وَفُلانًا وَفُلانًا اذ جَاء رَجُلٌ فَقَالَ وَهَلْ بَلَغَكُمْ الْخَبَرُ؟ فَقَالُوا: وَمَا ذاكَ؟ قَالَ: حُرِّمَتْ الْخَمْرُ قَالُوا: اهْرِقْ هَذهِ الْقِلالَ يَا انَسُ قَالَ: فَمَا سَالُوا عَنْهَا وَلا رَاجَعُوهَا بَعْدَ خَبَرِ الرَّجُلِ). (الحديث: ٤٦١٧– طرفه في: ٢٤٦٤– ٤٦٢٠– ٥٥٨٠– ٥٥٨٢– ٥٥٨٣– ٥٥٨٤– ٥٦٠٠– ٥٦٢٢– ٧٢٥٣ )[٤١٤].

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران مەی وبادەی ئێمە تەنیائەوجۆرە مەی وبادەیەبوو، کەئێوەناوتان ناوە فەضیخ کەجۆرە عەرەقێکە لەبەر سیلەی خورما دروست دەکرێت، جاجارێك وەستابووم خەریك بووم بادەم دەدا بەئەبو تەڵحە ی زڕبابم وفیسارە کەس و فیسارە کەس، لەم کاتەدا لەناکاو پیاوێك هات گوتی: ئەرێ هەواڵەکەتان پێ نەگەیشتووە؟ گوتیان کام هەواڵ؟ پیاوەکە فەرمووی : مەی قەدەغەکراوە واتە ئارەق حەرام کراوە.ئیتر بەبێ چەن وچوون ولێکۆڵینەوە یەکسەر بەمنیان گوت : ئەی ئەنەس !ئەم کوپە مەیانە بڕژێنە، وەمنیش هەموویانم ڕژاند.

٤١٤- اخرجهُ مسلم في الاشربة، باب: تحريم الخمر وبيان انها تكون من عصير العنب،..رقم: ١٩٨٠.

**ڕوونكردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە وچەند فەرموودەیەكی تری لەم بابەتە كە لەپێشەوە ڕەت بوون، بەلگەیەكی ڕۆشنی ئەوەن كەكار بەهەواڵێتاكەكەس دەكرێت كە لەشەرعا ناسراوە بەعەمەل بەخەبەری واحید. بڕوانە : ژمارە : ٣٨ تەجرید = ٤٤٠فەتح = بەرگی ١ل —٥٧+ژمارە: ٢٥٢ت = ٣٩٩ف = بەرگی/١ ل/٢٦٣ + تاج/٦ ز/٦ ل/١٣٩ ف/١٥، ١٦، + فیقهی ئاسان بەرگی سێیەم ل/٨٢٣ ز/٣٢٩.

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ لا تَسْألُوا عَنْ اشْيَاء انْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ ٥/١٠١

**(واتە : ئەی موسڵمانینە! پرسیاری وا لەپێغەمبەری خۆتان مەكەن كەبەدەردتان نەخواو، لەهەمان كاتا ئەركی سەرشانتان گرانتر بكات).**

١٦٥٨- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: خَطبَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ) خُطبَةً مَا سَمِعْتُ مِثلَهَا قَـط قَـالَ: (لَـوْ تَعْلَمُـونَ مَـا اعْلَـمُ لَـضحِكْتُمْ قَلِيلا وَلَبَكَيْتُمْ كَثيرًا قَالَ فَغَطى اصْحَابُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) وُجُـوهَهُمْ لَهُمْ خَنِينٌ فَقَالَ رَجُلٌ: مَنْ ابِي؟ قَالَ: فُلانٌ فَنَزَلَتْ هَذهِ الايَة: ﴿لا تَسْألُوا عَنْ اشْيَاء انْ تُبْـدَ لَكُـمْ تَـسُؤْكُمْ ﴾ رَوَاهُ النَّـضرُ وَرَوْحُ بْـنُ عُبَـادَةَ عَـنْ شُـعْبَةَ. ( الحـديث ٤٦٢١- اطرافـه فـي: ٩٣- ٥٤٠- ٧٤٩- ٦٣٦٢- ٦٤٦٨-٦٤٨٦- ٧٠٨٩- ٧٠٩٠- ٧٠٩١- ٧٢٩٤- ٧٢٩٥ )[٤١٥]

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) وتارێكی دا، هەرگیز وتاری وادلگیرو دڵ هەژێنم نەبیستووە، فەرمووی: (ئەوەی كەمن دەیزانم، ئەگەر ئێوە دەتان زانی، كەم پێ دەكەنین وزۆر دەگریان، ) فەرمووی: جا یارانی پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر پێغەمبەرو

(٤١٥) اخرجهُ مسلم في الفضائل، باب: توقيره (صلى الله عليه وسلم) و ترك اكثار سؤاله .. رقم: ٢٣٥٩ .

رەزای خوا لەسەر لەیارانی) ڕووی خۆیان داپۆشی و دایان لەپڕمەی گریان، پیاوێك عەرزی کرد : ئەی پێغەمبەر ی خودا ! باوکی من کێ یە؟ فەرمووی: (فیسارە کەسە )جا ئەم ئایەتەی هاتە خوارەوە: ﴿لا تَسْالُوا عَنْ اشْيَاء انْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾. (تاج/٦ ل/١٤١- ژمارە:١٧، ١٩ )+ (ریاض/٢ ز/٥٤ ژ: ٢/٤٤٧ ل/٣٣) .

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم پیاوە بۆیە ئەم پرسیارەی لەپێغەمبەر کرد، چونکە خەڵك بەناڕەوا تانەی زۆڵیان لێ دەدا، بەڵام پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) بەدرۆی خستنەوەو فەرمووی تۆ کوڕی باوکی خۆتی.

١٦٥٩- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (كَانَ قَوْمٌ يَسْالُونَ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتِهْزَاء فَيَقُولُ الرَّجُلُ: (مَنْ ابِي؟ وَيَقُولُ الرَّجُلُ تَضلُّ نَاقَتُهُ: ايْنَ نَاقَتِي؟ فَانْزَلَ اللّهُ فِيهِمْ هَذهِ الايَة: ﴿يَا ايُّهَا الَّذينَ امَنُوا لا تَسْالُوا عَنْ اشْيَاء انْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾حَتَّى فَرَغَ مِنْ الايَة كُلِّهَا). (الحديث٤٦٢٢)[٤١٦].

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: هەندێ کەس (بۆ گاڵتە پێکردن و تەڵفیسی) پرسیاریان لە حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) دەکرد: پیاو هەبوو دەیگوت : کێ باوکمە؟ پیاوی وا هەبوو کاتێ وشترەکەی بزر دەبوو دەیگوت : وشترە کەم لەکوێ یە؟ جا خودای گەورە بۆ سەرزەنشتی ئەمانە ئەم ئایەتەی بەتەواوی ناردە خوارەوە: ﴿يَا ايُّهَا الَّذينَ امَنُوا لا تَسْالُوا عَنْ اشْيَاء انْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾. (تاج/٦ ل/١٤١).

---

(٤١٦) وهذا الحديث من افراده (عيني /١٨ص ٢١٣) -المترجم .

## تەفسیری سوورەتی ئەنعام (تفسير سورة الانعام)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى انْ يَبْعَث عَلَيْكُمْ عَـذابا مِـنْ فَـوْقِكُمْ اوْ مِـنْ تَحْـتِ ارْجُلِكُمْ﴾٦/٦٥

(واتە: ئەی موحەممەد! بفەرموو: خودا دەتوانێ سزا لەڕاسەرتانەوە، یا لە ژێر پێتانەوە بنێرێ بۆتان).

١٦٦٠- عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) يَقُولُ: لَمَّا نَزَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى انْ يَبْعَث عَلَيْكُمْ عَذابا مِنْ فَوْقِكُمْ﴾ قَالَ: اعُوذ بِوَجْهِكَ اوْ مِنْ تَحْتِ ارْجُلِكُمْ قَالَ : اعُوذ بِوَجْهِكَ فَلَمَّا نَزَلَتْ اوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذيقَ بَعْضكُمْ باسَ بَعْض قَالَ هَاتَان اهْوَنُ اوْ ايْسَرُ. (الحديث: ٤٦٢٨ – طرفاه فی : ٧٣١٣- ٧٤٠٦)[٤١٧].

جابیر(رەزای خودای لێ بێ) کاتێ ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى انْ يَبْعَث عَلَيْكُمْ عَذابا مِنْ فَوْقِكُمْ﴾ تۆ ئەی خۆشەویست ! پێیان بفەرموو : هەرخودایە کە توانایە لەژوور سەرتانەوە سزاتان بەسەردا ببارێنێ، وەك : هەورە بروسکەو تۆف وتەرزە وبەردەبارانی ئاسمانی وبۆمباو شتی تری لەم بابەتە، لێرەدا حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( پەنا دەگرم بەزاتی تۆ ئەی خودایە !) وە لەوێدا کە دەفەرموێ: ﴿اوْ مِنْ تَحْتِ ارْجُلِكُمْ﴾ یاخود ئازارو سزاتان بۆ بنێرێ لە ژێر پێتانەوە، وەك بورکان وبومەلەرزە ولوغم ومین ومارو دووپشك و شتی تری وا.

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرموویەوە : (پەنا دەگرم بەزاتی تۆ لە شتی وا ) وە لەوێدا کەئایەتە کە دەفەرموێ :﴿ اوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذيقَ

---

(٤١٧) لم يوافقهُ مسلم على تخريج حديث جابر: قل هو القادر. فتح خاتمة كتاب التفسير ج/٩ ص ٧٧٢ طبعة جديدة – المترجم .

بَعْضَكُمْ بَاسَ بَعْضٍ﴾ ٦٥/٦. یاخود دەستە دەستەو تاقمە تاقمەو تێکەڵ وپێکەڵ وجیاجیا تان بکاو تێکتان بەربداتن لەیەکتری، وەك ئێستای عێراق، هەرکامتان چەقۆ لەوی ترتان بسوێ، تالاوی دووبەرەکی وخۆخوری وخۆ خۆیی لە دەستی یەکتر بچێژن، وەك ئێستای کوردەکان لەبەشی ئازادی کوردستان دا.لێرەدا حەزرەت فەرمووی: (هەرچۆنێ بێ ئەمەیان سووکترە ) یافەرمووی: (بەهەرحاڵ ئەمەیان ئاسانترە ). (تاج/٦ ل/١٥٢ ژمارە:٢ ز/٧- سوورەتی ئەنعام ).

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ اولَئِكَ الَّذينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمْ اقْتَدِهِ﴾٦/٩٠

١٦٦١– عن ابْنَ عَباسٍ رضي الله عنهما: انَّه سئلَ افِي (ص) سَجْدَةٌ؟ فَقَالَ: نَعَمْ ثمَّ تَلا ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ اسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ﴾ الَى قَوْلِهِ ﴿فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾ ثمَّ قَالَ: نَبِيُّكُمْ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِمَّنْ امِرَ انْ يَقْتَدِيَ بِهِمْ ( الحديث ٤٦٣٢– اطرافه في: ٣٤٢١– ٤٨٠٦– ٤٨٠٧ )

پرسیار کرا لە ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) ئایا لە سوورەتی (صاد)دا سووجدەی تیلاوەت هەیە، کەبە کوردی پێی دەگوترێ : کوڕنوشی قورئان خوێندن؟ فەرمووی: بەڵێ هەیە. لەوێدا کە دەفەرموێ: ﴿..فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعًا وَانَابَ﴾ ص/٣٨- ٢٤- ئەوجا بۆ پشتیوانی فەتواکەی خۆی ئەم حەوت ئایەتەی خوێندەوە، کە لەئایەتی هەشتاو چوارەوە دەست پێدەکات کە بە: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ اسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ﴾ دەست پادەکات وە بەئایەتی نەوەد لە سورەتی ئەنعام، کۆتاییان دێ، کەبەمە دەست پێ دەکا: ﴿ اولَئِكَ الَّذينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمْ اقْتَدِهِ﴾.

لەپاشا ئیبنوعەبباس فەرمووی:(دەی حەزرەتی موحەممەدیش کە پێغەمبەری ئێوەیە، یەکێکە لەو کەسانەی کە فەرمانیان پێکراوە کە

پەیڕەوی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانە بکا، کەیەکێکیان حەزرەتی داوودە (علیهم الصلاه و السلام). (تاج/٦ ل/١٥٨ ژمارە: ٧ ).

**ڕوونکردنەوە:**

بەپێی ئایەتەکەی سوورەتی صاد، چەسپاوە کەحەزرەتی داوود کوڕنوشی بردووە، وە بە پێی ئایەتەکانی سوورەتی ئەنعامیش فەرمان بە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) کراوە کە پەیڕەوی حەزرەتی داوودبکا، کەواتە : سوجدەی تیلاوەت لەم شوێنەدا سوونەتی پێغەمبەرە، ئەوەیشی کەسوونەت بێ بۆپێغەمبەر ومەودای پەیڕەوی هەبێ، بۆ ئوممەتیشی سوننەتە، ئەمەیش لەسەر ئەوبنەمایەیە (کەشەرعی دینەکانی پێش ئێمە، کەلەشەرعی ئێمەدا بەچاك وخراپ، باسی نەکرابێ دروستە پەیڕەوی لێ بکرێ).

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿وَلاتَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَاظَهَرَ مِنْهَا وَمَابَطَنَ﴾٦/١٥١

(واتە: ئەی موسڵمانەکان بەهیچ شێوەیەك نزیکی ئیش وکاری شەرم وئاوەری حەیابەر مەکەون، چ بەئاشکرا، چ بەنهێنی)

١٦٦٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ عَنْ ابِي وَائِلٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قُلْتُ: انْتَ سَمِعْتَ هَذا مِنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: نَعَمْ وَرَفَعَهُ قَالَ: لا احَدَ اغْيَرُ مِنْ اللَّهِ فَلِذلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلا احَدَ احَبُّ الَيْهِ الْمِدْحَةُ مِنْ اللَّهِ فَلِذلِكَ مَدَحَ نَفْسَهُ. (الحديث ٤٦٣٤- اطرافه في: ٥٢٢٠- ٤٦٣٧- ٧٤٠٣)[٤١٨].

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (کەس وەك خودا بەتەنگەوە نییەو، لەسەر ناڕەوایی

(٤١٨) اخرجهُ مسلم في التوبة، باب: غيرة الله تعالى و تحريم الفواحش ، رقم: ٢٧٦٠ .

دەمار نایگرێ وهەڵناداتێ، وە هەرلەبەر ئەوەیە کەهەرچی نەشاوناڕەوابێ حەرامی کردووە، ئیتر چ بەئاشکرا بێو، چ نهێنی و شاراوەبێ، وەکەسیش وەك خودا وەسپی جوان ومەتحی پێخۆش نییە، هەرلەبەر ئەوەیە کەخودا وەسف وستایشی خۆی کردووە).

## تەفسیری سوورەتی ئەعراف (تفسير سورة الاعراف)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ خُذ الْعَفْوَ وَامُرْ بالْعُرْفِ وَاعْرِض عَنْ الْجَاهِلِينَ﴾ ١٩٩/٧.

١٦٦٣– عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ امَرَ اللّٰهُ نَبِيَهُ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْ يَاخُذ الْعَفْوَ مِنْ اخلاقِ النَّاسِ. ( الحديث ٤٦٤٤– طرافه في: ٤٦٤٣ )[(٤١٩)].

عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: بەپێی ئایەتی: ﴿خُذ الْعَفْوَ وَامُرْ بالْعُرْفِ﴾ خودای گەورە فەرمانی کردووە بە موحەممەدی پێغەمبەری خۆی (دروودی خودای لێ بێ) کەئەوەی بێئەرك وئاسان وخۆش وباشە لەڕەفتارو خووی مەردووم، وەری بگرێوقەبوڵی بکاو چاوپۆشی یان لێبکاو، پەڵپی ڕەفتارو خووی زۆر گرانیان لێ نەگرێ).

## تەفسیری سوورەتی ئەنفال (تفسير سورة الانفال)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلّٰهِ﴾ ٣٩/٨

---

(٤١٩) لم يوافقهُ مسلم على تخريج حديث ابن الزبير في تفسير قوله تعالى ﴿خذالعفو وامر بالعرف﴾ (فتح /٩ ص٧٧٢) — المترجم .

١٦٦٤- عن ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) انَهُ قيلَ لَهُ: كَيْفَ تَرَى فِي قِتَالِ الْفِتْنَةِ؟ فَقَالَ: وَهَلْ تَدْرِي مَا الْفِتْنَةُ؟ كَانَ مُحَمَّدٌ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يُقَاتِلُ الْمُشْرِكِينَ وَكَانَ الدُّخُولُ عَلَيْهِمْ فِتْنَةً وَلَيْسَ كَقِتَالِكُمْ عَلَى الْمُلْكِ. (الحديث ٤٦٥١- اطرافه في: ٣١٣٠- ٣٦٩٨- ٣٧٠٤- ٤٠٦٦- ٤٥١٣- ٤٥١٤- ٤٦٥٠- ٧٠٩٥).

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: لە من پرسیار کرا: ڕات چییە سەبارەت بەشەڕی ئاژاوە، کە لەم ئایەتەدا باسی لێ وەکراوە: (شەڕیان لەگەڵ بکەن هەتا ئاژاوە ڕونەدات؟ ). ئیبنو عومەریش (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جا تۆ دەزانی مەبەست لە کوشتاری ئاژاوە لەم ئایەتەدا چییە؟ جاران پێغەمبەری خودا(دروودی خودای لێ بێ) ناچاردەبوو شەڕ لەگەڵ هاوبەش پەیداکەراندا بکا، چوون بۆ ناویان ئاژاوەبوو، یادەیان کوشتی، یا ئەشکەنجەیان دەدای، وەك ئەم کوشت و بڕەی ئێستای ئێوە نییە، کە بۆ شەڕە کورسی و پاشایەتییە! ).

## تەفسیری سوورەتی بەرائەت، سوورەتی تەوبەیشی پێ دەکوترێ
## تفسير سورة براءة (التوبة)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿وَاخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطوا عَمَلا صَالِحًا وَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللّٰهُ انْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ انَّ اللّٰهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ٩/ ١٠٢

(واتە: کەسانێکی تریش هەن، ئەوانیش لەئێوەن وموسڵمانن، بەڵام توشی تاوان وگوناه بوون، تەنانەت خۆیشیان پێ لەوەدەنێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا، رابووردویەکی باش وپەرێزێکی پاکیان هەیە. واتە: کردەوەی چاك و کردەوەی خراپیان هەیە و، لەهەردوولا تێیان گوشیوە، جائەمانەو مانەندی

ئەمانەهیوا وایە کە خودا تەوبەو پەشیمانئیان لێ گیرا بکا، چونکە بەڕاستی تا تۆ بڵێی لە ڕادەبەدەر خودا تاوان بەخش ومیهرەبانە).

١٦٦٥- عن سَمُرَةُ بْنُ جُنْدَبٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَنَا: (اتَانِي اللَّيْلَةَ اتِيَانِ فَابْتَعَثانِي فَانْتَهَيا بي الَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذهَبٍ وَلَبِنِ فِضةٍ فَتَلَقَّانَا رِجَالٌ: شَطرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَاحْسَنِ مَا انْتَ رَاء، وَشَطرٌ كَاقْبَحِ مَا انْتَ رَاء، قَالا لَهُمْ: اذهَبُوا فَقَعُوا فِي ذلِكَ النَّهْرِ فَوَقَعُوا فِيهِ ثمَّ رَجَعُوا الَيْنا قَدْ ذهَبَ ذلِكَ السُّوء عَنْهُمْ فَصَارُوا فِي احْسَنِ صُورَةٍ قَالا لِي: هَذهِ جَنَّةُ عَدْنٍ وَهَذاكَ مَنْزِلُكَ قَالا: امَّا الْقَوْمُ الَّذينَ كَانُوا شَطرٌ مِنْهُمْ حَسَنٌ وَشَطرٌ مِنْهُمْ قَبِيحٌ فَانَّهُمْ خَلَطوا عَمَلا صَالِحًا وَاخَرَ سَيِّئًا تَجَاوَزَ اللّٰهُ عَنْهُمْ). (الحديث ٤٦٧٤- طرافه في: ٤٥٥ تەجريد = ٨٤٥ فتح البارى = بەرطى يەكەم لاثەرة : ٤٣٢)[420].

سەموورەی کوڕی جونـدوب (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: (پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم شەو دووفریشتە هاتن بۆلام، لە خەوهەڵیان ساندم، وبردمیان لەگەڵ خۆیاندا ڕۆیشتن هەتا گەیشتینە شارێ، دروست کرابوو، خشتێکی لەزێڕ بوو خشتێکی لەزیو، پیاوگەلێکمان توش بوون نیوەی لەشیان تا بڵێیت جوان بوو، ئەونیوەکەی تریان تابڵێیت ناشیرین بوو، دوو فریشتەکەی کەلەگەڵ من بوون پێیان گوتن : بڕۆن خۆتان بخەنە ناو ئەوچەمەوە، ئەوانیش چوونە ناو چەمەکە وەو، لەپاشا هاتنەوە بۆلای ئێمە، یەك دەنك چییە ناشیرینی یەکەیان پێوە نەمابوو، وەتا بڵێی جوان بووبون، گوتیان پێم : ئەمە بەهەشتی ئێجگاری (جەننەتولعەدن)ە، ئا ئەوەش جێگای تۆیە، ئەو پیاوانەش کە نیوەیان جوان ونیوەیان ناشیرین بوو، ئەوە بۆیە وابوون چونکە کاری باش وکاری خراپیان ئاوێتە کردبوو، وەلە کرداری چاك

(٤٢٠) راجع، رقم: ٤٥٥ تجريد – المترجم .

ولــەكرداری خــراپ تێیــان گوشــی بــوو، بــەلام لەئەنجامــدا خــودا چاوپۆشــی لێکردن ). (تاج/٦ ل/٢٠٩ ز/١٠ - سوورەتی تەوبە ژ: ١٧).

## تەفسیری سوورەتی هوود (تفسير سورة هود)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ﴾

(واتە: وەبارەگا (عەرش)ی خودا لەسەر ئاوبوو)

١٦٦٦- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عنـهُ) انَّ رَسُـولَ اللّٰـهِ (صَـلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ انْفِقْ انْفِقْ عَلَيْكَ وَقَالَ يَدُ اللّٰهِ مَلاى لا تَغِيضهَا نَفقَـةٌ سَحَّاء اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَقَالَ ارَايْتُمْ مَا انْفَقَ مُنْذ خَلَقَ السَّمَاء وَالارْض فَانَّهُ لَمْ يَغِض مَا فِي يَدِهِ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاء وَبِيَدِهِ الْمِيزَانُ يَخْفِض وَيَرْفَعُ. ( الحديث ٤٦٨٤- اطرافه في: ٥٣٥٢- ٧٤١١- ٧٤١٩- ٧٤٩٦ ) [٤٢١].

ئـەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لێ بێ) فـەرمووی: (خـودای بالادەسـت وخـاوەن شـکۆ، لەفەرمودەیـەکی پـاك وپـیرۆزدا دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! ماڵ بەخت بکە، خێرزۆر بکە، تۆڵت بۆدەکەمەوە، تۆچـاوت لەبەنـدەکانی مـن بـێ، منـیش چـاوی خێـرم لـەتۆدەبێ) گـوتی : فەرمووشی : دەسـتی ڕاسـتی خـودا هەمیـشە پـڕەو سـەر ڕێـژ دەکا، خەزینـەو گەنجینـەی خـودا هەمیـشە پـڕە لـەخێرو بێـر، ئـەوەتا وابـە بەرچـاوەوە و هەمەدەم، شـەووڕۆژ خـودای گـەورە، بـە درێـژایی سـاڵ، لێـی دەبەخـشێ، نـازو بەهرە دەڕێژی بەسەر دروست کراوەکانیدا، ڕزق ورۆزی تێرو تەسـەلیان دەدا، بەلام هیچ کەم ناکا، خۆباش دەزانـن ئـەوەتی خـودا ئاسمانـەکان وزەمینـەکانی دروست کردووە، چـەندەی بەخـشیوەتەوە، دیارەکـە زۆر زۆری بەخـشیوەتەوە، دەسـا لەگـەڵ ئەوەشـدا، خەزینـەو گەنجینـەی خـودا، یـەك تاقـە دەنـك چییە کەمی نەکردووە، وەوەك خۆی ماوە!).

---

(٤٢١) اخرجهٔ مسلم في الزكاة، باب: الحث على النفقة و تبشير المنفق بالخلف ، رقم: ٩٩٣ .

فـەرمووی: ( وه لـەپێش دروسـت كردنـی دروسـت كراوەكـان دا، تـەخت وبارەگا(عەرش )ی خودا لەسەر ئاوبوو تەرازوویش وا لـە دەسـتەكەی تريـدا و بە ئارەزووی خۆی تـاوتووی پـێ دەكاو، سـەر بـەرەوژوورو سـەربەرەو خـواری پێدەكا، لەنگەری دادپەروەری پێ ڕادەگرێ بەپێی دانایی خـۆی كـە لـە ئێمـە پەنهانە، رۆزيی كەسێ زياد دەكاو ڕۆزيی كەسێكیتر كەم دەكات ئـەم بـەرزەوە دەكاو ئەوی ترنەوێ، وەهەروەها ) (تاج/٦ ز/٢٣ ل/٦٠ ژ/٣).

**ڕوونكردنەوە:**

ئەم جۆرە فەرموودانە كـەمێ پێچیدەن، وشـەو ڕسـتەو قسەكان، هـەموو بەڕەمزن، كە بەكار دەهێنرێن بۆ دروست كراوان مەبەستێكی تايبەتی زانـراو وئاساييان هەيە، هەموو كەسێ بەپێی مەدلولی زمانی خۆی تێیدەگات، بەلام كـاتێ بـەكاردەهێنرێن بۆخـودا، واتاكـەيان تـەواو دەگوڕدرێـت، وەگـەلێك جـار لـەكاتی وەرگێـڕان وتەرجەمـەدا هەڵەی گـەورە گـەورەيان تێدەكـەوێ، بـەلام كـورت وپوخـت : ئێمـە دەزانـين كـە خودايەكـەو نـابێ بـەدوو، خودايـەكی بێچوونە و لەڕەنگی نييە، وە ئەم جۆرە وشەو ڕستانە واتای تايبـەتی شياوی خۆيان هەيە، كە بگونجێن لەگەڵ خودادا ).

**فەرمايشتی خودای گەورە:**

﴿وَكَـذلِكَ اخْـذ رَبِّـكَ اذا اخَـذ الْقُـرَى وَهِـيَ ظالِمَـةٌ انَّ اخْـذهُ الِـيمٌ شَدِيدٌ﴾ ١٠٢/١١

١٦٦٧- عَنْ ابِي مُوسَى(رَضيَ اللّٰهُ عنهُ)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): (انَّ اللّٰهَ لَيُمْلِي لِلظالِمِ حَتَّى اذا اخَذهُ لَمْ يُفْلِتْهُ قَالَ ثمَّ قَرَا ﴿وَكَـذلِكَ اخْـذ رَبِّكَ اذا اخَذ الْقُرَى وَهِيَ ظالِمَةٌ انَّ اخْذهُ الِيمٌ شَدِيدٌ﴾. ( الحديث ٤٦٨٦ )[٤٢٢].

(٤٢٢) اخرجهُ مسلم في البرّ و الصلة و الاداب ، باب: تحريم الظلم ، رقم: ٢٥٨٣ .

ئەبوموسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (لەڕاستیدا خودا مۆڵەتی زۆردارو ستەم کاردەدات و، تاماوەیەك جڵەوی بۆشل دەکات، هەتابزانێ دەگەڕێتەوە یان نا، لەوانەکانی ڕۆژگار پەندوئامۆژگاری وەردەگرێیان نا، بەلآم کەکاسە پڕبوو، ئەوساقورتمی دەگرێ، ئیتر قوتاری نابێ لەچنگی وتۆڵەی بەرودوای لێ دەسێنێ !).

ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَذلِكَ اخْذ رَبِّكَ اذا اخَذ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ انَّ اخْذهُ الِيمٌ شَدِيدٌ﴾ واتە: ئاوەها پاش مۆلەت وماوەپێدان، خودای تۆ ئەی خۆشەویست ! سزای سەخت دەنێرێو، قارو خەشم وغەزەب دەگرێ، لە خەڵکی ئەو ولات و دێهاتانە کە زۆرو ستەم و ناهەقیو بێ دادی و ناڕەوایی لەناویاندا پەرەدەسێنی و، دەڵێی گوندو شارەکان سەرجەم بوون بەلانە و خانەی زۆرداری وستەمکاری !

وەلێ لەمەکری خودا ئەمین مەبن، چونکە بەڕاستی کاتێ خودای تۆ قورتمی زاڵم دەگرێ، ئێشی پێدەگەیەنێو، بڕسی دەبڕێ!) (ریاج صالحین/١ ل/١٩٥ ژمارە: ٢٠٧- بەرگی یەکەم + تاج/٦ ل/٢٤٢ - ژمارە:٤ ز/١٢- سوورەتی هوود).

## تەفسیری سوورەتی حجر (تفسير سورة الحجر)

**فەرمایشتی خودای کەورە:**

﴿الا مَنْ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَاتْبَعَهُ شِهَابٌ مُبِينٌ﴾١٥/١٨

١٦٦٨- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اذا قَضى اللَّهُ الامْرَ فِي السَّمَاء ضَرَبَتْ الْمَلائِكَةُ باجْنِحَتِهَا خُضعَانًا لِقَوْلِهِ كَالسِّلْسِلَةِ عَلَى صَفْوَان، فَاذا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا: مَاذا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا: لِلَّذي قَالَ الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ فَيسْمَعُهَا مُسْتَرِقُو السَّمْعِ وَمُسْتَرِقُو السَّمْعِ هَكَذا وَاحِدٌ

فَوْقَ اخَرَ فَرُبَّمَا اذْرَكَ الشِّهَابُ الْمُسْتَمِعَ قَبْلَ انْ يَرْمِيَ بِهَا الَى صَاحِبِهِ فَيُحْرِقَهُ وَرُبَّمَا لَمْ يُدْرِكْهُ حَتَّى يَرْمِيَ بِهَا الَى الَّذي يَلِيهِ الَى الَّذي هُوَ اسْفَلَ مِنْهُ حَتَّى يُلْقُوهَا الَى الارْض فَتُلْقَى عَلَى فَمْ السَّاحِرِ فَيَكْذبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذبَةٍ فَيُصَدَّقُ فَيَقُولُونَ الَمْ يُخْبِرْنَا يَوْمَ كَذا وَكَذا يَكُونُ كَذا وَكَذا فَوَجَدْنَاهُ حَقًّا؟ لِلْكَلِمَةِ الَّتِي سُمِعَتْ مِنَ السَّمَاء. (الحديث ٤٧٠١- اطرافه فى: ٤٨٠٠- ٧٤٨١).

**ئەبوهورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (کاتێ خودای گەورە لەئاسمان کارێکی بڕیارداو، فەرمایشتێکی فەرموو، فریشتەکان لەترسانا باڵ دەدەن بە یەکاو ملکەچ دەکەن بۆ فەرمایشتەکەی خودا، دەنگی ئەو فەرمایشتە وەك دەنگی زڕو هوڕی زنجیر وایە کە بەسەر تاوێرا ڕایبکێشی ئیتر فریشتەکان لەترسی خودا دەشەڵەژێن ودەتۆقێن، کاتێ تۆزێ ترسەکەیان دەنیشێتەوە ودەزانن کەئەوە نییە کەئەوان لێی دەترسان، لەناو خۆیاندا بەیەکتری دەڵێن : پەروەردگارتان چی فەرموو؟**

**فریشتە گەورەو پایە دارەکانیشیان (وەك جوبرائیل ومیکائیل) دەفەرموون بەوانەی کەئەم پرسیارە دەکەن : خودای پایە بەرزو پایە گەورە وتارێکی ڕاست ودروستی فەرموو، ئەمە ئەوپرسیارو وەلامەیە کەخودای گەورە لەقورئاندا لەم ئایەتە دا باسی کردووە، کە دەفەرموێ:** ﴿وَلا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِنْدَهُ الا لِمَنْ اذنَ لَهُ حَتَّى اذا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾٣٤/٢٣. **واتە : تکاکردن لای خودا سودی نییە، مەگەر بۆکەسێ کە خودا خۆێ ڕێگەی تکا کردنی بدا، وەلەو ماوەیەدا ترس وبیم وادایان دەگرێ، کەس سەر کەسی ناپرژێ، هەتا تۆزێ ترسەکەیان دەڕەوێتەوە، دەڵێن : خودای گەورە چی فەرموو؟ دەڵێن : خودای پایە بەرزو پایە گەورە وتارێکی ڕاستو دروستی فەرموو).**

جا وارێدەکەوێ ئەو شەیتانانەی واگوێ هەڵ دەخەن وگوێ لەقسەی فریشتەکان دەگرن، ئەو وتەیەی کەخودا فەرمووبووی لەدەمی فریشتەکانی دەبیستن ودەیفڕێنن و، ئەم دەی گەیەنێ بەوەی ژێر خۆی و، ئەویش دەیگەیەنێ بەشەیتانێکیتر لەخوار خۆیەوە، ئیتر هەروا دەماو دەمی پێدەکەن و ئەم دەیدا بەوو ئەو دەیدا بەم، هەتا شەیتانێك لەهەل و مەرجێکا دەیچپێنێ بەگوێی جادوگەرێك دا، یا دەیخاتە سەردەمی کوڵەنانیو کاهینێ، لەسەر زەوی، ئەویش لە گیرفانی خۆیەوە سەد درۆی تری پێوە دەنێ.

جا بۆیە خەڵك باوەڕ بەقسەی کوڵەنانی و کاهین وجادووباز دەکەن ودەڵێن: ئەوە نەبوو لە فیسارە ڕۆژوو لە فیسارە مانگا، ئەو قسەیەی بۆ کردین وقسەکەشی ڕاست دەرچوو، هۆی باوەڕ پێ کردنەکە ئەو تاقە وشە ڕاستەیە، کە شەیتانەکان لە ئاسمان لەفریشتەکانیان بیستووە وبەم شێوەیە گەیاندوویانە بەجادوو گەرو کاهیین وکوڵەنانییەکان). (تاج/٧ ز/١٧- سوورەتی سەبەء. ل/١٠٥ ف/٢. بڕوانە : بەرگی چوارەم، تاج، ل/٢٣٥ ز/٧٩- باسی کاهینیو کولەنانی ودانەگرتنەوە.تاکۆتایی )+ (بڕوانە : ریاض صالحین/ بەرگی چوارەم زنجیرە/٣٠٣ ل/١٢٢١- هەتادوایی).

## تەفسیری سوورەتی نەحل (تفسير سورة النّحل)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ الَى ارْذَلِ الْعُمُرِ﴾ ١٦/٧٠

١٦٦٩- عَنْ انَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَدْعُو اعُوذ بِكَ مِنْ الْبُخْلِ وَالْكَسَلِ وَارْذَلِ الْعُمُرِ وَعَذابِ الْقَبْرِ وَفِتْنَـةِ الدَّجَّالِ وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ. ( الحديث ٤٧٠٧).

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەمیشە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەم نزایەی دەکرد : (اعوذ بكَ من البُخلِ والكسَل و ارزلِ العمرِ، وعذابِ القبرِ، وفتنه الدّجال وفتنه المحياو الممات)خودایە! پەنادەگرم بەزاتی تۆ لەڕژدی وچرووکیو لە تەممەڵی وتەوەزەلی لەتەمەنی کەسیفی وکەفتەکاری ولەعەزابی قەبرو سزای گۆڕ و لەفیتنەو ئاژاوەو فەرتەنەی جەجاڵ و، لەپشێویو ئاژاوەی ژیان ومردن )، (تاج/٦ ل/٢٦٢ ز/١٧- سوورەتی نەحل) + (تاج/٩ ز/٧١ ل/٢٠٨ ژمارە/٤) + (ریاض صالحین/٣ ل/١٠٢١ ز/٢٤٤ ژمارە/١٤- ١٦ - نامەی زیکر و یادی خودای گەورە).

## سوورەتی بەنی ئیسرائیل کەناوداره بەسوورەتی ئیسرا
## سورة بني اسرائيل(الاسراء)

١٦٧٠- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قالَ: اتِيَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِلَحْمٍ فَرُفِعَ الَيْهِ الذرَاعُ وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ فَنهَشَ مِنْهَا نَهْشَةً ثمَّ قَالَ: (و انَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَهَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذلِكَ؟ يَجْمَعُ اللّٰهُ النَّاسَ الاوَّلِينَ وَالاخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ يُسْمِعُهُمْ الدَّاعِي وَيَنْفُذهُمْ الْبصَرُ وَتَدْنُو الشَّمْسُ فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنْ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لا يُطيقُونَ وَلا يَحْتَمِلُونَ فَيَقُولُ النَّاسُ: الا تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ الا تَنْظرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ الَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ بَعْض النَّاسِ لِبَعْض عَلَيْكُمْ بادَمَ فَيَاتُونَ ادَمَ عَلَيْهِ السَّلام فَيَقُولُونَ لَهُ: انْتَ ابُو الْبَشرِ خَلَقَكَ اللّٰهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ وَامَرَ الْمَلائِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ الا تَرَى الَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ ادَمُ انَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثلَهُ وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثلَهُ وَانَّهُ قَدْ نَهَانِي عَنْ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى نُوحٍ.

فَيَاتُونَ نُوحًا فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ انَّكَ انْتَ اوَّلُ الرُّسُلِ الَى اهْلِ الارْض وَقَدْ سَمَّاكَ اللّٰهُ عَبْدًا شَكُورًا اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: انَّ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثلَهُ وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثلَهُ

وَانَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى ابْرَاهِيمَ فَيَاتُونَ ابْرَاهِيمَ فَيَقُولُونَ يَا ابْرَاهِيمُ انْتَ نَبِيُّ اللّٰهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ اهْلِ الارْض اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: لَهُمْ انَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَانِّي قَدْ كُنْتُ كَذبْتُ ثلاث كَذباتٍ فَذكَرَهُنَّ ابو حَيَانَ فِي الْحَدِيث نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى مُوسَى فَيَاتُونَ مُوسَى فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى انْتَ رَسُولُ اللّٰهِ فَضلَكَ اللّٰهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلامِهِ عَلَى النَّاسِ اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: انَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَانِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ اومَرْ بِقَتْلِهَا نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ.

فَيَاتُونَ عِيسَى فَيَقُولُونَ يَا عِيسَى انْتَ رَسُولُ اللّٰهِ وَكَلِمَتُهُ الْقَاهَا الَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ فَيَقُولُ عِيسَى انَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ قَط وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَلَمْ يَذكُرْ ذنْبا نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى مُحَمَّدٍ فَيَاتُونَ مُحَمَّدًا فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ انْتَ رَسُولُ اللّٰهِ وَخَاتِمُ الانْبِيَاء وَقَدْ غَفَرَ اللّٰهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذنْبِكَ وَمَا تَاخَّرَ اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟

فَانْطَلِقُ فَاتِي تَحْتَ الْعَرْشِ فَاقَعُ سَاجِدًا لِرَبِّي عَزَّ وَجَلَّ ثمَّ يَفْتَحُ اللّٰهُ عَلَيَ مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثنَاء عَلَيْهِ شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى احَدٍ قَبْلِي ثمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَاسَكَ سَلْ تُعْطهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَارْفَعُ رَاسِي فَاقُولُ: امَّتِي يَا رَبِّ امَّتِي يَا رَبِّ امَّتِي يَا رَبِّ فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ادْخِلْ مِنْ امَّتِكَ مَنْ لا حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنْ الْبابِ الايْمَنِ مِنْ ابْوَابِ الْجَنَّةِ وَهُمْ شُرَكَاء النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذلِكَ مِنْ الابْوَابِ ثمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ انَّ مَا بَيْنَ الْمِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَحِمْيَرَ او كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى). (الحديث ٤٧١٢- طرافاه فى: ٣٣٤٠- ٣٣٦١ )[٤٢٣].

---

(٤٢٣) اخرجهُ مسلم في الايمان، باب: ادنى اهل الجنة منزلة فيها، رقم: ١٩٤ .

ئـەبوهورەیرە (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژێـك مەرگـەی گۆشـتیان بۆپێغەمبـەر هێنـا پێغەمبـەر (درودی خودای لـێ بێ) حـەزی لەگۆشـتی دەسـت بـوو لەبـەر ئـەوە دەسـتێکیان بۆدانـا، قـەپالێکی لێ گـرت وفـەرمووی: (لـەدوارِۆژدا، لەقیامەت دا خۆم گەورەو سەروەری بەرەی ئادەمیزادم، ئایادەزانن ئـەوە بـۆ؟ لەرِۆژی دوارِۆژدا خودا پێشینان وپاشینانی مـەردووم، لەیـەك دەشـتی تـەختی پان وبەریندا کۆدەکاتەوە، بانگکـەرێ بانگیـان بکـا، هـەمویان گوێیـان لێیـەتی وەدەنگی یەك کەس بەگوێی هەموویان دەگات، کەسێکیش تەماشایان بکـا (٤٢٤) هەمویان دەبینـێ، خۆریـان لێ نزیـك دەبێتـەوە تـەواو تـەواو تینـی هـەتاو کـە زۆریـان بـۆ دێنـێ، (بـڕ: تـاج/١٠ل- ٣٦٤ ز- ١٢٠ژمـارە: ٣ )+ (تـاج/٦ ل/٨ ز/٣ ژمـارە:٣) مـەردووم دەکەونـە خـەم و پـەژارە وتەنگانەیـەکی واوە، نـە وزەیـان لەبەردا دەمێنێ وەنە بەرگـەی ئـەوەدەگرن، لـەناو خۆیـان بەیـەکتری دەڵێن : ئایا خۆدەبینن لەچ تەنگانەیەك داین، ئادەی بەڵکو کەسێك بدۆزینـەوە لـەلای خودای پەروەردگار تکامان بۆ بکات، لەم سەخڵەتی یە ڕزگارمان بکات.

دەڵێن : بابچین بۆ خزمەت بـاوە ئـادەم، دەچـنە خزمـەتی (سەلامی خوای لـێ بێ) پێی دەڵێن : ئەی ئادەم تۆ باوکی هەموو بەرەی ئـادەمیزادی، خـودا بەدەسـتی خـۆی دروسـتیکردووی، لـەگیانی خـۆیی کـردووە بەبـەرتا، فـەرمانی بەفریشتەکان کرد، کورِنوشیان بـۆ بردیـت، کـەوابوو تـۆ لـەلای خـودا خـاترت هەیـە، لەبـەر ئـەوە لەخزمـەت خـودا تکامـان بـۆ بکـە، ئایانـابینی کەچـیمان بەسەر هاتووە، سەیرناکەی کەتووشی چ ڕۆژێکی ڕەش بـووین، ؟ ئـادەم (سەلامی خوای لـێ بێ) دەفـەرموێ : ئـەمرِۆ پـەروەردگارم ڕقێکـی ئـەوتۆی گرتـووە، نـە لەمەوبەرو نە لەمەودوا، نەڕقی وای هەڵساوەو، نـەڕقی وای هەڵدەسـتێ، کـاتی خۆی خودا قەدەغـەی لێکـردم کـە لـەو درەختـە نـەخۆم، بـەڵام مـن بـە گوێم

---

(٤٢٤) وەك چۆن ئێستا بەهۆی رادیۆو تەلەفزیۆنەوە لەهەموو کون و قوژبنێکی جیهانـدا گوێمان لە دەنگی یەك وتار خوێنە( وەرگێڕ) .

نەكردو بێ فەرمانی ئەوم كرد، من بەتەنیا خەمی خۆمەو بەس (نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم هەقم بەسەر كەسیترەوە نییە) بچنەلای كەسێكی تر: بڕۆنە خزمەتی نووح (بڕوانە : تاج/١ ژ/٦ ژ/٣ ل/٣٨).

ئەوجا دەچنە خزمەتی نووح پێغەمبەر وعەرزی دەكەن : ئەی نووح ! تۆ یەكەم پێغەمبەری ڕەوانە كراوی‌خودای بۆسەر خەڵكی سەر ڕووی زەوی، خودا لەقورئاندا ناوی ناویت بەندەی سوپاس گوزار، وەك دەفەرموێ: ﴿ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ انَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾ ئیسرا- ٣/١٧. كەواتە: لەبەر ئەوە لەخزمەت پەروەردگارتا تكامان بۆ بكە، خۆ دەبینی حاڵمان چەن پەریشان وپەشێوە و چیمان بەسەردا هاتووە؟ نووحیش پێیان دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم ڕقێكی سەختی وای هەڵساوە، نە لەمەو بەرو نە لەمەودوا، نەڕقی وای هەڵساوەو، نەڕقی وای هەڵدەستێ، وەكی تریش من خودا نزایەكی گیرابووی پێ خەلات كردم، بەڵام لە جیهاندا ئەونزایەمم لەگەڵەكەی خۆم كرد ئیتر ڕووی ئەوەم نەماوە: (نەفسی، نەفسی، نەفسی= خۆم، خۆم، خۆم) بچن بۆخزمەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) دەچنە خزمەتی ئەویش دەڵێن : ئەی ئیبراهیم ! تۆ هەم پێغەمبەر ی خودایت وهەم خەلیلوڵلای، واتە : لەخەڵكی سەرڕووی زەوی تەنها تۆی هەڵبژاردووە وكردوویتی بەدۆستی ئازیزی خۆی، لەخزمەت خودای پەروەردگارتا تكامان بۆبكە، خۆ دەبینیت كەچۆن تووشی ئەم هەمكە خەم وناخۆشی یە بووین، سا بەشكوو بەزەویبێتەوە پیاماندا ولەم تەنگانەیە سەر فەرازمان بفەرمووێ، دەفەرموێ : ئەمڕۆ پەروەردگارم ڕقی تەواوی هەڵساوە وەبۆ عوزر خوایی، باسی درۆكانی خۆی دەكات كەبریتین لە سێ درۆ، كە ئەبوحەییان، كە ئەو ڕاوییەی ئەم فەرموودەیە لەئەبوزورعەوە دەگێڕێتەوە..

كە ئەم سێ شتەن : ﴿انّي سقيم﴾: من نەخۆشم، ﴿بلْ فعلَهُ كبيرُهمْ﴾: من نەم كردووە گەورەی بتەكان كردوویەتی، (انّها اختي) سارا خوشكمە ژنم نیە،

- ئەوجا ئیبراهیمیش دەفەرموێ : نفسی، نفسی، نفسی خەمی خۆمەو بەس سێجار وا دەفەرموێ: بڕۆن بۆلای کەسێکیتر بچن بۆ خزمەتی مووسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ)) دەڵێن : ئەی مووسا !تۆ فرستادەی نازداری یەزدانی پاکی، خودا بەپەیام و نامەو گفتوگۆ لەگەڵتا باوی تۆی داوە بەسەر هەموو مەردووم دا، دەی لەخزمەت خودادا تکامان بۆبکە، خۆ خۆت چاوت لەحاڵمانە کە توشی چ گۆبەندێك بووین، پێیان دەفەرموێ: ئەوە ڕاستەو وەك دەڵێن هەمووی وایە بەڵام ئەمڕۆ تکای وا گەورەو گشتی بەهەموو کەس ناکرێ، چونکە ئەمڕۆ خودا ڕقێکی وەهای هەڵساوە، سەرە ڕای ئەوەیش، من کاتی خۆی پیاوێکم لەخۆمەوە کوشت، خودا فەرمانی پێم نەکردبوو کەبیکوژم، ئاوا عوزر خوایی دەکاو دەفەرموێ: نەفسی، نەفسی، نەفسی، من تەنها مشووری خۆم دەخۆم وسێجار ئەمە دەفەرموێ. بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، بڕۆن بۆخزمەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)! دەچن عەرزیدەکەن : ئەی عیسا! تۆ هەم پێغەمبەر ی خودای، هەم بەساوایی لەبێشکەدا قسەو گفتوگۆت لەگەڵ مەردووم دا دەکرد، هەم ئەو وشە پیرۆزە یەزدانییەی کەخودا بۆخۆی گەیاندی بەمەریەمی دایکی تۆ، هەم گیانێکی پاکی لەلایەنی خوداوە، تۆ لەلای خودا گەڵێ بەڕێزی، کەوابوو ئادەی بفەرموو لەخزمەت خودای خۆتا تکامان بۆ بکە ولەم سەخڵە تییە ڕزگارمان بکە، خۆخۆت چاوت لەبارودۆخمانە کەچیمان بەسەرهاتووە، دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم ڕقێکی گەورەی وای هەڵساوە، نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم، بڕۆن بۆلای کەسێکی تر بڕۆن بۆ خزمەت موحەممەد (دروودی خودای لێ بێ) وەعیسا (سەلامی خوای لێ بێ) باسی گوناهی خۆی ناکات، وەك پێغەمبەرەکانی تر باسی گوناهی خۆیان دەکەن.

جا ئەوجا دێن بۆ لای من، دەڵێن : ئەی موحەممەد! تۆ خاوەنی گەڵێ بەهرەی گەورە گەورەی وەك ئەوەی پێغەمبەر ی خودای، دوا هێنەری پێغەمبەر انی و، دوا پێغەمبەری، خودا لەگوناهی بەرو دوات خۆش بووە،

کەواتە: بفەرموو تکاو شەفاعەتمان بۆ بکە لەلای خودای خۆت خۆ خۆت دەبینیت کەواین لەچ گۆبەندێکدا ئیتر منیش دەردەچم وخۆم دەگەیەنمە ژێر تەخت وبارەگای خوداو، لەوێ کڕنوشێکی دوورو درێژی پڕلەستایشی جوان دەبەم بۆخودای خۆم، خودازەینم دەکاتەوە، جۆرە ستایشێکی زۆر نایاب وسوپاسێکی جوان جوانی خۆیم فێر دەکات و دەیخاتە ناو دڵمەوە، کە لەوەوبەر فێری کەسی تری نەکرد بێ، لەپاش دا دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! سەرت هەڵبڕە، داوا بکە هەر چی داوا دەکەی دەی دەم بەتۆ، تکا بکە هەر تکایە بکەی، گەورەبێ یان بچوك گیرای دەکەم..

ئیتر منیش سەرم بەرزەوە دەکەم ودەڵێم : ئەی خودایە! بەزەییت بەگەلی مندا بێتەوە، چەند جارێك وا دەڵێم، جا دەگوترێ : ئەی موحەممەد ! ئەو حەفتاهەزار کەسانەی کە لێپرسینەوەیان لەسەر نیە، لەگەلی خۆت، ئەوانە لە دەرگاکانی لای ڕاستی بەهەشتەوە ببەرەناو بەهەشتەوە، ئومەتەکەشت لە هەموو دەرگاکانیتری بەهەشتیش دا، بۆ چوونە ژورەوە بۆناو بەهەشت، هاوبەشی خەڵکەکەی تریش بن، ئەوجا فەرمووی : (بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، کە دیارە خودای گەورەیە، بەینی دوو لاشیپانەکانی دەرگاکانی بەهەشت، بەقەدبەینی مەککەو حیمیەر دەبێ.یافەرمووی: بەقەد مابەینی مەککەو بوسرا دەبێ ) (تاج/١٠زنجیرە/١٣٠ژمارە:٨ ل/٤٠٤) + (ژمارە:٧١١ تەجرید- بەرگی/٢ ل/١٣٤).

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ عَسَى انْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ ١٦/٧٩

واتە: ئەی موحەممەد! هیوا وایە، کەخودای پەروەردگاری تۆ پلەو پایە پەسەندەکەت پێ خەلات بفەرمووێ). (بڕوانە : تاج/١ ز/١٨١ ل/٤٩١).

١٦٧١- عن ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) يَقُولُ انَّ النَّاسَ يَصِيرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ جُثا كُلُّ امَّةٍ تَتْبَعُ نَبِيَّهَا يَقُولُونَ يَا فُلانُ اشْفَعْ يَا فُلانُ اشْفَعْ حَتَّى تَنْتَهِيَ الشَّفَاعَةُ الَى

النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذلِكَ يَوْمَ يَبْعَثُهُ اللّٰهُ الْمَقَامَ الْمَحْمُودَ ( الحديث ٤٧١٨- طرافه في: ٧١١ تجريد = ١٤٧٥ فةتح =بةرطى دووةم لاثةرِة: ١٣٤).

ئيبنوعومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی دواڕۆژدا، مەردوم کۆمەڵ کۆمەڵ دەبن، هەموو نەتەوەیەك شوێن پێغەمبەر ی خۆیان دەکەون، دەڵێن : ئەی فیسارە کەس! ئادەی بفەرموو : تکا بکە. ئەی ئەو فیسارە کەس تکا بکە. هەتا بەرەبەرە تکاو تکاکاری لەسەر پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) دەوەستێ، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کەخودای گەورە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەباتە پایە بەرزو پەسەندەکە ) (بڕ:تاج/١ ژ/٦٣ - باسی: کەسێ گوێی لە بانگ بێ چی باشە کەبیکا ل/٢٣٠ ژ/١- ژ/٢).

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا﴾١٧/١١٠

١٦٧٢- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا﴾ قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ كَانَ اذا صَلّٰى باصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْانِ فَاذا سَمِعَهُ الْمُشْرِكُونَ سَبُّوا الْقُرْانَ وَمَنْ انْزَلَهُ وَمَنْ جَاء بِهِ فَقَالَ اللّٰهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ﴿وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ﴾ اىْ بِقِرَاءتِكَ فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ فَيَسُبُّوا الْقُرْانَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا عَنْ اصْحَابِكَ فَلا تُسْمِعُهُمْ وَابْتَغِ بَيْنَ ذلِكَ سَبِيلا). (الحديث ٤٧٢٢- اطرافه في: ٧٤٩٠- ٧٥٢٥- ٧٥٤٧)(٤٢٥).

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) لەبارەی ڕاڤەی ئەم ئایەتەوە، لێیان پرسی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا﴾ ١٧/١١٠ کەمانای وایە : لەقورئان خوێندنی ناونوێژدا نەزۆر دەنگ بەرز بکەرەوە و نەزۆریش نزم، لەوەلامدا فەرمووی: ئەم ئایەتە لە کاتێکی وادا دابەزی، کە

(٤٢٥) اخرجهُ مسلم في الصلاة، باب: التوسط في القراءة في الصلاة الجهرية .. رقم:٤٤٦ .

پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) لەمەککە لەترسی ناموسڵمانە هاوبەش پەیداکەرەکان خۆی دەشاردەوەو، خۆی دەرنەدەخست، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەستوری وابوو کە بەرنوێژی بۆ هاوڕێکانی دەکرد لە کاتی قورئان خوێندن دا دەنگی بەرز دەکردەوە، جا کاتێ کە هاوبەش پەیداکەران دەنگیان دەبیست جنێویان دەدا بەقورئان وبەوکەسەش کە ناردویەتی وبەوکەسەش کەهێناویەتی بۆسەر زەوی (واتە: جنێویان بەخوداو بەقورئان وبەپێغەمبەر وبەجوبرەئیل دەدا) ئیتر خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە وفەرمووی: بەپێغەمبەری خۆی : ﴿ولاتجهَرْ بصَلاتِكَ﴾ واتە : بەدەنگی زۆر بەرز لەناو نوێژدا قورئان مەخوێنە، تا کافرەکان نەیبیستن وجنێو نەدەن بەقورئان، وە ئەوەندەش دەنگ نزم مەکەرەوە کە هاوڕێکانت نەیبیستن وسەریان لێ تێک بچێت، لەشوێن کەوتنی تۆدا، لەناو نوێژەکەدا، بەڵکو بەدەنگا بیخوینە کەلەناوەندی ئەم دووشێوەیەدابێ، نەزۆر بەرزو نەزۆر کزو نزم. ( تاج/٦ زنجیرە/١٨- باسی سوورەتی ئیسراء ژ: ٢٣ )

## تەفسیری سوورەتی کەهف (تفسير سورة الكهف)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿اولَئِكَ الَّذينَ كَفَرُوا بايَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطتْ اعْمَالُهُمْ﴾ ١٨/١٠٥

١٦٧٣- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ انَّهُ لَيَاتِي الرَّجُلُ الْعَظيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لا يَزِنُ عِنْدَ اللّٰهِ جَنَاحَ بَعُوضةٍ وَقَالَ اقْرَءوا انْ شئتمْ ﴿فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾. ( الحديث: ٤٧٢٩)[٤٢٦].

(٤٢٦) اخرجهُ مسلم في صفات المنافقين واحكامهم،كتاب: صفة القيامةو الجنةو النار، رقم: ٢٧٨٥ .

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خودای لـێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) دەفـەرموێ: لـە ڕۆژی قیامەتـدا پیـاوی زل زلی قەڵـەو قەڵـەو دەهێـنن، لـەلای خودا سەنگی باڵی مێشوولەیەك قورس نین، وەبەقەد تۆسقاڵێ دەگەر وقـەدرو ڕێزیان بۆدانانرێ.فەرمووی: ئەم ئایەتـە بخوێنن، بۆپـشتیوانی ئـەم باسـە کـە دەفەرموێ: ﴿فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾ واتـای تـەواوی ئایەتەکـە : ئەوانـە کەسانێکی باباوەڕی ناموسڵمانن، باوەڕیـان بەپـەروەردگاری خۆیـان وبەرنامـە پیرۆزەکانیو بەشـادبوون بـەدیاری پـیرۆزی نییـە، لەبـەر ئـەوە کردەوەکانیـان پوچەڵ بۆتەوە، ئەمانە لەڕۆژی ژینەوەدا نـرخ ودەگـەرو ڕێزدانـانێین بۆیـان.( تاج/٧ ل/١٦ ز/١).

## تەفسیری سوورەتی مەریەم (تفسير سورة مريم)

١٦٧٤– عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُؤْتَى بالْمَوْتِ كَهَيْئَةِ كَبْشٍ امْلَحَ فَيُنَادِي مُنَادٍ يَا اهْلَ الْجَنَّةِ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظرُونَ فَيَقُولُ هَلْ تَعْرِفُونَ هَذا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذا الْمَوْتُ وَكُلُّهُمْ قَدْ رَاهُ ثمَّ يُنَادِي: يَا اهْلَ النَّارِ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظرُونَ فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذا الْمَوْتُ وَكُلُّهُمْ قَدْ رَاهُ فَيُذبَحُ ثمَّ يَقُولُ: يَا اهْلَ الْجَنَّةِ خُلُودٌ فَلا مَوْتَ وَيَا اهْلَ النَّارِ خُلُودٌ فَلا مَوْتَ ثمَّ قَرَا: ﴿وَانْذرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ اذ قُضيَ الامْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ ﴾وَهَؤُلاء فِي غَفْلَةِ اهْلُ الدُّنْيَا﴿وَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾. ( الحديث ٤٧٣٠)(٤٢٧)

ئەبوسەعید (رەزای خودای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (درووی خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: لەڕۆژی قیامەت دا مردن دەهێنن، لەشێوەی بەرانێکی تەودا، دەیهێـنن لەسـەر شوورەکەی نێـوانی بەهەشـت ودۆزەخ، کەپێ‌ی‌دەگوترێ: ئـەعراف ڕای دەگـرن ئەوجا جاڕچی جاڕهەلا دەداو بەدەنگی‌بەرزبانگ دەکا، ئەی خەڵکی‌بەهەشت! ئـەی بەهەشــتییەکان! گــوێ بگــرن ئــەوانیش گــوێ قــولاخ دەکــەن

(٤٢٧) اخرجهُ مسلم في صفة الجنّة و نعيمها واهلها ، النار يدخلها الجبارون، رقم: ٢٨٤٩ .

ودەنوارن،جارچییەکە دەڵێ ئایا ئەمە دەناسن؟ دەڵێن بەڵێ، ئەمەمردنە، هەموویان بەباشی چاویان لێیەتی، ئەنجا جارچییەکە بانگ دەکات : ئەی دانیشتوانی دۆزەخ ! ئەی دۆزەخیەکان ! گوێبگرن، ئەوانیش هەموویان گوێ قولاخ دەکەن ودەنوارن بۆی، جارچییەکە دەڵێ : ئایا ئەمە دەناسن؟ دەڵێن : ئا، ئەمە مردنە، هەر کەسەشیان لەجای خۆیەوە بەباشی چاوی لەبەرانەکەیە، کە نمونەیە بۆ مردن، جا یەحیای کوڕی زەکەریا بەرانەکە پاڵ دەخاو سەری دەبڕێ.

ئەوجا جارکێش بانگەواز هەڵ دەدا : ئەی خەڵکی بەهەشت خۆشی لەئێوە مژدەتان لێبێ ئیتر مردن نەما، هەتا هەتایە لە بەهەشتا بە خۆشی دەژین، وەئەی دۆزەخ نشینەکان، قوڕ بەبانی چاوتان دەرگای ئومێدتان لێداخرا، ئیتر مردن نەما، هەتا هەتایە ئەمە شوێنتانە! جا حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) خوێندیەوە: ﴿ وَانذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ اذ قُضِيَ الامْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ ٣٩/١٩، واتە: وە ئەو کافرانە بترسێنەو هەڕەشەی ئەو ڕۆژەیان لێبکە کەڕۆژی داخ وخەفەت و ئاهـ وهەناسەی سارد هەڵکێشانە، لەو دەمە ناسك و هەڵوێستە ئاڵۆز و شڵۆقەدا کە کار لەکار دەترازێ و ئیش هەمووی دەبڕێتەوە و خەڵکی بەهەشت لەخەڵکی دۆزەخ جوێ دەکرێنەوە، بەڕاستی ئەوانە لەبێ ئاگاییدا دەژین و باوەڕ ناهێنن) تاج/٧ ز/٢ ل/١٩ ژ/٢- سوورەتی مەریەم).

## تەفسیری سوورەتی نوور (تفسير سورة النور)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ ازْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاء الا انفُسهُمْ فَشَهَادَةُ احَدِهِمْ ارْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ انَّهُ لَمِنْ الصَّادِقِينَ﴾ ٦/٢٤

١٦٧٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ عُوَيْمِرًا اتَى عَاصِمَ بْنَ عَدِيٍّ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) وَكَانَ سَيِّدَ بَنِي عَجْلانَ فَقَالَ: (كَيْفَ تَقُولُونَ فِي رَجُلٍ وَجَدَ مَعَ امْرَاتِهِ رَجُلا ايَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ امْ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ سَلْ لِي رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذٰلِكَ فَاتَى عَاصِمٌ النَّبِيَّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَكَرِهَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسَائِلَ فَسَالَهُ عُوَيْمِرٌ: فَقَالَ: انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَرِهَ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا.

قَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللّٰهِ لا انْتَهِي حَتَّى اسْالَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذٰلِكَ فَجَاءَ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ رَجُلٌ وَجَدَ مَعَ امْرَاتِهِ رَجُلا ايَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ امْ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (قَدْ انْزَلَ اللّٰهُ الْقُرْانَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ فَامَرَهُمَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْمُلاعَنَةِ بِمَا سَمَّى اللّٰهُ فِي كِتَابِهِ) فَلاعَنَهَا ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ انْ حَبَسْتُهَا فَقَدْ ظَلَمْتُهَا فَطَلَّقَهَا فَكَانَتْ سُنَّةً لِمَنْ كَانَ بَعْدَهُمَا فِي الْمُتَلاعِنَيْنِ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (انْظُرُوا فَانْ جَاءَتْ بِهِ اسْحَمَ ادْعَجَ الْعَيْنَيْنِ عَظِيمَ الالْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَلا احْسِبُ عُوَيْمِرًا الا قَدْ صَدَقَ عَلَيْهَا وَانْ جَاءَتْ بِهِ احَيْمِرَ كَانَّهُ وَحَرَةٌ فَلا احْسِبُ عُوَيْمِرًا الا قَدْ كَذَبَ عَلَيْهَا فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى النَّعْتِ الَّذي نَعَتَ بِهِ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ تَصْدِيقِ عُوَيْمِرٍ فَكَانَ بَعْدُ يُنْسَبُ الَى امِّهِ). ( الحديث ٤٧٤٥- اطرافه في: ٤٢٣- ٤٧٤٦- ٥٢٥٩- ٥٣٠٨- ٦٨٥٤- ٧١٦٥- ٧١٦٦- ٧٣٠٤)

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عووەیمیری عەجلانی هات بۆلای عاصمی کوڕی عەدی، کەسەرۆك خێلی عەجلان بوو (رەزای خودایان لێ بێ) گوتی : ئێوە چی دەڵێن سەبارەت بە پیاوێ، کەپیاوێك بەسەر ژنەکەیەوە بگرێت، ئەگەر دەی کوژێ ئێوە دەی کوژنەوە، یاچ فوڕێ بەسەر خۆیدا بکا؟ ئەی عاصم! ئەم پرسیارەم لە پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) بۆبکە. عاصم چوو بۆخزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا !

لەم بارەیەوە دەفەرمووی چی؟ پێغەمبەریش (درودی خودای لێ بێ) ئەم جۆرە پرسیارانەی پێناخۆش بوو، بەشورەیی دانا کاتێ عووەیمیر لە عاصمی پرسی لەم بارەیەوە، فەرمووی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) وەلامی نەدایەوە، حەزی لەم پرسیارانە نییە وبەنەنگی دەزانێ، عووەیمیر گوتی : بەخودا کۆل نادەم هەتا لەم بارەیەوە بۆ خۆم لەپێغەمبەر نەپرسم، جا عووەیمیر چوو بۆ خزمەتی و عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا !پیاوا پیاوێك بەسەر ژنەکەیەوە بگرێت چی بکا، ئەگەر دەی کوژێ ئێوە دەی کوژنەوە، ئەگەر نەشی کوژێ ئەی چی بکا؟ پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی : (خودا لەبابەتی تۆو ژنەکەتەوە، قورئانی ناردووەتەخوارەوە.

جا پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمانی بەهەردوکیان دا، لەناو مزگەوت دا، ژن وپیاوەکە شەڕە نەفرینیان کرد، لەسەر ئەو شێوەیەی کە لەقورئاندا باسی کردووە، کە لەئایەتەکەی سەرەتای ئەم فەر موودەیەدا باس کراوە، ئەوجا عووەیمیر گوتی : ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ئەم ژنە لەپاش ئەم ڕووداو وکەین وبەینە قەبولْ بکەمەوە، ئەوە واتای وایە کەمن درۆم کردووە زۆرو ستەمم لێ کردووە، ئیتر تەلاقی دا ئیتر لەدوای ئەو دوو کەسە، جیابوونەوەو تەلاق دان بووبە باو لەنێوان ئەو ژن ومێردانە دا، کەشەڕە نەفرین یان دەکرد، وەلەو کاتەدا ژنەکە سك پڕبوو، دوو گیان بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( سەرنج بدەن ئەگەر ئەم ژنە منالێکی ڕەشکەڵەی چاو ڕەشی تۆخی، سمت گەورەی، قول قەوی بوو، ئەوە بەزەینم عووەیمیر ڕاست دەکا ودرۆی بۆ هەڵنەبەستووە، بەلام ئەگەر منالێکی سوورکەلەی بوو، وەك شەوگەردی سوور کەلە، ئەوە بەزەینم عووەیمیری مێردی بوختانی بۆ کردووە).

جا لەدوایی دا ژنەکە کەمنالەکەی بوو، شێوەی لەو پیاوەی دەکرد کەعووەیمیر دەیگوت گرتوومە بەسەر ژنەکەمەوە، کە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرموو بووی ئەگەر شێوەی منالەکە لەو بچێ عووەیمیر ڕاست دەکا، ئیتر

منالّەکەبەناوی دایکییەوە ناودەبرا. ( تاج/٣ ز/٦٩ ژ/١- ٢- ل/١٦٧- باسی شەڕە نەفرین : لیعان+ تاج/ بەرگی حەوتم/ ل/٤٥ ز/٧ باسی سوورەتی نوور ژ: ١).

فەرمایشتی خودای گەورە:

﴿وَيَدْرَا عَنْهَا الْعَذابَ انْ تَشْهَدَ ارْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللّٰهِ انَّهُ لَمِنْ الْكَاذِبِينَ﴾ ٨/٢٤

١٦٧٦ - عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ هِلالَ بْنَ امَيَةَ قَذفَ امْرَاتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاء فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الْبَيِّنَةَ اوْ حَدٌّ فِي ظهْرِكَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ اذا رَاى احَدُنَا عَلَى امْرَاتِهِ رَجُلا يَنطلِقُ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ فَجَعَلَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: الْبَيِّنَةَ وَالا حَدٌّ فِي ظهْرِكَ فَقَالَ هِلالٌ وَالَّذي بَعَثكَ بِالْحَقِّ انِّي لَصَادِقٌ فَلَيُنْزِلَنَّ اللّٰهُ مَا يُبَرِّئُ ظهْرِي مِنْ الْحَدِّ فَنَزَلَ جِبْرِيلُ وَانْزَلَ عَلَيْهِ وَالَّذينَ يَرْمُونَ ازْوَاجَهُمْ فَقرَا حَتَّى بَلَغَ انْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَارْسَلَ الَيْهَا فَجَاء هِلالٌ فَشَهِدَ وَالنَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ انَّ اللّٰهَ يَعْلَمُ انَّ احَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ ثمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ فَلَمَّا كَانَتْ عِنْدَ الْخَامِسَةِ وَقَّفُوهَا وَقَالُوا: انَّهَا مُوجِبَةٌ.

قَالَ ابْنُ عَباسٍ: فَتَلَكَّاتْ وَنَكَصَتْ حَتَّى ظنَنَّا انَّهَا تَرْجِعُ ثمَّ قَالَتْ لا افْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ فَمَضَتْ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ابْصِرُوهَا فَانْ جَاءَتْ بِهِ اكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ سَابِغَ الالْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاء فَجَاءَتْ بِهِ كَذلِكَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَوْلا مَا مَضى مِنْ كِتَابِ اللّٰهِ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَانٌ. ( الحديث ٤٧٤٧- طرفاه في: ٣٦٧١، ٥٣٠٧).

ئیبنوعەبباس ((رەزای خودایان لێ بێ)) دەفەرموێ: هیلالی کوڕی ئومەییە هاتەلای حەزرەت(دروودی خودای لێ بێ) شەریکی کوڕی سەحمای نا بەقنگی

ژنەکەی خۆیەوە و گوتی : شەریکم بەسەر ژنەکەمەوە گرتووە، حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (شتی وا بەقسەی ڕووت ناسەلمێ، یابەڵگەو شایەت ڕاست دەکەیتەوە، یاداری حەددی بوختیان لە پشتت دەدرێ!) هیلال گوتی : ئەی پێغەمبەر ی خودا! ئەمە چۆن حاڵێکە، کاتێ پیاوێ بەسەر پشتی ژنی خۆمانەوە بگرین، بڕۆین بەشوێن بەڵگەو شایەت دا بگەڕێین!، حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هەر ئەوەیە یاخود بەڵگەو شایەت پەیدا دەکەی یاخود خۆت ئامادە دەکەی بۆداری حەددی بوختان بۆژنی مەرد. هیلالیش گوتی: بەو خودایەی کەئەم ئایینە ڕاست ودروستەی بەتۆدا ناردووە قسەکەم ڕاستە، لەبەرئەوە لێم ڕوونە کەخودا سروش و وەحیت بۆ دەنێرێت و پشتی من ڕزدگار دەکات لەداری حەد، چونکە خودا لەگەڵ، حەقە، ئیتر جوبرەئیل ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) هێنا : ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾ ٢٤/٦.

واتە : ئەومێردانەی کەبەدەمی خۆیان تۆمەتی حیزێتی دەدەن لە ژنەکانیان و، بێجگە لەخۆیان شایەت وبەڵگەی تریان نییە، ئەوە بۆ چەسپاندنی ئەم داوایە، دەبێ خۆی لە لای قازی، لە ناو کۆمەڵێکا چوار جار شایەتی بدات، بڵێ : شایەتی دەدەم بەخودا کەمن ڕاست دەڵێم، لەوەدا کەمن دەیڵێم بەژنەکەم، وەکو داوێن پیسی بێ. وە ئەگەر ویستی حاشا لەباو کێتیی منداڵەکەیشی بکا، ئەوا لە هەموو شایەتی یەکانیدا بڵێ : وە ئەم منداڵەیش لە من نییە، کەلەم ژنەی منە، وەبۆجاری پێنجەم، بڵێ: لەعنەت ونەفرینی خودام لێبێ، ئەگەر درۆ بکەم لەم شایەتی یەم دا.

ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) وازی لەهیلال هێناو، ناردی بەشوێن ژنەکەیداو هیلال هات شایەتی یەکەی خۆی لەسەر شێوەی پێشوو کەلەتەفسیری ئایەتەکەدا ڕابوورد، شایەتی یەکەی خۆی دا. حەزرەت(درودی

خودای لیّ بیّ) ئامۆژگاری کردن‌و فەرمووی: (خودا بۆ خۆی دەزانیّ کەئێوە لایەکتان درۆ دەکەن، دەی کەستان دەیەویّ لەقسەی خۆی پەشیمان بێتەوەو تەوبەی لێبکا، بەڵام ژنەکەش هەڵساو چوار جار شایەتی داوگوتی : شایەتی دەدەم بەخودا بێگومان ئەم مێردەی من درۆزنەو ئەوە بوختان و شەڵتاخ بوو، کردی بەمنا..

بەڵام کە گەیشتە سەر شایەتی جاری پێنجەم، بەریان لێبڕییەوەو ڕایان وەستان وگوتیان : ئەم شایەتی جاری پێنجەمەیان سزاو تۆڵەی خودا مسۆگەر دەکات، ئەگەر دەتەویّ پێڵەڕاستی بنێی، هێشتا ماوەت ماوە، ژنەکەش هەڵوێستێکی کردو ڕاماو چاش بوو، تەنانەت ئێمە زەینمان بۆ ئەوە چوو کەوا پەشیمان دەبێتەوە، لەقسەی خۆی وەدەچێتە ژێر تاوانەکەی، کەچی سەر ئەنجام گوتی : نابم بەمایەی سەرشۆڕی بۆ کەسو کارەکەم و هۆزی خۆم بەدناو ناکەم هەتا هەتایە، وەشایەتی پێنجەمیشی دا.

جا حەزرەت (دروودی خودای لیّ بیّ) فەرمووی: (چاوی تێبڕن، ئەگەر ئەم ژنە منداڵێکی چاو ڕەشی چاو قەویلەی سمت قەوی، سمت پانی، قول قەویلەی بوو، ئەوە وا دەزانم کە مێردەکەی ڕاست دەکاو، ژنەکە درۆ دەکات، ئەومنداڵە هی شەریکی کوڕی سەحمایە. جا کاتیّ کە منالەکە لەدایك بوو، حەزرەت چۆنی فەرمووئاوا بوو، بۆیە کە بەم حاڵەی زانی، فەرمووی : (حوکم و بڕیاری قورئانی و فەرموودەو، نامەی خودا ڕابوورد، وەجێی خۆی گرت وە هەڵ ناوەشێتەوە دەنا ئەگەر لەبەر حوکمی ئایەتی شەڕە نەفرین نەبیّ خۆم دەمزانی کە چیم لەم ژنە دەکرد ) ( تاج/٧ زنجیرە/٧ ل/٤٥ ژ/٢ سوورەتی نوور).

# تەفسیری سوورەتی فورقان (تفسير سورة الفرقان)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ الَى جَهَنَّمَ اوْلَئِكَ شَرٌّ مَكَانًا وَاضَلُّ سَبِيلا﴾ ٢٥/٣٤

١٦٧٧- عن انَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَجُلا قَالَ: يَا نَبِيَ اللّٰهِ كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يومَ القيامة؟ قَالَ: الَيْسَ الَّذي امْشَاهُ عَلَى الرِّجْلَيْنِ فِي الدُّنْيَا قَادِرًا عَلَى انْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قَالَ: قَتَادَةُ بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا)، (الحديث: ٤٦٧٠، طرفه في: ٦٥٢٣)[٤٢٨].

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ)فەرمووی: پیاوێ گوتی : ئەی پێغەمبەری خودا؛ لەرۆژی قیامەت دا بێبڕوا لەسەر ڕوو چۆن حەشر دەکرێت؟ فەرمووی: ( ئەوخودایەی کەلەم جیهانەدا دەتوانێ کارێکی وا بکا کە ئادەمیزاد لەسەر دوو پێ بڕوات ئایا ناتوانێ کە لەو جیهان دا کارێکی وا بکا کە لەسەر ڕوو بڕوا، قەتادە فەرمووی: با، بەگەورەیی خودا دەتوانێ وزیاتریش)، (تاج/٦ ز/٨ ل/٢٧٨ ژ/٢٠- ش ).

# تەفسیری سوورەتی ﴿الم - غُلِبَتِ الرُّوم ﴾ (تفسير سورة- الّم- غلبت الروم)

١٦٧٨- عَنْ مَسْرُوقٍ ( رحمهُ الله تعالى ) قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يُحَدِّث فِي كِنْدَةَ فَقَالَ: يَجِيء دُخَانٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَاخذ باسْمَاعِ الْمُنَافِقِينَ وَابْصَارِهِمْ يَاخُذ الْمُؤْمِنَ كَهَيْئَةِ الزُّكَامِ فَفَزِعْنَا فَاتَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَغَضبَ فَجَلَسَ فَقَالَ:

---

(٤٢٨) اخرجهُ مسلم في صفات المنافقين واحكامهم، باب: يحشر الكافر على وجهه ، رقم: ٢٨٠٦ .

(مَنْ عَلِمَ فَلْيَقُلْ : وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلْ: ( اللّٰهُ اعْلَمُ ) فَانَّ مِنْ الْعِلْمِ انْ يَقُولَ لِمَا لايَعْلَمُ: (لا اعْلَمُ)، فَانَّ اللّٰهَ تعالى قَالَ: لِنَبِيِّهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): ﴿ قُلْ مَا اسْالُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ اجْرٍ وَمَا انَا مِنْ الْمُتَكَلِّفِينَ ﴾ وَانَّ قُرَيْشًا ابْطئُوا عَنْ الاسْلام فَدَعَا عَلَيْهِمْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: (اللّٰهُمَّ اعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ) فَاخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَتَّى هَلَكُوا فِيهَا وَاكَلُوا الْمَيْتَةَ وَالْعِظَامَ وَيَرَى الرَّجُلُ مَا بَيْنَ السَّمَاء وَالارْض كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ فَجَاءهُ ابُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ جِئْتَ تَامُرُنَا بِصِلَةِ الرَّحِمِ وَانَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللّٰهَ فَقَرَا ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَاتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُبِينٍ ﴾ الَى قَوْلِهِ عَائِدُونَ افَيُكْشَفُ عَنْهُمْ عَذابُ الْاخِرَةِ اذا جَاء؟ ثُمَّ عَادُوا الَى كُفْرِهِمْ فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى﴾ يَوْمَ بَدْرٍ وَ لِزَامًا يَوْمَ بَدْرٍ الم غُلِبَتْ الرُّومُ الَى سَيَغْلِبُونَ وَالرُّومُ قَدْ مَضى)، (الحديث ٤٧٧٤- طرفه في: ٥١٨ = تجريد =١٠٠٧ فةتح = بةرطى يةكةم، لاثةرِة: ٤٩٢ + بر: تاج/٧ ل/١٢٠ ز/٢١ ذ/٤ + تاج/٦ ز/١٣- سوورةتى يوسف ل/٢٤٨ ذ:٤) + (رياض الصالحين/٤ ل/١٢١٤ ز/١٣٠١ ذ/٢)[٤٢٩].

مەسروق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەولاتی کیندە پیاوێ خەریك بوو، فەرموودەی دەخوێندەوە، گوتی : لەڕۆژی قیامەت دا دوکەڵێ پەیدا دەبێ، دەدا بەسەر گوێو چاوی ناپاکە(منافق)ەکاندا، لەسەر شێوەی هەلامەتیش موسڵمان دەیگرێ، ئێمەش لەمە شڵەژاین وتۆقین.

جا من خۆم چووم بۆ خزمەتی ئیبنو مەسعود (ڕەزای خودای لێ بێ) کاتێ قسەی کابرام بۆ گێڕایەوە، پاڵ کەوتبوو، تووڕەبوو هەڵسا، فەرمووی: (ئەوەی شتێ دەزانێ، بابیڵێ، ئەوەی کەشتەکە نازانێ بابڵێ خودا خۆی دەیزانێ، چونکە ئەوەیش هەر بەشێکە لە عیلم وزانست، کە کەسێك شتێکی لێبپرسن کە نەیزانی بڵێ نایزانم چونکە خودای گەورە بە پێغەمبەرِ ی خۆی دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا اسْالُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ اجْرٍ وَمَا انَا مِنْ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾ ص/٨٦، واتە :

(٤٢٩) راجع رقم: ٥١٨ = بەرگی/١ ل/٤٩٢ . —المترجم .

ئەی موحەممەد! پێیان بفەرموو : مـن بەسیفەتی ئەوەی کە پێغەمبەرو ڕەوانە کراوی خودام بۆسەر ئێوە، لەم ڕووەوە، لەسەر هەڵسان بەم پەیامە داوای پارەو پووڵ و موزدو کرێتان لێناکەم، وە من لەو کەسانە نیم کە شت بە زۆرەکی وە بە تەکەللوف ئەنجام بدەم) ئەوی تری ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لەم شوێنەدا ڕابوورد).

مەسروق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) تابیعییە پیاوێکی فەرمووده‌زانی گەورەیە، لە ریجالی سەحیحەینە، سوار چاکێکی گەورە بوو، لەپشتی حەزرەتی ئەبوبەکرەوە نوێژی کردووە، فەرموودەی گێڕاوەتەوە لەعومەرو عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو عائیشەو کەسانی تریش، تەمەن درێژ بووە، بەکۆی دەنگ پێشەوایەکی مەزنی متمانەپێکراوی فەرموودە زانەکان بووە، خوشکەزای صەحابی ناودارو شکۆ دار مەعدیکه ریبه بووە، لە پێش وەفاتی پێغەمبەردا ئیسلام بووە، پێیان دەگوت ئەبو عائیشە سەدری ئەوەلی سەحابیەکانی دیوە، عائیشە بە منداڵی کردبووی بە کوڕی خۆی کۆمەڵەی فەرموودە زانەکان فەرموودەی ئەویان گێڕاوەتەوە، مەسروق خۆی دەفەرموێ : عومەر لێی پرسیم : ناوت چییە؟ گوتم : مەسروقی کوڕی ئەجدەع! فەرمووی: ئەجدەع ناوی شەیتانە، تۆ لە ئێستاوە ناوت مەسروقی کوڕی عەبدول ڕەحمانە، ساڵی شەست ودوو، یان شەستو سێی کۆچی عەمری حەقی بەجێ هێناوە.

## تەفسیری سوورەتی تەنزیل - سەجدە
## تفسير سورة التنزيل - السجدة

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا اخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ اعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ١٧/٣٢

١٦٧٩- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: اعْدَدْتُ لِعِبادِي الصَّالِحِينَ مَـا لا عَـيْنٌ رَاتْ وَلا اذنٌ سَـمِعَتْ وَلا خَطرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ ذخْرًا بَلْهَ مَا اطلِعْتُمْ عَلَيْهِ ثمَّ قَرَا فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا اخفِـيَ لَهُـمْ مِنْ قُرَّةِ اعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ. ( الحديث ٤٧٨٠- اطرافه فـى: ٣٢٤٤-٤٧٧٩- ٧٤٩٨ )[٤٣٠].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لە فەرموودەیەکی پیرۆزیـن دا دەفـەرموێ: خـوای گـەورەو سـەروەر دەفـەرموێ: ئەوبەهرەو نازونیعمەت وخۆشی وشادییە، کە خۆم ئامادەم کردووە و، هەڵم گرتووە بۆ بەندە باش وخاسەکانی خۆم، ئەوەنـدە بـاش ونایابن، نـە بـە چاو بینـراون و نـە بـەگوێ بیسراون و، نەبـە دڵـی کـەس دا هـاتوون وە نـە بەخەیاڵیدا ڕابووردوون، بێجگە لەوەیش کە خۆتان ئاگادارن لێ‌ی‌و، لەقورئان وفـەرمووده دا بـاس کـراوە بۆتـان ) ئـەنجا خۆشەویـست (دروودی خودای لێ بێ) بۆ پشتیوانی ئەمەی خوێنـدەوە: ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا اخفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ اعْـيُنٍ جَـزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سجدة/٣٢.

واتـە: کـەس پـەی نابـات بـەو هەمکە خێرو خۆشـی یـە چاو ودڵ ڕۆشـن کەرەوەی‌کـەبۆ چـاکان وخواناسـان ئامـادەکراوە، لەپاداشـتی کـردەوەی باشـی خۆیان دا). (تاج/٧ ز/١٥ ل/٨٤ ژ/٢- سوورەتی سەجدە).

## تەفسیری سوورەتی ئەحزاب (تفسير سورة الاحزاب)

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي الَيْكَ مَنْ تَشَاء وَمَنْ ابْتَغَيْتَ مِمَّـنْ عَزَلْـتَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ ٥١/٣٣

---

(٤٣٠) اخرجهُ مسلم في اوائل كتاب الجنة و صفة نعيمها، واهلها ، رقم: ٢٨٢٤ .

١٦٨٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كُنْتُ اغارُ عَلَى الّلاتِـي وَهَبْنَ انْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاقُولُ: اتَهبُ الْمَرْاةُ نَفْسَهَا فَلَمَّا انْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿تُرْجِئُ مَنْ تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي الَيْكَ مَنْ تَشاء وَمَنْ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ قُلْتُ: مَاارَى رَبَّكَ الا يُسَارِعُ فِي هَوَاكَ)( الحديث ٤٧٨٨- طرفه في: ٥١١٣)[٤٣١].

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رق وقیزم لەو ژنانە دەبۆوە کە دەچوون خۆیان دەبەخشی بەپێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەمگوت : خۆ ئافرەت دیاری ودەسەنە و شمەك نییە، چۆن خۆی دەبەخشێ، کاتێ ئەم ئایەتەش هاتەخوارەوە : ﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي الَيْكَ مَنْ تَشَاء وَمَنْ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ ٥١/٣٣. واته: لەگەڵ ئەوەدا کەمن ئەم ژنانەم بۆ حەلاڵ کردووی وە ئێستا حەلاڵ و هاوسەرتن، تۆ خۆت سەرپشك بە بەئارەزوی خۆت لەگەڵیاندا هەڵسو کەوت بکەو، کامیان دوادەخەیودرەنگ دەچیتە لای، تاوانت لەسەر نییە، وە کامیان بانگ دەکەیت بۆلای خۆت وەلەنۆرە نوستنی شەوانەدا وەپێشی دەخەی بەئارەزوی خۆتە، وەئەو ژنەی کە کەنارت لێ گرتووە، وەلێی دوور کەوتویتەوە، ئەگەر دووبارە ئاشتی کەیتەوە گوناهت ناگات).

عائیشە فەرمووی: (کەئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیە هاتەخوارەوە، بۆ پێغەمبەر، کە ئەوەی بۆدابین کردبوو، کە بەکەیفی خۆی، شەو لەلای ژنەکانی بمێنێتەوە، نەوەك بەپێی قەسم ونۆرە شەوی خۆیان ) کاتێ ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیە هاتە خوارێ گوتم بە پێغەمبەر : وادەزانم، بەزەینم خودا بەکەیفی دڵی تۆ دەجوڵێتەوە وزوو زووهەوەس وئارەزوت جێ بەجێ دەکات). (تاج/٧ ز/١٦ ل/٩٨ ژ/١٣- سوورەتی ئەحزاب -ش).

(٤٣١) اخرجهُ مسلم في الرّضاع، باب: جواز هبتها نوبتها لضرّتها ، رقم: ١٤٦٤ .

١٦٨١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): (انَّ رَسُولَ اللّـهِ (صَلّىاللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَسْتَاذنُ فِي يَوْمِ الْمَرْاةِ مِنَّا بَعْدَ انْ انْزِلَتْ هَذهِ الايَة ﴿تُرْجِئُ مَنْ تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي الَيْكَ مَنْ تَشَاء وَمَنْ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ فَقُلْتُ لَهَا: مَا كُنْتِ تَقُولِينَ؟ قَالَتْ؟ كُنْتُ اقُولُ لَهُ: انْ كَانَ ذاكَ الَيَ فَانِّي لااريدُ يَارَسُولَ اللّهِ انْ اوثرَ عَلَيْكَ احَدًا). (الحديث ٤٧٨٩)(٤٣٢).

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپاش هاتنی ئەم ئایەتە : ﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاء مِنْهُنَّ﴾ کە ئەوەی تیێدایە کە پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) خۆی سەرپشکە وخاتر خۆیە، بۆشەو نوستن لەلای هەر کامێ لەژنەکانی کە خۆی بییەوێ، لە گەڵ ئەوەش دا هێشتا پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) بۆ ڕاگرتنی دڵی ئێمە، لەرۆژی سەرەی خۆماندا، ئەگەر بی ویستایە بچێ بۆلای یەکێکی ترمان پرسی پێ دەکردین، وڕای وەردەگرتین، موعازە گوتی : بەعائیشەم گوت : ئەی لەحاڵەتی وەها دا تۆ دەتگوت چی؟ فەرمووی: منیش پێیم دەگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر شتەکە بەدەستی خۆم بێ، بەش و سەرەی خۆم لەخێر وپیت و فەڕی بوونم لەخزمەتی تۆدا بەکەسی تری نادەم ! (تاج/٧ ز/١٦ ل/٩٩ ژ/١٤- ش ).

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿لا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ الا انْ يُؤْذَنَ لَكُمْ الَى طعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ انَاهُ وَلَكِنْ اذا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَاذا طعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلا مُسْتَانِسِينَ لِحَدِيث انَّ ذلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَ فَيَسْتَحْيِ مِنكُمْ وَاللّهُ لا يَسْتَحْيِ مِنْ الْحَقِّ وَاذا سَالْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْالُوهُنَّ مِنْ وَرَاء حِجَابٍ ذلِكُمْ اطهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ انْ تُؤْذوا رَسُولَ اللّهِ وَلا انْ تَنْكِحُوا ازْوَاجَهُ مِنْ بَعْدِهِ ابَدًا انَّ ذلِكُمْ كَانَ عِنْدَ اللّهِ عَظيمًا﴾ ٥٣/٣٣.

---

(٤٣٢) اخرجهُ مسلم في الطلاق ، باب: بيان انَ تخيير امراته لا يكون طلاقا الا بالبينة ، رقم:١٤٧٦ .

( واته: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! لەخۆتانەوە بەبێ هۆی ڕەوا، مەچنە ناو ماڵەکانی پێغەمبەر، مەگەر لەپاش ڕێگە پێدان وەك ئەوە بانگ کرابن بۆنان خواردن وقاوەڵتی کردن، بەڵام پێش کات مەچن، بەوێنە ئەگەر چوون بۆ نان خواردن، بەر لەوەی نانە کە ئامادە بکرێ وپێ بگا، مەچن لەوێ دابنیشن وچاوەڕوانی پێگەیشتنی نان وچێشتەکە بکەن، بەڵام کاتێکیش دەچن وبانگ کران بۆسەر نان خواردن، ئەوا لە کاتی گونجاو ودیاری کراودا بڕۆن ونان وئاوەکە نۆش کەن، کەدەعوەتە کە تەواو بوو، وەنان خورا ئیتر بلاوەی لێبکەن و، کۆڕی قسەو باسی لێ دامەمەزرێنن، چونکە شتیوا ئازاری پێغەمبەر دەدا وهەراسانی دەکا، پێغەمبەر شەرمتان لێدەکا، کە باسی ئەوەتان بۆ بکا، کەئێوە بەم جۆرە ڕەفتارەتان ئازاری ئەدەن وبێزاری دەکەن، بەڵام خودا شەرم لە ڕوونکردنەوەی ڕووی ڕاستی ناکا، بۆیە واکوتومەترەقی دەیدا لەڕوتان، هەرکاتێکیش داوای شتێك لەهاوسەرەکانی پێغەمبەر دەکەن، بەشەرم وشکۆ و لەسنووری ڕێزدا داوای شمەکیان لێ بکەن، وەك ئەوە لەپشت پەردەوە داوای شمەکیان لێبکەن، ئەوە بۆ ئێوەش و بۆ ئەوانیش باشترە دڵتان پاك دەکا، ئەوە بزانن کەئەوە بۆ ئێوە ڕەوا نییە کە بەهیچ شێوەیەك ئازاری دڵی پێغەمبەر بدەن، وەنابێ لەپاش خۆی، هەرگیزاو هەرگیز ژنەکانی مارە بکەن، کاریوا لەلای خودا، ئەگەر کەسێ ئەنجامی بدات تاوانێکی گەلێ گەورەیە، ئەوانە دایکی ئێوەن دایك چۆن مارە دەکرێت).

١٦٨٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: خَرَجَتْ سَوْدَةُ بَعْدَمَا ضُرِبَ الْحِجَابُ لِحَاجَتِهَا وَكَانَتْ امْرَأةً جَسِيمَةً لا تَخْفَى عَلَى مَنْ يَعْرِفُهَا فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ فَقَالَ: يَا سَوْدَةُ امَا وَاللّٰهِ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا فَانْظرِي كَيْفَ تَخْرُجِينَ؟ قَالَتْ: فَانْكَفَاتْ رَاجِعَةً وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فِي بَيْتِي وَانَّهُ لَيَتَعَشَّى وَفِي يَدِهِ عَرْقٌ فَدَخَلَتْ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ انّي خَرَجْتُ لِبَعْض حَاجَتِي فَقَالَ لِي عُمَرُ: كَذا وَكَذا قَالَتْ: فَاوْحَى اللّٰهُ الَيْهِ ثمَّ رُفِعَ عَنْهُ وَانَّ الْعَرْقَ فِي يَدِهِ مَا وَضَعَهُ فَقَالَ:

(انَّهُ قَدْ اذنَ لَكُنَّ انْ تَخرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ). (الحديث ٤٧٩٥- طرفه في: ١١٩ تەجرید = ١٤٦فتح الباری = بەرطی یەکەم ل: ١٤٣ =١١٩ت =١٤٦ف = بەرطی/١ ل/١٤٣).

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ، پاش ئەوە یاسای بالاپۆشی کە پێی دەگوترێ حیجاب، دامەزرا، سەودەی کچی زەمعە کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، بۆ کارێکی خۆی دەچێتە دەرەوە، چوو بوو بۆ سەراو، عومەر دەیبینێ ودەیناسێو دەڵێ: بەخودا ئەی سەودە! دەتناسمەوە، بزانە چۆن دەردەچی؟ عائیشه فەرمووی: جا سەودە بەرەو دوا گەڕایەوە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر کە لەو کاتەدا لەماڵی من بوو، شێوی دەکرد، سەودە قسەکانی عومەری بۆ پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) گێڕایەوە، لەو کاتەدا گرتکێکی بەدەستەوە بوو گرتکەکەی دانەنا کەسروش (وەحی)ی بۆهات : کە حاڵەتی سروش بۆ هاتن بەری دا فەرمووی: ( ڕێگەتان پێ دراوە ئەی هاوسەرە کانی پێغەمبەر، وە هەروەها ئەی ژنانی موسڵمانان! کە بۆ کارو فرمانی خۆتان لەماڵ دەربچن) (تاج/٣ ل/١١٩ ژ/١- ز/٤٨ + ژ/١١٩ تجرید - بەرگی/١ ل/١٤٣).

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿انْ تُبْدُوا شَيْئًا اوْ تُخفُوهُ فَانَّ اللّٰهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا، لاجُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي ابائِهِنَّ وَلا ابْنَائِهِنَّ وَلا اخْوَانِهِنَّ وَلا ابْنَاءِ اخْوَانِهِنَّ وَلا ابْنَاءِ اخَوَاتِهِنَّ وَلا نِسَائِهِنَّ وَلا مَا مَلَكَتْ ايْمَانُهُنَّ وَاتَّقِينَ اللّٰهَ انَّ اللّٰهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ ٣٣/٥٤-٥٥.

(واتە: هەر شتێ بەئاشکرا بیکەن یابەنهێنی، خودا دەیزانێ، هیچ شتێ لەخودا ون نابێ، حیجاب وڕووپۆشی و لەچك گرتنەوە بۆ بێگانانە، لەبەر ئەوە ئەگەر ژنان لەکەسی خۆیی ڕوونەپۆشن وەلەچك نەکەن و حیجاب نەگرنەوە قەیدی نییە.مەحرەم وخۆیی وەك باوك وکوڕو براو و کوڕی براو کوڕی خوشك وژنیموسڵمانی وەك خۆیان وبەندەو کەنیزەکی خۆیان،

وەهەروەها مام وخاڵیان.ئەی ژنەموسڵمانەكان !لەخودا بترسن، چونكە خودا بۆ خۆی لەهەموو شتێ ئاگا دارەو ئاگای لەخشەی مارو مێرووە!)

١٦٨٣- عن عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (اسْتَاذنَ عَلَيَ افْلَحُ اخُو ابِي الْقُعَيْسِ بَعْدَمَا انْزِلَ الْحِجَابُ فَقُلْتُ:(لا اذنُ لَهُ حَتَّى اسْتَاذنَ فِيهِ النَّبِيَ (صَلَّىاللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)فَانَّ اخَاهُ ابـاالْقُعَيْسِ لَيْسَ هُوَ ارْضَعَنِي وَلَكِنْ ارْضَعَتْنِي امْرَاةُ ابِي الْقُعَيْسِ) فَدَخَلَ عَلَيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ لَهُ: (يَا رَسُولَ اللَّهِ انَّ افْلَحَ اخَا ابِي الْقُعَيْسِ اسْتَاذنَ فَابَيْتُ انْ اذنَ لَهُ حَتَّى اسْتَاذنَكَ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):(وَمَامَنَعَكِ انْ تَاذنِي عَمُّكِ؟ قُلْتُ: (يَا رَسُولَ اللَّهِ انَّ الرَّجُلَ لَيْسَ هُوَ ارْضَعَنِي وَلَكِنْ ارْضَعَتْنِي امْرَاةُ ابِي الْقُعَيْسِ) فَقَالَ: (ائْذنِي لَهُ فَانَّهُ عَمُّكِ تَرِبَتْ يَمِينُكِ). (الحديث: ٤٧٩٦- اطرافه في: ٢٦٤٤- ٥١٠٣- ٥١١١- ٥٢٢٩- ٦١٥٦).

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەفلەحی برای ئەبول قوعەیس، ڕێگە خوازی كرد كە بێت بۆ سەردانم، ئەمەش ئەو كاتەبوو كە ئایەتی خۆ داپۆشین ولەچك كردن (ئایەتی حیجاب )هاتبوو، وەژنەكانی پێغەمبەر بەپێی ئەو ئایەتە فەرمانیان پێ كرابوو، كەلە پیاوی ناخۆیی وبیانی حیجاب بكەن وپەردەو سەر پۆش ولەچك بپۆشن، منیش گوتم : ڕێگەی دیدارو دێنی پێ نادەم هەتا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) نەپرسم، خۆ من ئەبو لقوعەیس خۆی شیری پێم نەداوە، بەڵكو ژنەكەی ئەبولقوعەیس مەمكی پێ داوم، كەواتە ئەم ئەفلەحە چۆن چۆنی دەبێ بەخۆیی ومەحرەمی من.

كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) تەشریفی هات، پێم گوت : ئەی پێغەمبەری خودا! ئەفلەحی برای ئەبولقوعەیس، ڕێگە خوازی كرد كەبێت بۆ دێنیم، گوایە مامی شیریم بێ، بەڵام من قایل نەبووم، كەڕێگەی پێ بدەم هەتا لەتۆ نەپرسم.پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوە مامی شیریتە، ئەدی بۆچی ڕێگەی هاتنی مامەتت نەداوە كە بێ بۆ سەردانت؟.

منیش زیاتر ڕوونم کردەوە بۆی وگوتم؟ خۆ ئەی پێغەمبەری خودا ! مـن شـیری ئـەوم نـەخواردووە، مـن شـیری براژنەکـەیم خـواردووە، کـە ژنـی ئەبولقەعەیسە؟ فـەرمووی: ( ڕێگـەی پـێ بـدە کـە بێـت بـۆ دیێنیـت، چونکە بەپێی شەرع ئەوە مامی شیریتە) کەواتەخۆیی ومەحرەمـە وپێویـست ناکات کەپەچەو سەر پۆشی بۆ بگریتەوە، ئەی هەژارۆکە !چۆنە شتێوا نازانیت !!

**ڕوونکردنەوە:**

پوختـەی فـەرموودە کـە ئەمەیـە : ژنـی پیـاو، شـیربدات بەهـەر منـداڵێ، ژنەکـە دەبـێ بـەدایکی، مێردەکـەی دەبـێ بـە بـاوکی شـیری، بـرای مێردەکـەی دەبێ بەمامی شیری، وههەروەها، واتە: براژنـت شـیر بـدات بەهـەر منـداڵێ تـۆ دەبیـت بـەمامی شـیری ئـەو منداڵـە، وە دەسـت نوێـژتان لەیـەکتری ناشـکێ، پەیوەندی فەرموودە کە بە ئایەتە کـەوە لـەم ڕووەوەیـە: بـۆ کـەلا(فحل) شـیر دەچەسپێ، وەخۆیەتی(مەحرەمیەت) هەر وەك لەژنی شیردەرەوە دەتەنێتەوە بـۆ کـەس وکـاری وەك دایـك و بـاوك وخوشـك وبـرا و نـەنك و بـاپیری، لەمێردەکەشـیەوە، بـەهۆی ئـەوەوە کـە ئـەو خـاوەن شـیرەکەیە، واتـە سـکی ژنەکـەی پـڕ کـردووە هـەتا هاتووەتـە شـیر، خۆیـەتی لەکەڵێـشەوە- واتـە: لەمێردی ژنە شیر دەرەکەوە –دەتەنێتـەوە بـۆ کـەس وکاری، وەك کوڕ وکچ وباوك ودایك وبرا وخوشك و.....هتد.

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ ٥٦/٣٣

(واته: خودا وفريشتەكانى خودا، سەلاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر ئەی كەسانێ كەباوەڕتان بەخودا وپێغەمبەر ی خودا هێناوە! ئێوەش صەلاواتی لەسەر بدەن و سەلامی لێ بكەن)

١٦٨٤– عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ امَّا السَّلامُ عَلَيْكَ فَقَدْ عَرَفْنَاهُ فَكَيْفَ الصَّلاةُ عَلَيْكَ؟قَالَ:(قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَىمُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌمَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بارَكْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ). (الحديث ٤٧٩٧– طرفاه في:٤٧٩٧– ٦٣٥٧)[٤٣٣].

كەعبی كوڕی عوجرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوترا : ئەی پێغەمبەری خودا !ئێمە دەزانین سەلام لەدیاری تۆ بدەین، وەك ئەوەی لەتەحیاتا دەڵێین : (السلام عليك ايّها النبيُّ ورحمة الله وبركاته) بەڵام نازانین سەلاوات لەسەر تۆ چۆن دەدرێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: بڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بارَكْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) ئەی خودایە! بڕژێنە ڕەحمەت ومیهرەبانی بەسەر گیانی موحەممەد وبەسەر گیانی كەس وكاری موحەممەددا، هەروەك چۆن رەحمەت ومیهرەبانیت ڕژاندووە بەسەر ئیبراهیم وكەسو كاری ئیبراهیم دا، بەڕاستی تۆ خاوەنی سوپاسیت وشكۆ مەندیت، خودایە !پیت وفەڕ بڕێژە بەسەر گیانی موحەممەد وبەسەر گیانی كەس وكاری موحەممەدا هەروەك چۆن پیت وفەڕت ڕژاندووە بەسە رخانەوادەی ئیبراهیم دا، بەڕاستی تۆ سوپاسكراو وشكۆمەندی). (تاج/٧ ل/١٠٠ ژ/١٨ ز/١٦- سوورەتی ئەحزاب).

---

(٤٣٣) اخرجهُ مسلم في الصّلاة، باب: الصّلاة على النبي (صلى اللهُ عليهِ وسلم) بعد التشهد ، رقم: ٤٠٦ .

١٦٨٥- عَنْ ابي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قُلْنَا: يَارَسُولَ اللّٰهِ هَذا التَّسْلِيمُ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: (قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ وَبارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بارَكْتَ عَلَى ابْرَاهِيمَ)(الحديث ٤٧٩٨- طرفه في: ٦٣٥٨ )(٤٣٤).

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتمان : ئەی پێغەمبەری خودا! سەلاو لەتۆ ئەمەیە کەفێری بووین ولە تەحیاتا دەیلێین ئەی چۆن چۆنی سەلاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بلێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ وَبارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بارَكْتَ عَلَى ابْرَاهِيمَ) خودایە برێژە رەحمەت بەسەر موحەممەد دا، کە بەندەو پێغەمبەر ی‌تۆیە، هەروەك رەحمەتت ڕژاندووە بەسەر خانەوادەی ئیبراهیم دا وەپیت وفەر برێژە بەسەر مەوحەممەد وخانە وادەی موحەممەددا، هەروەك ڕژاندووتە بەسەر ئیبیراهیم دا). (بڕوانە : ریاج الصالحین/٣ ل/١٠٠٣ ز/٢٤٣- نامەی سەلاواتدان لە دیداری پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ).

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿يَاايُّهَا الَّذينَ امَنُوا لا تَكُونُوا كَالَّذينَ اذَوْا مُوسَى﴾٣٣/٦٩

١٦٨٦- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انَّ مُوسَى كَانَ رَجُلا حَيِيًّا وَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿يَا ايُّهَا الَّذينَ امَنُوا لا تَكُونُوا كَالَّذينَ اذَوْا مُوسَى فَبَرَّاهُ اللّٰهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللّٰهِ وَجِيهًا﴾. ( الحديث

---

(٤٣٤) لم يوافقهُ مسلم على تخريج حديث ابي سعيد في الصلاة على النبيّ (صلى الله عليه وسلم) (فتح/٩ص٧٧٣)—المترجم .

٤٧٩٩ = ١٩٢ تجريد =٢٧٨ فتح البارى = بەرطى يةكـةم لـةم كتيبـة، ل : ٢٠٤ ) فةرموودة كة بة تةواوى لةوىَ رؤيشت [٤٣٥].

## تەفسیری سوورەتی سەبەء (تفسير سورة السبأ)

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿انْ هُوَ الا نَذيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذابٍ شَدِيدٍ﴾ ٣٤/٤٦

واته ئەی خوشەویست ! ئەی موحمەد! ئەی پێغەمبەری بە حەقی من !بفەرموو پێیان من ئەم تاقە ئامۆژگاری‌یەم هەیە بۆ ئیوه : کە خوا پەرەست بن، فەرمانە کانی بەجابهێنن لە گشت بارو دووخێکا بصولّحێن بۆ خودا، ئیتر تاکە تاکە بن، یاکۆمەڵ کۆمەڵ بن، گرنگ ئەوەیە فەرمانبەری خودا بن، پاش ئەمەیش باش سەرنج بدەن هەتا بۆتان روون ببێتەوه، موحەمەدی هاورێتان، کەشەو ورۆژ لەگەڵتانەو بەباشی لە داواکەی حاڵی بوون، وەك چۆن هاورێ لە حاڵی هاورێ ی خۆی حاڵی دەبیّ، کە پیاوی وا هۆشیار و خاوەن هیمەت، زۆر دووره لە شێتی و شتی وا، ژێری ساخ ڕێگەی ڕێ تێچوون و ئەگەری وا نادات. بەڵام باش باش بزانن کە موحەممەد ترسێنەرێکی ڕاست و دروستە بۆ ئێوه، وا لە پێش سزایەکی سەختەوه کەلە هەردوو جیهاندا، ئەگەر لەفەرمانی ئاینەکەی دەربچن ئەو سزا سەختە چاوەڕوانی ئێوه دەکات).

١٦٨٧- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: صَعِدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) الصَّفَا ذاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: يَاصَباحَاهْ فَاجْتَمَعَتْ الَيْهِ قُرَيْشٌ قَالُوا: مَا لَـكَ؟ قَـالَ: (ارَايْتُمْ لَوْ اخْبَرْتُكُمْ انَّ الْعَدُوَّ يُصَبِّحُكُمْ اوْ يُمَسِّيكُمْ امَا كُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟ قَالُوا: بَلَى قَالَ: ﴿فَانِّي نَذيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذابٍ شَدِيدٍ﴾ فَقَـالَ ابُـو لَهَـبٍ: تَبـا لَـكَ الِهَـذا

(٤٣٥) اخرجهُ مسلم في الحيض، باب: جواز الاغتسال عريانا ، رقم ٣٣٩ .

جَمَعْتَنَا؟ فَانْزَلَ اللّهُ ﴿تَبَّتْ يَدَا ابِي لَهَبٍ﴾. (الحديث ٤٨٠١- اطرافه في: ١٣٩٤- ٣٥٢٥- ٣٥٢٦- ٤٧٧٠- ٤٩٧١- ٤٩٧٢- ٤٩٧٣- ).

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئایەتی: ﴿وانذر عشيرتك الاقربين﴾ ئەی موحەممەد! خزم وخوێشانی خۆت، یەك لەدوای یەك بترسێنە، لەنزیك ترین یانەوە دەست پێ بکە ).کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کەئایەتی (٢٦/٢١٤) دووسەدوو چواردەیە لە سوورەتی شوعەرا، کەسوورەتی بیست وشەش هەمە لەسوورەتەکانی قورئان.

ئیبنوعەبباس فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ڕۆژێك پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) ڕۆیشتە سەر تەپۆلکەی سەفا، لەوێ راوەستا وبەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی هاوار لەم بەیانی ڕۆژی ڕەشە! ). ئیتر قورەیش هەموو بەدەنگی ئەم هاوارە وە، چوون ولەدەوری کۆ بوونەوە وگوتیان : ئەوە چیتە، چی قەوماوە؟ فەرمووی: (ئەرێ پێم بڵێن : ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم کە لەشکری دوژمن سەر لەبەیانی، یا سەر لەئێوارە پەی دا دەبێو لەناکاو دەدا بەسەرتانا، ئایا باوەڕم پێدەکەن یان نا؟ )گوتیان بەڵێ باوەڕت پێ دەکەین، چونکە هەتا ئێستا درۆمان لەتۆ نەبیستووە ! فەرمووی : ( دەسا چاوتان بکەنەوەو خاس وخراپی خۆتان بزانن، من خودا کردوومی بە ترسێنەر بۆ ئێوە، هەتا ئاگادارتان بکەمەوە: ئەگەر لەفەرمانی من دەربچن وبە گوێم نەکەن، کە پێغەمبەری خودام، ئەوا بەزوویی لە گەڵ تۆڵەیەکی سەختی خودایدا ڕووبەڕو دەبنەوە، ئیتر کەیفی خۆتانە، بەئیقتیباس لەم ئایەتە دەیفەرموو: ﴿ فانّي نَذيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذابٍ شَدِيدٍ﴾.

جا ئەبولەهەبی مامی پێی گوت: هەی لەناوچیت، دەستەکانت گۆدو شەلەبن وعەمرت نەمێنێ، ئا بۆئەمە ئێمەت کۆکردووەتەوە، گوتمان دەبێ چی قەوما بێ ! دوای ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەڵساو ڕۆیشت، ئەوجا خودای گەورە سوورەتی: ﴿تبّتْ يدا ابي لهبٍ وتبّ﴾ی لەژەم وهەجوی

ئەبولەهەبدا نارده خوارەوە. (تاج/٧ ز/٩ ل/٧٤ ژ/٣- سوورەتی شوعەراء، تاج/٧ ز/٨٩ ژ/١ ل/٢٦٩- سوورەتی مەسەد =تەببەت یەدا ) + ( تجرید/١ ل/٢٧٠ ژ/١١٤٠ =٢٧٥٣ فتح ).

## تەفسیری سوورەتی زومەر (تفسير سورة الزمر)

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿ قُلْ يَاعِبادِيَ الَّذينَ اسْرَفُوا عَلَى انْفُسِهِمْ لاتَقْنَطوا مِنْ رَحْمَةِ اللّٰهِ انَّ اللّٰهَ يَغْفِرُ الذنُوبَ جَمِيعًا انَّهُ هُوَ الْغَفُورُالرَّحِيمُ﴾ ٣٩/٣١

١٦٨٨- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): (انَّ نَاسًا مِنْ اهْلِ الشِّرْكِ كَانُوا قَدْ قَتَلُوا وَاكْثَرُوا وَزَنَوْا وَاكْثَرُوا فَاتَوْا مُحَمَّدًا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: انَّ الَّذي تَقُولُ وَتَدْعُو الَيْهِ لَحَسَنٌ لَوْ تُخْبِرُنَا انَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَّارَةً فَنَزَلَ: ﴿وَالَّذينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللّٰهِ الَهًا اخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّٰهُ الا بالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ ﴾ وَنَزَلَتْ : ﴿قُلْ يَا عِبادِيَ الَّذينَ اسْرَفُوا عَلَى انْفُسِهِمْ لا تَقْنَطوا مِنْ رَحْمَةِ اللّٰهِ﴾ (الحديث: ٤٨١٠ )[٤٣٦].

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: گەلێ لەبت پەرستەكان خەڵكێكی زوریان كوشتبوو، وەزیناو داوێن پیسی زۆریان كردبوو، جا بە پێی خۆیان هاتنە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتیان ئەی موحەممەد ! ئەمەی تۆ دەیڵێیت وخەڵكی بۆ بانگ دەكەی بۆی، شتێكی زۆر جوان وشیرینەو، لێی جوانترو باشتر نییە، بەلاَم خۆت دەزانیت كە ئێمە حاڵەكەمان وایە : تاوانێكی زۆرمان تێ گوشیوە، جا ئایا ئەم كردەوە خراپانەی كە ئێمە كردومانن، كەفارەت وبرێتی پاك بوونە وەیان بۆ هەیە یانا؟ جا بەم

(٤٣٦) اخرجه مسلم في الايمان، باب: كون الاسلام يهدم ما قبله.. رقم: ١٢٢ .

بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ الَهًا اخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ الا بالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ﴾.

هەروەها ئەم ئایەتەی‌تریش دابەزی : ﴿قُلْ يَاعِبَادِي الَّذِينَ اسْرَفُوا عَلَى انْفُسِهِمْ لا تَقْنَطوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ انَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذنُوبَ جَمِيعًا انَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ ٣٩/٥٣، واتە ئەی موحەممەد! ئەی خۆشەویست، بفەرموو بە بەندەکانی من، لەسەر زمانی من : ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەو کەسانەی کەستەم وتاوانێکی زۆرتان کردووە و، باری دوارۆژی خۆتانتان گران و دشوار کردووە، نائومێدمەبن لەڕەحمەتی خوا، ئەگەر ئێوە بەڕاستی ڕوو لەخودابن و خۆتان فڕێ بدەنە قاپی ئەو پادشا گەورەیە، چونکە خودا لەهەمووگوناهێ خۆش دەبێ ). (تاج/٧ ز/٢٢ ژ/٢ ل/١٢٢ + تاج/٦ ل/١٠٦ ژ/١٧).

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

## ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ ٣٩/٦٧

١٦٨٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: جَاء حَبْرٌ مِنْ الاحْبَارِ الَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ انَّا نَجِدُ انَّ اللَّهَ يَجْعَلُ السَّمَوَاتِ عَلَى اصْبَعٍ وَالارَضِينَ عَلَى اصْبَعٍ وَالشَّجَرَ عَلَى اصْبَعٍ وَالْمَاء وَالثرَى عَلَى اصْبَعٍ وَسَائِرَ الْخَلائِقِ عَلَى اصْبَعٍ فَيَقُولُ: (انَا الْمَلِكُ فَضحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذهُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ الْحَبْرِ ثمَّ قَرَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالارْض جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَوَاتُ مَطوِيَاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾. (الحديث ٤٨١١- اطرافه فى: ٧٤١٤- ٧٤١٥- ٧٤٥١- ٧٥١٣ )[٤٣٧].

---

(٤٣٧) اخرجه مسلم في صفات المنافقين و احكامهم، كتاب : صفة القيامة و الجنة و النار، رقم: ٢٧٨٧.

١٦٩٠- عنْ ابَي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: يَقْبِض اللّٰهُ الارْض وَيَطوِي السَّمَوَاتِ بِيَمِينِهِ ثمَّ يَقُولُ انَا الْمَلِكُ ايْـنَ مُلُـوكُ الارْض). ( الحـديث ٤٨١٢- اطرافـه في: ٦٥١٩- ٧٣٨٢- ٧٤١٣).

عەبـدوڵلای کـوڕی مەسـعود (رەزای خودایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: یـەکێ لـەزانا گـەورەکانی جوولەکـە هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەر،گوتی: ئـەی موحەممـەد! لەتـەوراتی ئێمـەدا هەیـە : کـەخودا لـە ڕۆژی قیامـەت دا ئاسمانـەکان دادەنـێ لەسـەر پەنجـەیێ و زەویـەکان دادەنـێ لەسـەر پەنجـەیێ و دار و درەختـەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێو ئاو وخاك دادەنێ لەسەر پەنجەیێ وهەموو دروست کراوەکـانیتریش دادەنـێ لەسـەر پەنجـەیێ.واتـە : بوونـەوەر سـەرو خـواری، بەدەستی توانایی خۆی وەك گوێیدەگرێ و، ئـەوجا بـۆ نوانـدنی جەبرەوشـان وشکۆی خۆیو بەیانی یەکتایی خۆی و، بێ نموودیی پادشاو قڕاڵەکانی جیهان دەفەرموێ: ( پادشاهەر خۆمم، پادشاکانی سەر زەمین ونـاو جیهـان کـوان ولـە کوێن بابێنە مەیدان؟! ).

جـا پێغەمبـەر (دروودی خودای لـێ بـێ) بـۆ پـشتیوانی قـسەی مالوومەکـە وەهـا پێکـەنی، ددانـە پێـشینەکانی وەدەر کـەوتن، لەپاشـا حـەزرەت(دروودی خودای لـێ بـێ) دیـسان بـۆ نیـشانەی ڕاسـتیی قـسەکانی مالومەکـە ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللّٰهَ حَقَّ قَـدْرِهِ﴾ هـەتا ﴿عمّـا يـشر كون﴾ واتـە : خودايـان —وەکو پێویـستە نەناسـیوە- دەنـا هاوبەشـیان بـۆی دانـەدەنا، ڕۆژی قیامـەت هـەموو زەمینـە کـان وا لـە چـەنگی ئـەودا و وان لـەژێر دەسـەلاتیدا، ئاسمـەکانیش بەدەسـتی ئـەو پێـچراونەتەوە، خـودا پـاك وبـەرزترەو دوورە لـەوە کـەوەکوو ئەوان دەڵێن شەریکی هەبێ ). (تاج/٧ ز/٢٢ ل/١٢٣ ژ/٤ — سوورەتی زومەر ).

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الارْض الا مَنْ شَاء اللّٰهُ ثمَّ نُفِخَ فِيهِ اخْرَى فَاذا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ﴾٣٩/٦٨

(واتە: بەفەرمانی خودا ئیسرافیل بۆ کۆتای هێنان بە جیهانی یەکەم، فوو دەکا بە صووردا، ئیتر کۆتایی بەجیهانی یەکەم دێنێ وجیهان سەراسەر خاپوور دەبێ، هەرچی گیانلەبەرە لە ئاسمانەکان و، لەزەویداهەموو بێهۆش دەکەون، یا دەمرن، کەسانێ نەبێ کەخودا خواستی لەسەر ئەوە بێ کە بمێنێتەوە، ئیتر تا ماوەی چل سالْ چۆلْ وهۆلْ ووێرانەدەبێ، ئەنجا دووبارە فوو دەکرێتەوە بەو کەڕەنایەدا، کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: صوور، ئیتر هەموو گیانداران زیندوو دەبنەوە و کتوپڕ، هەموویان بەسەر سامی ڕەق ڕا دەوەستن و، وەك سەر گەردان تەماشای ئەم لاو ئەولای خۆیان دەکەن، چاوەڕوانی ئەوەن کەدەبێ چییان لێ بکرێ).

١٦٩١- عن ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ ارْبَعُونَ قَالُوا: يَا ابا هُرَيْرَةَ ارْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: ابَيْتُ قَالَ: ارْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: ابَيْتُ قَالَ: ارْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: ابَيْتُ وَيَبْلَى كُلُّ شَيْءٍ مِنْ الانْسَانِ الا عَجْبَ ذنَبِهِ فِيهِ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ). (الحديث: ٤٨١٤- اطرافه في ٤٩٣٥)[٤٣٨]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( ئەم فوو تا ئەو فوو چلە، = لەم نەفخە تا ئەو نەفخە چلە، = لەنەفخەی یەکەم تانەفخەی دووەم چلە، ) یارانی پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) گوتیان : ئەی ئەبو هورەیرە ؛ مەبەست لەماوەی بەینی دوو فووە کە، کەناسراون بەنەفخەتەین چل ڕۆژە؟ گوتی: نازانم. گوتیان : ئەی مەبەست

(٤٣٨) اخرجه مسلم في الفتن و اشراط الساعة، باب: مابين النفختين ، رقم: ٢٩٥٥

چل ساڵە؟ گوتی نازانم. گوتیان : ئەی مەبەست چل مانگە ؟ گوتی نازانم و من چونکە ژمێردراوەکەم لە پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) نەبیستووە کەچییە لەخۆمەوە ناتوانم بڕیار بدەم کە ساڵە یارۆژە یا مانگە یاحەفتەیە، یاچییە ئەبو هورەیرە فەرمووشی (لەش و ئەندام وهەموو شتێکی ئادەمیزادیش دەڕزێ، نووکی بێخی جوجکەی سمتی نەبێ، کەبەقەد دەنکە خەرتەلەیەك دەبێ، لەوێوە فریشتەکان بەفەرمانی خودا سەرلەنوێ هەموو کەسێ وەك حاڵی ژیانی دروستی دەکەنەوە ). (تاج/٧ ل/١٢٥ ز/٢٢ ژ/٨- سوورەتی زومەر ش ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەگەر کەسێ بڵێ : ئێمە بەئاشکرا دەبینین کەسێ دەسووتێ، یادەخرێتە ناو تێزابەوە، ئەسەری نامێنێ؟ لە وەلامدا دەڵێین : دەقی فەرموودەی صەحیح، بەفەرچییەی ڕووت ڕەت ناکرێتەوە. ئەم فەرموودەیە هەواڵدانە لەغەیب، غەیبیش خودا نەبێ کەس نازانێ چۆنە، وەکی تریش واتای فەرموودە کە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو عەجبوژەنەبە لە قەبرەکەدا دەمێنێ، وەهەر کەسێ بیەوێ دەتوانێت بیبینێ، یادەستی لێ بدات، کەسێ بەوردی سەرنجی قورئان وسوونەتی پێغەمبەر بدات، کۆمەڵێ شتی لەم بابەتە دەبینێ، کە بەدیمەن وڕواڵەت، لەگەڵ تێگەیشتنی سەرەتایی ئێمەدا ناگونجێ، یا بڵێین: ئێمە بەتەواوی لە مەبەستەکەی خوداو پێغەمبەر وەك خۆی بەتەواوی وبەباشی تێ ناگەین، مەگەر بەتەئویل وشتی وا، وە ئەهلی تەئویلیش هەر یەکەی بەجۆرێك دەفەرموون.

جا لەم شوێنەدا هەر وەکو ئێمە موشاهەدەی ئەحواڵیسەرە مەرگی مردوو، وەهەروەها ئەحواڵی ناو قەبری و پرسیاری فریشتە لێی وگۆڕەوشار و گوشاد بوونی گۆڕو بوونی بەباخێ لەباخەکانی بەهەشت، یا بەچاڵێ لە چاڵەکانی دۆزەخ، موشاهەدە ناکەین وبەچاو نابینین و بەگوێ نابیستین،

مەگەر بۆ پێغەمبەران وپیاوچاکان، ئاوەهاش مانەوەو نەفەوتانی ئەو دەنکە خەرتەلەیە لە عەجبو زەنب بەچاو نابینین و هەستی پێ ناکەین، مەگەر بۆ کەسی خۆی، وە دوور نییە هەروەکووچۆن فریشتە بە فەرمانی خودا بەبەر چاومانە وە گیانی مردوو دەکێشێ ودەیبا بۆ شوێنی تایبەتی، وە ئێمە ئەوچۆنیەتانەو ئەوشوێنانەو ئەوفریشتانە نابینین و سەرو وفەهم وتێگەیشتنی ئێمەن، ئاوەهاش فریشتە ئەو پارچە یە لەمرۆڤ لەکاتی مردندا ببەن و لەشوێنی تایبەتی خۆیدا هەڵی بگرن ولەکاتی زیندووکردنەوە دا، بەفەرمانی خودا بیکەن بەهەوێنی دروست بوونەوەی جەستەی مردووەکە، وەمەرج نییە کە ئێمە هەست بەوە بکەین، هەروەك هەست بەزۆر روداویتری کاتی سەرەمەرگ و کاتی بردن بۆ سەرگۆرستان و کاتی دێنی گۆڕ ناکەین، گەرچی ئەمانە لە قورئان وسوونەتدا زۆر بەئاسایی باس کراون.

کورت و پوخت: بەکوردی پەتی: (مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوە نییە کە ئەودەنکە خەرتەلەیی،ئێمە بەئەزموون وتاقیکردنەوە،دەتوانین بیچەسپێنین کە نافەوتێ، بەڵکو ئەوە شتێکی نهێنییە، ئیشیخودایە، بەڵام مەبەست ئەوەیە: کە لەقیامەتدا فریشتەکان جەستەی مرۆڤەکان لەودەنکە خەرتەلەیەوە دروست دەکەنەوە، هەروەکوو لەسەرەتاوە لەوە دروست کراوە).

## تەفسیری سوورەتی (حمسق) سوورەتی شوورا
## تفسير سورة ( حمسق ) سورة الشّورى

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿ الا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ ٤٢/٢٣

(واتە : بفەرموو ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری خۆشەویستی من! من مەبەستم لەڕاگەیاندنی ئەم ئایینە پیرۆزە، کۆکردنەوەی موڵك وسامان نییە، کرێ ومزم لەسەر ئەوە لەئێوە ناوێ، تەنیا ئەوەی کە من لەئێوەی داوا دەکەم ئەوەیە : کەمافی خزمایەتی کەلە نێوانماندا هەیە بیپارێزین).

١٦٩٢- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما): (انَّ النَّبِيَ (صَلَّىاللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَكُنْ بَطنٌ مِنْ قُرَيْشٍ الا كَانَ لَهُ فِيهِمْ قَرَابَةٌ فَقالَ: الا انْ تَصِلُوا مَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ مِنْ الْقَرَابَةِ). (الحديث ٤٨١٨- طرفه فى: ٣٤٩٧ )[٤٣٩].

لەبارەی ئەم ئایەتەوە پرسیار لە ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) کرا، کە مەبەست لەم خزمایەتیەیە ودۆستایەتی یە، کەلەم ئایەتە دا باس کراوە چییە و کێیە؟ سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) کەیەکێکە لەناودارانی پەیرەوان (تابیعین) تەشریفی لەوێبوو، ئەو وەلامی دایەوەو فەرمووی: مەبەست خزم وکەس وکاری موحەممەدە.

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پەلە مەکە وانییە، چونکە هەموو تیرەو خێڵ وبەرەبابەکانی قورەیش بە خزمایەتی دەگەنەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەچاك وخراپیانەوە. ئیبنوعەبباس فەرمووی: مەبەست ئەوەیە دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! پێیان بفەرموو : تەنیا ئەوەم لە ئێوە دەوێ، لەچاکەی ئەم ئەرك وزەحمەتەدا کەمن دەیکێشم بۆ خۆشی وباشی هەردوو جیهانی ئێوە، ئێوەش لە پاداشتی ئەوە داباش بن بۆ خزم و کەس وکاری من، کە خزمی خۆشتانن ) (تاج/٥ ل/٩٦ ز/١٦ ژ/١- باسی گەورەیی کەسو کاری پێغەمبەر ).

**ڕوونکردنەوە:**

سەعیدی کوڕی جوبەیر، لە پەیڕەوانە، واتە لەتابعینە، پێشەوایەکی گەورەو ناودارە، بەکۆی دەنگ دانراوە بە زانایەکی بەرزو بەڕێز و، بە خواناسێکی گەورە، فەرموودەی لە زۆر لەهاوڕایانەوە گێڕاوەتەوە، حەجاج

---

(٤٣٩) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عباس في تفسير (المودة في القربى) فتح الباري/٦ص٦٣٥ —خاتمة كتاب المناقب- المترجم .

بەندی کرد ولە بەندا کوشتی، خۆشی لەپاش شەهید بونی ئەو زۆر نەژیا، وە لە پاش سەعید حەجاج کەسی تری نەکوشت، یەکێ لەفەقێ ناودارەکانی سەعید ئیمامی زوهرییە (رەحمەتی خودای لێ بێ).

## تەفسیری سوورەتی (حا میم)ی دوخان
## تفسير سورة (حم) الدخان

١٦٩٣- عَنْ مَسْرُوقٍ رحمه الله تعالى قَالَ: دَخَلْت عَلَى عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: يَا ايُّهَا النَّاسُ مَنْ عَلِمَ شَيْئًا فَلْيَقُلْ بِهِ وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلْ اللّٰهُ اعْلَمُ فَانَّ مِنْ الْعِلْمِ انْ يَقُولَ لِمَا لا يَعْلَمُ: اللّٰهُ اعْلَمُ قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ لِنَبِيِّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ﴿قُلْ مَا اسْالُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ اجْرٍ وَمَا انَا مِنْ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾. (سبق في : رقم : ٥١٨ تجريد =١٠٠٧ فتح =مجلد/١ ل: ٤٩٢ ) + (راجع : ١٦٧٨)[٤٤٠].

## (تەفسیری سوورەتی(حم)ی (جاثیة)
## تفسير سورة حم (الجاثية)

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿وَمَا يُهْلِكُنَا الا الدَّهْرُ﴾ تا کۆتایی

١٦٩٤- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ يُؤْذِينِي ابْنُ ادَمَ يَسُبُّ الدَّهْرَ وَانَا الدَّهْرُ بِيَدِي الامْرُ اقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ( الحديث ٤٨٢٦- طرفاه في: ٦١٨١- ٧٤٩١ )[٤٤١].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( خوای گەورەو سەروەر دەفەرموێ : ئادەمیزاد ئازاری من دەدات،

---

(٤٤٠) راجع رقم: ٥١٨ المترجم .

(٤٤١) اخرجه مسلم في الالفاظ من الادب و غيرها ... النهي عن سب الدهر ، رقم:٢٢٤٦ .

کاتێ جنێو بە چەرخ وبەگەردون دەدا، وەکوو ئەوەی کاتێ کەسێ هەست بە ئێش وئازارێ دەکا، لە داخی دڵی خۆی ناسوپاسی دەکا ودەڵێ: ئەی فەلەك واو وات لێ بکرێ، یادەڵێ: ئەی گەردونی چەپ گەرد ! بزانن گەردوون یا فەلەك، یا چەرخ، هیچی بەدەست نییە، ئەوەی کە ئێوە نیسبەتی لە گەردوون دەدەن ودەڵێن : گوایە هەموو کاروبارێ، چەرخ وگەردوون هەڵی دەسوڕێنێ ئەوە وا نییە، بەڵکوو من خۆم هەموو شتێ هەڵ دەسوڕێنم، گەردوون وەك هەموو شتێکی تر من دروستم کردووە، ئەو چی بەدەستە، هەموو کارو بارێ بە دەستی خۆمە، خۆم ئەم شەو ورۆژەم دروست کردووە، خۆم تاو وتوێیان دەکەم و دەیان هێنم ودەیانبەم ) (تاج/٧ ل/١٣٦ ز/٢٨ - سوورەتی جاثية ژ/١).

## تەفسیری سوورەتی (حامیم)ی ئەحقاف
## تفسيرسورة (الاحقاف)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ فَلَمَّا رَاوْهُ عَارِضا مُسْتَقْبِلَ اوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذا عَارِض مُمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُمْ بِهِ: رِيحٌ فِيهَا عَذابٌ الِيمٌ﴾٢٤/٤٦

١٦٩٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: (مَا رَايْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضاحِكًا حَتَّى ارَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ انَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ قَالَتْ: وَكَانَ اذا رَاى غَيْمًا اوْ رِيحًا عُرِفَ فِي وَجْهِهِ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ انَّ النَّاسَ اذا رَاوْا الْغَيْمَ فَرِحُوا رَجَاء انْ يَكُونَ فِيهِ الْمَطَرُ وَارَاكَ اذا رَايْتَهُ عُرِفَ فِي وَجْهِكَ الْكَرَاهِيَةُ؟ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ مَا يُؤْمِنُنِي انْ يَكُونَ فِيهِ عَذابٌ؟ عُذبَ قَوْمٌ بالرِّيحِ وَقَدْ رَاى قَوْمٌ الْعَذابَ فَقَالُوا: هَذا عَارِض مُمْطِرُنَا (راجع هامش

رقــم : ١٢٩٣ =ج/٣ل –٤٢٤ (المترجــم ). (الحــديث ٤٨٢٨– ٤٨٢٩ ) لەپێشەوە بەتەواوی ڕۆیشت بڕوانە : ژ: ١٢٩٣ )[٤٤٢].

## تەفسیری سوورەتی موحەممەد ﷺ
## تفسير سورة محمد ﷺ

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ وَتُقَطِّعُوا ارْحَامَكُمْ﴾ ٤٧/٢٢

١٦٩٦– عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عنـهُ) انَّ رَسُولَ اللّـهِ (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَلَقَ اللّهُ الْخَلْقَ فَلَمَّا فَرَغَ مِنْهُ قَامَتْ الرَّحِمُ فاخذت بحَقوِ الرحمنِ فَقَالَ لَهُ: مَهْ، قَالَتْ: هَذا مَقَامُ الْعَائِذ بِكَ مِـنْ الْقَطِيعَـةِ فَقَـالَ: الا تَرْضَـيْنَ انْ اصِـلَ مَـنْ وَصَلَكِ وَاقْطع مَنْ قَطعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى يَاربِّ قَالَ: فَذلِكِ لَكِ ثمَّ قَـالَ ابُـو هُرَيْـرَةَ: اقـرؤوا انْ شـئتُمْ: ﴿فَهَـلْ عَـسَيْتُمْ انْ تَـوَلَّيْتُمْ انْ تُفْـسِدُوا فِـي الارْض وَتُقَطِّعُـوا ارْحَـامَكُمْ﴾. ( الحـديث ٤٨٣٠– اطرافـه فـى: ٤٨٣١– ٤٨٣٢– ٥٩٨٧– ٧٥٠٢)[٤٤٣].

١٦٩٦م– وعنهُ (رَضِيَ اللهُ عنهُ)، في رواية، قال: قالَ رسول اللهِ (صَـلّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اقْرَءوا انْ شِئْتُمْ ﴿فَهَـلْ عَـسَيْتُمْ﴾. (الحـديث ٤٨٣٢– طرفـه فـى: ٤٨٣٠).

ئـەبو هـورەیرە(رەزای خـودای لـێ بێ) فـەرمووی: خۆشـەویـست (درودی خودای لـێ بێ) فـەرمووی: ( ئـەو كاتـەی خـودا ئـەم بوونـەوەرەی دروسـت كـرد ولێ بوویـەوە لێی، خزمایەتی (ڕەحم) هەڵسا كەمـەری خـودای میهرەبـانی گـرت و گـوتی :

(٤٤٢) راجع هامش رقم:١٢٩٣ = ج/٣ل –٤٢٤ ، المترجم .

(٤٤٣) اخرجه مسلم في البرّ و الصّلة و الاداب، بـاب: صـلة الرّحم و تحـريم قطعهـا ، رقـم: ٢٥٥٤ .

دەستم دامێنت! خودا فەرمووی پێی: بۆ وا دەکەی، داوات چییە لێم بیلێ؟ خزمایەتی، گوتی : بۆ ئەوە هەڵساوم ئا لەم شوێنەداکەمرت دەگرم پەنام بۆ هێناویت و سکاڵا دەکەم لەدەستی ئەو کەسانەی کەمافی من بەجێ ناهێنن و، ڕشتەی پەیوەندی خزمایەتی دەبڕن، خودای گەورەش دەفەرموێ : ئەی خزمایەتی! ئایا ڕازی دەبی بەوەی کە هەر کەسێ پێ لە تۆ نەبڕێ و پەیوەستی هەبێ لە گەڵتا وخزم دۆست بێ، منیش پێ لەئەو نەبڕم وپەیوەستیم هەبێ لە گەڵیاو وبۆی باش بم، وەئەو کەسەشی پێ لەتۆ ببڕێ وپەیوەستی نەبێ لەگەڵتاوخزم دۆست نەبێ، منیش پێ لەئەو ببڕم و پەیوەستیم نەبێ لە گەڵیا؟ ئایا بەم بەڵێنە ڕازی دەبی؟ خزمایەتی گوتی : بەڵێ ئەی پەروەردگارم ! من بەمە ڕازیم، فەرمووی: (دەی ئەمە پەیمان بێ لەبەینی من وتۆدا ).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەگەر ئارەزو دەکەن، بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە، ئەم ئایەتە بخوێنن، کە ئەم مەبەستە دووپات دەکاتەوە: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ انْ تَوَلَّيْتُمْ انْ تُفْسِدُوا فِي الارْض وَتُقَطِّعُوا ارْحَامَكُمْ﴾ ٢٢/٤٧ واتە : چی چاوەڕوانی دەکرێت لە کار بەدەستانی بەدکارانی ئێوە و، لە ناموسڵمانان، غەیری ئەوە : کاتێ ببن بە بەر پرسانی ولات، دەس بکەن بەخراپە کاری وپشێوی نانەوە لەولات داو ڕشتەی خزمایەتی بپچڕن و مافی خزم وکەس وکار پێشێل بکەن؟). (تاج/٧ ل/١٤٣ ز/٣ ژ/٢- شەیخان).

## تەفسیری سوورەتی ق (تفسير سوره ق)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ﴾ ٥٠/٣٠

١٦٩٧- عَنْ انَسٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ:يُلْقَى فِي النَّارِ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ ﴾حَتَّى يَضعَ قَدَمَهُ فَتَقُولُ:قَط قَط). (الحديث ٤٨٤٨ – طرفاه في: ٤٨٥٠، ١٤٤٩).

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( دۆزەخ هەر لرفەی دێ، هەر پڕنابێ پەیتا پەیتاهەر خەڵکی تێ فڕە دەدەن و هەر پڕنابێ و دەڵێ : ئەگەر ماوە بابێ! هەتا خودا پای عیززەتی دادەنێ لەسەری، ئەوکاتە دەڵێ: ئیتر بەسە، ئیتر بەسە، ئیتر جێگە نەما، جا ئەو جا پڕدەبێ‌و دەپەچنێ بەسەر یەکاو، لەناو خۆیدا پەنگ دەخواتەوە! (. )تاج/٧ ل/١٥٧ ژ/٢ ز/٢٤ –ش ).

١٦٩٨- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (تَحَاجَّتْ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَقَالَتْ النَّارُ: اوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ وَقَالَتْ الْجَنَّةُ: مَا لِي لا يَدْخُلُنِي الا ضعَفَاء النَّاسِ وَسَقَطهُمْ قَالَ اللَّهُ تَبارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنَّةِ: انْتِ رَحْمَتِي ارْحَمُ بِكِ مَنْ اشَاء مِنْ عِبادِي وَقَالَ لِلنَّارِ: انَّمَا انْتِ عَذابِي اعَذبُ بِكِ مَنْ اشَاء مِنْ عِبادِي وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا فَامَّا النَّارُ فَلا تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضعَ رِجْلَهُ فَتَقُولُ: قَط قَط قَط، فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضهَا الَى بَعْض وَلا يَظلِمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ خَلْقِهِ احَدًا وَامَّا الْجَنَّةُ: فَانَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا). (الحديث ٤٨٥٠- طرفاه في: ٤٨٤٩- ١٤٤٩ )[٤٤٤].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی : ( بەهەشت ودۆزەخ دەبێ بە دەمە قاڵە یان، دۆزەخ دەڵێ : خۆ بە زلزان و زەبرو زەنگەکان تەرخان کراون بۆ من، بەهەشتیش دەڵێ: ئەی من چیمە، کەوا هەر لازە بوونەکان وبێنەوایانی ئەو خەڵکەم تێ دێن وبووم بەجێگەی دوارۆژی ڕەش وڕوتەکان ! ئەوجا خوای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەی بەهەشت تۆ ڕەحمەتی منی، هەر کەسێ بمەوێ لەبەندەکانی

(٤٤٤) - اخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمها واهلها..النار يدخلها الجبارون .. رقم:٢٨٤٦ .

خۆم، ڕەحمی پێ دەکەم وتۆ دەکەم بە شوێنی ڕەحمەت بۆی، ومبە دۆزەخیش دەفەرموێ: ( تۆ هۆی سزا پێ دانی منی، هەر کەسێ خۆم بمەوێ، لەبەندەکانی خۆم بەتۆ سزای دەدەم وتۆ دەکەم بەجێگای سزادانی، ومبەڵێنە لەسەرم کە هەردو لاتان پڕبکەم، هەرکەسەتان لەئەهلی خۆی، بەلام دۆزەخ هەر لرفەی دی، هەر پڕنابێ، پەیتا پەیتا هەر خەڵکی تێ فڕە دەدەن و هەر دەڵێ : ئەگەر ماوە بابێ، هەتا خودا پای عیززەتی دادەنێ لەسەری، ئەوکاتە وازدێنێ و دەڵێ: بەسە، بەسە، بەسە، ئیتر جێگە نەما، جا ئەو جا پڕدەبێ‌و دەپەچنێ بەسەر یەکاو، لەناو خۆیدا پەنگ دەخواتەوە ( ) دیارە کە خوای گەورەو خاوەن شکۆ زۆرو ستەم لە کەس ناکا، لەدروست کراوەکانی خۆی، وەهەروەها بەهەشتیش هەر پڕنابێ وشوێنی وای هەیە، هەر چۆڵ دەبێ، هەتا خودا لە نوێ خەڵکی تری بۆ دروست دەکا و بەوان پڕی دەکا!). (تاج/٧ ل/١٥٧ ز/٣٣ ژ/٢- ش ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە جۆرە ئەدەبێکی ڕەمزی وا تیادا مەبەست لەم جۆرە تەعبیرە ڕاکێشانی سەرنجی گوێگرانە، بۆ گرنگی وعەنتیکەیی و پێچیدەیی بابەتەکە، زانایان بە شێوەی گشتی لەم جۆرە جێگایانەدا دوو فەرمایشتیان هەیە:

یەکەم: ئیمامی نەوەوی وزانایانی گەورە گەورەتر دەفەرموون: (ئەم فەرمودەیە بەپێی زاهیرەکەیەتی، خودای گەورە لەبەهەشت ودۆزەخ دا هەست وفام دروست دەکاو، بەوهەست وفامە دەتوانن ئەم جۆرە گفتوگۆو دەمەقاڵێ‌و بەلگەسازیە ئەنجام بدەن ئەمەش لەگەڵ سوننەتی صەحیح و دەقی قورئان دا ڕێك دەکەوێ، کە دەفەرموێ: ﴿أنطقَنا الله الذي انطقَ كلَّ شيئ﴾).

دووەم: (ئەمە تەمسیلە بەلیسانی حاڵ ) کەواتە مەرج نیە، ئەم جۆرە شتانە لەسەر ڕووی ڕاستەقینە (وجهی حقیقە) بێ، بەڵکو بۆ ئەوەیە بیسەر لەحاڵەکە حاڵی بێت و بەس، بەهرەی ئەم ڕاجیاییەش ئەوەیە کە بۆ ئێمە دروستە بەپێی ئامادەیی گوێگر، باسی یەکێ لەم دوو ڕایەی بۆ بکەین.

١٦٩٩- عن جُبَيْرِ بْنِ مُطعِمٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَا فِي الْمَغْرِبِ بالطورِ فَلَمَّا بَلَغَ هَـذِهِ الايَـة : ﴿امْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ امْ هُمْ الْخَالِقُونَ امْ خَلَقُوا السَّمَوَاتِ وَالارْض بَلْ لا يُوقِنُونَ امْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ امْ هُمْ الْمُسَيْطِرُونَ﴾ قَالَ: كَادَ قَلْبِي انْ يَطِيرَ. ( الحديث ٤٨٥٤- طرفه فى: رقم : ٤١٦ تجريد = ٧٦٥ فتح البارى = المجلّد الاوّل باللغة الكردية من ترجمة هذا الكتاب المبارك ص ٤٠٠ )[٤٤٥].

جوبەیری کوڕی موتعیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) لە نوێژی شێواندا سوورەتی گوری دەخوێند کە گەیشتە سەر ئەم ئایەتانە : ﴿ام خلقوا...﴾ هەتا ﴿المسيطرون﴾٥٢/٣٥- ٣٧، واتە ئایا هۆش وبیری ساغ ڕێی ئەوە دەدا کەئەو خەڵکەو ئەو بوونەوەرە سەیرو عەنتیکەیە، هەروا لەخۆیەوەو بە هەوانتە، بە بێ دروست کارێکی دانا و زانا پەیدا بووبێ، ئایا ئەم سەرکەشە بێباوەڕانە خۆیان دروست کەری خۆیان بن، بۆیە بەندەیی بۆ خودا ناکەن یا بەعەقڵی کادا دەچێ کە ئەم هەموو ئاسمانە گەورانە، وەئەم زەویە پان وپۆڕو بەرینە بەدەستی ئەو لاژگ وگەوجانە دروست کرابا، دیارە کەئەم داوایانە وبۆچونانە هەموویان پوچن، کەوابوو هۆی ئەم بێباکی ئەمانە ئەوەیە کەنەزانن ونەفامن وبێباوەڕن، دیارە بۆیە ش ددان نانێن بە پێغەمبەرایەتی تۆدا، چونکە خۆیان کلیل بەدەستی گەنجینەکانی خودان ! یاخود خۆیان بۆ هەموو شتێ بە دەسەلاتن وبەبێ ڕەزای ئەوان کەس ناتوانێ پەنجە بکات بە ئاودا. جوبەیر (ڕەزای خودای لێ بێ)

(٤٤٥) راجع رقم:٤١٦ - المترجم .

فەرمووی: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە گەیشتە سەر ئەم ئایەتانە، وابەجوانی وتەئسیر و بەدەنگی خۆش وپڕ سام و شکۆ خوێندی، کاری تێ کردم وسام وشکۆیەکی وا گرتمی وەختە بوو دڵم بفڕێ و بەندی دڵم بپچڕێ، ( تاج/٧ ل/١٦١ ز/٣٥).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەو کاتەی کە جوبەیر گوێ لەم نوێژەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەگرا هێشتا موسڵمان نەبوو بوو، وە کاتێ ئە م فەرموودەیەی دەگێڕایەوە موسڵمان بوو بوو، ئەمەش ئەوەیە کەلەزانستی فەرموودەدا کراوە بەم یاسایە: (صحّة اداء ما تحمّلهُ الرّاوي في حال الكفر وكذا الفسق اذا ادّاهُ في حال الاسلام و العدالة) ئەوەی کە ڕاوی لەکاتی کافری، یا کاتی فاسقی، دەیبیستێ یا دەیبینێ دروستە لەپاش ئیسلام بوون بیگێڕێتەوە وەبە صەحیح دادەنرێ بەمەرجی دادپەروەری).

## تەفسیری سوورەتی (والنجم) (تفسير سورة (والنجم))

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ افَرَايْتُمْ اللاتَ وَالْعُزَّى﴾ ١٩/٥٣

١٧٠٠- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: وَالّلاتِ وَالْعُزَّى فَلْيَقُلْ: لا الَهَ الا اللّٰهُ وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: (تَعَالَ اقَامِرْكَ فَلْيَتَصَدَّقْ)(الحديث ٤٨٦٠- اطرافه فى: ٦١٠٧- ٦٣٠١- ٦٦٥٠ ) عن ابن عباس (رَضيَ اللهُ عَنهُما) في قولهِ: (الّلات و العزّى) كان اللات رجلا يلتُّ سويقَ الحجّاج. ( الحديث ٤٨٥٩ )[٤٤٦].

---

(٤٤٦) اخرجه مسلم في الايمان، باب: من حلف باللات و العزى .. رقم:١٦٤٧ .

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان سوێندی خوارد ولەسوێندە کەیدا گوتی: بەلات و بە عوززا، بابڵێ: (لاالە الا اللە) ئەوکەسەیشی بەهاوڕێکەی بڵێ : وەرە با قومار بکەین، باخێرێ بکا، لە کەفارەتی ئەو قسە پیسەدا ). (تاج/٣ ل/٣٢٤ ز/١٢٤ ژ/٢- ش/ د/ ت/ ن ). ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) لە تەفسیری ئایەتی (اللاتَ وَالْعُزّى)دا فەرمووی: لات پیاوێك بوو قاوتی بۆ حاجییان دەگرتەوە ).

## تەفسیری سوورەتی (قەمەر ) ﴿اقتَرَبَتِ السّاعة﴾ ١/٥٤

## تفسير سورة القمر

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿بَلْ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ اذْهَى وَامَرُّ﴾ ٤٦/٥٤

١٧٠١- عن عَائِشَةَ امِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْها) قَالَتْ: (لَقَدْ انْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَكَّةَ وَانّي لَجَارِيَةٌ الْعَبُ ﴿بَلْ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ اذْهَى وَامَرُّ﴾. (الحديث ٤٨٦٧- طرفه في: ٤٩٩٣)(٤٤٧)

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارە وە لە مەککە وە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەوسا من کچۆڵەیەکی منالکار بووم لەناو منالاندا یاریم دەکرد.

## تەفسیری سوورەتی ڕەحمان (تفسير سورة الرحمن)

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿ وَمِنْ دُونِهِمَا جَنَّتَانِ﴾ ٦٢/٥٥

---

(٤٤٧)لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عائشة في نزول﴿بل الساعة موعدهم﴾ فتح/٩ص٧٧٣- المترجم

١٧٠٢- عنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْن قَيْس (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ جَنَّتَانِ مِنْ فِضةٍ انِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَانِ مِنْ ذهَبٍ انِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ انْ يَنْظرُوا الَى رَبِّهِمْ الا رِدَاء الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ). (الحديث ٤٨٧٨- طرفاه فى: ٤٨٨٠- ٧٤٤٤ )[٤٤٨]

عەبدوڵلای کوڕی قەیس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هەموو خوا پێداوێ لەناو بەهەشت دا دوو بەهەشتی هەیە، کە قاپو قاچاخ وتفاقی ناویان هەمووی لە زیون وە دوو بەهەشتیشی هەیە، کە قاپو قاچاخ وتفاقی ناویان هەمووی لە زێڕن، بەهەشتییەکان وان لەناو بەهەشتی عەدن دا، کە بەڕاستی جێگای حەوانە وەو نیشتەجێ بوونە، هەموو ئاواتێکیان هاتووەتە دی، تەنیا ئەو تاقە ئاواتەیان ماوە کە تەماشای زاتی خودا بکەن، ئەگەر لەبەر تارای مەزناهی وپەردەی گەورەیی و شکۆمەندی نەبێ، کە بەسەر زاتی پاکی خوداوە، ئەو ئاواتەشیان دەهاتە دی وبەچاوی سەر چاویان دەکەوت بە زاتی خودای پەروەردگاری خۆیان ).
(تاج/٧ ز/٣٨ ل/١٧٤ ژ/٢- سوورەتی ڕەحمان ).

١٧٠٣- عنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ قَيْسٍ انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: انَّ فِي الْجَنَّةِ خَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ عَرْضهَا سِتُّونَ مِيلا فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا اهْلٌ مَا يَرَوْنَ الاخَرِينَ يَطوفُ عَلَيْهِمْ الْمُؤْمِنُونَ وَجَنَّتَانِ مِنْ فِضةٍ انِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَانِ مِنْ كَذا انِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ انْ يَنْظرُوا الَى رَبِّهِمْ الا رِدَاء الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ). (الحديث ٤٨٧٩- طرفه فى: ٣٢٤٣. والحديث ٤٨٨٠ طرفه فى : ٤٨٧٨)[٤٤٩].

ئەبوموسای ئەشعەری کەناوی عەبدوڵلای کوڕی قەیسە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەبەهەشتا چادری وا

---

(٤٤٨) اخرجه مسلم في الايمان، باب: اثبات رؤية المؤمنين في الاخرة ربهم ... رقم:١٨٠ .

(٤٤٩) اخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمها، باب: في صفة خيام الجنة .. رقم:٢٨٣٨ .

هەیە، بریتیە لە یەك دەنك مرواری هلۆل، پانیەكەی شەست میلە، لە هەموو گۆشەیەك لە گۆشەكانیدا خێزانێكی وا تیادا، كە هەمیشە چاویان بڕیوەتە هاوسەرە كانی خۆیان و دڵیان لای كەسی تر نییە، ئەوانەی كەوان لەناو یەكێ لەم گۆشەیانەدا چاویان لەو خێزانەیتر نییە كەوان لەناو گۆشەكانیتری ئەم چادرەدا، ئیتر پیاوە موسڵمانەكان بە ئارەزوی دڵی خۆیان گۆشە بە گۆشە دەسوڕێنەوە بەسەر ئەم خێزانانەی خۆیاندا وەك خودا لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿حورٌ مقصوراتٌ في الخيامِ﴾ ٥٥/٧٢، واتای فەرموودەی ژمارە (٤٨٨٠) لە ژمارە (٤٨٧٨) دا ڕابوورد.

## تەفسیری سوورەتی مومتەحینە (تفسير سورة الممتحنة)

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿لا تَتَّخِذوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ اولِيَاء﴾ ٦٠/١

١٧٠٤- عنْ عَلِي بن ابي طالب (رَضيَ اللهُ عنهُ) قال: بَعَثنِي رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انا وَالزُّبَيْرَ وَالمِقْدَادَ فَقَالَ: انطلِقُوا حَتّى تَاتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ فَانَّ بِهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ فَخُذوهُ مِنهَا، فَذهَبْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتّى اتَيْنَا الرَّوْضَةَ فَاذا نَحْنُ بالظعِينَةِ فَقُلْنَا: اخرِجِي الْكِتَابَ فَقَالَتْ: مَا مَعِي مِنْ كِتَابٍ فَقُلْنَا: لَتُخرِجِنَّ الْكِتَابَ اوْ لَنُلْقِيَنَّ الثيَابَ فَاخرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا.

فَاتَيْنَا بِهِ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاذا فِيهِ مِنْ حَاطِبِ بْنِ ابِي بَلْتَعَةَ الَى انَاسٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِمَّنْ بِمَكَّةَ يُخبِرُهُمْ بِبَعْض امْرِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا هَذا يَا حَاطِبُ؟) قَالَ: لا تَعْجَلْ عَلَيَّ يَارَسُولَ اللّهِ انّي كُنتُ امْرَا مِنْ قُرَيْشٍ وَلَمْ اكُنْ مِنْ انْفُسِهِمْ وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ لَهُمْ قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ بِهَا اهْلِيهِمْ وَامْوَالَهُمْ بِمَكَّةَ فَاحْبَبْتُ اذ فَاتَنِي مِنْ النَّسَبِ فِيهِمْ انْ اصْطنِعَ الَيْهِمْ يَدًا يَحْمُونَ قَرَابَتِي وَمَا فَعَلْتُ ذلِكَ كُفْرًا وَلا ارْتِدَادًا عَنْ دِينِي.

فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (انَّهُ قَدْ صَدَقَكُمْ) فَقَالَ عُمَرُ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَاضرِبَ عُنُقَهُ فَقَالَ: (انَّهُ شَهِدَ بَدْرًا وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ اطلَعَ عَلَى اهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ) قَالَ عَمْرٌو: وَنَزَلَتْ فِيهِ ﴿يَا ايُّهَا الَّذِينَ امَنُوا لا تَتَّخِذوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ اوْلِيَاءَ﴾. ( الحديث ٤٨٩٠- اطرافه في: ٣٠٠٧- ٣٠٨١- ٣٩٨٣- ٤٢٧٤- ٦٢٥٩- ٦٩٣٩ )(٤٥٠).

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ بێبڕواکانی مەککە پەیمانەکەی حودەیبیە یان شکاند، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بڕیاری دا کە شاری مەککە بگرێ، وە فەرمانیدا بەموسڵمانەکان کەخۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ، حاطەبی کوڕی ئەبوبەلتەعە، لە ژێرەوە کاغەزا دەنووسا بۆ دانیشتوانی مەککە، کە ئاگاتان لەخۆتان بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەم ڕۆژانەدا دێتە سەرتان و دەدا بەسەرتانا، وە بەدزییەوە بەژنێکی مەککەیدا دەینێرێ بۆیان.

جا حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای لە با) دێ بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) وە ئەم هەواڵەی پێ دەداو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) من و زوبەیر و میقدادی ناردو، فەرمووی: (بڕۆن هەتا دەگەنە باخچەی خاخ لەوێدا ئافرەتێکی کەژاوە نشینی لێیە، کاغەزێکی پێ یە لێی بسێنن، ئەگەر کاغەزەکەی نەدا پێتان بیکوژن، جا بە غار ڕۆیشتین ومایینەکانمان تاودا، هەتا چووینە باخچەکە، کە سەیرمان کرد واژنەکە لەوێیە، وە داوای کاغەزەکەمان لێکرد، حاشای کرد وگوتی: کاغەزم پێ نییە. جا گوتمان: یا کاغەزەکەمان دەدەیتێ یا دەبێ خۆت ڕووت و قوت بکەیتەوە یا دەتکوژین، ئەوجا ژنە کە کاغەزەکەی لەناو لۆی پەلکەکانیدا دەرهێناو، ئەوجا ژنەکەو نامەکەمان برد بۆ لای پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) کە نامەکەمان خوێندەوە

---

(٤٥٠) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل اهل البدر رضي الله عنهم ، رقم: ٢٤٩٤

ئەمەی لێ نوسرابوو: حاطەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە وە بۆ فیسارە کەس و ئەوفیسارە کەس کەناوی چەند کەسێ بوون لە نا موسڵمانەکانی مەککە، وە هەواڵی هەندێ لە کاروباری پێغەمبەری بۆیان نووسیبوو، کەدەیەوێ بچێ بۆ سەریان، جا پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لێ بێ) حاطەبی بانگ کردو پێی فەرموو: (ئەی حاطەب ئەمە چییە؟ ئەم کاغەزەت بۆ نوسییوە؟ ئەویش گوتی : ئەی پێغەمبەری خودا پەلەم لێ مەکە تا مەسەلەکەتان بۆ ڕون دەکەمەوە، بە خودا ئەوەتی موسڵمان بووم نە لە دیین هەڵگەڕاومەتەوە و، نە ناپاکی و منافقیم کردووە، بەڵام من بابایەکی بەڕانی بووم لەناو هۆزی قوڕەیشدا بووم ولە خۆیان نەبووم وژن ومنداڵەکانم لەناو ئەواندا بەجێ ماون ئەم هەموو کۆچکەرانەی تر کە لەگەڵ تۆدان، هەموو کەس وکارو وخزم و خوێشیان لە مەککە هەیە، کە ئاگاری منداڵە کانیان دەکەن، لەوێتەنیا من نەبێ، لەبەر ئەوەی کە بەخزمایەتی هیچم بۆ ناکرێ، ویستم بەم شێوەیە دەستیاوێکیان لەگەڵدا بکەم، هەتا بەرابەر بەوە ئەوانیش ئاگاداری خزمەکانم بکەن، ئەگینا نە لەبەر بێبڕوایی ونە لەبەر هەڵگەڕانەوە لەئاییینی خۆم ئەمەم نەکردووە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: قسەی ڕاستی بۆ کردن. عومەر (رمزای خودای لێ بێ)فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا لێم گەڕێ ئەمەناپاکە با لەملی بدەم؟ فەرمووی(دروودی خودای لێ بێ) : (ئەمە لەیارانی بەدرە، چۆنی دەکوژیت؟ چونکە خودای گەورەو سەروەر، ڕووی قسەی کردووەتە یارانی بەدرو پێی فەرمون : بەئارەزوی خۆتان ئیتر چی دەکەن بیکەن، من هەر لە ئێستاوە لێتان خۆش بووم، لەبەر ئەوەی کەبەشداری ئەم جەنگە پیرۆزەتان کردووە، جا لەشانی ئەوەدا ئەم ئایەتە دابەزی :﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ ٦٠/١ (ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان! هەرگیزاو هەرگیز

کافرو بابڕوایان –کە هەم دوژمنی من وهەم دوژمنی ئێوەن –مەگرن بە دۆستی خۆتان ). (تاج/٧ ز/٤٣ ژ/١ ل/١٩١ - ش/د/ت ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەم چەند شتە :

١- گوناه وتاوان، هەتا جاسووسیکردن بەسەر پێغەمبەر ولەشکری ئیسلامەوە ئەگەر بەتەئویل بێ، مرۆڤ پێی کافر نابێ.

٢- عوزرێ عەقڵ بیگرێ واباشە قەبووڵ بکرێ (ادرؤا الحدوذ بالشبُهاتِ).

٣- پەلە لەحوکم و بڕیاردان نەکرێ، ڕێگەی گومانبار(متهم ) بدرێ هەتا بە تەواوی قسەی خۆی بکاو بەرگری لەخۆی بکا، ئەگەر بەرگرییەکەی ڕاست بوو بڕوای پێ بکرێت، وە بەپێی توانا چاوپۆشی لە کار بکرێ وە دادوەر تابۆی دەکرێ، ئەگەر بەڵگەو شایەت نەبوو لایەنی گومانبار بگرێ.

٤- ئەم تەخویلەی لەم فەرموودەیەدا هەیە، کەئەهلی بەدر بەکەیفی خۆیان: چی دەکەن بیکەن واتای وانییە :

ا. ئەگەر تاوانێ بکەن شایانی داری حەددبێ، داری حەدیان لێ نادرێ، شتیوا نییە، بەڵکو لە کاتی وا دا اجرای بڕیاری شەرعیان بەسەردا دەکرێت.

ب. مەبەست ئەوەیە لە قیامەت دا سزا نادرێن وبەس.

ج. مەبەست ڕێز گرتنە لە ئەهلی بەدر، دەنا مەبەست ئەوە نییە کە بەکەیفی خۆیان گوناه وتاوان تێ گوشن بە بێ لێپرسینەوە وە جۆرە سەرمەشقێکە لەمەسەلەی ﴿انَّ الحسَناتِ يذهِبنَ السّيئات﴾.

٥- وا باشە حەددی شەرعی، بەپێی توانا تەئویل بکرێ و لەبەر شوبهەو شتیوا جابەجا نەکرێ، مەبەست لێی چاوترساندن بێ، نەوەك ئینتیقامی شەخصی.

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

**﴿ اذا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبايِعْنَكَ﴾ ٦٠/١٢**

**١٧٠٥- عَنْ امِّ عَطِيَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (بايَعْنَا رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَرَا عَلَيْنَا: ﴿انْ لا يُشرِكْنَ باللّهِ شَيْئًا﴾ وَنَهَانَا عَنْ النِّيَاحَةِ فَقَبَضتْ امْرَاةٌ يَدَهَا فَقَالَتْ: اسْعَدَتْنِي فُلانَةُ اريدُ انْ اجْزِيَهَا فَمَا قَالَ لَهَا النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَيْئًا فَانْطلَقَتْ وَرَجَعَتْ فَبايَعَهَا). (الحديث ٤٨٩٢- سبق طرفه في: رقم: ٦٢٨ تجويد =١٣٠٦ فتح =مجلد/٢ص ٥٣ )[٤٥١].**

**ئوم عەطییە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: کاتێ پەیمانمان بەست، ئێمەی ژنان لەگەڵ پێغەمبەر دا** (درودی خودای لێ بێ) **ئەم ئایەتەی بەسەرماندا خوێندەوە :﴿ انْ لا يُشرِكْنَ باللّهِ شَيْئًا﴾ ٦٠/١٢، واتای تەواوی ئایەتەکە ئاوایە : ئەی پێغەمبەر! کاتێ ئافرەتە موسڵمانەکان هاتن بۆ لات، کەپەیمان وبەیعەتت بدەنێ، لەسەر ئەوە پەیمانیان لێ وەربگرە کە : بە هیچ جۆرێ هاوبەش بۆ خودا بڕیارنەدەن و دزی نەکەن وحیزی نەکەن ومنداڵی خۆیان نەکوژن وکچی خۆیان زیندە بەچاڵ نەکەن وبوختانی درۆ لەنێوان دەست وپای خۆیاندا نەکەن واتە: منداڵی بێگانە نەهێنن و لە بەینی دەست پای خۆیانا دایبنێن و بەدرۆ و ناهەق بیکەن بەمنداڵی مێردەکەیان وە لەکردنی کاری خێردا نا فەرمانی تۆ نەکەن وسەرپێچی لە فەرمانی تۆ نەکەن، جا لەپاش ئەمە لەخودا بپاڕێرەوە بۆیان کە خودا لێیان خۆش ببێ، بەڕاستی خودا تاوان بەخش ومیهرەبانە (تاج/١ ل/٤٩).**

**وە پێغەمبەر** (درودی خودای لێ بێ) **نەهی لێ کردین لە شین وشەپۆڕ لەسەر مردوو، جا لەم کاتەدا ژنێ لە ژنەکان کەئوم عەتێ خۆی بووە، دەستی خۆی کێشایەوە لە پەیمانەکەو، گوتی: (کاتی خۆی فیسارە ژن لە گەڵمدا شیوەنی**

---

**(٤٥١) اخرجه مسلم في الجنائز، باب: التشديد في النياحة ، رقم:٩٣٦ .**

بۆم گێڕاوە، ئەو دەستیاوەی لەسەرمە، دەمەوی ئێستا ئەو قەرزەی بدەمەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هیچی پێ نەگوت و لێی بێدەنگ بوو ژنەکە رۆیشت وشین و زاریەکەی لەگەڵ دەستە خوشکەکەی کرد، وگەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر و پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەر دا بەست ).

**ڕوونکردنەوە:**

لە هەندێ فەرمودەدا، جۆرە ئاسان کاری یەکێرەچاو نەکراو هەیە، وەك فەرموودەی پێشوو، وە هەروەها ئەم فەرموودەیەی کە بۆنی ئەوەی لێدا شین وزاری بۆ مردوو دروست بێ، لەبەر ئەوە نابێ بەپەلە حوکم وبڕیار لەکاتی وا دا لەو جۆرە فەرموودەیێ وەربگیرێ.دەبێ بەوردی موتالای شەرح وکتێبی شەرع لەکاتی وا دا بکرێ.

## تەفسیری سوورەتی جوموعە (تفسير سورة الجمعة)

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿وَاخَرِينَ منْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾ ٣/٦٢

١٧٠٦- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَانْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْجُمُعَةِ ﴿وَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾ قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَلَمْ يُرَاجِعْهُ حَتَّى سَالَ ثلاثا وَفِينَا سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ وَضعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ ثمَّ قَالَ: (لَوْ كَانَ الايمَانُ عِنْدَ الثريَا لَنَالَهُ رِجَالٌ اوْ رَجُلٌ مِنْ هَؤُلاء). ( الحديث ٤٨٩٧- طرفه في: ٤٨٩٨)[٤٥٢].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ)فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دانیشتبووین، لەو کاتەدا سوورەتی جوموعە هاتە خوارێ بۆی، کە ئەم

(٤٥٢) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضل فارس ، رقم:٢٥٤٦ .

ئایەتەی خوێندەوە :﴿ وَاخَرِينَ منهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾٢/٦٢ واتە : هەروا ئەم ڕەهبەرە نازدارە بە هۆی نامەی پیرۆزی خودایی و، بە هۆی فەرموودە بەرزەکانی خۆیەوە، گەلێ کەسانیش لە موسڵمانان، فێری یاسانامەی خوداو خێر وبێری هەردوو جیهان دەکا، کە ئەمانە هێشتا وان لە ژێر پەردەی غەیبەوەو، جارێ پەیڕەوی ئەمانەیان نەکردووە، بەڵام بەزوویی ئەوانیش وەك ئەمان ئەو ڕێگە حەقە دەگرن).

کاتێ خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە، پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا !! ئەوانە کێن؟ کە ئەم ڕێگەی هەقەی ئێمە بە زوویی دەگرن؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) وەلامی نەدایەوە، تا پیاوەکە سێ جار هەمان پرسیاری لێ دووبارە کردەوە: گوتی لەو کاتەدا سەلمانی فارسی لەناو کۆڕەکەماندا بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەستی خستە سەر ڕانی سەلمان و فەرمووی (ئەگەر گریمان ئیمان وئیسلامەتی لەسەر ئەستێرەی کۆش بێ، پیاوانێ لەمانە خۆیانی دەگەیەننێ !) (تاج/٥ ز/٧٢ ژ/٢- گەورەی ولاتی عەجەم = ولاتی فارس ).

**ڕوونکردنەوە:**

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەواتای وشەی (فارس )بفەرموو بڕوانە : (تاجول ئوصوڵ، بەرگی پێنجەم، ل : ٢٥٤- باسی فەزڵی فارس ).

## سوورەتی مونافیقین (سورة المنافقين)

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿اذا جَاءكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا: نَشْهَدُ انَّكَ لَرَسُولُ اللّٰهِ﴾١/٦٣

١٧٠٧- عَنْ زَيْدِ بْنِ ارْقَمَ (رَضيَ اللّٰهُ عنهُ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَمِّي في غَزاةٍ فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ ابَيّ ابْنَ سَلُولَ يَقُولُ: لا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللّٰهِ حَتَّى يَنْفَضوا منْ حولِهِ و لَئِنْ رَجَعْنَا الَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الاعَزُّ مِنْهَا الاذلَّ) فَذَكَرْتُ

ذلِكَ لِعَمِّي اوْ لعُمَرَ فَذكَرَه للنبيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَدَعاني فحدَّثتُهُ فارْسَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى عَبْدِاللّٰهِ بْنِ ابَيّ وَاصْحَابِهِ فَحَلَفُوا مَا قَالُوا فَكَذبني رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وصدَّقَهُ فاصَابَنِي هَمٌّ لَمْ يُصِبْنِي مِثلُهُ قَط فَجَلَسْتُ فِي البَيْتِ: فقالَ لي عمّي: ما اردتَ الى انْ كَذبَكَ رسول الله و مَقَتَكَ؟ فانْزَلَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿اذا جَاءكَ الْمُنَافِقُونَ﴾ فبَعَث الَيَ النبيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَرَاهَا؟ فقَالَ : (انَّ اللّٰهَ قَدْ صَدَّقَكَ يازيدُ). (الحديث ٤٩٠٠- اطرافه في: ٤٩٠١- ٤٩٠٢- ٤٩٠٣- ٤٩٠٤ )(٤٥٣).

زەیدی كوڕی ئەرقەم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ( جارێ لە خزمەتی مامەمدا بووم، لە غەزایەكدا، گوێم لێ بوو عەبدوڵلای كوڕی سەلول، دەیگوت :ماڵی خۆتان بۆ ئەوانە خەرج مەكەن كە وان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، هەتا بلاوەی لێ بكەن و لێی بتەكێنەوە. وە دەیگوت: (ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، لەوێ لەئێمەو لەدەستەی موحەممەد، كێمان بەدەست وبە دەسەلات و ئازاتر بێ، شاری مەدینە، بەدەستە كوونی وبێ دەسەلاتەكەی ترمان چۆڵ دەكەین! ).

منیش ئەمەم بۆ مامەم (یا بۆ عومەری كوڕی خەتتاب)- گێڕایەوە، ئەویش بۆ حەزرەتی دەگێڕێتەوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ)ناردی بە شوێن عەبدوڵلای كوڕی سەلول وهاوڕێكانیداو، باسە كەیان بۆ باس دەكا، كە ئێوە شتێكی واتان گوتووە، ئەوانیش حاشایان لێ كرد و، بەدرۆ سوێندیان خوارد كەئێمە قسەی وامان نەكردووە و، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) باوەڕی پێ كردن وباوەڕی بەمن نەكرد..

منیش توشی خەمێ وابووم، هەرگیز توشی خەمێوا نەبووبووم، لە ماڵەوە دەستە ئەژنۆ بەخەم وخەفەتەوە لێی دانیشتم، تا خواو ڕاسان خودای باڵا دەست وخاوەن شكۆ ئەم ئایە تانەی ناردە خوارەوە لە ﴿اذا جَاءكَ

(٤٥٣) اخرجه مسلم في اول كتاب صفات المنافقين واحكامهم، رقم:٢٧٧٢ .

الْمُنَافِقُونَ﴾ەوە هەتا ﴿لَيُخْرِجَنَّ الاعَزُّ مِنْهَا الاذَلَّ﴾ جا حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) ناردی بە شوێن من داو، ئایەتەکانی بۆم خوێندەوە و فەرمووی: ( ئەی زەید! قسەکەت ڕاست دەرچوو، چۆنت گوت وابوو، ئەوەتانێ خودا بەم ئایەتانە ڕاستیی قسەکەی تۆی دەرخست وئەوانی بەدرۆخستەوە ). (تاج/٧ ز/٤٦ ژ/١ ل/١٩٨- ش/ت) + (تەجرید/٢ ل/٢٩ ژ/٦٠٩ هەتا لاپەڕە: ٣٥) + ( ژمارە:٥٩٠ تەجرید = ل/١٠ بەرگی/٢).

١٧٠٧م– وعنهُ في روايةٍ قال: فَدَعَاهُمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ فَلَوَّوْا رُءوسَهُمْ. ( الحديث: ٤٩٠٣– طرفه في: ٤٩٠٠ )[٤٥٤].

لەگێڕانەوەیەکی تری زەیدی کوڕی ئەرقەمدا، فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) بانگی کردن کە بۆیان بپاڕێتەوە، کە چی لووتیان کرد بەو لادا و ڕوویان وەرچەرخان وبۆ پاڕانەوەکەی پێغەمبەریان ڕەت کردەوە.

١٧٠٨– وعنه (رَضيَ اللهُ عنهُ) قال: سَمِعتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (اللَّهُمَّ اغفِرْ لِلانْصَارِ وَلابْنَاء الانْصَارِ وَشَكَّ الراوي فِي ابْنَاء ابْنَاء الانْصَارِ)( الحديث ٤٩٠٦ )[٤٥٥].

دیسان زەیدی کوڕی ئەرقەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (خودا خۆش بە لەیاریدە دەران ولە منالانی یاریدە دەران ). قسەبەر گومانی لەوەدا هەبوو کە پێغەمبەر فەرمووبێتی: (وە لەمنالانی منالانی یاریدە دەرانیش خۆش بە ).

## تەفسیری سوورەتی تەحریم (تفسير سورة التحريم)

**فەرمایشتی خودای گەورە:**

﴿ يَاايُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا احَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاةَ ازْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ٦٦/١.

---

(٤٥٤) راجع(١٧٠٧) - المترجم .

(٤٥٥) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل الانصار ... رقم:٢٥٠٦ .

١٧٠٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَشْرَبُ عَسَلا عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَيَمْكُثُ عِنْدَهَا فَوَاطَيْتُ انَا وَحَفْصَةُ عَلَى ايَّتُنَا دَخَلَ عَلَيْهَا فَلْتَقُلْ لَهُ: اكَلْتَ مَغَافِيرَ انِّي اجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ قَالَ: لا وَلَكِنِّي كُنْتُ اشْرَبُ عَسَلا عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَلَنْ اعُودَ لَهُ وَقَدْ حَلَفْتُ لا تُخْبِرِي بِذَلِكَ احَدًا). (الحديث ٤٩١٢- اطرافه في: ٥٢١٦، ٥٢٦٧، ٥٢٦٨، ٥٤٣١، ٥٥٩٩، ٥٦١٤، ٥٦٨٢، ٦٦٩١، ٦٩٧٢ )[٤٥٦].

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لەماڵی زەینەبی کچیجەحش، کەهاوسەری بوو،دەمایەوە شەربەتی هەنگوینی دەخواردەوە، جا من وحەفصەی کچیعومەر، کەئەویش وەك ئێمە هاوسەری پێغەمبەر بوو، قسەمان کرد بەیەك وبڕیارمان دا : هەرکامێکمان لەپێش دا پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) هات بۆ لای پێی بڵێت : مەغافیرەت خواردووە، من بێنی گیای مەغافیرت لێ دەکەم، کە تامێکی شیرین وبۆنێکی ناخۆشی هەیە، زۆر جار هەنگ شیلەکەی دەمژێت، جا کاتێ ئەم قسەیەمان عەرزی پێغەمبەر کرد، وایزانی بەڕاست وا دەڵێین : فەرمووی: ( نەخەیر مەغافیرم نەخواردووە، بەڵام لە لای زەینەبی کچی جەحشی خێزانم شەربەتی هەنگوینم خواردووە، سوێندم خواردووە ئیتر نایخۆمەوە، ئەم قسەیەی من بە کەس مەڵێ ). (تاج/٧ ز/٤٨- سوورەتی تەحریم ژ/١ ل/٢٠٥ ).
پەیوەندی فەرموودەکە بەئایەتەکەوە ئاشکرایە.

## تەفسیری سوورەتی (ن والقلم ) (تفسير سورة (ن و القلم))

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿عتلِ بعدَ ذلكَ زنيمٍ﴾ ١/٦٨

(٤٥٦) اخرجهُ مسلم في الطلاق عن محمد بن حاتم(عيني - عمدة القارئ ج/١٩ص٢٤٩)، - المترجم.

١٧١٠- عنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ الْخُزَاعِيَ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ الا اخْبِرُكُمْ باهْلِ الْجَنَّةِ كُلُّ ضعِيفٍ مُتَضعِّفٍ لَوْ اقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لابَرَّهُ الا اخْبِرُكُمْ باهْلِ النَّارِ كُلُّ عُتُلّ جَوَّاظ مُسْتَكْبِرٍ ( الحديث ٤٩١٨- طرفاه في: ٦٠٧١، ٦٦٥٧ )[٤٥٧].

حاریثەی کوڕی وەهب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی با هەواڵتان پێ بدەم و، نیشانەی مرۆڤی خودا پێ داوی بەهەشتیتان پێ نیشان بدەم : هەموو موسڵمانێکی لازەبوونی بێنموودی بێفیزی خۆ بە کەم زانی بێناز بەهەشتی یە، ئەو جۆرە کەسانە هەرچەندە خەڵك بە بێ نموو سەیریان دەکەن وقەدریان وەك خۆیان نازانن، بەڵام لەلای خودا ئەوەندە بە قەدر و بەڕێزو نازدارن هەموو دوعا ونزایەکیان گیرایە، ئەگەر یەکێ لەوانە سوێند بخوات لە سەر شتێ بەپشتی کەرەم و بەخششی خودا، خودا دڵی ناشکێنێ و خودا سوێندەکەی بۆ دەباتە سەر.ئەدی با پێتان بڵێم کە کێ دۆزەخی یە و نیشانەی خەڵکی دۆزەخ چییەو چۆنە: هەموو ئادەمیزادێکی چارە قورسی مرقنی گۆشتنی فیزنی بە دەعیەو دەماری زۆر خۆر دۆزەخییە ). (تاج/٧ ل/٢١٢ ز/٥١- ش/ت ).

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ﴾

١٧١١- عَنْ ابِي سَعِيدٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَ (صَلَّىاللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: يَكْشِفُ رَبُّنَا عَنْ سَاقِهِ فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ فَيَبْقَى كُلُّ مَنْ كَانَ يَسْجُدُ فِي الدُّنْيَا رِيَاء وَسُمْعَةً فَيَذهَبُ لِيَسْجُدَ فَيَعُودُ ظهْرُهُ طبَقًا وَاحِدًا). (الحديث ٤٩١٩- ٢١ تەجرید =٢٢ فتح = بەرگی یەکەم ل/٤١ لەم کتێبە)[٤٥٨].

(٤٥٧) اخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمهاواهلها، باب: النار يدخلها الجبارون ، رقم: ٢٨٥٣ .

(٤٥٨) راجع رقم: ٢١ تجريد= ٢٢ فتح الباري - المترجم .

ئەبوسەعیدی خدری (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت(درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( لەڕۆژی قیامەت دا، خودای پەروەردگارمان، لاقی خۆی هەڵ دەماڵێ، ئیتر هەموو موسڵمان و بڕواداری ج پیاو، ج ژن، کوڕنووش وسەجدەی بۆ دەبەن، ئەوانەیشی کە لەجیهان دا، بۆ چاوەو ڕوو پامایی وناوبانگ کوڕنوشیان بردووە، دەمێنێتەوەو لەپاش ئەوان دەچن کە کوڕنوش ببەن بۆ خودا بەلام، لە خوداوە پشتیان ڕەق دەبێ‌و دەبێ بەیەك پارچە تەختەو هەرچی هەوڵدەدەن ناتوانن سوجدە ببەن، ئاوا لەبەر چاوی ئەو عەشاماتە تەریق وچاوشۆڕ وڕیسوا دەبن). (تاج/٧ ل/٢١٢ ز/٥١- سوورەتی نوون ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیەش یەکێکە لەو فەرموودانەی کە موتەشابیهاتن، زانایان لەکۆن ونوێدا دوو فەرمایشتیان هەیە لەبارەیانەوە، پوختەی ڕێبازی پێشینانی باش ئەمەیە: ( کار لەبارەیەوە بدرێتە دەست خودا خۆی، وە باوەڕمان وابێ: کەواتایەکی وای هەیە، کە شایانی خودای بێچوون وبێ‌مانەندبێ) پاشینانیش بە تەئویل وساخکردنەوەی جیا جیا تەئویلی ئەم جۆرە فەرموودەو ئایەتە موتەشابیهانە دەکەن، مەئالی هەردوولایان یەکە ( کە بیرو باوەڕی ئیسلام دوورە لە بیرو باوەڕی هەڵە، سەبارەت بە یەزدانی مەزن ).

## تەفسیری سوورەتی ﴿وَالنَّازِعاتِ﴾ (تفسير سورة ﴿وَالنَّازِعاتِ﴾)

١٧١٢- عنْ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ رَأيتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ باصْبَعَيْهِ هَكَذا بالْوُسْطى وَالّتِي تَلِي الابْهَامَ بُعِثتُ انا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ ). (الحديث ٤٩٣٦ – طرفاه فی: ٥٣٠١، ٦٥٠٣)[٤٥٩].

(٤٥٩) اخرجهُ مسلم في الفتن و اشراط الساعة، باب: قرب الساعة رقم: ٢٩٥٠ .

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بە چاوی خۆم چاوم لێبوو، کە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) پەنجەی ناوەڕاستی وپەنجەی شایەتمانی، ئاوا جووت کرد و ئاڕاستەی یارانی کردن وفەرمووی: ( من وقیامەت وەك ئەم دوو پەنجەیە، ئاوا دوا بە دوای یەك هاتووین، من دوا هەمینی پێغەمبەرانم و لە دوای من قیامەت هەڵ دەستێ، پێغەمبەری تر نایە ). کورت وپوخت : هاکا قیامەت هات.(تاج/٧ ز/٦٢ ل/٢٣٥ سوورەتی — نازیعات).

## تەفسیری سوورەتی ﴿عَبَسَ﴾ (تفسير سورة ﴿عَبَسَ﴾)

١٧١٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَثلُ الَّذي يَقْرَا الْقُرْآنَ وَهُوَ حَافِظ لَهُ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ وَمَثلُ الَّذي يَقْرَا وَهُوَ يَتَعَاهَدُهُ وَهُوَ عَلَيْهِ شَدِيدٌ فَلَهُ اجْرَانِ) (الحديث ٤٩٣٧ )[٤٦٠].

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (نموونەی ئەو قورئان خوێنەی کە بە ڕەوانی قورئانی لەبەرە و ڕەفتاری پێ دەکا، ئەوە لە پایەی ئەو فریشتە بەڕێزە خێرخوازیانەدایە کە لە جیهانی بالاداو لە عالەمی مەلەکووت دا، سەر پەرشتی قورئان دەکەن وخودا لەم دوو ئایەتەدا باسیانی کردووە، کە دەفەرموێ: ﴿بايـدي سَـفَرَةٍ كِـرامٍ بـرَرَةٍ﴾: (ئەم قورئانە لە جیهانی بالادا،وا بەدەستی چەند فریشتەیەکی بەڕێزی خێرۆ مەندی فەرمان بەری خواوە).

پێغەمبەر فەرمووشی: ( وە ئەو کەسەشی کە خەریکە دەیخوێنێ و بە گران بۆی لەبەر دەکرێت، لە جیاتی یەك پاداش، دوو پاداشی بۆ هەیە ). (تاج/٥ ل/٢٧١ ز/٧٦ ف/٢- باسی گەورەیی قورئان ).

---

(٤٦٠) اخرجهُ مسلم في صلاة المسافرين و قصرها، باب: فضل الماهر بالقران و الذي يتعتع فيه ، رقم: ٧٩٨ .

# تەفسیری سوورەتی ﴿وَيلٌ لِلْمُطفِّفِينَ﴾

# تفسير سورة المطففين

١٧١٤- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) انَّ النَّبِيَ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ حَتَّى يَغِيبَ احَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ الَى انْصَافِ اذنَيْهِ). (الحديث ٤٩٣٨- طرفه في: ٦٥٣١ )[٤٦١].

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿يومَ يقومُ النّاسُ لربِّ العالمين﴾ ٦/٨٣. واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی گەلێ گەورەیە، ئەو خەڵکە سەرتاپا لە بەر بارە گای پەروەردگاری هەردوو جیهان دا بۆ پرسینەوە وداد پرسی دەستەو نەزەر ڕادەوەستن ). لە کاتی ڕودانی ڕاوەستانی ئەم ڕۆژەدا هەڵوێست وا ئاڵۆز دەبێ و ئەوەندە بەپێوە دەوەستن و ئەوەندە ماندوو وشەکەت دەبن، هی وایان هەیە ئەوەندە دەوەستێ، هەتا بنا گوێی لە ئارەقی خۆێ دا دەچەقێ ). (تاج/٧ ز/٦٦ ل/٢٣٨- سوورەتی موطەففیفین).

# تەفسیری سوورەتی ﴿اذا السَّمَاء انْشَقَّتْ﴾

## تفسير سوره ﴿اذا السَّمَاء انْشَقَّتْ﴾

١٧١٥- عنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ احَدٌ يُحَاسَبُ الا هلك. سبق بتمامة في رقم : ٨٧تجريد =١٠٣ فتح =بەرگی یەکەم ل- ١٠٨ [٤٦٢].

(٤٦١) اخرجه مسلم في الجنّة و صفة نعيمها واهلها، رقم:٢٨٦٢ .

(٤٦٢) سبق في رقم:٨٧ - المترجم .

فەرمایشتی زاتی پاك:
﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَنْ طَبَقٍ﴾ ١٩/٨٤

١٧١٦- عَنْ ابْنُ عَباسٍ(رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قالَ: ﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَنْ طَبَقٍ﴾ حَالا بَعْدَ حَالٍ قَالَ هَذا نَبِيُّكُمْ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٤٩٤٠- طرفه في: ٩٣٨ تجويد =٢٠٦١ فتح = بەرطى/٣ل- ١٤ )(٤٦٣)

ئیبنوعەبباس (رەزای خودای لێ بێ) لە تەفسیری ئایەتی: ﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَنْ طَبَقٍ﴾ دا دەفەرموێ : واتە : حالّ لە دوا حالّ، ئەمەیش پێغەمبەرەکەتان خۆی فەرموویەتی (دروودی خودای لێ بێ) .

## تەفسیری سوورەتی ﴿والشَّمْسِ وَضحاهَا﴾
## تفسير سورة ﴿والشَّمْسِ وَضحاهَا﴾

١٧١٧- عن عَبْدُ اللّهِ بْنُ زَمْعَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ سَمِعَ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطبُ وَذكَرَ النَّاقَةَ وَالّذي عَقَرَ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ﴿اذ انْبَعَث اشْقَاهَا﴾ انْبَعَث لَهَا رَجُلٌ عَزِيزٌ عَارِمٌ مَنِيعٌ فِي رَهْطِهِ مِثْلُ ابِي زَمْعَةَ وَذكَرَ النِّسَاء فَقَالَ يَعْمِدُ احَدُكُمْ فَيَجْلِدُ امْرَاتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ فَلَعَلَّهُ يُضاجِعُهَا مِنْ اخِرِ يَوْمِهِ ثمَّ وَعَظهُمْ فِي ضحِكِهِمْ مِنْ الضرْطةِ وَقَالَ لِمَ يَضحَكُ احَدُكُمْ مِمَّا يَفْعَلُ.

وعنهُ في رواية: مِثلُ ابِي زَمْعَةَ عَمِّ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ( الحديث ٤٩٤٢- طرفه في: ٥٠٠٢ )(٤٦٤).

---

(٤٦٣)راجع المجلد الثالث من الترجمة الكريدة ص١٤،رقم:٩٣٨،قال العسقلاني:لم يخرجه مسلم - المترجم

(٤٦٤) اخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمهاو اهلها، باب: النار يدخلها الجبارون ، رقم: ٢٨٥٥ .

عەبدوڵلای کوڕی زەمعە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێبوو پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) وتاری دەفەرموو، لەو کاتەدا باسی وشترە کەی پەموودی فەرموو، نیشانی ئەو پیاوەچارە ڕەشە بەدبەختەی هەلا دەدا کە خودا لەم ئایەتەدا ناوی ناوە بەدترین و خراپترین پیاوی ئەو هۆزە لەخودا یاخیە، فەرمووی: پیاوێکی بەدەسە لاتی بەهێز بوو، خاوەن دەسەلات وکەس وکارو خزمێکی زۆر بوو، کە پشتیان دەگرت، وەکوو چۆن ئەبو زەمعە لەناو هۆزی قورەیش دا ئێستا خاوەن دەسەلات وکەس وکارە ئەویش ئاوابوو، بەڵام ئەو هەتا بڵێی بێ ڕەزاو شەڕانی بوو، بۆیە کە چوو بۆگیانی وشترە کەی کە موعجیزەی حەزرەتی صالح پێغەمبەر بوو، وەناوی قداری کوڕی سالف بوو، وشترەکەی پەی کرد وکوشتی.

وە پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) باسی ژنانیشی فەرموو، فەرمووی: ( ئەوە چۆن کارێکە، پیاوی واتان وا تیادا، بە بێ هۆیەکی ڕەوا، هەروا لەخۆیەوە هەڵ دەکوتێتە سەر ژنەکەی وپەلاماری دەدا، ڕێك وەك بەندەی زەڕ خڕیدەی بێ، ئاوا دار کاری وفەلاقەی ئەو ژنە بەستە زمانە دەکا، کەچی دوور نیە هەر ئەو ڕۆژە سەر لە ئێوارە، دەست بکاتە ملی ولە گەڵی دا دروست ببێ، دەی ئەمەی لە چی وئەوەی لەچی !!).

ئەوجا خۆشەویست (درودی خودای لێ بێ) لەبارەی ئەوەوە کە بەترو تسی یەکتری پێ دەکەنن، تەمێ وئامۆژگاری کردن وفەرمووی: ( ئەوە چۆن حاڵێکە، شتێ کە لە خۆتان ڕوودەدا، ئەگەر لە یەکێکی ترتان ڕوو بدات، بۆچی پێی پێدەکەنن، کاری وا مەکەن ). (تاج/٧ ز/٧٤ ل/٢٥١ ژ/ ١ + تاج/٣ ل/١٣٢ ز/ ٥٣ ژ/١- ش/ت ).

**ڕوونکردنەوە:**

١- لە کۆتایی فەرموودەکەدا، پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) ئەم بەدکارەی هۆزی پەموود، دەشوبهێنێ بە ئەبو زەمعەی ئامۆزای زوبەیری کوڕی

عەووامـەوە، ئـەم ئـەبو زەمعەيـە نـاوى ئەسـوەدى كوڕى مـوطـطـەليبى كـوڕى ئەسـەدى كـوڕى عەبدولعوززايـە، يـەكێك بـوو لـە خـاوەن دەسـتە لاتـەكانى مەككـە، تـەوس ولاقرتـى بـە پێغەمبـەر دەكـرد، بـە كـافرى لـە مەككـە مـرد، زەمعەى كوڕيشى كە باوكى صەحابى (عەبداللەى كوڕى زەمعەيە) ئـەويش لـە ڕۆژى غـەزاى بـەدردا، بـە بێبڕوايـى كـوژرا، لـە گـەڵ برايـەكى تـرى دا كـەناوى عەقيلى كوڕى ئەسوەد بوو.

٢- عەبداللـەى كـوڕى زەمعـەى كـوڕى ئەسـوەد (رەزاى خـوداى لـێ بـێ) هـاوەڵێكى نـاودارى پێغەمبـەرە، بـەس ئـەم فەرموودەيـەى هەيـە لـە بوخاريـدا، كـە لـە ڕاستيدا بريتيە لـە سـێ فـەرموودە. خوشـكە زاى ئوممـو سـەلەمەى هاوسـەرى پێغەمبەرە دايكى ناوى قەريبەى كچى ئومەيەيە، ئەم فەرموودەيە كە لێرەدا دەيگێڕێتەوە سێ بڕيارى تێدايە: باسى وشـترەكەى پهموود و نـەيى كـردن لـە پێكەنين بە با لێبەربونـەوەو نـەيى كـردن لـە لێدانى ژن، هەنـدێ فـەرموودە گێڕەرەوە كردويانە بە سێ فەرموودە وە بە جيا جيا دەيگێڕنەوە.

كـوڕێكى هـەبوو نـاوى يەزيـدى كـوڕى عەبـدوڵلاى كـوڕى زەمعـە بـوو، موسليمى كـوڕى عوقبـە، لـە ڕۆژەكـەى ئـەل حـەررەدا شـەهيدى كـرد، بـەديلى هێنايـان بـۆ موسـليم، پێـى گـوت: پـەيمان بـدە لەسـەر ئـەوە كـە تـۆ بەنـدەو كۆيلەى يەزيدى كوڕى موعاوييەى، كە فەرمان ڕەواى موسـڵمانانە، خـۆى چـى بڕيـار دەدات بەرانبـەر بـە خـوێن ومـاڵت مـافى خۆيـەتى. يەزيـد گـوتى: مـن ئـامۆزاى فـەرمانڕەواى موسـڵمانانم، پـەيمانى دەدەمـێ، لەسـەر ڕەفتـار كـردن بەنامەى خودا و سوونەتى پێغەمبەر، جا لەسەر ئەم بنياتە خۆى سەر پشك بێ، سەبارەت بە خوێن وسامان وخێزانم، چى بڕيار دەدات با بيدات).

يەزيد لەوەوپێش دۆستى يەزيدى كوڕى موعاويە بـوو، جـا كـە واى گـوت، موسـريف گـوتى : لـە گـەردنى بـدەن. مـەروان ڕاپـەڕى وخـۆى دا بەسـەريدا وگوتى: منيش لە گەڵيدا نەكوژن نـا يـەڵم بيكـوژن، موسـريف گـوتى: (ئەگـەر

مـەروان لێـی دوورکەوتـەوە، ئـەوا باشـە ئـەگینا هـەردوکیان بەسـەر یەکـەوە بکوژن ). ئیتر مەروان لێیدوورکەوتەوە ودایـان لـە گـەردنی، لـەو ڕۆژەدا زۆر لـە کوڕانیعەبـدوڵلای کـوڕی زەمعـە شـەهید بـوون، کـە بـرای ئـەم یەزیـدە بـوون.بـۆ زیـاتر شارەزا بـوون. بڕوانـە : ژ : ۱۲۱۳ تجریـد = مختـصر صـحیحی بوخاری =۲۹۵۹ فتح الباری =بەرگی سێیەم لاپەڕە: ۳۳٦ ).

## تەفسیری سوورەتی ﴿اقْرَا باسْمِ رَبِّكَ الّذي خَلَقَ﴾
## تفسير سورة العلق ﴿اقْرَا باسْمِ رَبِّكَ الّذي خَلَقَ﴾

**فەرمایشتی زاتی پاك:**

﴿كَلا لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعَنَّ بالنَّاصِيَةِ، نَاصِيَةٍ كَاذبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾ ١٥/ ١٦

١٧١٨– عن ابْنُ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ ابُو جَهْلٍ: لَئِنْ رَايْتُ مُحَمَّدًا يُصَلِّي عِنْدَ الْكَعْبَةِ لاطانَّ عَلَى عُنُقِهِ فَبَلَغَ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (لَوْ فَعَلَهُ لاخَذَتْهُ الْمَلائِكَةُ). (الحديث ٤٩٥٨ )[٤٦٥].

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەبو جەهلی لەعنـەتی گوتی : ئەگەر دەستم لە موحەممەد گیرببێ، وە ببینم لەلای کەعبـەدا نوێـژ بکـا، پـێ دەنێمـە ڕێـسا ملی و پـێ دەنێمـە سـەر بـۆ تقـەی ملی. کـە ئـەم هەڕەشـەیەی گەیشتەوە بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئەگـەر شـتی وا بکـات، فریشتەی خودا بەئاشکرا و بەبێ پەردە دەیگرن وپەل پەلی دەکەن ). (تـاج/۷ ل/۲۵۷ ژ/۱).

(٤٦٥) اخرجهُ مسلم راجع: صحيح مسلم بشرح النووي ج/٧ص١٤٠ - المترجم .

## تەفسیری سوورەتی (الکَوثر) (تفسير سورة الكوثر)

١٧١٩- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: لَمَّا عُـرِجَ بـالنَّبِيِّ (صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) الَى السَّمَاء قَالَ: (اتَيْتُ عَلَى نَهَرٍ حَافَتَاهُ قِبابُ اللُّؤْلُؤِ مُجَوَّفًا فَقُلْتُ: مَا هَـذا يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَذا الْكَوْثرُ). (الحديث ٤٩٦٤ ).

**ئەنـەس (رەزای خـودای لـێ بـێ) لـە بـارەی فەرمایـشتی خـودای گـەورەوە: ﴿انّـا اعطيناك الكوثر﴾ەوە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فـەرمووی: کـاتێ بـرام بـۆ میعـراج، بـۆ ئاسمـان، چـوومە سـەر ڕوبـارێ هـەردوو قەراخەکـەی گومەزی مرواری هوڵۆڵ بوو، گوتم: ئەی جوبرائیل! ئەمـە چییە؟ فـەرمووی: ئەمە حەوزی کەوپهرە). (تاج/٧ ل/٢٦٤ ز/٨٦ ژ/١- سوورەتی کەوپهر)**

١٧٢٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهـا) وقـدْ سُئِلَتْ عَـنْ قَوْلِـهِ تَعَـالَى: ﴿انَّـا اعْطَيْنَاكَ الْكَوْثرَ﴾ قَالَتْ: نَهَرٌ اعْطِيَهُ نَبِيُّكُمْ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَاطِئَاهُ عَلَيْهِ دُرٌّ مُجَوَّفٌ انِيَتُهُ كَعَدَدِ النُّجُومِ. (الحديث ٤٩٦٥ )[٤٦٦].

**سەبارەت بەمەبەست لەفەرمایـشتی خـودای گـەورە کـە دەفـەرموێ: ﴿انّـا اعطينـاك الكـوثر﴾ لـە عائیـشەی خێزانـی پێغەمبـەر (دروودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەر و ڕەزای خـودا لەعائیـشە بـێ) پرسـیار کـرا، فـەرمووی: کـەوپهر ڕوبـارێکی زۆر گەورەیـە، وا لـە بەهەشـتا، خـەڵات کـراوە بـە پێغەمبـەری ئێوە(دروودی خودای لێ بێ) هەردوو کەنارەکـەی گومـەزی مـرواری هوڵۆڵـە، بـە قـەد ژمـارەی ئەسـتێرەی ئاسمـان، ئـاوا زۆر و بـێ شـومار، جـام وپـەرداخ وحاجـەتی شت خواردنەوەیوا لەسەر). (تاج/٧ ل/٢٦٥- ز/٨٦).**

---

(٤٦٦) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عائشة في تفسير ذكر الكوثر - المترجم .

# تەفسیری سوورەتی ﴿قلْ اعوذ بربّ الفلقِ﴾
# تفسير سورة الفلق ﴿قلْ اعوذ بربّ الفلقِ﴾

١٧٢١- عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ سَأَلْتُ اُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ عَنْ الْمُعَوِّذَتَيْنِ فَقَالَ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ قِيلَ لِي فَقُلْتُ فَنَحْنُ نَقُولُ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (٤٩٧٦- طرفه في ٤٩٧٧)[٤٦٧].

زێـڕی کـوڕی حوبـەیش (رەزای خـوداى لـێ بـێ) فـەرمووی: پرسـیارم کـرد لـە ئوبەییـەی کـوڕی کـەعب، لـە بـارەی سـوورەتی: ﴿قـل اعـوذ بـربّ النـاس﴾و سوورەتی: ﴿قلْ اعـوذ بـربّ الفلـق﴾ەوە.فـەرمووی: لـە پێغەمبـەرم پرسـی لـە بارەیانـەوە: ئایـا ئـەم دوو سـوورەتە لـە قورئـانن یـا نـا؟ فـەرمووی: (ئـەم دوو سوورەتە جوبرەئیل گوتوونی بەمن، منـیش گوتوویـانم بـە ئێـوە ). ئوبەیـەی کـوڕی کـەعبیش فـەرمووی: ئێمـەش باوەڕمـان بـە فەرمایـشتەکەی پێغەمبەرهەیە لەبارەیانەوە، کەواتە گومانمان نییە لەوە دا کە دوو سوورەتن لە قورئانی پیرۆز).

# پایانی (خاتِمَةٌ)

مامۆستا شێخی عەسقەلانی لێرەدا دەفەرموێ :

(نامەی تەفسیر ٥٤٨ پێنج سەدو چل وهەشت فـەرموودەی بـەرزەوەکراوی یـا لـەحوکم و بڕیـاری بـەرزەوە کـراوی واتیـادا پەیوەسـت (موصول )ەکانیـان (٤٦٥) فەرموودەن، ئـەوانی تریـان یـا بێڕشـتن یـا لـەحوکم و بڕیـاری بێڕشتە (معلـق) دان، (٤٤٨ )چـوار سـەدو چـل وهەشـتیان دووبـارەن، پاڵفتـەو پوختەکـەیان سـەد فەرموودەیـە، پێـشەوا موسـلیمیش، وەك پێـشەوا بوخـاری

---

(٤٦٧) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابيّ بن كعب في المعوذتين (خاتمة/ج/٩ص٧٧٢) - المترجم .

(رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم پوختەیەی کە (١٠٠ ) سەد فەرموودەیەیە، هەموو یانی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەم (٦٦) شەست وشەش فەرموودەیەیان :

١- فەرموودەی ژمارە: (١٦٣٠- تەجرید = مختصر صحيح البخاری = ٤٤٧٤ فتح الباری).

٢- فەرموودەکەی عومەر: ( ابی اقرانا)= ٤٤٨١ فەتح =١٦٣٤ تەجرید ).

٣- ژ : ١٦٣٥تەجرید ٤٤٨٢ فەتح.

٤- ژ : ١٦٣٧ ت =٤٤٨٥= ١٦٣٧ تەجرید =٤٤٨٥ فتح.

٥- فتح: ٤٤٨٩ لە تەجریدەکەدا نییە.(لم يبق ممن صلى القبلتين غيری).

٦- ژ: ٤٤٩٨ ف لە تەجریدەکەدا نییە. (كان في بني اسرائيل القصاص).

٧- ژ : ٤٥٠٥ ف لە تەجریدەکەدا نییە. ﴿وعلى الذين يطيقونه..﴾.

٨- ژ: ٤٥٠٦ ف لە تەجریدەکەدا نییە. ﴿فدية طعام مساكين..﴾.

٩- ژ ٤٥٠٨ ف. لە تەجریدەکەدا نییە. (كانوا لايقربون رمضان كله).

١٠- ژ : ٤٥١٦ ف ﴿ولاتلقوا بايديكم الى التهلكة..﴾.

١١- ژ: ٤٥٢٦ف ﴿نساؤكم حرث لكم..﴾.

١٢- ژ: ٤٥٢٩ ف ﴿ولاتعضلوهنّ..﴾.

١٣- ژ : ٤٥٣٠ ﴿والذين يتوفّون منكم و يذرون ازاواجا﴾.

١٤- ژ: ٤٥٣١ ف. حديث ابن عباس في تفسير: ﴿والذين يتوفّون منكم و يذرون ازاواجا﴾.

١٥- ژ: ٤٥٣٢ ف. (اتجعلون عليها التلغيظ...).

١٦- ژ: ٤٥٣٨ ف. ﴿ايودّ احدكم..﴾.

١٧- ژ: ٤٥٤٥ ف. ﴿وان تبدوا ما في انفسكم..﴾.

١٨- ژ: ٤٥٦٣ ف.حديث ابن عباس في: (حسبنا الله و نعم الوكيل) = ١٦٤٥ مختصر صحيح البخاری = تجرید.

١٩- ژ: ١٦٤٩ تجريد=٤٥٦٦ فتح (كان النبيّ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) واصحابه يعفون عن المشركين) يعني الجزء الاخير منه - المترجم.

٢٠- ژ: ٤٥٧٨ ( كان المال لِلوَلد = حديث ابن عباس ).

٢١- ژ: ٤٥٧٩ فتح (كان اذا مات الرجل كان اولياؤه احقّ بامراته).

٢٢- ژ: ٤٥٨٠ فتح ( ولكلّ جعلنا موالي=حديث ابن عباس).

٢٣- ژ: ٤٥٨٧ : فتح (كنتُ انا وامّي من المستضعفين).

٢٤- ژ: ١٦٥٣ تجريد =٤٥٩٦ فتح البارى = ﴿انَّ الَّذينَ تَوَفّاهُمْ الْمَلائِكَةُ ظالِمِي انفُسِهِمْ﴾.

٢٥- ژ: ٤٥٩٩ فتح (ان كان بكم اذىً من مطرٍ)= ابن عباس.

٢٦- ژ: ٤٦٠٣ ف =حديث ابن مسعود فى يونس بن متى ).

٢٧- ژ: ٤٦٠٢ ف =حديث حذيفة فى النفاقِ.

٢٨- ژ: ٤٦١٣ حديث عائيشة فى لغوِ الايمانِ.

٢٩- ژ:٤٦١٤ حديث عائشة عن ابيها فى كفارة اليمين.

٣٠- ژ : ١٦٦٠مختصر = تجريد= ٤٦٢٨ فتح: ﴿ قُل هوَ القادِرُ ﴾.

٣١- ژ : ٤٦١٩ فتح : ( حديث ابن عمر فى الاشْرِبَةِ ).

٣٢- ژ: ١٦٥٨ تجريد = ٤٦٢١ فتح ﴿ لا تسالُوا عَنْ اشياء...﴾.

٣٣- ژ: ٤٦٤٢ فتح: حديث الحر بن قيس مع عمر فى قولة تعالى: ﴿خُذ العَفْوَ﴾.

٣٤- ژ: ١٦٦٣ تجريد = ٤٦٤٤ فتح: (حديث ابن الزبير فى تفسير قوله تعالى: ﴿خُذ العَفْوَ﴾.

٣٥- ژ: ٤٦٤٦ ف =حديث ابن عباس في تفسير قوله تعالى: (الصُمُ البُكم)

٣٦- ژ : ٤٦٥٢ ف =حديث ابن عباس فى تفسير قوله تعالى: ﴿ ان يكن منكم عشرون صابرون﴾.

٣٧- ژ : ٤٦٥٨ فتح : حديث حذيفة : (مابقي من اصحاب هذه الاية الا ثلاثةٌ).

٣٨- ز : ٤٦٦٤ فتح =حديث ابن عباس في قصته مع ابن زبير وفيه ذكر ابي بكر في الغار.

٣٩- حديث ابن عباس في تفسير قوله تعالى: ﴿يثنون صدورهم﴾ برقم : ٤٦٨١، ٤٦٨٢، ٤٦٨٣ فتح.

٤٠- حديث ابن مسعود فى : ﴿ هَيْتَ لَكَ﴾ رقم : ٤٦٩٢ و ﴿بل عجبت﴾.

٤١- حديث ابى هريره فى صفه مسترقى السمع، رقم ٤٧٠١ فتح = ١٦٦٨ تجريد.

٤٢- ز : ٤٧٠٥ فتح = حديث ابن عباس، في تفسير (عِضينَ ).

٤٣- ز: ٤٧٠٨ فتح، حديث ابن مسعود ( الكهف ومريم من تِلادى ).

٤٤- ز : ٤٧١١ فتح حديث في :(كنا نقول للحيَ اذا كثروا).

٤٥- ز : ٤٧١٦ فتح :﴿ وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي ارَيْنَاكَ الا فِتْنَةً...﴾.

٤٦- ز : ٤٧٢٨ فتح : حديث سعد في: ﴿الاخَسرِينَ اعْمالا﴾.

٤٧- ز : ٤٧٤٢ فتح : حديث ابن عباس في تفسير قوله تعالى :﴿ وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ﴾.

٤٨- ز : ٤٧٥٨ فتح : حديث عائشه فى نزول : ﴿وَ لْيَضرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ ﴾.

٤٩- ز : ٤٧٧٣ فتح : حديث ابن عباس في: ﴿لَرادُّكَ الَى مِعادٍ﴾.

٥٠- ز : ١٦٨٤ تجويد = مختصر صحيح البخارى = ٤٧٩٨ فتح البارى.

٥١- ز : ٤١- سورة حم السجدة بعدها مباشرة حديث ابن عباس فى جواب (انـي اجد في القران اشياء تختلف عليَ).

٥٢- ز : ٤٨٢٧ فتح =حديث عائشة فى تفسير : ﴿والذي قال لوالديهِ افٍ لكما﴾.

٥٣- حديث عبد الله بن مُغَفل فى البول فى المُغتسل = ٤٨٤٢ فتح.

٥٤- ز : ٤٨٥٢ فتح: حديث ابن عباس فى تفسير : ﴿ادبارَ السُّجُود﴾.

٥٥- ژ : ٤٨٥٩ حديث ابن عباس في تفسير : ﴿اللاتِ﴾

٥٦- ژ : ٤٨٧٦ حديث عائيشه في نزول : ﴿بَلْ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ اذْهَى وَامَرُّ﴾ = ١٧٠ تجريد.

٥٧- ژ : ٤٨٩٣ فتح، حديث ابن عباس في تفسير: ﴿ولا يعصينَكَ فى مَعرُوفٍ﴾.

٥٨- ژ : ٤٩٠٦ فتح = حديث انس عن زيد بن ارقم فى فضل الانصار.

٥٩- ژ : ١٧١٠ تجريد = ٤٩١٨ فتح. حديث ابن عباس فى تفسير: ﴿عُتُلّ بَعْدَ ذلِكَ زَنِيمٌ﴾.

٦٠- ژ : ٤٩٢٠ فتح، حديث ابن عباس في ذكر الاوثان التي كانت في قوم نوح.

٦١- ژ : ٤٩٣٢ حديپ ابن عباس فى تفسير: ﴿ترمي بِشَرَرٍ كَالقَصرِ﴾.

٦٢- ١٧١٦ تەجريد = مختصر صحيح البخارى =٤٩٤٠ فتح البارى حديث ابن عباس في تفسير :﴿لَتركَبُنَّ طبَقا عَنْ طبَقٍ﴾.

٦٣- حديث ابن عباس فى تفسير ﴿فَلْيَدْعَ نادِيَةُ﴾.

٦٤- حديث عائشة في تفسير : ذكر الكوثر =رقم ٤٩٦٥ فتح = ژماره : ١٧٢٠تجريد = مختصر صحيح البخاري.

٦٥- حديث ابن عباس فى تفسير الكوثر بالخير الكثير = رقم ٤٩٦٦ فتح.

٦٦- ژماره : ١٧٢١ تجريد =مختصر صحيح البخارى= ٤٩٧٦ فتح البارى = حديث ابى كعب في المعوذتين.

مامۆستای گەورەو مەزن شێخی عەسقەلان (رەحمەتی خودای لێ بێ) هەروا لەم پایانەدان دەفەرموێ : ( پێنج سەدو هەشتا بیستراو (ئەثەر)ی صەحابە وگەورە پیاوانی دوا ئەوانیشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٦٩- نامەی گەورەیی قورئانی پیرۆز
# كتابُ فضائلِ القُرْآنِ

١٧٢٢- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا مِنْ الانْبِيَاء نَبِيٌّ الا اعْطيَ مَا مِثلهُ امَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ وَانَّمَا كَانَ الَّذي اوتِيتُهُ وَحْيًا اوْحَاهُ اللَّهُ الَيَّ فَارْجُو انْ اكُونَ اكْثرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ( الحديث ٤٩٨١- طرفه في : ٧٢٧٤ )(٤٦٨).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی : پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی : ( هەموو پێغەمبەر ێ لە کاتی خۆیدا، نیشانەی گەورە گەورەو موعجیزەیەکی وەهای پێ دراوە، کە ئادەمیزادەکانی سەردەمی خۆی بە هۆی ئەو نیشانە و موعجیزانەوە ئیمان وباوەڕیان پێی هێناوە، بەڵام ئەو موعجیزەیەی کە خەلات کراوە بە من ئەم قورئانەیە، کە خودا بە وەحی وسروش بۆی ناردووم، کە لایەنی ئیعجازەکەی نەبڕاوەیە و هەمیشە بەردەوامە بۆیە ئومێدم گەورەیە کە لەڕۆژی قیامەت دا من لە هەموو پێغەمبەرەکانی تر ئۆمەتم زۆرتربێ ).( تاج/٧/ل- ١٣٤ ).

**سەرنج :**

نامەی گەورەیی قەرئانی پیرۆز دەکەوێتە بەرگی/٣ لاپەڕە: ٨٠٤ لە ریاج الصالحين دا، هەتا لاپەڕە : ٨٢٣، کە برێتیە لە زنجیرەی ژمارە : ١٨٠، ١٨١، ١٨٢، ١٨٣. لە تاجول ئوصولیش دا دەکەوێتە : بەرگی/٥ لاپەڕە٢٦٩ هەتا ٣٤٤.

١٧٢٣- عن انَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ اللَّهَ تَعَالَى تَابَعَ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْوَحْيَ قَبْلَ وَفَاتِهِ حَتَّى تَوَفَّاهُ اكْثرَ مَا كَانَ الْوَحْيُ ثمَّ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدُ (الحديث ٤٩٨٢)(٤٦٩).

---

(٤٦٨) اخرجهُ مسلم في الايمان، باب: وجوب الايمان برسالة نبيّنا محمد (صلى الله عليه وسلم)، رقم:١٥٢

(٤٦٩) اخرجهُ مسلم في الايمان، باب: وجوب الايمان برسالة نبيّنا محمد (صلى الله عليه وسلم) ، قم:١٥٢

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی : خودای گەورە بەر لە كۆچ كردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ ئەو دونیا، پەیتا پەیتا خودا سروشی بۆ دەنارد، تەنانەت كاتێ كە گیانی پاكی سپارد، سروش (وەحی )لە جاران گەرمتر دەهاتە خوارێ. ئیتر لە پاشان ئەوەندەی نەخایاند كە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) عەمری خوای كرد.

١٧٢٤- عن عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ (رَضـيَ اللهُ عنـهُ) يَقُـولُ: سَـمِعْتُ هِـشَامَ بْـنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ يَقْرَا سُورَةَ الْفُرْقَانِ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللّـهِ (صَـلّىاللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) فَاسْتَمَعْتُ لِقِرَاءتِهِ فَاذا هُوَ يَقْرَا عَلَى حُرُوفٍ كَثِيرَةٍ لَمْ يُقْرِئْنِيهَا رَسُـولُ اللّـهِ (صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَكِدْتُ اسَاوِرُهُ فِـي الـصَّلاةِ فَتَـصَبَّرْتُ حَتَّـى سَـلّمَ فَلَبَّبْتُـهُ بِرِدَائِـهِ فَقُلْتُ: مَنْ اقْرَاكَ هَذهِ السُّورَةَ الّتِي سَمِعْتُكَ تَقْرَا؟ قَالَ: اقْرَانِيهَا رَسُولُ اللّهِ (صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقُلْتُ: كَذبْتَ فَانَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَدْ اقْرَانِيهَا عَلَى غَيْرِ مَا قَرَاتَ.

فَانْطَلَقْتُ بِهِ اقُودُهُ الَى رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقُلْتُ: انّي سَـمِعْتُ هَذا يَقْرَا بِسُورَةِ الْفُرْقَانِ عَلَى حُرُوفٍ لَمْ تُقْرِئْنِيهَا فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ) ارْسِلْهُ اقْرَا يَا هِشَامُ فقَرَا عَلَيْهِ الْقِرَاءةَ الّتِي سَمِعْتُهُ يَقْـرَا فَقَـالَ رَسُـولُ اللّـهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): (كَذلِكَ انْزِلَتْ) ثمَّ قَالَ: (اقْرَا يَـا عُمَـرُ) فَقَـرَاتُ الْقِـرَاءةَ الّتِي اقْرَانِي فَقَالَ رَسُولُ اللّـهِ (صَـلّىاللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ): (كَـذلِكَ انْزِلَـتْ انَّ هَـذا الْقُرْآنَ انْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ احْرُفٍ فَاقْرَءوا مَا تَيَسَّرَ مِنْه ((الحديث ٤٩٩٢- اطرافه فى : ٢٤١٩، ٥٠٤١، ٦٩٣٦، ٧٥٥٠ )(٤٧٠).

عومەری كوڕی خەطاب(رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی : بە سەرینی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لێ بێ) جارێ لە مزگەوت بووم، گوێم لێ بوو، كە هیشامی كوڕی حەكیم، سوورەتی فورقانی دەخوێند، كە گوێم گرت لە

(٤٧٠) اخرجهُ مسلم في صلاة المسافرين و قصرها، باب: بيان انَ القران .. رقم:٨١٨ .

خوێندنەکەی، سەرنجم دا وا بە چەند پیت گەلێك (واتە: بە چەند شێوەو شێوازو لکەزارێ ) دەخوێنێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەو شێوازە بە منی نەخوێندبوو، جا خەریك بووم هەر لەناو نوێژەکەیدا پەلاماری بدەم، بەڵام ئارامم گرت هەتا سلاوی نوێژەکەیی دایەوە ئەوجا بەپۆشاکەکەی لوولم دا وەیەخەیم گرت وگوتم: ئەم سوورەتەی کە ئێستا خوێندت لەم نوێژەدا لە لای کێ خوێندووتەو کێ پێی ڕەوان کردووی؟ فەرمووی:(پێغەمبەر خۆی پێی لەبەر کردووم ). گوتم : درۆ دەکەی، من پێغەمبەر خۆی ئەم سوورەتەی بە شێوەیەکی تری جیاواز لەمە پێڕەوان کردووم، ئینجا بردم وکێشم کرد بۆ لای پێغەمبەر، وە عەرزیم کرد : ( ئەمە بەشێوەیا سوورەتی فورقان دەخوێنێ، کە تۆ خۆت بەشێوەیەکی تری جیاواز لەوەی ئەو بە منت ڕەوان کردووە ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی : ( تۆ جارێ بەرەڵای کە، ئەی هیشام ئادەی بخوێنە ).جا بەو شێوەیە خوێندی کە من گوێم لێی بوو، وە لە سەر ئەوە ڕەخنەم لێی هەبوو، وە بۆ بەرپرسی هێنام بۆ لای پێغەمبەر، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ڕەزا لێبوونی لەسەر شێوازی خوێندنەکەی دەربڕی وفەرمووی : ( ئاوەهایش هاتووتە خوارەوە ).فەرمووی بەمنیش : ( ئادەی تۆش بخوێنە ئەی عومەر ! ) منیش لەسەر شێوەکەی خۆم کە لە پێغەمبەر وەرم گرتبوو خوێندم، فەرمووی : (ئاوەهایش هاتووتە خوارەوە، ئەمەیش قەیدی نیە، چونکە ئەم قورئانە بە حەوت شێوە خوێندنەوە نێردراوەتە خوارەوە بۆ من، جا ئێوە بە کام شێوە خوێندنەوە بە ئاسانی بۆتان دەخوێنرێ، بەو شێوەیە بیخوێنن!). (تاج/٥ ز/٩٣ ژ/١ +٢ +٣ — ل/٣٢٥ + تجريد/٣ ل/٤٣٣ ژ/١٣٠١).

١٧٢٥- عَنْ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قالت: (اسَرَّ الَيَّ النَّبِيُّ(صَلَّىاللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضنِي بالْقُرْانِ كُلَّ سَنَةٍ وَانَّهُ عَارَضنِي الْعَامَ مَرَّتَيْنِ وَلا ارَاهُ الا حَضرَ اجَلِي)(٤٧١).

فاتيمەی كچی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەر و ڕەزای خودا لەسەر فاطيمەی كچی) فەرمووی: بە نهێنی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دركانی بۆم : (كە لەسالانی پێشین دا، هەموو ساڵێ، حەزرەتی جوبرائيل يەكجار دەوری قورئانی پيرۆزی پێ دەكردمەوە، ئەويش لە مانگی ڕەمەزان دا، من دەم خوێندو ئەويش گوێی لێ دەگرتم، يا ئەودەيخوێندو منيش گوێم لێی دەگرت هەتا قورئانەكە ڕەوان بكەم وفێری تە جويدو زانستەكانی قورئان وشێوە خوێندنەكانيم بكات، بەڵام ئەمساڵ جوبرائيل بۆ هەمان مەبەست، لە ڕەمەزاندا دوو جار دەوری قورئانی پێم كردەوە، وا دەزانم ئەمەيش نيشانەی هاتنی ئاكاممەومردنم نزيك بۆتەوە ).

**ڕوونكردنەوە:**

فاطيمە (ڕەزای خودای لێ بێ) ناسراوە بەفاطيمەی زەهراء كچی حەزرەتی پێشەوای خواناسان، پێغەمبەری خودا موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی عەبدولوطەليبە. كچی بچكۆلەی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لە حەزرەتی خاتوو خەديجەی هاوسەری، دوو كوڕو چوار كچی بووە، كوڕەكان ناويان : قاسم و عەبدوڵلابوو، پێغەمبەر بەكەسناوی باوكی قاسم ناودارە، قاسم لە پێش سەردەمی پێغەمبەرايەتیدا لە دايك بووە، ئەوەندەش ژيا، هەتا دەيتوانی سواری ولاخ ببێ، قاسم يەكەم منالی پێغەمبەر بوو، بەڵام نۆبەرەی خەديجە نەبوو، چونكە خەديجە لە مێردی يەكەمی كچێكی تری

(٤٧١) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل فاطمة بنت النبي (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ)، رقم:٢٤٥٠ .

بوو ناوی هیندی کچی ئەبوو هاله بوو، عەبدوڵلایان هەر لە ساوایی دەمرێ، نازناوی عەبدوڵلا: طاهیر وطەییب بوو، عەبدوڵلا سێیەم منالی پێغەمبەر بوو.پێغەمبەر کورێکی تری بوو لە مارییەی (قیبطیية) بوو، ناوی ئیبراهیم بوو، بە منداڵی مردووە: (بڕ: ژ : ٦١٦ بەرگی/٢ ل -٤١ + ٦١٧ + ٦٢٦ = بەرگی/٢ ل- ٥١ + ژ: ٦٥٩ ب/ ٢ ل - ٧٩).

کچەکانیش ناویان: زەینەب ورِوقیەوئوم کەلثووم وفاتیمە بوو، منالەکانی پێغەمبەر لە خەدیجە بەڕیز ئاوا لە دایك بوون: قاسم، زەینەب، عەبدوڵلاو ڕوقیە وئوم کەلثووم وفاتیمە. کچە کانی ئیسلام بوون و کۆچیانکرد بۆ مەدینەو هەموویان شوویان کرد.

دەڵێن : فاطیمە ئەوکاتە لەدایك دەبێ، کە کەعبەیان دروست دەکردەوە، تەمەنی پێغەمبەر ئەوکاتە دەوری سیو پێنج ساڵ بوو، فاطیمە لە عائیشە بە تەمەن تر بوو، لە پاش ڕۆژەکەی ئوحود، لە سەرەتای مانگی موحەررەمی ساڵی دووەمی کۆچی، بە کچی شووی کردووە بە ئیمامی عەلی، تەمەنی ئەوکاتە ( ١٨ )ساڵ بووە، بازێ دەڵێن ( ١٥ ) ساڵ بووە، لە عەلی حەسەن وحوسەین و موحسینی بووە، موحسین بە منداڵی دەمرێ، ئەم سێ کچەشی لێ بووە : ڕوقیە وزەینەب وئوم کولثووم، ڕوقیە پێش ڕەسیدە بوون مردووە، زەینەب شووی کرد بەعەبدوڵلای کوڕی جەعفەر، ئوم کولثووم شوی کرد بە عومەری کوڕی خەطاب، کوڕێکی لە عومەر بوو ناوی زەید بوو، کەواتە خاتوو فاطیمە شەش منداڵی لە ئیمامی عەلی بووە : سێ کوڕو سێ کچ، شووی تری نەکردووە، وە ئیمامی عەلی و فاطیمە خەزور و خەسووی حەزرەتی عومەر بوون، وە باپیرو نەنکی زەیدی کوڕی بووون ! هەر شەش منداڵەکەیان دادەنرێن بە سەحابە، وەچەی پێغەمبەر(درووودی خودای لێ بێ) بەس لە فاطیمە ماوە، کۆمەڵێ فەرمودەو فەرمایشت هەن سەبارەت بەڕێزو شکۆمەندیی فاطیمە، عائیشە دەفەرموێ : کەسم نەدیوە وەك فاطیمە ئاوا بەڕێزو

شكۆمەندبێ مەگەر باوکی). هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ (فاطیمە پارچەیەکە لەمن، لەبەر ئەوە هەر کەس ئازاری ئەو بدا ئازاری منیش دەدا...).

فاطیمە ئەم زاتانە فەرمودەیان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە : حەسەن وحوسەین وعەلی وعائیشە و ئوم سەلەمەو ئەنەس وکەسانی تریش، فاتیمە لە بوخاری و موسلیم دایەك فەرموودەی هەیە، کە ئەم فەرموودەیە کە واین لە خزمەتیدا، عەلی ویستی ژنی بەسەر بهێنێ، پێغەمبەر (درووی خودای لێ بێ) قەبوولی نەکردو نەیهێشت، ئیتر هەتا مرد عەلی ژنی بەسەر نەهێنا.

لەگەڵ ئیمامی عەلی دا ژیانێکی زۆر زبرو دەروێشانەیان گوزەراند، فاتیمە ئەوەندە دەستاڕی هاڕیبوو، ناو لەپی بلۆقی کردبوو، جارا نەخۆش بوو پێغەمبەر چوو بۆ هەواڵپرسی، پێی دەفەرموێ: (چۆنی؟) دەفەرموێ: (بەڕاستی هەم نەخۆشم وهەم برسیمە و هەم هیچ نییە کە بیخۆم ).

پێغەمبەر (درووی خودای لێ بێ) گەڵێ جار دێنی فاتیمەی دەکرد، فاتیمەش زۆر دەچوو بۆ خزمەتی باوکی، پێغەمبەر لەبەری هەڵ دەساو چاك وچۆنی لەگەڵ دەکرد و ماچی دەکرد بەخێرهاتنی گەرمی لێدەکرد، کە پێغەمبەریش دەچوو بۆماڵی فاتیمە هەروەها، شێوەی زۆر لە پێغەمبەر دەچوو، تەنانەت دەنگیشی لە دەنگی پێغەمبەری دەکرد، ڕاست گۆی وەك فاتیمە کەم بوو، خۆشەویست ترین کەس بوو لەلای پێغەمبەر.

شەش مانگ لە دوای پێغەمبەر (درووی خودای لێ بێ) ژیاوە لە چواری مانگی ڕەمەزانی ساڵی یازدەی کۆچی، شەوی سێ شەممە مەرگی حەقی بەجێ هێنا، ئیمامی عەباس و ئیمامی عەلی نوێژی مردوویان لەسەر تەرمەکەی کرد، تەمەنی سی وپێنج ساڵ بوو، گۆڕەکەی وا لەگۆڕستانی بەقیع لە مەدینە، یەکەم کەس بوو لە کەس وکاری پێغەمبەر، کە لەپاش پێغەمبەر مرد، کە

مرد ئیمامی عەلیو ئەسمائی کچی عومەیس شۆردیان، لەسەر ڕاسپێری خۆی بەشەو ناشتیان، عەباس و عەلی و فەضل دایان هێلایە ناو گۆڕەکەی.

بۆ زیادە سوود وبەهرە بڕوانە : (فەرموودەی ژ : ٩٤، ١٠٥، ٧٠٥ بەرگی/٢ل- ١٢٨+ ژ: ٧٢٨ب/٢ل —١٥٧ژ : ٧٥٠ب/٢ل —١٧٤+ژ: ٧٦١ ب —٢ل- ١٨٧ + ژ: ٧٨٨ ب - ٢ ل —٢٠٦ + ژ: ٨٥٦ ب- ٢ ل- ٢٥٢ + ژ: ١٠٤٣ بەرگی/٣ ل- ١٣٥ تا ١٣٨ + ژ: ١١٠٢ ب —٣ ل - ١٩٠+ ژ: ١٢١٨ ب —٣ ل - ٣٤٣ ) + (تاج/٥ ل- ١٤٨، ١٤٩، هەتا ١٦٤، ١٠٣، ١٠٨، ١١٣، ل- ٥٩ ).

١٧٢٦- عن عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ مَسْعُودٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) فَقَالَ: (وَاللّٰهِ لَقَدْ اخَذتُ مِنْ فِي رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بِضعًا وَسَبْعِينَ سُورَةً وَاللّٰهِ لَقَدْ عَلِمَ اصْحَابُ النّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) انّي مِنْ اعْلَمِهِمْ بِكِتَابِ اللّٰهِ وَمَا انَا بِخَيْرِهِمْ) (الحديث ٥٠٠٠) [٤٧٢].

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سوێندم بە خودا، لە زاری پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لێ بێ) حەفتاو ئەوەندە سوورەتم لە سوورەتەکانی قورئان وەرگرتووەو لەبەرم کردوون، سوێندم بەخودا هاوڕێکانی پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) باش باش دەزانن کە من لەو هاوڕێیانەی پێغەمبەرم کەزۆر چاك شارەزای قورئانن و زۆر باش دەیزانن، بەلام من باشترینی ئەوان نیم. (تاج/٥ ل/١٣٢ ز/٢٨- گەورەیی ابن مسعود ).

١٧٢٧- عَنْ عَلْقَمَةَ (رحمه الله تعالى) قَالَ: (كُنّا بِحِمْصَ فَقَرَا ابْنُ مَسْعُودٍ سُورَةَ يُوسُفَ فَقَالَ رَجُلٌ: مَا هَكَذا انْزِلَتْ؟ قَالَ: (قَرَاتُ عَلَى رَسُولِ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: احْسَنْتَ وَوَجَدَ مِنْهُ رِيحَ الْخَمْرِ فَقَالَ: اتَجْمَعُ انْ تُكَذبَ بِكِتَابِ اللّٰهِ وَ تَشْرَبَ الْخَمْرَ فَضرَبَهُ الْحَدَّ)، (الحديث ٥٠٠١ ).

---

(٤٧٢) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل عبدالله بن مسعود وامه (رَضيَ اللهُ عَنهما) ، رقم: ٢٤٦٢ .

عەلقەمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە حومس بووین، ئیبنو مەسعوود سوورەتی یوسفی خوێند. پیاوێ گوتی : ( ئەم سوورەتە بەم شێوەیە نەهاتووەتە خوارەوە. ئیبنومەسعود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی : (ئەم سوورەتەم لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا خوێند لەسەر ئەم شێوەیەی کە ئێستا خوێندم، فەرمووی پێم : ئافەریم بۆ خۆت).

ئیبنو مەسعوود سەرنجی دا کە کابرا بۆنی مەی و بادەی لێدێ، جا پێی گوت : تۆ لەلایەکەوە بەنەزانی دەم لە نامەی خودای گەورە دەکوتی ولافی مامۆستایی لەنامەی خوادا لێئەدەی، لەلایەکی تریشەوە ڕەفتارت پێچەوانەی گوتارتە، چونکە ئەوەتا ئارەقت خواردۆتەوەئەمە چەنی بەچەنە؟ ) جا پاش ئەوە کابرای ڕەخنەگر، ددانی بەوەدا نا کەبادەی نۆشیوە، داری حەددی ئارەق خواردنەوەی لێی دا.

١٧٢٨- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) (انَّ رَجُلا سَمِعَ رَجُلا يَقْرَا ﴿قُلْ هُوَ اللّٰهُ احَدٌ﴾ يُرَدِّدُهَا فَلَمَّا اصْبَحَ جَاء الَى رسول اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذكَرَ لَهُ ذلِكَ وَكَانَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ انَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُث الْقُرْانِ)، (الحديث : ٥٠١٣- طرفاه في : ٦٦٤٣، ٧٣٧٤ )[٤٧٣].

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ)دەفەرموێ : شەوێ پیاوێ هەر سوورەتی: ﴿ قُلْ هُوَ اللّٰهُ احَدٌ﴾ دەخوێنێ و دیسانەوە دووبارەی دەکاتەوە، پیاوێکی تر گوێی لەم کارە دەبێ، بۆ سبەینێ دەچێتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) ئەوەی عەرز دەکا، وەك پیاوەکە خوێندنی ئەم سوورەتە بە تەنها خۆی بەکەم دابنێ وابوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی : ( بەو کەسەی ڕۆحی منی بە دەستە، ئەم سوورەتە لەبەر گەورەیی خۆی،

---

(٤٧٣) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي سعيد الخدري في فضل ﴿قل هو الله احد﴾ (كتاب فضائل القران) خاتمة ج/١٠ ص١٢٧ — فتح الباري - المترجم.

هاوتای سێ یەکی قورئان دەکا ! ). ( تـاج/٥ ل/٣١٦ ژ : از :٩٠+ ریـاض/٣ ل/٨١٥ ز/١٨٣ ژ/٣).

١٧٢٩- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاصْحَابِهِ: (ايَعْجِزُ احَدُكُمْ انْ يَقْرَا ثلث الْقُرْانِ فِي لَيْلَةٍ فَشَقَّ ذلِكَ عَلَيْهِمْ؟ وَقَالُوا: ايُّنَا يُطِيقُ ذلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: (اللَّهُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ ثُلُث الْقُرْانِ)، (الحديث ٥٠١٥)[474].

ئەبو سەعیدی خودری (رمزای خودای لێ بێ) فەرمویی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بە یارانی خۆی فەرموو : ( کەستان دەتوانن کەسایەکی قورئان لە شەوێکا بخوێنن؟ ) یارانی (رمزای خودای لێ بێ) ئەمەیان پێ زەحمەت بوو، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لەکوێ دەتوانین بە شەوێ سێیەکی قورئان دەوربکەینەوە! فەرمویی: ( دەبزانن سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ احَدٌ﴾ هاوتای سێیەکی قورئان دەکا ) ( تاج/٥ ل/٣١٦ ز/٩٠- ش/ ت + ریاض/٣ ل- ٨١٤ ).

١٧٣٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) (انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ اذا اوَى الَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ ثمَّ نَفَث فِيهِمَا فَقَرَا فِيهِمَا ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ احَدٌ﴾ وَ ﴿قُلْ اعُوذ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ وَ ﴿قُلْ اعُوذ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ ثمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتطاعَ مِنْ جَسَدِهِ يَبْدَا بِهِمَا عَلَى رَاسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا اقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذلِكَ ثلاث مَرَّاتٍ ( الحديث : ٥٠١٧- طرفاه فی : ٥٧٤٨، ٦٣١٩)[475].

دیسان عائیشە (رمزای خودای لێ بێ) دایکی موسڵمانان فەرمویی: جاران پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) هەمو شەوێ، کە دەچووە سەر نوێنی نووستن، هەردوو لالەپی خۆی دەنا بەیەکەوە و، بە تەرپی دەمی کوفوی پیادەکردن و ئینجا ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ احَدٌ﴾ و﴿قُلْ اعُوذ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ و﴿قُلْ اعُوذ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ی

---

(٤٧٤) لم يوافقه مسلم على اخراج حديث ابي سعيد الخدري (ايعجز احدكم ان يقرا ثلث القران)، (فتح الباري ج/١٠ص١٢٧ —خاتمة كتاب فضائل القران) - المترجم .

(٤٧٥) اخرجهُ مسلم في السلام، باب: باب: رقية المريض بالمعوذات و النفث، رقم:٢١٩٢ .

بەناو هەردو دەستی خۆیدا دەیخوێند، ئینجا دەیهینان بە سەر جەستەی خۆیدا سەرتا پا ئەوەندەی کە دەستی پێی دەگەیشت، لە پێشا دەیهێنان بە سەر سەرو ڕوخساریدا، ئینجا بە بەری لەشیدا، ئینجا بە بەری پشتیدا، سێ جار ئاوای دەکردو ئەم شتەی ئەنجام دەدا. (تاج/٥ ل/٣٢١ ز/٩١ ژ/٣ - بوخاری).

**ڕوونکردنەوە:**

گەرچی بە ڕواڵەت و بە دیمەن لە پێش خوێندنی ئەم سێ سوورەتەدا، پفو دەکرێ بەناو لەپدا، بەڵام مەبەست ئەوە نییە، بەڵکو لە پێش دا ئەم سێ سوورەتە دەخوێنرێ و ئەوجا بە تەڕای دەم پف دەکرێ بە ناو لەپدا، هەتا ناو لەپ بەو تەڕاییە پیرۆز ببێ، بە هۆیەوە پیت وفەڕی قورئانەکە ڕاگوێز بکرێ بۆ ناو لەپ و لە وێشەوە بۆ باقی تری جەستە.

١٧٣١- عَنْ اسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ قَالَ: (بَيْنَمَا هُوَ يَقْرَا مِنَ اللَّيْلِ سُورَةَ الْبَقَرَةِ وَفَرَسُهُ مَرْبُوطَةٌ عِنْدَهُ اذ جَالَتْ الْفَرَسُ فَسَكَتَ فَسَكَتَتْ فَقَرَا فَجَالَتْ الْفَرَسُ فَسَكَتَ وَسَكَتَتْ الْفَرَسُ ثُمَّ قَرَا فَجَالَتْ الْفَرَسُ فَانْصَرَفَ وَكَانَ ابْنُهُ يَحْيَى قَرِيبا مِنْهَا فَاشْفَقَ انْ تُصِيبَهُ فَلَمَّا اجْتَرَّهُ رَفَعَ رَاسَهُ الَى السَّمَاء حَتَّى مَايَرَاهَا فَلَمَّا اصْبَحَ حَدَّثَ النَّبِيَ (صَلَّىاللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: اقْرَا يَا ابْنَ حُضَيْرٍ اقْرَا يَا ابْنَ حُضَيْرٍ قَالَ: فَاشْفَقْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ انْ تَطا يَحْيَى وَكَانَ مِنْهَا قَرِيبا فَرَفَعْتُ رَاسِي فَانْصَرَفْتُ الَيْهِ فَرَفَعْتُ رَاسِي الَى السَّمَاء فَاذا مِثْلُ الظُّلَّةِ فِيهَا امْثَالُ الْمَصَابِيحِ فَخَرَجَتْ حَتَّى لا ارَاهَا قَالَ: وَتَدْرِي مَا ذاكَ؟ قَالَ: لا قَالَ: (تِلْكَ الْمَلائِكَةُ دَنَتْ لِصَوْتِكَ وَلَوْ قَرَاتَ لاصْبَحَتْ يَنْظرُ النَّاسُ الَيْهَا لا تَتَوَارَى مِنْهُمْ). ( الحديث :٥٠١٨)[٤٧٦].

---

(٤٧٦) اخرجهُ مسلم في صلاة المسافرين و قصرها، باب: نزول السكينة لقراءة القران ، رقم: ٧٩٦ .

ئوسەیدی کوڕی حوچەیر(رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: جارێکیان شەو بوو، سوورەتی بەقەرەم دەخوێند، ماینەکەیشم لە لاما بەگوریسێ سترابۆوە، لە پڕێکا ماینە کە ڕاچەنی و هەڵ سڵەمی یەوە، ئیتر منیش بێ دەنگ بووم، ماینەکەش بێ دەنگ بووو دا سەکنا، کە من دەستم کردەوە بەقورئان خوێندن دیسان ماینەکە ڕاچەڵەکییەوە، کە من بێ دەنگ بوومەوەو هەستم هەڵ گرت دیسان ماینە کەش هێمن بوویەوە، هەتا چەند جارێ ئەم حاڵە دووبارە بویەوە، ئیتر دەستم لە قورئان خوێندنەکەم هەڵگرت. یەحیای کوڕیشم منداڵ بوو لە ماینەکەوە نزیك بوو، ترسام ئەگەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بێ ماینەکە کوڕەکەم بشێلێ، لەبەر ئەوە ڕام کێشاو دوورم خستەوە لەماینەکە، کە سەرم هەڵبڕی وا شتێ وەك کاژە هەور لە ڕاسەرم وا بەئاسمانەوە، هەر تەماشام کرد، هەتا دوور کەوتەوەو لە بەر چاوم نەما، کاژە هەورەکە کە بەڕاسەرمەوە دەجولا، چرا گەلێکی درەخشانی تێدا بوو.

جا بۆ بەیانی کە ئەمەم عەرزی پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) کرد، فەرموی: دەبوو بتخوێندایە ئەی کوڕی حوزەیر ! هەتا لە پیت و فەڕی دابەزینی فریشتە بەشدار بوویتایە). منیش عەرزیم کرد : ئەی پێغەمبەری خوا ! مەترسی ئەوەم بوو ماینەکە یەحیای کوڕم بشێلێ، چونکە لە نزیکیەوە بوو بوو، لەبەر ئەوە چووم بە لای یەحیاوە. فەرموی: ئایا دەزانی ئەوە چی بوو ؟ گوتم : نە. فەرموی: ( ئەوانە فریشتە بوون، بۆ گوێگرتن لە قورئان خوێندنەکەی تۆ نزیك بوونەتەوە، ئەگەر بەردەوام بویتایە لەسەر قورئان خوێندنەکەت، بەیانی بە بێ پەردە خەڵکان سەیری ئەو پۆلە فریشتەیان دەکرد، لەسەر ئەو حاڵە تەی کە گوێیان لە دەنگی تۆ گرتبوو، وە خۆیان لەوان نەدەشاردەوە). (تاج/٥ ل- ٢٩٢ ز: ٨٠ ژ : ١ + ریاض/٣ ل- ٨٠٨ ژ : ٨ ز :١٨٠ ) + ( ژ : ١٤٣٩ تەجرید بەرگی چوارەم ).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

**یەکەم** : ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لە سەر گەڵێ شت :

١- ئوسەید دەنگی زۆر خۆش بووە.

٢- لە ناو یارانی پێغەمبەر دا کەرامات ڕووی داوە ( بڕ : ژ : ١٤٥٦ ).

٣- موسڵمانی خواناس فریشتە دەبینێ. (بڕ : ژ: ١٤٤٤ تەجرید ).

٤- ئاژەڵ و ولاخ و وەڵس فریشتە دەبینن. ( بڕ: ژ: ١٥٠٧ ).

٥- قورئان خوێندن بە دەنگی خۆش، لە گەڵ صلاح وتەقوادا، ڕێخوشکەرە بۆ خێر وبێر وپیت و فەڕی زۆر، وەك دابارینی سەکینەو دیتنی فریشتەو ڕۆشنبونەوەی دڵ ودەرون وچاوو گەیشتن بە پایەی ویلایەتی شەرعی (بڕ: ژ: ١٤٩٢).

٦- لە فەرموودەی ساخ دا کۆمەڵی فەرمودە هەیە ئەم جۆرە بابەتانە دەسەلمێنێ ( بێجگە لە مرۆڤ و فریشتەو جنۆکە وپەری وشەیاتینی، شتگەلی تریش هەستیان هەیە،وەك تەسبیحی خۆراك و دارو بەردو قسەکردنی حەیوانات و تێگەیشتنیان لە زۆر شت تەنانەت گریان و پێکەنینیش، (بڕوانە : تاج/٤ ل —٣٤٨ ز: —١٠٩ — ژ: ١، ژ : ٢ ) بڕوانە: ژ: ١٦٩٧ تجرید + ١٦٩٨ تجرید = ٤٨٤٨ ف + ٤٨٤٩ فتح ).

**دووەم** : ئوسەیدی کوڕی حوچهیر (ڕەزای خودای لێ بێ) یەکێکە لە گەورە هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەر و ڕەزای خودا لەسەر هاوڕێیانی بێ) حوضەیری باوکی پیاوێکی سوار چاك بوو، سەرۆکی هۆزی ئەوس بوو، بە ناموسڵمانی مردووە لە ڕۆژی هەرای بوعاثدا خۆی سەرۆکی هۆزەکەی بوو (بڕ : ژ : ١٤٨١ تەجرید= مختصر صحیح البخاري ).

ئوسەید یەکێکە لە موسڵمانە هەرە پێشینەکان، لە شەوی پەیمانی بەیعەتول عەقەبەی دووەم دا یەکێك بوو لە نەقیبەکان، لەسەر دەستی موصعەبی کوڕی عومەیردا ئیسلام بوو، لە کاتی بەستنی پەیمانی برایەتی دا، پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) داینا بەبرای زەیدی کوڕی حاریثە.

له ڕۆژی هەرای ئوحود دا، که موسڵمانان پشتی پێغەمبەریان چۆڵ کرد ئەو لەخزمەتی دا خۆگر بوو، وه حەوت برینی لەو شەڕەدا لێ کرا، ئەوەنده ئازاو نەبەرد بوو، کۆمەڵێ فەرموودەی هەیە له صەحیحین دا.

ئوسەید پیاوێکی ژیری هۆشمەندی کامڵی خاوەن ڕاو بۆچوون بوو، پیاوێکی زۆر دەنگ خۆش بوو، له شەودا به دەنگێکی خۆش لە شەو نوێژدا قورئانێکی زۆری دەخوێند، جاری وا دەبوو سوورەتی به قەرەی بەتەواوی دەخوێند، به پێی ئەم فەرموودەیە فریشتە دەهاتنە خزمەتی و گوێیان له دەنگە خۆشەکەی دەگرت، له کاتی قورئان خوێندن د.

لەسەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەردا، حەزرەتی ئوسەید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمانی حەقی بەجێ هێنا و، به مەرگی خوا مرد، له مانگی کۆڵە مانگدا، ساڵی بیستی کۆچی، پێشەوا عومەر پیش نوێژیی نوێژی تەرمی لەسەر کرد، به فەرمانی ئیمامی عومەر دوو ڕیز له نەوەی بەنی ئەشهەل، که ئوسەید لەو بەرره بابە بوو، هەڵیان گرت هەتا گۆڕستانی بەقیع و لەوێ بەخاکیان سپارد، ڕاسپێری بۆ عومەر نوسیبوو، عومەر تەماشای ڕاسپێرینامەکەی کرد، چوارهەزار لیرەی زێڕ قەرزار بوو، رەزەخورمای له مەدینه هەبوو، عومەر فرۆشتنی و قەرزەکەی سەری دایەوه لێی، دەڵێن : ئیمامی عومەر خۆیشی چووەتە ژێر تەرمەکەی، کاتێ دەیبەن بۆ گۆڕستان.

له ریاض صالحین دا دەفەرموێ : ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ : (ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عەببادی کوڕی بیشر (رەزای خودای لێ بێ) شەوێ له خزمەت پێغەمبەر دا دەبن هەتا شەو درەنگ دەبێ، خەریکی قسەو باس و گفتوگۆ دەبن، شەوەکەشی شەوە زەنگ دەبێ، که له لای پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێ) دەردەچن و بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوه، هەر کەسەیان سەرو دار دەستیان به دەستەوه دەبێ..

ئیتر به فەرمانی خودا، له ڕێگا داردەستی یەکێکیان دەبێ به چرا و ڕۆشنایی یان بۆ دەکا و، لەبەر شەوقەکەی دەڕۆن هەتا ڕێگەیان له یەکتر

جيا دەبێتەوە، ئەو جا داردەستی ئەویتریان دەبێ بەچراو ڕۆشنایی دەکا بۆی ئیتر هەریە کەیان لەبەر شەوقی داردەستی خۆی دەڕوا، هەتا دەگاتەوە ماڵی خۆی، ئیمامی بوخاری (رەحمەتی خودای لێ بێ) گێڕاویەتەوە. (ریاچ صالحین/٣ ل-١٠٩٣ ز- ٢٥٣- باسی کەراماتی ئەولیا ژ : ٦ ) بۆ زێدە بەهرەو فەزڵی ئوسەیدی کوڕی حوزەیر، بڕ : تاجول ئوصول، بەرگی پێنجەم، ل : ١٧٦+ ب/ ٥ ل - ٦- ز: ١ ژ: ٥.

**سێیەم** : بۆ ئەوەی بە باشی بزانین کە خەواریق و کەرامات لەناو هاوڕێیانی پێغەمبەر دا، هەتا چ ئەندازەیەك باوبووە و ڕوی داوە، گەلێ بە زۆری، ئاماژە دەکەین بۆ ئەم شوێنانە، بە پێچەوانەی ئەو قسە لۆکەوە کە گوایە کەرامات، لە ناو یاران و هاوڕێیانی پێغەمبەردا کەم بووە ز بڕوانە :

ا- تەجریدی بوخاری کە ئەم پەراوە پیرۆزەیە بەرگی یەکەم ل/٤ ژ: ٥ کە باسی ژیان نامەی صەحابەکان دەکاو ئاماژە بۆ چەند ژمارەیێ دەکا لەم پەراوە پیرۆزەدا.

ب- بەرگی دووەم، لاپەڕە (ڕوونکردنەوە) لیستی ناوی هاوڕێیان، کە بە پێی ژمارە کانی ئەم پەراوە پیرۆزە دیاری کراون، کە بە ژ :٣ کە حەزرەتی عائیشەیە (رەزای خودای لێ بێ) دەست پێ دەکا. وە بە ژمارە (٨٣٧- تەجرید = ژ : ١٨١٥فتح الباری کۆتایی دێ کە ( کەعبی عوجرەیە ) کە دەکەوێتە لاپەڕە :٢٣٧ی بەرگی دووەم. زۆر بەی ئەم ژمارانە کە کورتەیەکی پوختی ژیانی هاوڕێیانی پێغەمبەرن، کەراماتی شەرعی کە لەو زاتانە بینراون وا تیادا و باس کراوە.

ج- تەجرید ٣ = موختەصەری صەحیحی بوخاری ب/٣ بڕ : ئەم ژمارانە : ل:٨٢ ژ: ١٠٠٦ تەجرید = ٢٢٧٦ فتح الباری. ژ: ل:١٠٠ ژ : ١٠١٦ت =٢٣١١ فتح الباری، ل- ١٠٤ ژ : ١٠١٧ت = ٢٣١٢ فتح الباری، ل- ١١١ ژ: ١٠٢٢ت = ٢٣٢٤ فتح الباری ل- ١٥٦ ژ: ١٠٦٣ ت = ٢٤٥٢ فتح الباری ژ : ١٠٧٥ت = ٢٤٨٤ ل- ١٦٥ل- ١٧١ ژ: ١٠٨٠ ت = ٢٥٠٢ فتح ل —١٧٩ ژ: ١٠٨٧ ت=٢٥٣٠ فتح ل- ٢٠٠ ژ: ١١١٣ ت =

٢٦٢٤ فتح ل- ٢٤٢ ژ : ١١٣٤ت = ٢٧٣١ فتح ل- ٢٧٥ ژ: ١١٤٥ ت = ٢٧٨٠ فتح ل- ٢٨٣ ژ: ١١٥٣ت = ٢٨٠١ فتح البارى ل ٢٨٦ ژ:١١٥٦ ت = ٢٨٠٦ فتح ل- ٣٠٧ ژ: ١١٧٩ت=٢٨٥٦ فتح ل- ٣٢٩ ژ:١٢٠٦تجريد= ٢٩٣٧ فتح ل- ٣٤٣ ژ: ١٢١٨ت= ٢٩٧٦ فتح البارى ل-٣٧١ ژ: ١٢٥ت= ٣٠٧٠ فتح البارى.

د- بۆ بەرگی یەکەمی ئەم تەجریدە پیرۆزە، بۆ چەسپاندنی کەرامەت و خەواریق بۆ سەحابەکانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەر و رەزای خودا لەسەر هاوەڵانی بێت) بڕوانە ئەم ژمارانەی تریش: ژ: ٤٦٨ ل — ٤٤٢، ل —٤٥٣ ژ : ٤٧٩، ل —٤٥٨ ژ : ٤٨٥ ل —٤٦٤ ژ: ٤٩٠ ل- ٥٠٠ ژ: ٥٢٨ ل —٥٢٤ ژ: ٥٥٢ ل —٥٣١ ژ: ٥٥٤ ل : ٥٥١ ژ : ٥٧٧ ل - ٥٥٣ ژ: ٥٧٨.

هـ- بڕوانە : بەرگی سێیەم، ریاچ صالحین، بە کوردی ل : ١٠٧٢- سەرباسی کەراماتی پیاو چاکان. ژ/٢٥٣ ژ/١ ل/١٠٨٢ — هەتا لاپەڕە :١١٠٠.

و- تاجول ئوصول، بەرگی پێنجەم ل/١١ ژ/٣ هەتا ژ/٦٦ ل/٢٣٥ هەروەها ژ/٦٠ ل/١٩٧ فەرمودەی ژمارە:٨.

١٧٣٢- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا حَسَدَ الا فِي اثنَتَيْنِ رَجُلٌ عَلَّمَهُ اللّٰهُ الْقُرْانَ فَهُوَ يَتْلُوهُ انَاء اللَّيْلِ وَانَاء النَّهَارِ فَسَمِعَهُ جَارٌ لَهُ فَقَالَ: لَيْتَنِي اوتِيتُ مِثلَ مَا اوتِيَ فُلانٌ فَعَمِلْتُ مِثلَ مَا يَعْمَلُ وَرَجُلٌ اتَاهُ اللّٰهُ مَالا فَهُوَ يُهْلِكُهُ فِي الْحَقِّ فَقَالَ رَجُلٌ:(لَيْتَنِي اوتِيتُ مِثلَ مَاوتِيَ فُلانٌ فَعَمِلْتُ مِثلَ مَا يَعْمَلُ). (الحديث ٥٠٢٦- طرفه في :٧٢٣٢، ٧٥٢٨ )[٤٧٧].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( حەسوودی و بە خیلی بە کەس دروست نییە، بەم دوو کەسە

(٤٧٧) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث (لاحسد الا في اثنتين)(خاتمة ج/١٠ص١٢٧) - المترجم .

نـەبێ، بـە پیاوێـك كـە خـودای مـەزن فێـری قورئـانی پیرۆزی كردبـێ، وە بەردەوام بە شەو و بە ڕۆژ خەریكی بێو دەوری بكاتـەوە، دراوسـێیەكی گوێی لێ بێ، بڵێ: خۆزگە منیش وەك ئەم پیاوەم پێ ببەخشرایە، منیش وەك ئەوم دەكـرد. بـە پیـاوێكیش خـودای گـەورە مـاڵی ڕەحمـەتی پێبـدا، وە خۆیـشی دەستی تێ بچێ، لە ڕێگای ڕاست دا داغانی بكا. پیاوێكی تریش، خۆزگەی پێ بخوازێ و بڵـێ : خۆزگـە منـیش وەك ئـەم پیـاوە خـودا پێـداوە مـاڵ و سامانم دەبوو، منیش وەك ئەو ئاوا كاری شایان و دروستم پێ ئەنجام دەدا ).

**ڕاڤەو شیكردنەوە:**

( بڕ : تاج/١ ل/٨١ ژ/٥ + ل/٨٦ ژ/٦). وەك چەند جارێ ڕوونمان كـردەوە : وشـەی (پیـاو)و وشـەی ( فێركردنـی قورئـان) وەهـەروەها ( مـاڵ ) لـەم جۆرە شوێنانەدا بۆ قەید نین، بەڵكو بۆ نموونەن، كەواتە : خۆزگە بـە ژنـی قورئـان پـەروەریش، لـە لایـەنی ژن و پیـاوەوە دروسـتەو ڕەوایـەو بگـرە كـارێكی پەسەندیـشە. هـەروەها ئەگـەر كەسـێ خۆزگـە بـە ئیمـامی بوخـاری، یـا بـە ئیمامی موسلیم بخوازێ، بە هۆی ئـەوەی كـە خزمـەتێكی گـەورەی سوونـنەتی پێغەمبەریان كردووە، جێگەی خۆیەتی، وەهەروەها ئەگەر كەسێ خۆزگە بـە موسڵمانێ بخوازێ، لە سەر ئەوەی كـە مرۆڤێكـی ئـالوودەی مزگەوتـە، یـا شـەو نوێژێكی جوان دەكا، یا ڕۆژو گرێكی باشە، یا هاوسایەكی زۆر پیرۆزو پاكە، یا دووكـان دارێكـی حـەقانی و حـەلاڵ خـۆرو مامەڵـە خۆشـە، یـا مەلایـەكی چاكە....تاد. بەڵام ئەوەنـدە هەیە: (هەمیشە نموونە باس كراوەكان، هەمیـشە لە پێشی پێشەوەن لەو كارەدا، كەواتە: خۆزگە بە قورئـان خـوێنی بـاش، سـەر گوڵی ئەم بابەتەیە، هەروەك خۆزگە بە پیاوی خوا پێـداوی سـەخی نموونـەی بـاڵای ئـەم بابەتەیـە). ( بڕوانـە: بـەرگی/١ ل/٨٩ ژ/٦٥ تەجریـد =٧٣ فـەتحول باری: بڕ: ژ/٤٠ ت = ژ/٤٣ فەتحول باری ب/١ ل/٦١) + (ریـاچ صالحین/٣ ل/٨٠٧ ژ/١٨٠ ژ/٧) + (تاج/١ ل/٨٦ ز/١٥ ژ/٦).

١٧٣٣- عَنْ عُثمَانَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ). (الحديث٥٠٢٧- طرفه في: ٥٠٢٨ )[٤٧٨].

پێشەوا عوثمان (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (باشترین کەسی ئێوە، ئەی گەلی ئیسلام ! ئەو کەسەتانە کە خۆی فێری قورئان دەبێو خەڵکی تریش فێری قورئان دەکا). (تاج/٥ ل/٢٧١ ز/٧٦ ژ/١ + ریاض/٢ ل/٨٠٥ ز/١٨٠ ژ/٣).

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لە فێر بوونی قورئان تەنیا ئەوە نییە کە بزانێ قورئان بخوێنێ بە جوانی و بەس، بەڵکو دەبێ بە پێی توانا کاریشی پێ بکات. لە گێڕانەوەیەکی ئەم فەرموودەیەدا ئاوایە: (خيركم من تعلّم القران او علّمه) بە (او) کە بۆ تەنویع بێ، نەوەك بۆ دو دڵی و گومان. بە پێی ئەم گێڕانەوەیە معلم و مامۆستای فێرکاری قورئان لە باشترین ئوممەتی موحەممەدن. هەروا کەسێ خۆی فێری قورئان ببێ، با نەیشبێ بە مامۆستای قورئان گوتنەوە.

١٧٣٣ م- وعَنْه في رواية قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انَّ افْضَلَكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ. (الحديث ٥٠٢٨- طرفه في : ٥٠٢٧).

واتاکەیلەپێشەوە ڕۆیشت، چونکە فەرقی(خيريه)و (افضلية) نییە لەمەعنادا.

١٧٣٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: انَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الابِلِ الْمُعَقَّلَةِ انْ عَاهَدَ عَلَيْهَا امْسَكَهَا وَانْ اطلَقَهَا ذهَبَتْ). (الحديث ٥٠٣١ ).

---

(٤٧٨) لم يوافقه مسلم على حديث عثمان : (خيركم من تعلم القران) – خاتمة كتاب فضائل القران ، مجلد/١٠ص١٢٧ - المترجم .

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) فەرموی: (نموونەی قورئان خوێن، وەك نموونەی خاوەن وشتر وەهایە، كە وشترەكەی بە پەتێ بەستبێتەوە و، بە مەڕ بەندێ مەڕ بەندی كردبێ، چۆن ئەو ئەگەر سەرەو كاری وشترەكەی بكا ئەوا وشترەكەی بۆ دەمێنێ، بەڵام ئەگەر بەرەڵای بكا ئەوا وشترەكە بە لەسە دەبێ و لە دەستی دەر دەچێ، قورئانیش هەروەها، ئەگەر خاوەنەكەی خەریكی بێو چاودیری بكا، ئەوا لە بەری دەمێنێ، دەنا بەرە بەرە لە بیری دەچێتەوە). ( تاج/٥ ز/٧٧ ل/٢٨٢ ژ/١ + ریاض صالحین/٣ ل/٨١٠ ز/١٨١ ژ/٢- ش ).

١٧٣٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ ابن مسعود (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِئْسَ مَا لاحَدِهِمْ انْ يَقُولَ نَسِيتُ ايَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ بَلْ نُسِّيَ وَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْانَ فَانَّهُ اشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنْ النَّعَمِ. (الحديث ٥٠٣٢- طرفه في : ٥٠٣٩)[٤٧٩].

عەبدوڵلای كوڕی مەسعود (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ : پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ : ( چەندە خراپ و ناشیرینە بۆمرۆڤ كەبڵێ: من ئەو ئایەتە یا ئەو سوورەتەم لە بیرچووەتەوە، بەڵكو ئەوە چارەنووسی خودایی لە بیری بردۆتەوە، كەوابوو با بڵێ : فیسارە ئایەتم، یا فیسارە سوورەتم لە بیر براوەتەوە!).

دەی هەمیشە دەوری قورئان بكەنەوەوبیكەن بەویردی سەرزمانتان وپیشەی هەمیشەتان، ئەگینا چۆن وشترو مالات كە لە پەت بەر بوون، ئەگەرچاودێری نەكرێن، بەرە بەرەكێوی‌و بەلەسە دەبن وئیتر زەوت ناكرێن، قورئانیش ئاوا، بگرە خێراتریش لەسینگی قورئان خوێنەكان نائاشنا دەبێ، ئەگەر بێتو سەرو مڕ دەوری نەكرێتەوە ). ( تاج/٥ ل/٢٨٣ ز/٧٧ ژ/٣- ش/ت).

---

(٤٧٩) اخرجهُ مسلم في صلاة المسافرين و قصرها، باب: فضائل القران و ما يتعلق به ... ، رقم:٧٩٠

١٧٣٦- عَنْ ابِي مُوسَىعَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَعَاهَدُوا الْقُرْانَ فَوَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ اشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ الابِلِ فِي عُقُلِهَا). (الحديث ٥٠٣٣).

**ئەبو موسا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: (سەرەو کاری قورئان بکەن و هەمیشە دەوری بکەنەوە، دەسا بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، قورئان زووتر لە بیر دەچێتەوە، کاتێ دەوری نەکرێتەوە، هەتا وشتر، کاتی لە پەت بەر دەبێ و بە لەسە دەبێ !! ). (تاج/٥ ل/٢٨٢ ز/٧٧ ژ/٢- ش ) + ( ریاض صالحین/٣ ل/٨١٠ ز/١٨١ ژ/١).**

١٧٣٧- عَنْ انَس ابن مالك (رَضيَ اللهُ عنهُ) انهُ سئل: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: كَانَتْ مَدًّا ثمَّ قَرَا بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ يَمُدُّ بِبِسْمِ اللَّهِ وَيَمُدُّ بالرَّحْمَنِ وَيَمُدُّ بالرَّحِيمِ (الحديث ٥٠٤٦- طرفه في : ٥٠٤٥)[480].

**ئیمامی ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **پرسیاری لێ کرا : قوربان! ئایا پێغەمبەری خودا، قورئانی چۆن دەخوێند ؟ فەرمووی: بە مەددەوە دەیخوێند، هەڵکشاو و داکشاوی بە باشی ڕەچاو دەکرد، ئەوجا ئەنەس بۆ نموونە و سەر مەشق (بسم الله الرحمن الرحيم)ی خوێند بە مەددەوە ئاوا لامی ئەڵلاو میمی ڕەحمان و حێی ڕەحیمی درێژ کردەوە. ( تاج/٥ ل/٢٨٤ ز/٧٨ ژ/١).**

١٧٣٨- عَنْ ابِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهُ: (يَا ابا مُوسَى لَقَدْ اوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ الِ دَاوُدَ). (الحديث ٥٠٤٨ ).

**ئەبو موسای ئەشعەری** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لێ بێ) **پێی فەرمووم : (ئەی ئەبوو موسا ! بە ڕاستی خودای گەورە دەنگ و ئاوازێکی خۆشی پێ داویت، دەڵێی دەنگ و ئاوازە خۆشەکەی داوود**

---

(٤٨٠) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث انس : (كانت قراءته مدا) (مجلد/١٠ص١٢٧/خاتمة كتاب فضائل القران) - المترجم .

پێغەمبەرە (درودی خوای لێ بێ) ). ( تاج/٥ ز/٦٣ ل/٢٢٨ ژ/٥ + ریاض/٣ ل/٨١١ ز/١٨٢ ژ/٢- ش ).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

دەنگی خۆش بەهرەیەکی گەورەی خودایە، بۆ کەسێ بزانێ ڕێزی بگرێو لە سنووری شەرعی خۆێدا بە کاری بهێنێ. سوونەتە بانگ دەر دەنگی خۆش و زۆلال بێت، هەروەها سوونەتە پێش نوێژ دەنگی خۆش بێ، لە هەندێ گێڕانەوەی ئەم فەرمودەیەدا هەیە، کە هاوسەرە کانی پێغەمبەریش گوێیان لە دەنگی ئەبوموسای ئەشعەری دەگرت لەکاتی قورئان خوێندن دا، هۆی ورودی ئەم فەرموودەیە ئەوە بوو، کە شەوێ پێغەمبەر و عائیشە، گوێ لە ئەبوموسا دەگرن، بە دەنگە خۆشەکەی قورئان دەخوێنێ، ئەوەیش بەلگەیە بۆ ئەوەی کە بۆ ژنیش سوونەتە کە گوێ لە دەنگی قورئان خوێندنی پیاویش وەك هی ژن بگرێت، وەك گوێ لە دەنگی قورئانی تۆمار کراوی عەبدول باسیط و مەنشاوی و شێخ مەحموودی ئەل حوصەری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ)و ئەمانە بگرێ، یا لە پشت پێش نوێژەوە گوێ لە دەنگی قورئان خوێندنەکەی بگرێ.

١٧٣٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: انْكَحَنِي ابِي (رَضيَ اللهُ عنهُ) امْرَاةً ذاتَ حَسَبٍ فَكَانَ يَتَعَاهَدُ كَنَّتَهُ فَيَسْالُهَا عَنْ بَعْلِهَا فَتَقُولُ: نِعْمَ الرَّجُلُ مِنْ رَجُلٍ لَمْ يَطا لَنَا فِرَاشًا وَلَمْ يُفَتِّشْ لَنَا كَنَفًا مُنْذ اتَيْنَاهُ فَلَمَّا طالَ ذلِكَ عَلَيْهِ ذكَرَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (الْقَنِي بِهِ فَلَقِيتُهُ بَعْدُ فَقَالَ: كَيْفَ تَصُومُ؟ قَالَ: كُلَّ يَوْمٍ قَالَ: وَكَيْفَ تَختِمُ؟ قَالَ: كُلَّ لَيْلَةٍ.

قَالَ: (صُمْ فِي كُلِّ شَهْرٍ ثلاثةً وَاقْرَا الْقُرْانَ فِي كُلِّ شَهْرٍ) قَالَ: قُلْتُ: اطيقُ اكْثرَ مِنْ ذلِكَ قَالَ: (صُمْ ثلاثةَ ايامٍ فِي الْجُمُعَةِ) قُلْتُ: اطيقُ اكْثر مِنْ ذلِكَ قَالَ: (افْطرْ يَوْمَيْنِ وَصُمْ يَوْمًا) قَالَ: قُلْتُ: اطيقُ اكْثرَ مِنْ ذلِكَ قَالَ: (صُمْ افْضلَ الصَّوْمِ

صَوْمَ دَاوُدَ صِيَامَ يَوْمٍ وَافْطارَ يَوْمٍ وَاقْرَا فِي كُلِّ سَبْعِ لَيَالٍ مَرَّةً) فَلَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصَةَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَذاكَ انِّي كَبِرْتُ وَضَعُفْتُ فَكَانَ يَقْرَا عَلَى بَعْضِ اهْلِهِ السُّبْعَ مِنْ الْقُرْانِ بالنَّهَارِ وَالَّذي يَقْرَؤُهُ يَعْرِضهُ مِنْ النَّهَارِ لِيَكُونَ اخَفَّ عَلَيْهِ باللَّيْلِ وَاذا ارَادَ انْ يَتَقَوَّى افْطرَ ايَامًا وَاحْصَى وَصَامَ مِثْلَهُنَّ كَرَاهِيَةَ انْ يَتْرُكَ شَيْئًا فَارَقَ النَّبِيَ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ (الحديث ٥٠٥٢- طرفه فی : رقم : ٥٦٤ تجريد ١١٣١ فتح البارى = بةرطى يةكتم = لاثةرة : ٥٤٢ ).

مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە ڕۆیشت. بڕ : ژ : ٥٧٦ تجرید = ١١٥٢ فتح = بەرگی یەکەم ل- ٥٥١ + ژ: ٩١٢ ت = ١٩٧٥فتح = بەرگی/٢ ل/٢٩٣ + ژ/٩١٢ م= ١٩٧٧ فتح = بەرگی/٢ ل/٢٩٤.

لێرەدا دەفەرموێ: باوکم ژنێکی خانەدانی هێنابۆم، ناوبەناو بووکەکەیی بەسەر دەکردەوە و، لە بارەی مێردەکەیەوە کەمن بووم لێی دەپرسی. ئەویش جارێ عەرزی دەکا: پیاو هەروا دەبێ، لەوە چاکتر نابێ، ئەوە تەی نسیبم کەوتووەتە لای نەپێی ناوەتە سەرنوێنەکەم نەچمکی پەردەکەیهەڵداوەتەوە واتە هێشتا دروست نەبووە لەگەڵماو بەدەستی نەگرتووم!

جا کەئەم بارودۆخە درێژەی کێشا، باوکم ئەمەی عەرزی پێغەمبەر کرد. ئەویش (درودی خودای لێ بێ) پێی دەفەرموا: (بیهێنە بۆ لام). جا کاتێ چووم بۆ خزمەتی پێی فەرمووم: (چۆن چۆنی بە ڕۆژو دەبێ؟) گوتم : ( بەردەوام ساڵ دووانزە مانگە هەموو ڕۆژێ بەڕۆ ژو دەبم ) فەرمووی : ( ئەی چۆن و بە چەند ڕۆژ خەتمەیەکی قورئان دەکەی ؟ ) گوتم : هەمو شەوێ خەتمێ دەکەم.

فەرمووی : (وامەکە بەڵکوو لە هەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، بە مانگێکیش خەتمەیەکی قورئان بکە ). گوتم لەمە زیاتر دەتوانم ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی : (دەی کەوایە گشت هەفتەیەك سێ ڕۆژ

بەڕۆژوبە) گوتم: زیاتر دەتوانم. فەرمووی: (دەی کەوایە هەمیشە دوو ڕۆژ بە ڕۆژوبە و ڕۆژێ بەڕۆژو مەبە). عەرزیم کرد لەمەیش زیاتر دەتوانم. فەرمووی: (دەی باشترین شێوەی ڕۆژو گرتن ئەنجام بدە، کە شێوەی بە ڕۆژو بوونی داوود پێغەمبەرە، کە بەم شێوەیە بەڕۆژو دەبوو، تۆیش ئاوا بەڕۆژو بە : ڕۆژێك بە ڕۆژو بە و ڕۆژێك بە ڕۆژو مەبە، وە بە حەوت شەویش خەتمەیەکی قورئان بکە). جاکاتێ عەبدوڵلا پیربوو، دەیفەرموو:(خۆزگە کاتی خۆی ڕوخسەتەکەی پێغەمبەرم قەبووڵ دەکرد و، ئەو هەموو چەندو چۆنەم لە گەڵ نەکردایە، چوونکە ئێستا پیربووم و بێ هێزو زەبوون بووم و، ئەوەی بە لاوی دەمتوانی بیکەم ئێستا بە ئاسایی بۆم ناکرێ).

موجاهید (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( کاتێ عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص، پیر بوو بەردەوام بوو لە سەر ئەو شێوە خوا پەرستیەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا بەردەوام بوو لەسەری، کە ئەوە بوو ڕۆژ نا ڕۆژێ بەڕۆژو بێ و، خەتمێکی قورئانیش بە حەوت شەو لە شەو نوێژدا بکات، بەڵام لە کاتی پیریدا بۆ ئاسان کاری ئاوای دەکرد، بە ڕۆژ پشکی قورئان خوێندنەکەی شەوی، کە حەوت یەکی قورئان بوو، لە لای یەکێ لە کەسوکارەکەی دەور دەکردەوە، هەتا بەباشی ڕەوانی بکاتەوە، مەبادا شتێکی لێی لەبیرچوو بێ، هەتا بەشەو بەئاسانی و ڕەوانی لە شەو نوێژەکەی دا بیخوێنێ.

وەکاتێکیش دەیویست کە تۆزێ تین و هێزو گوڕێکمان تێبێتەوە، ڕۆژ نا ڕۆژەکە بەڕۆژو نەدەبوو، وەك سەردەمی لاوی، بەڵکو چەند ڕۆژێ بەژمارە دەیشکان و، بەڕۆژو نەدەبوو، ئەوجا ڕێك بەژمارەی ئەو ڕۆژانەی کە بەڕۆژو نەبوو بوو، ئەوەندە ڕۆژ بەسەریەکەوە بەڕۆژو دەبوو. بەم شێوە یە بەردەوام بوو لەسەر ئەو خوا پەرستیەی کە لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا ئەنجامی دەدا، چونکە حەزی نەدەکرد کە ئەوەی لە ژیانی پێغەمبەردا کردوویەتی لە

پەرستش و خوا پەرستی لە پاش مەرگی ئەو لە هیچ قۆناغێکی ژینی دا لێی کەم بکاتەوە!!

١٧٤٠- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (يَخْرُجُ فِيكُمْ قَوْمٌ تَحْقِرُونَ صَلاتَكُمْ مَعَ صَلاتِهِمْ وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ وَعَمَلَكُمْ مَعَ عَمَلِهِمْ وَيَقْرَءونَ الْقُرْآنَ لا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنْ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَةِ يَنْظُرُ فِي النَّصْلِ فَلا يَرَى شَيْئًا وَيَنْظُرُ فِي الْقِدْحِ فَلا يَرَى شَيْئًا وَيَنْظُرُ فِي الرِّيشِ فَلا يَرَى شَيْئًا وَيَتَمَارَى فِي الْفُوقِ). (الحديث ٥٠٥٨- اطرافه في : ٣٣٤٤، ٤٣٥١، ٤٦٦٧، ٦١٦٣، ٦٩٣١، ٦٩٣٣، ٧٤٣٢، ٧٥٦٢ ) ( بڕوانه : ژ: ١٦٠٢ بەرگی چوارەم )[٤٨١].

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ)لە پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستەوە (دروودی خودای لێ بێ) وە ڕەحمەت و بەرەکاتی خودای گەورەی لێبێ و، سەرو ماڵ و منداڵ و هەستو نەست بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێت، دەفەرموێ: (هۆزێ لە ناوتانا پەیدا دەبن، نوێژو ڕۆژوو و کردەوەی خۆتان لەچاو هیئەواندا بەهیچ دادەنێن، بەڵام ئەو هۆزە کە قورئان دەخوێنن لە گەرویان ڕەت نابێ و سەر زارەکی دەیخوێنن و ناچێتە ناو دڵیان..

ئەوانە وا لە دین یاخی و بەلەسە دەبن و لە ئایین دەردەچن وەك تیرێ بدا لە نێچیرێ و گورج بیسمێ و بە بێ ئەوە کە شتێ لە نێچیرەکە لەگەڵ خۆی بەرێ لێی دەرچێ، ئەمانیش ئاوا بەبا ئەوەی شتێ لە شوێنەواری دینیان پێوە بمێنێ لێی دەر دەچن، جا تیر هاوێژکە سەیری پەیکانەکە دەکا هیچ خوێن و ئەسەری پێکانی پێوە نابینێ، تەماشای کلکی تیرەکە دەکا هەروا هیچی پێوە نابینێ سەیری پەڕەی تیرە کە دەکا هیچی پێوە نابینێ، لە لەلەی

(٤٨١) اخرجهُ مسلم في الزكاة، باب: ذكر الخوارج وصفاتهم ، رقم: ١٠٦٤ .

شوێنی ژای کوانەکەیشا بەشکە، کە خوێن و شوێنەواری نێچیرەکەی پێوەیە یا نا.

واتە : چۆن ئەو تیرە ئەوەندە خێرا نێچیرەکە دەسمیێو لێ دەردەچیێ و لەکاتی سمین و لێ دەرچوونەکەدا لەبەر خێرایی خۆی هیچ لە نێچیرەکە لەگەڵ خۆی نابات، ئەم هۆزەیش ئاوا فڕیان بەسەر ئایین دارییەوە نامێنێ ).
(تـــاج/٥ ل —٢٨٧ ز: ٧٨ ژ: ٨- ش/ د/ ت = شـــەیخان ئـــەبوداوودو ترمـــزی (رەحمەتی خودای لێ بێ)).

١٧٤١- عَنْ ابِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْمُؤْمِنُ الَّذي يَقْرَا الْقُرْانَ وَيَعْمَلُ بِهِ كَالاتْرُجَّـةِ طعْمُهَـا طَيِّـبٌ وَرِيحُهَـا طَيِّـبٌ وَالْمُؤْمِنُ الَّذي لا يَقْرَا الْقُرْانَ وَيَعْمَلُ بِهِ كَالتَّمْرَةِ طعْمُهَا طَيِّبٌ وَلا رِيـحَ لَهَـا وَمَثَـلُ الْمُنَافِقِ الَّذي يَقْرَا الْقُرْانَ كَالرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطعْمُهَا مُرٌّ وَمَثلُ الْمُنَافِقِ الَّـذي لا يَقْرَا الْقُرْانَ كَالْحَنْظلَةِ طعْمُهَا مُرٌّ اوْ خَبِيث وَرِيحُهَا مُرٌّ. (الحـديث ٥٠٥٩- اطرافـه في: ٥٠٢٠، ٥٤٢٧، ٧٥٦٠ )[٤٨٢].

ئەبو موسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ)دەفەرموێ : خۆشەویست (دروودو سلاو و ڕەحمەت و بەرەکاتی خودای گەورەی لێبێ و، سەرو ماڵ و منداڵ و هەست و نەست گشتی بەقوربانی گەردی ژێر پێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) دەفەرموێ: (نموونەی باڵای ئەو موسڵمانەی کە قورئان دەخوێنێو لە هەمان کاتدا کاری پێ دەکا، وەك لیمۆ وایە، هەم بۆنی خۆشەو هەم تامی خۆشەو هەم ڕەنگی جوانە، وە وێنەی ئەو کەسەی کە قورئان زۆر نەخوێنێ، بەڵام کاری پێ بکا، وەك خورما وایە، هەرچەندە بۆنی نییە، بەڵام تامی خۆشە، وێنەی پیاوی دوو ڕوی قور ئان خوێن وەك ڕێحانە وایە، هەرچەندە بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە!! وێنەی دووڕوی قورئان نەخوێنیش وەك گوژاڵكەوایە بۆنی خۆشی نییەو تامیشی تاڵ و ناخۆشە ).

---

(٤٨٢) اخرجهُ مسلم في صلاة المسافرين و قصرها، باب: فضيلة حافظ القران ، رقم:٧٩٧ .

( تاج/٥ ل -٢٧٢ ز- ٧٦ ژ : ٣- ش/ د/ ت/ ن= بوخاری و موسلیم و ئەبو داوودو تیرمزی و نەسائی ئەم فەرموودەیە یان گێڕاوەتەوە (رەحمەتی خودای لێ بێ) + ریاض الصالحين، بەرگی سێیەم لاپەڕە :٨٠٦ ).

١٧٤٢- عَنْ جُنْدَبِ بن عبدالله (رَضيَ اللهُ عنهُ) عنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: اقْرَءوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ فَاذا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ (الحديث ٥٠٦٠- طرفه في : ٥٠٦١).

جوندوبی کوڕی عەبدوللا (رەزای خودای لێ بێ)دەفەرموێ :خۆشەویست (دروودو سلاو و ڕەحمەت و بەرەکاتی خودای گەورەی لێ بێ و، سەرو ماڵ و منالا و دایك و باوك و هەست و نەست گشتی بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) دەفەرموێ: (ئەوەندە قورئان بخوێنن کە دڵتان لەسەریەتی، بەڵام کەبێتاقەت بوون و دڵتان لە لای خوێندنەکەتان نەما، یا قورئان خوێندنەکەتان سەری کێشا بۆ ناکۆکی و دوبەرەکی و شتی وا، ئیتر هەڵسن و واز لە قورئان خوێندن لەو کاتەدا بهێنن و، ئەو کۆڕو کۆمەڵەی کە وا بێ جۆڵی کەن و بەجێی بهێڵن.( تاج الاصول في احاديث الرسول (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) بەرگی پێنجەم لاپەڕە: ٢٨٧ ز : ٧٨ ژ: ٧).

**ڕاڤەو شیکردنەوە :**

(جوندوبی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سوفیانی بوجەلی)، لە هاوڕێیانە، لە سەردەمی پێغەمبەردا مێرد مندالّ بووە، دەگێڕێتەوەودەفەرموێ: (پێغەمبەری خودا(درودی خودای لێ بێ) نەخۆش بوو، لەبەر ئەوە شەوێ یان دوو شەو شەونوێژی نەکرد). هەشت فەرموودەی لە بوخاری پیرۆز دا هەیە، گێڕانەوەی لە ئوبەیی کوڕی کەعب و لە حوزەیفەوە ئەنجام داوە. (بڕ: ژ : ٥٦٠= بەرگی یەکەم لاپەڕە : ٥٣٨ + ژ : ٦٤٨ = بەرگی دووەم، ل: ٧١ ).

# پایانیٚ (خاتِمَة)

مامۆستای مامۆستایان، سەروەرمان (ئیمامی عەسقەلانی) (رەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) لە(خاتمە) ی ئەم جیٚگەیەدا، لەفەتحول باری شەرحی صەحیحیبوخاریدا دەفەرمویٚ:

نامەی فەضائیلی قورئان نەوەدو نۆ فەرموودەی بەرزەوە کراوی واتیادا نۆزدەیان موعەللەق ( بیٚپڕشتە )ـن، یا موتەباعاتن، ئەوانی تریان هەمووی مەوصولن، واتە : پەیوەستن، ڕشتەکەیان لە ئیمامی بوخاری یەوە هەتا سەر پیٚغەمبەر(درودی خودای لیٚ بیٚ) پەیوەستە و نەپچڕاوە. حەفتا و سیٚیان دووبارەن، ئەوانی تریان ( ٩٩- ٧٣= ٢٦) کە بیست و شەش فەرموودەن پوختەی ئەم نامەیەن. هەموویان (واتە: ئەم پوختەیە) ئیمامی موسلیمیش وەك ئیمامی بوخاری تەخریجی کردوون، بیٚجگە لەمانەیان :

١- فەرمودەکەی ئەنەس لە بارەی ئەوانەوە کە لە سەردەمی پیٚغەمبەردا هەموو قورئانیان لە بەر بووە =٥٠٠٣ بڕوانە ژ:١٤٩٤ تەجریدی صەریح بەرگی چوارەم = ٣٨١٠ فتح الباری + ٥٠٠٤ فتح الباری.
٢- فەرموودەکەی قەتادە ی کوڕی نوعمان لە بارەی فەضل و گەورەیی سوورەتی ﴿قل هو الله احد﴾ەوە. لە تەجریدەکەدا نییە =٥٠١٤ فتح الباری.
٣- فەرموودەکەی ژمارە : ١٧٢٨ تەجرید =٥٠١٣ فتح الباری. بەرگی/٤ تەجرید صەریح = مختصر صحیح البخاری.
٤- فەرموودەکەی ژمارە : ١٧٢٩ تەجرید =٥٠١٥ فتح الباری. بەرگی/٤ تەجرید صەریح = مختصر صحیح البخاری.
٥- فەرموودەکەی ژمارە : ١٧٣٠ تەجرید بەرگی چوارەم =٥٠١٧ فتح الباری بڕوانە پەراویٚزی/١٧٣٠.
٦- حدیث ابن عباس في قراءته المفصّل.

٧- فەرموودەکەی ژمارە : ٥٠١٩ فتح الباری. لە تەجریدە کەدا نییە.

٨- فەرموودەی ئەبو هورەیرە (لاحسد الا في اثنتين) =ژ :١٧٣٢ تەجریدی صەحیح، بەرگی چوارەم= فتح الباری شەرحی صەحیحی بوخاری ژ:٥٠٢٦.

٩- فەرموودەکەی عوثمان ژ :١٧٣٣ تەجرید، بەرگی چوارەم =ژ : ٥٠٢٧ فتح الباری.

١٠- فەرموودەی : (کانت قراءته مدّا) ژ : ١٧٣٧ تەجرید، بەرگی چوارەم = ٥٠٤٦ فتح.

١١- فەرموودەی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود: ( انه سمع رجلا یقرا ایة ) = ٥٠٦٢ فتح الباری =لە تەجریدەکەدا نییە.

## تەواو کاریّ (تتمە)

تەواو کاری ناوی ئەو صەحابەو پیاو چاکانەی کە پوختەییّ لە ژیان نامەیان نووسراوە، کە لیستیّ لە ناوی ئەم زاتانە لە سەرەتای بەرگی دووەم دا چەسپاوە، لە لاپەڕە شەشەوە دەست پیّدەکا، هەتا لاپەڕە نۆ. بە ناوی عائیشە – رەزای خوای لیّبیّ- دەست پیّ دەکا، کە ژمارەی ئەو فەرمودەیەی، کە ژیان نامەی عائیشە لەکۆتاییەوە نوسراوە، لەم پەڕاوە پیرۆزەدا، ژمارە (٣) یە، وە لیستە کە بە ناوی ( کەعبی کوڕی عوجرە ) کۆتایی دیّ، کە ژیاننامەی کەعب لە کۆتایی ژمارە : ٨٣٧=١٨١٥ فتح الباری =مختصر صحیح البخاری المسمّی بـ( التجرید الصریح ) بەرگی دووەم لاپەڕە :٢٣٧.

**بەرگی دووەم** :

ژ : ١٥١٣/٧٢٨- فەضلی کوڕی عەبباس = بەرگی/٢ ل –١٥٨.

ژ : ١٥٣٦/٧٣٨- یەعلای کوڕی ئومەییەی تەمیمی = ب/٢ ل- ١٦٣.

ژ : ١٥٥٣/٧٤٦- نافیعی کوڕی سەرجیس = ب/٢ ل- ١٧٠.

ژ : ١٥٦١/٧٥٠- صەفییەی کچی حویەیی=ب/٢ ل- ١٧٥+ بەرگی/٢ل٣١٠

ژ : ١٥٦٧/٧٥٥- شوعبەی کوڕی حەجاج = ب/٢ ل- ١٨٠+عەطای کوڕی سائیب = ب/٢ ل- ١٨٢ + الحکـم = ب/٢ ل/١٨٢+ مەنــصوری کــوڕی موعتەمــەری عەبـدوڵلا = ب/٢ ل/١٨٢+ یـەحیایی کوڕی سـەعیدی قـەطـطان = ب/٢ ل- ١٨٢.

ژ : ١٥٨٨/٧٦١- جەعفەرو عەلی و عەقیل و طالیب کوڕانی ئـەبو طالیـب = ب/ ٢ ل- ١٨٨.

ژ : ١٦٤٣/٧٨٤- عوروەی کوڕی زوبەیر = ب/٢ ل- ٢٠٣.

ژ: ١٨٧٥/٨٦٠- سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر = بەرگی/٢ل- ٢٥٦.

ژ : ١٩٤٥/٨٩٧- ئەبو دەرداء = ب/٢ ل- ٢٨٣.

ژ: ١٩٦٠/٩٠٥- روبەیعی کوڕی موعەویز = ب/٢ ل- ٢٨٧.

ژ : ١٩٨٦/٩١٦- جوەیریـیەی کچی حاریث = ب/٢ ل- ٢٩٨.

**بەرگی سێیەم:**

ژ : ٢٠٤٨/٩٣٣- عەبدوڕ رەحمانی کوڕی عەوف = ب/٣ ل- ٧.

ژ : ٢١٢٨/٩٦٤- میقدامی کوڕی مەعدیکەریبە = ب/٣ ل- ٣٨.

ژ : ٢١٢٩/٩٦٥- عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاصم = ب/٣ ل- ٣٩.

ژ : ٩٧٧/ ٢١٧٤- مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حدثان = ب/٣ ل- ٤٨.

ژ : ٢٢٥٨/١٠٠٠- ئەبو ڕافع =ب/٣ ل- ٧٣.

ژ : ٢٣٠٧/١٠١٥- مەڕوانی کوڕی حەکەم =ب/٣ ل- ٩٨.

ژ : ٢٣١٢/١٠١٧- بیلالی کوڕی رەباحی حەبەشی = ب/٣ ل- ١٠٤.

ژ : ٢٣١٦/١٠١٨- عوقوبەی کوڕی حاریث = ب/٣ ل- ١٠٦.

ژ : ٢٣٢١/١٠٢٠- ئەبو ئومامەی باهیلی = ب/٣ ل- ١٠٩.

ژ : ٢٣٢٧/١٠٢٤- رافیعی کوڕی خەدیـج = ب/٣ ل- ١١٥.

ژ : ٢٣٣٩/١٠٣٠- ظوهەیری کوڕی رافیع = ب/٣ ل- ١١٩.

ژ : ٢٣٥٢/١٠٣٤- ئیمامی زوهری = ب/٣ ل- ١٢٥.

ژ : ٢٣٥٦/١٠٣٦- ئەشعەثی كوڕی قەیس = ب/٣ ل- ١٢٨.

ژ : ٢٣٧٠/١٠٤١- صەعبی كوڕی جەثثامە = ب/٣ ل- ١٣٣.

ژ : ٢٣٧٥/١٠٤٣- حەمزەو عەلی = ب/٣ ل- ١٣٦.

ژ : ٢٤٥٢/١٠٦٣- سەعیدی كوڕی زەید = ب/٣ ل- ١٥٦.

ژ : ٢٥٠٢/١٠٨٠- عەبدوڵلای كوڕی هیشام = ب/٣ ل- ١٧٣.

ژ : ٢٥٩٣/١١٠٤- سەودەی كچی زەممە = ب/٣ ل- ١٩٤.

ژ : ٢٦٢٤/١١١٣- صوهەیبی كوڕی سنان ڕۆمی = ب/٣ ل- ٢٠١.

ژ : ١١١٦/ - ئوم ئەیمەن = ب/٣ ل- ٢٠٥.

ژ : ٢٦٩٢/١١٢٦- ئوم كەلثومی كچی عوقبە = ب/٣ ل- ٢٣٢.

ژ : ٢٧٣٩/١١٣٧- عەمری كوڕی حاریث = ب/٣ ل- ٢٦٩.

ژ : ٢٧٨٠/١١٤٥- تەمیمی داری = ب/٣ ل- ٢٧٦.

ژ : ٢٨٠٢/١١٥٤- جوندوبی كوڕی سوفیان = ب/٣ ل- ٢٨٦.

ژ : ٢٨٤٥/١١٧٣- ثابیتی كوڕی قەیس = ب/٣ ل- ٣٠٤.

ژ : ٢٧٥٠/١١٧٥- عوروەی كوڕی جەعدی باریقی = ب/٣ ل- ٣٠٥.

ژ : ٢٨٥٦/١١٧٩- موعازی كوڕی جەبەل = ب/٣ ل- ٣٠٧.

ژ : ٢٩٠٠/١١٩٤- ئەبوئوسەید : مالیكی كوڕی رەبیعە = ب/٣ ل —٣١٩

ژ : ٢٩٢٤/١٢٠٠- ئوم حەرامی كچی مەلحان = ب/٣ ل —٣٢٤.

ژ : ٢٩٣٧/١٢٠٦- طوفەیلی كوڕی عەمر = ب/٣ ل —٣٣٠.

ژ : ٢٩٥٩/١٢١٣- حەنظەلەی غەسیلی مەلائیكە = ب/٣ ل —٣٣٨.

ژ : ٢٩٦٢/١٢١٥- موجاشیعی كوڕی مەسعود = ب/٣ ل —٣٤٠.

ژ : ٢٩٧٦/١٢١٨- عەبباسی كوڕی عەبدول موطەلیب.

ژ : ٣٠٠٥/١٢٣٠- ئەبو بەشیری ئەنصاری = ب/٣ ل — ٣٥٤.

ژ : ٢١٥٩/١٢٧٨- جوبەیری كوڕی حەییە + موغەیری كوڕی شوعبە = ب/٣ ل/٤٠٨.

ژ : ٣١٧٣/١٢٨٢- سەهلی کوڕی ئەبو حەیثەمە = ب/٣ ل —٤١٣.

ژ : ٣١٧٦/١٢٨٤- عەوفی کوڕی مالیك =ب/٣ ل —٤١٥.

ژ : ٣٢٨٢/١٣٢٥- سولەیمانی کوڕی صورەد = ب/٣ ل —٤٥٣.

**بەرگی چوارەم:**

ژ : ٣٣٢٩/١٣٣٧- عەبدوڵلای کوڕی سەلام. بەرگی چوارەم/ لاپەڕە : ١٢.

ژ : ٣٥٠٩/١٣٩٦- واثیلەی کوڕی ئەسقەع- ب/٤ ل- ٨٧.

ژ : ٣٥١٨/١٤٠١- روبەیعی کچی موعەویز - ب/٤ ل-. ١٥٣١ ل ٢٥٧

ژ : ٣٦٣٣/١٤٤٤- دەحیەی ئەل —کەلبی - ب/٤ ل- ١٢٨.

ژ : ٣٦٦٠/١٤٥٠- عەمماری کوڕی یاسر - ب/٤ ل- ١٣٨.

ژ : ٣٧٠٥/١٤٦٢- فاتیمەی کچی پێغەمبەر - ب/٤ ل- ١٥٢.

ژ : ٣٧٤٢/١٤٧٣- عەبدوڵلای کوڕی مەسعود - ب/٤ ل- ١٦٢.

ژ : ٤٠١٩/١٥٣٥- میقدادی کوڕی عەمری کیندی - ب/٤ ل- ٢٦٩.

ژ : ٤٠٧٢/١٥٤٧- وەحشی بکوژی حەزرەتی حەمزە - ب/٤ ل- ٢٨٤.

ژ : ٤١٠٩/١٥٥١- سولەیمانی کوڕی صورەد ( بڕ :١٣٢٥ ) - ب/٤ ل- ٢٩١

ژ : ٥٠١٨/١٧٣١- ئوسەیدی کوڕی حوضەیر- ب/٤ ل- ٥٣٢.

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس بۆ خوا لێرەدا بەرگی چواری تەرجەمـە ( وەرگـەڕاوە ) کوردییـە کە تەواو بوو، کەبەباسی (فضائل القران) کۆتایی هات.

بەرگی چوارەم تەواو، خوا یـار بـێ سـەرەی بـەرگی پێنجەمـە لـەم پـەراوە پیرۆزە، کە دوا بەرگە، بە ( كتاب النكاح ) دەست پێ دەکا.

وەرگێڕ : نوری فارس حەمە خان حەسەن

٢٠٠٥/٥/٥

کوردستان /سلێمانی

# پێڕستی بابەتەکان

